عمریش ڕووی تیٚ کردو و پیٚ ی ووت: ئەو جلە ناشیرینانەی لەبەری خاڵمدایە، وایان لیٚ نەکردووە بیهێنێتە ئاستی تۆو ئەو جلە کەشخەو جوانەشی لەبەری تۆ دایە وای لەتۆ نەکردوە بتباتە ریزی خاڵم [١] و کەلە تەنیشت ئەمیری باوەڕدارانداية .

عمر رحمه الله لە خزمەت کۆمەڵێکی زۆر لە زانایاندا پەروەردە بووە و ژمارەیان لە(٣٣) زانا زیاترە، هەشتیان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بوون و (٢٥) یشیان لە (تابعین) بوون.[٢]

ئەمە گرنگترین هۆکاری دروست بوونی کەسایەتی بەرزی عمربووە، لێرەشدا ئەو وانەیەش فێر دەبین کە ئەرکی سەر شانی مامۆستاو زانا ئاینیەکانە کە گرنگی تەواو بدەن بە ڕۆڵەی موسڵمانان و لەسەر قورئان و سوننەت گۆشیان بکەن، بە تایبەتی کوڕی کار بەدەست و بەرپرسەکان چونکە لە دوا ڕۆژدا ئیشی چاکسازی زۆریان لە دەست دێت.

## سیٚ یەم: شوێنەواری زانستی عمر

هەموو ئەوانەی لەسەر ژیانی عمریان نووسیوە، لەسەر ئەوە کۆکن کە پێشەوایەك بووە لە پێشوواکانی سەردەمی خۆی، تا وای لێهاتووە هەردوو زانای مەزن ـ سوفیانی کوڕی عوییەینە و ئیمام مالیك ـ بە (ئیمام) وەسفیان کردووە.[٣]

موجاهیدیش دەربارەی دەڵێت : هاتین بۆ لای تا شتی فێر بکەین، کەچی ئەوەندەمان زانی ئەو شتی فێری ئێمە دەکرد.[٤]

مەیمونی کوڕی مەهرانیش دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز مامۆستای زاناکان بووە.[٥]

---

١ـ سير اعلام النبلاء لا (٤/٤٦١).

٢ـ مسند امير المؤمنين عمر لا٣٣٢.

٣ـ الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز (١/٦٧).

٤ـ تهذيب التهذيب (٧/٤٠٥)

٥ـ تاريخ ابى زرعة.

(الذهبی) دەربارەی عمر دەڵێت: (بەڕاستی پێشەوا و شەرع زان و موجتەهید بووە، زانا بووە بە سوننەتەکان، ناوداری مەزن، پلەی- حافظ -ی هەبووە، زۆر خواناس و تەوبەکار بووە، لە ژیان پاکی و دادپەروەریدا لەگەڵ باپیرە عمری کوڕی خطابیدا دەژمیررێت، لە زوهد و دنیا نەویستی دا لە (حەسەنی بەسری) و لە زانیاریشدا لە ئیمام زوهەری کردوە.[١]

زاناکان ووتەو کرداری عمریان بە بەڵگە زانیوەو بە نموونە هێناویانەتەوە، ئەمەش لەو پەیامانەدا دەردەکەوێت کە (لیث) ی کوڕی (سەعد) بۆ ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەسی ناردووە، کە کۆمەڵێك نامەی کورتن، تایدا بەڵگە لە بەرامبەر هەندێ لە بووچونەکانی مالیك دەیهێنێتەوە بە ووتەو کردارەکانی عمری کوڕی عبدالعزیز.[٢]

ناوی خەلیفە عمر لە کتێبە فیقهی یەکانی هەر چوار مەزهەبەکەی ئەهلی سوننەدا هاتووە، کە بۆچوونەکانی ئەویان بە بەڵگە هێناوەتەوە، حەنەفیەکان لە زۆرێ لە مەسەلە فیقهیەکاندا کارەکانی عمریان بە بەڵگە هێناوەتەوە و نازناوێکی تایبەتیان لێ ناوە، تا لە باپیرە عمری کوڕی خطاب ی جیا کردۆتەوە،

(القرشی) لە (الجواهر المضية)دا دەڵێت : بۆ سوود وەرگرتن: هاوڕێیانمان لە مەسەلە فیقهیە نا کۆکەکاندا ـ الخلاف ـ دەڵێت: ئەمە ووتەی عمری بچکۆلەیە. مەبەستیان عمری کوڕی عبدالعزیزە ئەو پێشەواو خەلیفە بەناو بانگەیە.[٣]

شافعی یەکان لە کتێبەکانیاندا زۆر جار ناویان هێناوە، وە تەنانەت پێشەوا نەوەوی لەسەر ژیانیشی بە درێژی ڕۆیشتووە.

هەروەها مالیکیەکان و حەنبەلیەکان زۆرێك لە ووتەو کردەوەکانی عمریان بە بەڵگە هێناوەتەوە وەلە سەر سەلماندنی بۆ چوونە فیقهیەکان، حەنبەلیەکان زۆر

---

١ـ تذكرة الحفاظ لا١١٨-١١٩.

٢ـ الاثار الواردة فی عمر بن عبدالعزيز فی العقيدة (١/٧٠).

٣ـ الجواهر المضية (٤/٥٥٢).

زیاتر له سەری دەڕۆن و وه تەنانەت ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: وا نازانم ووتەی هیچ کەسێك له تابعین بشێت به بەڵگه بهێنرێتەوه جگه له ووتەکانی عمری کوڕی عبدالعزیز و دەی ئەمەشی به.[1]

یان هەر ئیمامی ئەحمەد له جێ یەکی تردا دەڵێت: هەرکاتێك بینیت کەسێك عمری کوڕی عبدالعزیزی خۆش دەوێت و وەسفی چاکەکانی دەکات و له ناو خەڵکیدا بڵاوی دەکاتەوه، ئەوه بزانه ئەو کەسه خێری لێ بەدی دەکرێت– انشاءالله–[2].

١. عمر لەسەردەمی – وەلیدی کوڕی سولەیماندا:

عمر ی کوڕی عبدالعزیز به یەکێ لەو زانایانه دادەنرێت که له خەلیفەکانەوه زۆر نزیك بووه و شوێنەواری زۆری له ئامۆژگاری و ئاڕاستەکردنیان بۆ مەسەله سیاسیەکانی پێوه دیاره، وه عمر شوێنەوارێکی تایبەتی هەبوو لەناو خانەوادەی ئومەویەکاندا .

عبدالملك زۆر ڕێزی لێ دەگرت و سەرسام دەبوو به وردی و ژیری یەکەی لەسەردەمی لاوێتیدا، وەهەر ئەوەش وای لێ کردبوو له زۆرێك له کوڕەکانی خۆی خۆشتر دەویست و کچەکەی خۆشی بۆ هێنا، بەڵام لەسەردەمی خەلافەتی مەرواندا زۆر ڕۆڵی نەبووه چونکه لەو کاتەدا کەم تەمەن بووه و هەر وەك خەریکی زانست و خوێندن بووه.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا - ابن الجوزی - باسی ئەوەی کردووه، که له دوورەوه نامەی نوسیوه بۆ عبدالمليك و تێیدا ئاگاداری دەکردەوه له گەورەیی و ترسناکی ئەو بەرپرسیاریەتیەی خراوه ئەستۆی، تێیدا دەڵێت: ... پاشان، تۆ شوانیت و هەموو شوانێکیش بەر پرسیاره له رانەکەی، وه ئەنەسی کوڕی مالیك بۆی باس کردووین، که لەپێغەمبەری خوای بیستوه ﷺ فەرموویەتی: ((کل راع مسؤل عن رعیته)).[3] واته: هەموو شوانێك لەڕانەکەی بەرپرسیاره ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ

---

١ـ البداية والنهاية لة (الاثار الواردة ) وة لا (٧٢/١) وەرگیراوه.

٢ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (لابن الجوزي) لا٦١.

٣ـ اثرالحياة السياسية لا١٥٩.

لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۗ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴾النساء:٨٧.

دەڵێت: عبدالملك ی کوڕی مەروان عمری کرد بە والی ـ خەناسیرە ـ تا رای بهێنێت لەسەر فەرمانبەریەتی و ئەمیری لەکاتی لاویدا.[١] وەهەندێکیش دەڵێن: سولەیمانی کوڕی عبدالملك کردی بەوالی ئەو جێگایە .

خەلیفە عمر زۆر دڵ گرانبو و خەفەتبار بوو بە مردنی خەلیفە عبدالملك و کاتێ لەگەڵ موسەیلەمەی کوڕی عبدالملك دا کۆبوونەوە، عمر پێی ووت : ئەی موسەیلەمە من لەلای باوکت بووم کاتێ دفن کرا بە چاوەکانی خۆم سەیرم دەکرد کاتێ دەیانکرد بەژێر خۆڵەوە، بینیم وا گەڕایەوە حزوری خوای تەعالی زۆر ترسام و ڕاچلەکیم، وە پەیمانم دا بەخودا ئەگەر ببم بە فەرمانڕەوا وەك ئەو حوکم ڕانی و ئیش و کارەکان ئەنجام نادەم وە ئەوەش ئیجتهادی من بوو لەو کارەدا.[٢]

### ١ـ عمر کرا بە والی شاری مەدینە :

لە ربیع الاول ی ـ ی ساڵی ٨٧ ی کۆچیدا لەلایەن وەلیدی کوڕی عبدالملك ەوە کرا بە ئەمیری شاری مەدینە و پاشان لە ساڵی ٩١ ی کۆچیدا شاری (طائف) یشی خرا ئەستۆ واتە بوو بە والی هەموو وولاتی حیجاز.

بۆ وەرگرتنی بەرپرسیارێتی (٣) مەرجی لە خەلیفە هەبوو:

١ـ دەبێت بە جۆرێك مامەڵە لەگەڵ میللەتدا بکات کە پڕبێت لەدادپەروەری و ماف پێدان و کەسێ لەبن دەستی دا ستەمی لێ نەکرێت، نابێت هەموو ئەو سامانەی کۆدەکرێتەوە ببرێتەوە بۆ (بیت المال) ی گشتی، بەو هۆیەوە هەموو ئەو سمانانەی ڕەوانەی پایتەختی خەلافەت دەکرێت دەبێت زۆر کەم بێت .

٢ـ دەبێت لە یەکەم ساڵدا ڕیگای پێ بدرێت حەجیماڵی خوا بکات، چونکە تا ئەو ساتە وەختە حەجی نەکردبوو .

---

١ـ الاثار الواردة فی عمر بن عبدالعزیز (٩٣/١).

٢ـ السیاسة الاقتصادیة والمالیة لعمر بن عبدالعزیز، بشیر کمال عابدین لا١٠.

٣ـ دەبێت ڕێگای پێ بدرێت مووچەو هاوکاری دابەش بکات بەسەر خەڵکیدا لە شاری مەدینە.

(وەلید) یش بەم مەرجانە رازی بوو، عمری کوڕی عبدالعزیزیش رحمه الله دەست بەکار بوو خەڵکەکەش زۆر زۆر دڵخۆش بوون بە ئەمیری نوێیان .[١]

## ٢– ئەنجومەنی ڕاوێژکاری عمری کوڕی عبدالعزیز :

یەکێ لە کارە گەورە و بەرچاوەکانی عمر رحمه الله پاش دەست بەکاربوونی دروستکردنی ئەنجوومەنی شورا بوو لە شاری مەدینە، کاتێ خەڵکی هاتن بۆ پیرۆز بایی و سڵاو لێکردنی ئەمیری نوێی شارەکەیان (١٠) کەس لە زاناکانی شاری هەڵبژارد و بانگی کردن بۆ لای خۆی کە ئەمانە بوون:

(عروە) ی کوڕی زوبێر و عبیداللە ی کوڕی عبداللە ی کوڕی عوتبە و ئەبوبەکری کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی حارث و ئەبوبەکری کوڕی سولەیمان ی کوڕی ئەبی خەیثە مە، سولەیمانی کوڕی یەسارو قاسم ی کوڕی محمدو سالم ی کوڕی عبداللە ی کوڕی عمر و عبداللە ی کوڕی عبداللە کوڕی عمر و عبداللە ی کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعە و خارجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابت.

هاتن بۆ لای، لەلای دانیشتن، ئەویش بە سوپاس و سەنای پەروەردگار دەستی بە ووتارەکەی دا ووتی : من ئێوەم بۆ کارێك بانگ کردووە کە پاداشتتان دەدرێتەوە لەسەری، تیایدا پاڵپشتی هەق و ڕاستی دەگرن، منیش هیچ کارێك ئەنجام نادەم تا ڕای ئێوە وەرنەگرم یان ئەوانەتان لەو کاتەدا لێرە دەبن، هەر کاتێ بینیتان یەکێ ستەمی لێ دەکرێت و یان هەواڵی کار بەدەستی منتان بیست کە ستەمی کردووە لە یەکێك، بۆ خاتری خوا شتی واتان بیست ئاگادارم بکەنەوە.[٢]

کاتی خۆی عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه ئەنجوومەنی شورای کۆ دەکردەوە بۆ هەموو پێش هاتەیەکی تازە، بە پێویستی دەزانی ڕاوێژیان پێ بکات، عمری کوڕی

---

١ـ السياسة الاقتصادية والمالية لعمر بن عبدالعزيز، بشير كمال عابدين ل١٠.

٢ـ الطبقات (٢٥٧/٥) . موسوعة فقه عمر – قلعضى ل ٥٤٨.

عبدالعزیز‌رحمه‌الله کە ئەوەی خطاب بوو- ئەنجوومەنێکی نوێ ی هێنایە کایەوە و سنووری کاری بە دووخاڵ بۆ دیاری کردن :

أ- مافی ئەوەی پێدان کە ڕاو و بۆچوونەکان پەسەند بکەن، ئەو هیچ کارێك ئەنجام نادات بەبێ ڕای ئەوان، بەو شێوەیە ئەمیر سنووری کاری خۆی تەسك کردەوە بۆ ئەم ئەنجوومەنە کە پێی دەڵێن (ئەنجوومەنە دە کەسییەکە).

ب- وەك چاودێر دانان بەسەر فەرمانبەر و بەرپرسەکانییەوە، هەموو هەڵس و کەوتێکیان بخەنە ژێر چاودێرییەوە، هەرکاتێك زانیاریەکیان هەبوو لەسەر کەسێك لە بەر پرسەکان کە ستەم دەکەن خێرا عمری لێ ئاگادار بکەن و ئەگەر وا نەکەن ئەوە خوا ئەدات بە گژی ئەو کەسەدا شت دەشارێتەوە و ستەم پەردە پۆش دەکات.

لەمەدا دوو شت تێ بینی دەکەین:

١- ئەمیر باوەڕدارن عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه‌الله هیچ مووچەیەکی بۆ ئەو دە کەسە نەبڕیەوە،چونکە ئەوانە خۆیان مانگانەیان هەبوو، لەبەر ئەوەی خۆیان فەقیهو زانا بوون ئەوە بەشێك بوو لە ئەسلی کارەکەیان .

٢- عمر‌رحمه‌الله ئەوەی پێ ووتن کە مەرج نیە هەر هەمووتان کۆ بکەمەوە و ڕاتان وەربگرم چونکە لەوانەیە هەندێکتان لەبەر بیانوویەك نەتوانن ئامادە بن، بۆیە ژیرانە پێ ی ووتن : یان بە ڕای ئەو کەسانەتان کار دەکەم کە لەو کاتەدا لەشاردا بن.[١]

ئەم ئەنجوومەنە دە کەسیەش لە هەموو کارو پێشهاتەکاندا پرس و ڕاوێژیان پێ کراوە بەبێ دیاری کردن.[٢]

لەم بەسەر هاتەوە گرنگی و پلە و مەقامی زانایانمان بۆ دەردەکەوێت، پێویستە لەسەر حوکمڕاکان ئەو کەسانە لە خۆیان نزیك بکەنەوە و لە کارو باری میللەتدا ڕاوێژیان پێ بکەن، هەر وەك لەسەر زانایان پێویستە لە دەوری حوکمڕا چاکەکان

---

١- نظام الحکم فی الشریعة والتاریخ الاسلامی (٥٦١,٥٦٢/١).
٢- نظام الحکم فی الاسلام بین النظریة والتطبیق. ل٣٩١.

کۆ ببنەوە لە پێناو هێنانە دی ڕادەیەکی زیاتر لە بەرژەوەندییەکان و کەم کردنەوەی ئاستی گەندەڵییەکان، هەرچەندە عمری کوڕی عبدالعزیز بەو دە کەسە دڵی ئاوی نەدەخوارد بەڵکو پرس و ڕاو ڕاوێژیشی بە زانایانی تری ناو شاری مەدینە دەکرد وەك سەعیدی کوڕی مەسەییب و زوهەری و کەسانی تریش.

لەهەندێ مەسەلەی دادوەریدا پرسیاری لە سەعید دەکرد، لە شاری مەدینە عمر ڕێزی تەواو و شایستەی زانا و داناکانی دەگرت، دەڵێن جارێك کە سێکی نارد بە دوای سعیدی کوڕی موسەییب دا و لە مەسەلەیەك پرسیاری لێ بکات، سەعید هەرگیز نەچووە بۆلای خەلیفە و ئەمیرەکان، بەڵام نێرراوەکەی عمر ایێی تێك چوو پێ ی ووت: عمر بانگت دەکات، ئەویش خێرا نەعلەکانی لە پێ کرد خۆی پێ گەیاند، کاتێ عمر بینی هاواری کرد: داوات لێ دەکەم ئەی باوکی محمد بگەڕێوە ماڵەکەی خۆت تا لەوێ نێرەرەکەم پرسیارە شەرعیەکەت لێ بکات، چونکە ئێمە نەمان ناردووە بە دواتدا بەڵکو نوێنەرەکەم بە هەڵەدا چووەو وای زانیوە دەمەوێت بێیت بۆ لامان.[1]

لەسەردەمی ئەمیری مەدینەیدا بە فەرمانی عبدالملك ی کوڕی مەروان مزگەوتی پێغەمبەری خوای ﷺ فراوان کرد، کردی بە(٢٠٠) باڵ و هەر لەسەر فەرمانی عبدالملك زەخرەفەو نەخشەساندنی تێدا ئەنجام دا، هەرچەندە خۆی نەخشاندنی مزگەوتی پێ ناخۆش بوو.[2]

لەو هەڵوێستەی عمرەوە دەردەکەوێت کە کاربەدەست و ئاست نزم دەتوانێت ئەو فەرمانانەی سەرووی خۆی جێبەجێ بکات هەر چەندە لە دڵیشەوە پێی ڕازی نەبێت و پێی ناخۆش بێت، ئەگەر بزانێت لە ڕوویەکەوە بەرژەوەندی یەکی تێدایە .

لە ساڵی ٩١ ی کۆچیدا عبدالملك حەجی کرد و لەو سەرەوە سەردانی ئەمیری مەدینەی کرد و لە نزیکەوە چاوی کەوت بەو کارە چاکسازیانەی عمر کردوویەتی لە ناو شاری مەدینەی پڕ لە نووردا.[3]

---

١- سيرة عمر بن عبدالعزيز ومناقبه لابن عبدالحكم ل٢٣.

٢- تفسير القرطبي (١٢/٢٦٧).

٣- موسوعة فقه عمر بن عبدالعزيز ل٢٠.

**٣- ڕوداوێکی نەخوازراو:**

زاناکانی مێژوو نووس دەڵێن: خوبەیبی کوڕی عبداللە ی کوڕی زوبێر فەرموودەیەکی بە دەم پێغەمبەرەوە گێڕایەوە کە گوایە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((اذا بلغ بنو ابی العاص ثلاثین رجلا اتخذوا عباد الله خولا ومال الله دولا )).[1]

مانای فەرموودەکەش ئەمەیە گوایە فەرمویەتی: ئەگەر بنی عاص ی بنی امیە ژمارەیان بگاتە(٣٠) پیاو ئەوا بەندەکانی خوا دەکەنە خزمەتکاری خۆیان و پارەکانیشیان لێ دەگرنەوە بۆ خۆیان!.. کە فەرموودەیەکی لاوازە .

وەلیدی کوڕی عبدالملك یش جوابی نارد بۆ ئەمیری مەدینە عمری کوڕی عبدالعزیز و فەرمانی پێدا ئەو پیاوە بگرێت و(١٠٠) داری لێبدات و زیندانیشی بکات تا جارێکی تر بەدەم پێغەمبەری خواوە فەرموودە هەڵنەبەستێت و تیایدا زەمی ئومەوییەکان نەکات.

بەڵێ عمر رحمه الله بە قسەی کرد وای لێ کرد، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بوو بێت ئەو سزایەی بەکەم زانی بۆ کەسێك ئا بەو جۆرە فەرموودە هەڵبەستێت و خەلیفەی موسڵمانان و بنەماڵەکەی عەیب دار کات تیایدا، بۆیە فەرمانی دا یەك گۆزە ئاوی زۆر سارد، لە بەیانیەکی زۆر ساردا بکەن بەسەریدا و کاتێ وایان لێ کرد تووشی نەخۆشی گوزار — سەرما خوردەگی بوو، پاشان بەو نەخۆشیە مرد.

کاتێ عمر هەواڵی ئەوەی زانی کە نەخۆشی زۆری بۆ هێناوە، فەرمانی دەرکرد ئازادی بکەن تا بچێتەوە ناو منداڵی خۆی، زۆر پەشیمان بوو لەسەر ئەو کارەی، پاشان زۆر خەفەتبار بوو بە مردنی، لە(مصعب) ی کوڕی (عبداللە) و ئەویش لە (مصعب) ی کوڕی (عثمان)ەوە دەگێڕنەوە کە بەنەخۆشی بردیانەوە بۆ ماڵی عمری کوڕی مصعب ی کوڕی زوبێر لە بەقیع و لە دەوری کۆ بوونەوە تا گیانی سپارد، لەو

---

[1] ـ رواه البیهقی فی دلائل النبوة (٦/٥٠٧) وابن کثیر دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لە هەموو ڕێگاکانیەوە لاوازە .

کاتەدا (ماجەشون) هات و داوای هاتنە ژورەوەی کرد و لەو کاتەشدا خوبەیب لەناو مەوجێکدا ڕاکشێنرابوو.

ئەم (ماجەشۆن)ە لەگەڵ عمری کوڕی عبدالعزیزدا بوو لە هەموو کارەکانیدا لە مەدینە، عبدالله ی کوڕی عروە ووتی: ڕێگای بدەن با بێتە ژوور، کاتێ هاتە ژوورەوە عبدالله ووتی: وا دیارە ئەم پیاوە گومانی هەیە لە مردنی خوبویب دا سەری تەرمەکەی بۆ هەڵبدەنەوە، کاتێ بۆیان لادا، هەر کە ماجەشۆن بینی بە خێرایی چووە دەرەوە.

ماجەشۆن دەڵێت: هاتمەوە بۆماڵی مەروان، دام لە دەرگاو چوومە ژوورەوە و عمرم بینی وەك ئافرەتی سك پڕ، کە ژانی هەبێت هەڵئەساو دادەنیشتەوە، پێ ی ووتم: ها هەواڵ چی یە؟ منیش ووتم: پیاوەکە مرد، لەو کاتەدا عمر کەوتە سەر زەویەکەوە ڕەنگی تێك چوو و، پاشان سەری هەڵبڕی۔ انا لله وانا الیه راجعون ـــی دەووت، تەنانەت ئەو خەمباری‌یەی بە دەم و چاویەوە دیار بوو تا ئەو ڕۆژەی مرد، وازی لە ئەمیری مەدینەی هێنا و هیچ بەرپرسیاریێتی‌یەکی تریشی وەرنەگرت لە داخی ئەو ڕوداوە ناخۆشە، هەر کاتێ پێیان بگووتایە : فلان شتی چاکت کرد مژدەت لێبێت، ئەویش لە وەڵامدا دەیووت : ئەی خوبەیب چی لێ بکەم . تا مردن لە بیری نەدەچوو! .[1]

بەڵگەیەکی تر لەسەر چاکی و لەخوا ترسانی لە کاتی ئەمیری شاری مەدینەیدا : ئەوەیە کە ئەبوو عمر ئەسمای کچی ئەبوبەکر، دەڵێت : هاتم بۆ ئەو شوێنەی عمر نوێژی بەیانی لێ دەکرد و قورئانێکی لە باوەشدا بوو، فرمێسکەکانیشی دەهاتنە خوارەوە بەسەر ڕیشیدا.[2]

---

١ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز (لابن الجوزی) ل٤٢ .

٢ـ هەمان سەرچاوە.

(ابن ابی زناد) لە باوکی یەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز کاتێ ئەمیری مەدینە بوو هەر کاتێ بیوستایە خێرێك بکات دەیووت: ماڵێك بدۆزنەوە زۆر هەژار و نەدار بێت.[1]

## ٤- موزاحیم ی مەولای ئامۆژگاری دەکات:

عمر رحمه الله پیاوێکی زیندانی کرد لە مەدینە، لەو ماوەیەی بۆی دیاری کردبوو زیاتر لە زیندان هێشتی‌یەوە، (موزاحیم) هات داوای لە عمر کرد کە ئازادی بکات، عمریش ووتی: ئازادی ناکەم تا بەتەواوی و لە ڕادەبەدەر بۆم دەرنەکەوێت کە باش بووە و وازی هێناوە، موزاحیمیش بە تووڕە بوونەوە پێی ووت: ئەی عمری کوڕی عبدالعزیز، من ئەتترسێنم لە شەوێك بەیانی یەکەی ڕۆژی قیامەت بێت، ئەی عمر ئەمە چی‌یە خەریکە ناوەکەی خۆتم لەبیر دەچێتەوە ئەوەندە. ئەمیر ووتی، ئەمیر ووتی، ئەمیر ووتی: دەبیستم.

عمریش ووتی: یەکەمین کەسێك لەم بارەیەوە بە ئاگای هێنامەوە موزاحیم بوو، وەڵلاهی هەر وابوو کە ئەو ووتی لەم بارەیەوە، وەك بڵێ ی ئەو پەردە- ڕەشەی -لادا کە بەری چاومی گرتبوو.[2]

لەم چیرۆکە کورتەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بوونی هاوڕێی دڵسۆز و پیاو چاك پێویستە بۆمرۆڤ ـ لە کاتی غەفلەت و بێ ئاگایی دا بە ئاگای بێنێتەوە.

## ٥- نێوان عمر و حەجاج لەسەر دەمی وەلیددا:

(ابن الجوزی) باس لەوە دەکات کە عمری کوڕی عبدالعزیز داوای دەست لە کار کشانەوەی وەك ئەمیری مەدینەی کرد، وەك پێشتر باسمان کرد.

بەڵام هەندێکی تر باس لەوە دەکەن، کە وەلید لای بردووە، لە ساڵی ٩٢ ی کوچیدا سەرکردایەتی حەجی دایە دەستی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی و، کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز بەو هەواڵەی زانی، یەکسەر نامەی نووسی بۆ خەلیفە و

---

١ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز (لابن الجوزی) لا٤٢ .

٢ـ هەمان سەرچاوەلا١٤٠.

تیایدا داوای لیٚ کرد کە با حەجاج بەناو مەدینەدا تێنەپەڕێت، چونکە زۆر ڕقی لیٚی بوو، حەزی نەدەکرد چاوی بە ناو چاوی بکەوێت، لەبەرئەو زولم و ناڕەوایی یانەی کە بە خەڵکی عیراقی دەکرد .

وەلیدیش بە حەزی عمری کرد و نامەی نووسی بۆ حەجاج و پیٚ ی ووت : عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی بۆ ناردووم کە نەهێڵم تۆ بەناو شاری مەدینەی منەوەرەدا تیٚپەڕێت، دەی تۆش لە شوێنێکەوە مەڕۆ کە ڕقیان لێت بێت و لە مەدینە لادە بۆ ڕێگەیەکی تر.[1]

عمر کاتیٚ والی شاری مەدینە بوو – نامەی نارد بۆ عبدالملك و تیایدا باسی ئەو زوڵم و زۆرداری و ناڕەواییانەی حەجاجی دەکرد کە لەگەڵ خەڵکی عیراقدا دەینواند، حەجاجیش بەمانەی دەزانی بۆیە زۆر ڕقی لە عمر هەستا بوو، بۆ هەل دەگەڕا کە تۆڵەی لیٚ بکاتەوە بە تایبەت پاش ئەوەی کە وولاتی حیجازی وا لیٚ کردبوو ببێتە جیٚی حەوانەوەی ئەو کەسانەی لە عیراقەوە و لە دەستی زوڵمی حەجاج هەڵدەهاتن.

بۆیە نامەی نارد بۆ خەلیفە وەلید ووتی پیٚی : یۆخڵەواتی عیراق و بە تایبەت هەندیٚ لە سەقەفی یەکان لە دەستی من هەڵدێن و بەرەو مەککەو مەدینە دەڕۆن و لەویٚ بەبیٚ وەی دادەنیشن و ئەمەش دەستەلاتمان دەخاتە لێژی، ئەویش بۆی نووسی کە عثمانی کوڕی حەبان و خالدی کوڕی عبدالله ی قەسری دابنێت و عمری کوڕی عبدالعزیز لەسەر کار لابەرێت.[2]

ویست و حەزی خەلیفەی موسڵمانان بە ئاشکرا دیار بوو دەربارەی حەجاج، ئەو وای گومان دەبرد کە سیاسەتی توند و تیژی و زەبر و زەنگ تاکە چارەسەرە بۆ بەهێز کردنی دەستەڵاتی دەوڵەتەکەی، هەر ئەمەش بوو وای لیٚ کرد بە قسەو ڕاوێژە جوانەکانی عمر کار نەکات، هەر چەندە ڕووداوەکانی پاشتر ئەمەیان سەلماند کە بۆ چوونەکانی عمر ڕاستر و جوانتر بوون لەو بۆچوونانەی وەلید، بۆیە

---

١ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز ومناقبه لابن عبدالحکم لا٢٤.

٢ـ تاریخ الطبری (٣٨٣/٧) .

عمر پاش ئەوەی بوو بە خەلیفەی موسڵمانان خۆی هەموویانی جێبەجێ کرد و سەر کەوتنیشی بەدەست هێنا.[١]

## ٦- عمر رحمه الله بۆ دیمەشق دەگەڕێتەوە:

عمر رحمه الله لە مەدینەی پڕ لە نوور دەرچوو بەرەو شاری دیمەشق کەوتە ڕێ و چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو و بەکوڵ دەگریا، (موزاحیم) ی خزمەتکاری لەگەڵدابوو، بۆیە لای کردەوە بۆ لای موزاحیم و ووتی: ئەترسین لەو کەسانە بین کە مەدینە فڕێیان دەداتە دەرەوە،[٢]

مەبەستی لەو فەرموودەیە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( الا وان المدینة کالکیر یخرج الخبث، لا تقوم الساعة حتی تنفی المدینة شرارها، کما ینبغی الکیر خبث الحدید))،[٣] واتە: شاری مەدینە وەك کورە وایە پیسی دەردەداتە دەرەوە، قیامەت نایەت هەتا شاری مەدینە خراپەکانی دەرنەداتە دەرەوە، وەك چۆن کورە پیسی و خاشاکی ئاسن دەردەداتە دەرەوە.

مزاحم دەڵێت : کاتێ لە شار دەرچووین سەیرێکی ئاسمانم کرد بینیم مانگ کەوتۆتە نێوان ئەستێرەی سورەیا و جە وزاء، وەك بڵێی ئەوە باش نی یە . دەڵێ: پێم خۆش نەبوو ئەوەی پێ بڵێم، بەڵام پێم ووت : ئەوە سەیرێکی مانگ ناکەیت چەند جوانە لەوشەوەداو لەناوجەرگەی ئاسماندا! عمر چاوێکی هەڵبڕی و بینی وا مانگ کەوتۆتە نێوان ئەو دوو ئەستێرەیەوە، بۆیە بەموزاحیم ی ووت: چ-یە وویستت بۆم دەربکەوێت، کە مانگ کەوتۆتە نێوان سورەیاو جەوزاء ! ؟.

ئەی موزاحیم ئێمە لەسەر ئەساسی خۆر و مانگ لەماڵەوە دەرناچین، بەڵکو پشت بە خوای (واحد القهار) دەردەچین.[٤]

---

١ـ اثر العلماء فی الحیاة السیاسیة ل١٦٥.

٢ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز ومناقبه لابن عبدالحکم ل٢٧.

٣ـ مسلم کتاب الحج باب المدینة تنفی شرارها.

٤ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز ومناقبه لابن عبدالحکم ل٢٧.

عمر رحمه الله بەردەوام دەڕۆیشت تا گەیشتە ناوچەی (سوەیدا)و لەوێ لایدا بۆ حەوانەوە چونکە کێڵگەو خانوویەکی خۆی لەوێ هەبوو، ماوەیەك لەوێ نیشتە جێبوو لە دوورەوە سەیری بارو زرووفەکەی دەکرد، پاشان بیری هاتە سەر ئەوەی لەبەرژەوەندی موسڵمانانە، کە بەماڵەوە بڕواتە دیمەشق و لە نزیك خەلیفەوە بێت، بەڵکو بتوانێت ستەمێك نەهێڵێت، یان مافێك بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، بەو نیازەوە بەیەکجاری ڕۆیشت بۆ دیمەشق و لەوێ نیشتەجێ بوو[1]

ئەوە وەنەبێت عمری کوڕی عبدالعزیز نێوانی لەگەڵ خەلیفە وەلید دا خۆش بێت، چونکە ژیانی لە بن دەستی خەلیفەدا کۆمەڵێ گیرو گرفتی بۆ دروست بوو، چونکە وەلید بۆ بەهێز کردن و ڕاوەستا و کردنی بنچینەی دەوڵەتەکەی پشتی دەبەست بە هەندێ لە ئەمیر و کاربەدەستە توند و تیژو دڵڕەقەکانی بۆ قەوچاندنەوەی ملی خەڵکی، ئیتر با لەو کارەشدا زوڵم و ستەم ئەنجام بدەن.

بەڵام عمر رحمه الله بە پێچەوانەوە بۆی دەڕۆیشت، دەیووت دادو یەکسانی زامنی هەموو سەقامگیری یەکی ئاشتیە، هۆکاری گوێڕایەڵی میللەتە بۆ کار بەدەستان.

عمر رحمه الله هەموو جارێ دەیووت : وەلید لەشام و حەجاج لە عیراق و محمد ی برای حەجاج لە یەمەن و عثمانی کوڕی حەیان لە حیجاز و قرەی کوڕی شەریك لە میسر، ... دەی وادیارە وەڵلاهی سەر زەوی پڕ بوو لە زوڵم و ستەم[2].

### ٧- ئەی وەلید با( والی )یەکانت کەس نەکوژن بە پێ پرسی تۆ:

عمر رحمه الله هەندێ ڕێگا و هۆ کاری گرتە بەربۆ چاکردنەوەی وەزعە نائاسایی یەکان، یەکێ لەوانە ئامۆژگاری وەلیدی کرد کە سنورو دەسەڵاتی کاربەدەستەکانی تەسك بکاتەوە و بۆیان نەبێت سەربە خۆ کەس بکوژن، لەسەرەتاوە لەم کارەی سەرکەوتو بوو توانی بڕیارێك بەوەلید دەربکات کە هیچ والیەك بۆی نیەکەس بکوژێت مەگەر پاش ئاگادارکردنەوەی والی وڕازی بوونی بەوکارە.

---

١- البداية والنهاية (١٢/٦٨٣) .

٢- اثر العلماء فی الحیاة السیاسیة لا١٦٢.

(إبن عبد الحكم)دەڵێت: عمری کوڕی عبد العزیز چوو بۆلای وەلیدی کوڕی عبدالملك و پێ ی ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئامۆژگاریەکم لەلایە، هەرکاتێ بیرت لەلای خۆت و عەقلت جەم بوو پرسیارم لێ بکە پێت دەڵێم:

ووتی:ئەی ئێسا بۆ نایڵێت؟ عمریش ووتی: خۆت دەزانیت، ئەگەر ئەو ئامادەیی یانت تێدایە ئەوە من ئامادەم.

چەند ڕۆژێك تێ پەڕی وەلید بەدەرگاوانەکەی ووت: کێ لەبەر دەرگایە؟ ووتی: هەندێ کەسی لێ یە لەوانە عمری کوڕی عبد العزیز. ووتی: بیهێنە ژوورەوە ئەویش هێنایە ژوورەوە.

وەلید پێ ی ووت: ئامۆژگاریەکەت پێش کەش بکە. عمریش ووتی: لەپاش هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوا هیچ تاونێك ئەوەندەی کوشتن گەورە نیە لەلای خوا، والی و کاربە دەسەکانت خەڵکی دەکوژن و، پاشان ئاگادارت دەکەن لەوەی فلان کەسیان کوشتوە لەسەر فلان تاوان، پاشان تۆ بەر پرسیاریت لەوکارە تۆ سزا دەدرێت لەسەری، بۆیە نامەیان بۆ بنوسە کەکەس نەکوژن تا نامەت بۆ دەنێرن و تاوانەکەی دەڵێن و شایەتیشی هەبیت و پاش ئەوە خۆت لێ بکۆڵەرەوە و فەرمانی خۆت دەربکە.

وەلیدیش ووتی: (بارك الله فيك)ئەی باوکی حەفص خوا تۆمان لێ نەسەنێ، ئادەی نامەم بۆ بنێرن و نامەی نوسی بۆ هەموو ئەمیری هەرێمەکان پاش ئەوە کەس لەقسەی دەرنەچوو تەنها حەجاج نەبێت، کە زۆر نیگەران ببو بەو بڕیارە، وای زانی ئەو نامەیەی تەنها بۆ ئەو ناردووە، ووتی: چیمان بەسەر هات؟ ئایا ئەم ڕێگەیە کێ بۆ ئەمیری بڕوا دارانی داناوە؟ ئاگاداریان کرد، کە عمری کوڕی عبد العزیزە ﵀ ئەم کارەی کردووە، ئەویش ووتی: دەی هیچ! ئەگەر عمر پێ ووتبێت هەڵوەشاندنەوەی نی یە.

پاشان حەجاج ناردی بەوای یەکێ لە خەواریجەکاندا کە ناوی جافی کوڕی وائلی بوو، پاش ئەوەی هێنایان حەجاج پێ ی ووت: دەبارەی موعاویە چی دەڵێت؟ئەویش قسەیەکی پێ ووت:ووتی: ئەی یەزید؟جنێوێکیشی بەو دا، ووتی:

ئەی عبدالملك چۆنە؟ووتی:ستەمكاربووە.ووتی:ئەی وەلید؟ ووتی:هەر ئەو تاوانەی بەسە،كە تۆكردوتە والیو زانیویەتیشی چەندوژمنكارو ستەم كاریت.

حەجاج بێ دەنگ بوو هیچی نەوت و ئەوەی بەهەڵ زانی لەگەڵ نامەیەك ناردی بۆ لای وەلید و بۆ نووسی: من زیاتر خەمی دینی خۆم دەخۆم باشتر چاودێری ئەو مەسەلەیە دەكەم،كە تۆ منت بۆی داناوە خۆم زیاتر دەپارێزم لەوەی كە كەسێك بكوژم هەقی كوشتنی نەبێت و ئەوكەسەیشی بۆم ناردویت یەكێكە لەوێنەی ئەو كەسانەی كەمن دەیان كوژم و تۆش خۆت دەزانی چی لێ دەكەیت پێ ی بكە.

حەروریەكە هێنرایە ژوورەوە بۆ لای وەلید و لەوكاتەدا پیاو ماقوڵانی شام لەلای بوون و عمریش لەوێ بوو.

وەلید ووتی: دەربارەی من چی دەڵێت؟ ووتی: ستەمكاری دەست درێژ كار. ووتی: ئەی چی دەڵێت دەربارەی عبد الملك؟ ووتی: ستەمكاری تاوانبار. ووتی: ئەی موعاویە؟ ووتی: ستەمكار بووە، وەلیدیش ووتی:بە(إبن الريان)بدە لەگەردنی و ئەویش دای لەگەردنی.

پاشان هەستاو گەڕایەوە بۆماڵەوەو ، خەڵكەكەش بڵاوەیان لێ كرد، بەخزمەتكارەكەشی ووت: بڕۆ عمرم بۆ بانگ بكەو ، ئەویش عمری بۆ گەڕاندەوەو پێ ووت: ئەی باوكی حفص لەسەر ئەمە چی دەڵێت: خراپمان كرد یان باش؟ عمریش ووتی: باشت نەكرد كوشتت! شتێكی ترت بكردایە باشترو پاكتر بوو، ئەویش زیندانی كردنی بوو تایان بە خۆدادێتەوە یان مردن ڕێ پێ دەگرت.

وەلید ووتی: قسەی بەمن و عبدالملك ووت: تۆ ئەوە بەحەڵاڵ دەزانیت؟ عمریش ووتی:بە تەمەنم شتی وام حەڵاڵ نەكردووە، بەڵام ئەگەر زندانیت بكردایە دوای بەتەواوی ڕات دەهاتە سەركوشتنی یان ئازادكردنی.

وەلیدیش بە توڕەییەوە هەستاوە و ڕۆیشت، (إبن الريان)یش بە عمری ووت: خوا لێت خۆش بێت ئەی باوكی (حفص)ە، ئەوەندە بەرپەرچی ئەمیری باوەڕدارانت دایەوە گومانم برد پێم دەڵێت: بدەم لە گەردەنت.[1]

---

١ ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن حكم)لا (١١٩ـ ١٢١).

ئابەم جۆرە حەجاج بەلێزانی خۆی وەلیدی خەڵە تاند و وازی لێ هێنا لەسەر ئەو ڕایەی، کە عمر(رضي الله عنه) پێشکەشی کردبوو بۆ ئەوەی بەردەوام بۆیان هەبێت بە ئارەزووی خۆیا خوێن بڕێژن[1]

## ٨- ڕای عمر دەربارەی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەواریج:

جگە لەو بەسەر هاتەی پێشو کەباسمان کرد کە چۆن دڵنەرم بوو لەگەڵ ئەو حەروری یەدا، لەگەڵ کەسانی تریشدا، کە هاو فیکری ئەو بوون هەر بەو جۆرە بوو، (إبن شهاب) دەگێڕێتەوە کە عمری کوڕی عبد العزیز بۆی گێڕاوەتەوە کە جارێکیان لەقرچەی نیوەڕۆدا وەلید ناردی بەدوامدا، ومنیش ڕۆیشتم بۆلای و بجۆری بینیم، کە ناوچەوانی دابوو بەیەکدا و منیش لەلای دانیشتم ، کە کەسی لەلا نەبوو جگە لە (إبن ریان) - جەلادەکەی - بەشمشێرێکەوە وەستا بوو، پێی ووتم: چی دەڵێیت دەبارەی ئەو کەسانەی قسەی ناشیرین بە خەلیفەکان دەڵێن؟ پێت وایە دەبێت بکوژرێن؟ منیش بێ دەنگ بووم ، ووتی: ئەوەچیتە؟ هەر بێدەنگ بووم، هەر پرسیارەکەی کردەوە و، منیش پێم ووت: دەی دەبێ سزا بدرێت و تەمێ بکرێت. وەلید سەریکی بەرز کردەوە بۆلای (إبن ریان) ووتی: دەزانی زۆر بێ ئاگایە لەو خەواریجانە.

## ٩- ئامۆژگاری وەلید دەکات کە سلیمان لا نەبات:

کۆتا هەڵویستی عمری کوڕی عبد العزیز(رحمه الله) لەگەڵ وەلیدی کوڕی عبدالملك دا ئەوەبوو کاتێ وەلید ویستی کوڕەکەی خۆی (عبد العزیز) بکاتە خەلیفەی دوای خۆی لە باتی سلیمانی برای - عمر ئامۆژگاری کرد کە شتی وانەکات؛ وعمر هەڵوێستێکی مەردانەی نواند لەو بارەوە و پێ ی ووت: ئەی ئەمیری باوەڕدران ئێمە لەیەك کاتدا بەیعەتمان بەهەردوکیان داوە و چۆن ئەو لادەبەین ووا لە تۆدە هێنن؟! ئەوە بوو وەلید زۆر توڕە بوو ویستی هەر بەزۆر قەناعەتی پێبکات بۆ ئەو

---

١ - أثر العلماء في الحياة السياسة، لا ١٦٤.

كاره وه دهڵێن خستویهتی ڕۆژێك و دهرگای لێ داخستوه ڕهمی دهرگاكهشی به قوڕ ههڵچنیوه و بۆماوهی سی ڕۆژ بهبێ خواردن و خواردنهوهی هێشتویهتیهوه تا خوشكهكهی و خیزانهكهی وهلید كهوتنه بهین و دهرگاكهیان شكاند دهبینن له هۆش خۆی چووه و ملی لار بۆتهوه.[1]

## چوارهم: عمر لهسهردهمی خهلیفه سولیماندا

لهسهردهمی خهلیفهی سولهیماندا ههڵێكی باش هاته پێشهوه بۆ عمری كوڕێ عبد العزیز، وه ئاسهوارهكانیشی له زۆر لاوه دهر كهوتبو، ههر كه سولهیمان بووبه خهلیفه خێرا عمری له خۆی نزیك كردهوه و بواری فراوانی پێدا، پێ ووت: وهك دهبینی ئهم بهرپرسیارێتی یهكهوته سهرشانمان و بهڕیوهبردنیشی ههڵسوڕاندن و زانیاری یهكی زۆری دهوێت، ههرشتێك دهبینی چاكه و بهرژهوهندی گشتی ی تێدایه پێمان بڵێ با جێ بهجێ بهكهین.[2]

كردی به وهزیری ڕاوێژكاری خۆی و بهردهوام له ماڵهوهو لهسهفهردا هاوڕێی بووه، سولهیمانی وای دهبینی، كهله گهوره و بچوكدا پێویستی بهر پرس و ڕاكانی ئهو ههیه و ههردهم دهیووت: ئهگهر ئهم پیاوهم له دهست دهربچێت ئیتر ووا نازانم كهسێ: شك ببهم له مهسهلهفقهی و شهرعیهكان دا هاوكارم بێت.[3]

له شوێنێكی تردا پێ ی دهڵێت: ئهی باوكی حهفس، هیچ كارێك دڵگرانی نهكردووم و هیچ شتێكیش ناڕهحهتی نه كردووم، یهكسهر تۆم هاتۆته وه خهیاڵ.[4]

### ١. هۆكارهكانی نزیك كردنهوهی عمر له سوله یمان.

بهڕای من ئهوهی وای كرد له سولهیمان بواری تهواو بدات به عمری كوڕێ عبد العزیز (رضي الله عنه) بۆ دهست تێوهردانی دهوڵهت دهگهڕێتهوه بۆ كۆمهڵێك هۆكار، لهوانه:

---

١ - سير أعلام النبلاء (٥/ ١٤٨، ١٤٩)، أثر العلماء في الحياة السياسة، لا ١٦٧.

٢ - أثر العلماء في الحياة السياسة، لا ١٦٨.

٣ - المعرفة و التأريخ الفسوى (١/ ٥٩٨)

٤ - سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن حكم)لا ٢٨.

أ- کەسایەتی سولەیمانی کوڕی عبد الملك؛ چونکە هیچی لەوەلیدی برای نەدەکردوو نەش دەچووە ژێرکاریگەری والی یەکانی، بەڵکو سولەیمان زۆر پێچەوانەی ئەم شتانە بوو، هەروەك کاریگەریەکی بەرپرسی لەسەر نەبوو.
ب- سولەیمان لەو باوەڕەدا بوو لە عمر خاوەنی کۆمەڵێ تێڕوانینن ورای جوان و ژیرانە بوو.
ج- هەڵوێستی عمر لە کاتێکدا ویستی سولەیمانی برای کە نارگیر بکات بۆ کوڕە کەی خۆی و ئەم کارەی وەك سوپاسێك وابوو لەسەر ئەو کارەی عمر ، (الذهبي) ئامازەی بۆ ئەم لایەنە کردوەو پاش باس کردنی ڕووداوەکەی عمر، دەڵێت: ئا بەو چەشنە سولەیمان سوپاسی عمری کرد لەپاش خۆشی دەست نیشانی کرد بۆ خەلافەت.[1]

## ٢. کاریگەری عمر لەسەر سولەیمان:

عمر(رضي الله عنه) کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر سولەیمان و ئەوەش بووبە هۆی ئەوەی کۆمەڵێك بڕیاری بەسوود و چاکی پێ دەربکات، گرنگترینیان عەزل کردنی حەجاج و هەندێ لە والی یەکانی تر وەك: خالید (القسری) والی مەککە و عثمانی کوڕی حیان والی مەدینە.[2]
یەکێکی تر لەو بڕیارانە: گەڕانەوەی نوێژەکان بۆ کاتەکانی خۆیان، (إبن عساكر) لە سەعیدی کوڕی عبد العزیزەوەو دەگێڕێتەوە کە وەلیدی کوڕی عبد الملك نوێژی نیوەڕۆ و عەسری دوا خستوە لە کاتەکانی خۆی، کاتێ سولەیمان چووە سەر حوکم بوو بە خەلیفە لەسەر ڕای عمر بڕیاری دا کە نوێژەکان مردوون زندویان بکەنەوە[3].
ئەو کۆمەڵێ کاری گرنگی تر کە (الذهبي) هێناویەتی و دەڵێ: هەندێ کاری مەزنی تر لە عمری کوڕێ عبد العزیزەوە سودی وەردەگرت.[4]

---

١ ـ سير أعلام النبلاء (٥/ ١٤٩).
٢ ـ أثر العلماء في الحياة السياسة، لا ١٦٩.
٣ ـ التأريخ ديمشق لە أثر العلماء في الحياة السياسة وەرگیراوە لا ١٧٠.
٤ ـ سير أعلام النبلاء (٥/ ١٤٩).

### ۳. عمر( رضي الله عنه ) نا هێڵێ سو لە یمان کاربە وەسیەتی باوکی بکات:

عمر ی کوڕی عبد العزیز دەربارەی مافی هەندێ لە کچە کانی عبد العزیز لە نەوەی عبد الملك لەمیراتی عبد الملك دا. لەگەڵ سولەیمان قیەی کرد، بەڵام سولەیمان پێ ی ووت: عبد الملك وەسیەتی نامەیەکی نوسیوە و تیایدا بێ بەشی کردوون، ماوەیەك پشت گوێ ی خست و دواتر دووبارەی کردەوە، سولەیمانیش پێی ووت: عبدالملك وەسیەت نامەیەکی نوسیوە تیدا بێ بەشی کردوون، ماوەیەك پشت گوێ ی خست دوای دووبارەی کردەوە، سولەیمانیش وای زانی باوەڕی پێ نەکردووە و وەسیەتنامەی وا نی یە، بۆیە بە خزمەتکارەکەی ووت: ئەو نامیەی عبدملك م بۆ بهێنە، عمریش ووتی: ئایا قورئانە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ ئەیوبی کوڕی سولەیمان ووتی: هەندێکتان هەندێ قسە دەکەن نێزیکە لەسەری بدرێ لەسەر ئەو قسانە؛ عمریش ووتی: جا خۆ کاری خیلافەت بکە وێتە دەستی تۆ موسڵمانان زۆر زیاتر تووشی بەڵا دەبن، سولەیمانیش سەرزەنشتی ئەیوبی کرد، عمرەیش ووتی: ئەگەر بە نەفامی ئەو قسەیەی کردوە، ئێمە نەرم و نیانی خۆمان لێ دەبوورین.[1]

ئەمەش یەکێکە لە هەڵویستە بە غیرەتەکانی عمر، لە ووتەی حەق لەشەوێنی خۆیدا و ئەمەش بەسەروەریەکی عمر دادەنرێت، سلیمان وای دانابوو وەسیەتنامەی باوکی شەرعێکە ودروست نی یە پشت گوێ خستنی، بەڵام عمررحمه الله بەئاگای هێنایەوە و بۆی ڕوون کردەوە کە کتێبێك کە شایستەی دەسکاری و گۆڕان نەبێت تەنها قورئانی پیرۆزە و بەس، ئابەو جۆرە سەرکەشی وا لە خاوەنەکەی دەکات کەبە جۆرێکی لی ڕادە بەدەر باو باپیری بەگەورە سەیر بکات، باو باپیرێك کە شتێکی وا بۆ نەوەکانیان بنوسن نا ڕەوای تێدا بێت و بشزانن، کە نەوەکانیان بەبێ تێ ڕامان وورد ببنەوە جێ بە جێ ی دەکەن ئیتر با پێچەوانەی قورئان و سونەتیش بێت.

---

١ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن حكم)لا ٣١.

هـەروەك هەڵوێـستی ماردانـەی سـولەیمان بـەدی دەكـەین كەسەرزەنـشتی كوڕەكەی كرد لەسەر ئەوەی لەسەر ووتەی هەق هەڕەشەی لـە عمـر كـرد، ئەمـەش مانای وایە سولەیمان ڕەوشتی بەرز بووە زۆر گەڕاوەتەوە بۆدی هـەق كاتـێ بـۆی ڕۆشن بووبێـەوە.[١]

## ٤ـ سولەیمانی بەدڵ نی یە لە شێوەی ماڵبەخشیندا:

سـولەیمانی كـوڕی عبـد الملـك چـوو بـوو مەدینـەی پڕلـە نـور و لـەوێ مـاڵ و سامانێكی زۆری بەخشیوە بەسەر دانیشتوەكەیدا، و پاشان بـە عمـر ی كـوڕی عبـد العزیزی ووت: ڕات چۆنە بەرامبەر ئەو كارەی كردمان ئـەی (أبـا الحفـص)؟ ئـەویش لەوەڵامـدا ووتـی: دوەلەمەنـدەكانت دەوڵەمـەنتر كـرد و هەژارەكانیـشت هـەژارتر كرد...[٢]

ئەمـەش هەڵسەنگاندنێكی جوانـە لەلایـەن عمـرەوە بـۆ كارەكـانی سـولەیمان، چـونكە لەبەرئـەوەی نەشـارەزا بـوو بـە وردەكایـەكانی شـەریعەت لـە بـواری مـاڵ بەخـشیندا بۆیـە ئـەو هەمووپارەیـەی بـەبێ هـیچ هۆیـەك سـەرف كـردو خاوەنـە شەریعەكانی خۆی لێ بێ بەش كرد،[٣] ئابەو جۆرە عمـر رحمه الله بـۆی ڕوون كـردەوە كـە جیـاوازی گـەورە هەیـە لـە نیـوان خێركـردن و نێـوان گەیانـدنی پـارە بـە خاوەنـە نەشایستەكانیان.

## ٥ـ هانی سولەیمان دەدات بڕیارە ستەمان هەڵوەشێنێتەوە:

سـولەیمان و عمـر پێكـەوە لـە بیابانـدا دەگـەڕان؛ و هـەورێك هـات و دەنگـی هەورەبرسكە یەكی گەورەی لێ هات و سولەیمان ترسی لێ نیـشت، عمـریش ووتـی: ئەمەدەنگی بارانی پڕ لەنیعمەتە، ئەی دەبێ دەنگی سزا چۆن بێت؟ و سـولەیمان لەویدا بە عمری ووت: ئەوە (١٠٠) هەزار درهەمە بە ئـارەزووی خـۆت بیبەخـشەوە،

١ ـ التأريخ الإسلامي (١٥/ ٣١،٣٠).
٢ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن حكم)لا ٣١.
٣ ـ تأريخ الإسلامي (١٥/٢٩).

عمریش پێ ووت: ئەی ئەگەر شتێك لەوە باشتر بکەیت چۆنە؟ سولەیمان ووتی: ئەوشتە چی یە؟ کۆمەڵێك کەس بۆئەوە لەگەڵت هاتوون تا مافیان بۆ وەرگریتەوە، بەڵام نەیان توانی بگەن پێت و بگەنە خزمەتت، ئەویش دانیشتن و هەموو ئیش و کارەکانی بۆ ڕاپەڕاندن و مافەکانی گێڕاوە بۆ خاوەنەکانیان.[١]

ئابەو جۆرە عمر رحمه الله لە فقهی پێویستی گەورە لە پێویستی بچوکەوە مافی گەڕاندنەوە بۆ خاوەنەکانیان لەماڵبەخشین خێرکردن گەورەترە.

### ٦ـ دنیا خۆی دەخواتەوە:

سولەیمانی کوڕی عبد الملك لە گەڵ عمر ی کوڕی عبد العزیز دا لە ماڵ دەردەچن بۆ سەردانی کێڵگەکەی سولەیمان، کە جۆرەها ئەسپ و حوشترو مەڕو ماڵات و شت و مەك و پیاوانی خزمەتکاری لێ بوو، سولەیمان پرسی لە عمر: دەربارەی ئەمانە چی دەڵێیت؟ ئەویش ووتی: وا دەبینم ئەم دونیایە هەندێکی تری دەخوات، تۆش بەرپرسی لەهەموو ئەوانە، کاتێ نزیك بوونەوە لەکێڵگەکە قەلە ڕەشێك هات و خواردنێکی لە چادرەکەی سولەیمان فڕاندو قیڕەیەکی کرد و ڕۆی، سولەیمان پێ ووت: ئەم قەلە ڕەشە چی ووت ئەی عمر؟ ووتی: نازانم، ووتی: گومانی چی دەبەیت کەوتوبیەتی؟ ووتی: وەك ئەوەی بڵێت: من لە کوێ وە هاتووم؟ ئەم خواردنە بۆ کوێ دەبەم؟ سولەیمانیش ووتی: چ پیاوێکی سەیریت! عمریش ووتی: لەمن سەیرتر ئەوکەسەیە خوا دەناسێت، کەچی گوێڕایەڵی ناکات، و شەیتانیش دەناسێت، کەچیبەقسەی دەکات.[٢]

### ٧ـ شکات لێکراوەکانت لە قیامەتدا:

کاتێ سولەیمان و عمر لەسەر کێوی عەرەفە وەستا بوو، خەلیفە زۆر سەرسام بوون بەزۆری خەڵکەکە و، عمریش پێ ی ووت: ئەمانە ئەمڕۆ میلەتی تۆن و تۆش

---

١ ـ سیرة عمر بن عبد العزیز لا ٣٣.

٢ ـ البدایة والنهایة(١٢/ ٦٨٥).

سبەی بەرپرسی لێان لە ڕوایەتێکدا: ئەوانە شکات لێکەرت دەبن لەڕۆژی قیامەتدا، سولەیمانیش دەستی کرد بە گریان ووتی: خوایە داوای کۆمەکی لە تۆ دەکەم.[1]

## ٨ـ عمر ڕێز لە کوڕە زای علی کوڕی (أبو طالب)ئەبی تالب دەگرێت:

زەیدی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی، کاتی خۆی هاتبو بەدەم داواکاری وەلیدی کوڕی سولەیمانەوە لەمەسەلەی لابردنی سولەیمان، ئەمەش لە ترسی وەلید بوو، کاتێ سولەیمان بوو بەخەلیفە، نامەی نارد بۆ مەدینە تاپرسیار لەوەلید بکات بۆ مەسەلەی ئەو نامەیەی کەباسی ڕەزامەندی مەدینەییەکان لەکات لەلابردنی سولەیمان ـ و ئەگەر دانی پێدانا ئەوا نامەکەم بۆبنێرەوە ئەگەر نکۆڵی لێ کرد، ئەوا لەبەردەمی میمبەری پێغەمبەر ﷺ سوێندی بدە.

کاتێ دانی نابە کارەکەیدا و والی نوێش نامەکەی ناردەوە بۆ لای سولەیمان، سولەیمانیش پیاوێکی نارد بۆ مەدینە، تا بە والی بڵێ(١٠٠)دار بدە لە یەزید بەپێی پەتی ببیات بەڕێگادا.

عمریش ئەو کابرایەی گل دایەو ووتی: جارێ مەڕۆ تاقسەیەك لەگەڵ ئەمیری باوەڕداران دا دەکەم لەو بارەیەوە، بەڵکو قانەعاتی پێ بهێنم تاوەکو واز لەو نامەیە بهێنێ وازیش لەسزا دانی یەزید بهێنێ.

پیاوەکە نەڕۆیشت و لەو کاتەدا سولەیمان نەخۆش کەوت عمریش کابرای بانگ کردوو پێ ووت: ئەمیری باوەڕداران نەخۆشە جارێ مەڕۆ، کاتێ سولەیمان بەو نەخۆشیە کۆچی دوایی کرد عمر خۆی بوو بەخەلیفەو داوای نامەکەی کردوو دڕاندی.[2]

عمر بەردەوام و بەدرێژایی خەلافەتی سولەیمان هەر لێ دوورنەکەوتەوە ئامۆژگاری کردوو لەڕاپەڕاندنی کارەکانیدا هاوکاری و بەشداری کردووە.[3]

---

١ ـ سيرة عمر بن عبد العزيز لا ٣٣.

٢ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن حكم)لا ٣١.

٣ ـ أثر العلماء في الحياة السياسة، لا ١٦٩.

دکتۆر یوسف(العش) دەڵێت: سەرەتای سیاسەت و هەنگاوە چارەسەریەکانی عمر هەر لەسەرەتای خەلافەتی سولەیمانەوە دەستی پێ کرد، بەڵێ، سولەیمان لە هەندێ لە سیاسەتەکانیدا بەهەڵەدا دەچوو و هەندێ کاری دەکرد، کەلەوانەیە عمر بەدڵی نەبوبێت، بەڵام عمری کوڕی عبدالعزیز نواندنی هێزو زەبری پێ باش نەبوو لە دەوڵەتەکەی سولەیماندا، بەڵام سیاسەتی عمر نەگۆڕ بووە، ئەو لە مەدینە چۆن حوکمی موسڵمانی دەکرد، لە دیمەشق هەر بەو جۆرە حوکمی دەکرد، بەڵام ئەوەندە هەبوو لە دیمەشق کاری گەورەترو زیاتری لێ دەهات، بەڵام ئەوەی بەلایەوە گرنگ بو بێت ئەوەبوو کە نەهێڵێت ستەم و ناڕەوایی و ناهەقی بکرێت.[1]

لەژیانی عمردا ئەوە تێبنی دەکەین کە فقیهی پلەپلە (التدرج)و فەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپەی بەکارهێناوە لە بواری گەڕانەوەی مافەکان و نەهێشتنی ستەمەکان، بەڵام کاتێ گەشتە ترۆپکی خەلافەت ئەو کارانەی زۆربە خەست ترو قوڵ تر ئەنجام داوە لە داد پەروەری و یەکسانی و دژایەتی ستەمکردن دا، چونکە وەك خەلیفە سنوری کاری فراوان بووە، ئەوکاتی خۆی ئامۆژگاری مامە عبدالملیکی خۆی کردووە قیامەتی بیر خستۆتەوە لەگەڵ ئەو توند و تیژی و ستەمکاری یەیدا، هەرگیز لەسەردەمی وەلیدی ئامۆزایشدا کەمتەرخەمی نەنواندوە.

بەپێ توانایش لەسەردەمی سولەیماندا هەنگاوی چاکسازی زیاتری ناوە، لەسەردەمی خیلافەتی خویشیدا هەلی گەورەتری بۆ هەڵکەوت، بۆیە ئێمە نالێین: کودەتای دروست کرد، بەڵکو ئەتوانین بڵێین: کە توانی دەوڵەت بخاتە خزمەتی شەریعەتی ئیسلامیەوە لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا ئیتر با بنەماڵەی خەلیفە کانیش تییایدا زەرەرمەند بوبن ئەوەش بە هۆی ئەوەی کەسامانی بێ سنورو دەست ڕیشتنی تەواوی لێ گرتنەوە و، عمر ئەو کارەی بە مافی ئەممەتی ئیسلام دەزانێ و دەبێت هەمووی بگەڕێنرێتەوە بۆ (بیت المال) یان بۆ خاوەنە ئەسڵیەکانیان.

---

١ ـ الدولة الأموية ، يوسف العش لا ٢٥٤.

## پێنجەم: خەلافەتی عمری کوڕی عبدالعزیز

یەکێك لە چاکەکانی سولەیمانی کوڕی عبد الملك ئەوە بوو، کە گوێ گرت بۆ ڕەجائی کوڕی حیوة الکندی، کە پێشنیاری کرد لە نەخۆشی یەکەی سەرەمەرگیدا، کە عمری کوڕی عبدالعزیز بکاتە خەلیفەی لە دوای خۆی، ئەو ئامۆژگاریەش زۆر خاوین بوو بەشی شەیتانی تێدا نەبوو.[1]

(إبن سیرین) دەڵێت: خوای گەورە ڕەحم بە سولەیمان بکات، سەرەتای خەلافەتی بە زیندو کردنەوەی نوێژەکان دەست پێکرد، کۆتایەکەشی بەدانانی عمری کوڕی عبدالعزیز بە خەلیفەی دوای خۆی، و لەساڵی ٩٩ی کۆچیدا وەفاتی کرد و عمری کوڕی عبدالعزیز نوێژی لەسەر کرد و لە مۆرەکەی نوسرابوو(أؤمن بالله مخلصاً) واتە: باوەڕم بە خودا هەیە.[2]

ئەو ڕیوایەتانە کەباس لەبەسەرهاتی دانانی عمر دەکەن وەك خەلیفەی داهاتوو لەلایەن سولەیمانەوە، لەسەردەمی سولەیماندا هەندیکێانم باسکردووە، هەروەها (إبن سعد) لە(طبقات)دا بەم جۆرە هێناویەتی:

لەسوهەیلی کوڕی ئەبی سەهلەوە ڕیوایەتیکردووە و دەڵێت: لە ڕەجائی کوڕی حیوەم بیستوە دەیووت: ڕۆژی جومعە بوو، سولەیمان دەستی جلی کەشخەی لە ئاوریشم دوراو لەبەر کرد،[3] سەریرێکی ئاوێنەکەی کردوو وتی: وڵلاهی من پادشایەکی گەنجم! ، بەرەو مزگەوت دەرچوو بۆ ئەوەی نوێژی هەینیان بۆ بکات هەرکە نوێژەکەی بۆ کردن نەگەڕایەوە و هەر لە مزگەوت نەخۆش کەوت، کاتێ نەخۆشیەکەی زۆری بۆ هێنا و نامەیکی نوسی و تیایدا ئەیوبی کوڕی خستە شوێنەکەی خۆی ـ کە لەو کاتەدا منداڵێك بوو باڵغ نەبوو بوو ـ منیش پێم ووت ئەی

---

١ ـ عصر الدولتين الأموية والعباسية، لا ٣٧.

٢ ـ سير أعلام النبلاء (١١٢/١١١/٥).

٣ـ پێغەمبەری خوا حەرامی کردووە لەسەرپیاوانی ئومەتی ئیسلام ئاوریشم لەبەربکەن و ئەو کارەشی خەلیفەکان کرد ویانە ناشەرعی بووە یەك لە دوای ئەك تێی کەوتوون. (وەرگێڕ)

ئەمیری باوەڕداران ئەوە چی دەکەیت؟ ئەوەی سودی هەیە لەناو قەبردا بۆ خەلیفە ئەوەیە پیاویکی صالح هەلبژێریت بۆ دوای خۆی ببێتە خەلیفە. سولەیمانیش ووتی: کوڕە نامەیەکە نوسیومەو دوایی نوێژی إستخارەی بۆ دەکەم خۆ کۆتا ڕەئیم نی یە.

یەك دوو ڕۆژ مایەوە، پاشان نامەکەی دڕاند و منی بانگ کرد ووتی: ئەی چۆنە داودی کوڕم دابنێم؟ ووتم: ئەو لێرە نی یەو لە قوستەنتینیە یەو نانزانی ماوە یان مردووە، ووتی: ئەی ڕەجا تۆ کێ بە باش دەزانی؟ منیش ووتم: تۆ ناوی خەلکی بلێ، دەمویست ئەو کەسە بلێ کە خۆم بەدلم بوو، ووتی: ئەی عمری کوڕی عبدالعزیز چۆنە؟ ولڵاهی من وای دەناسم، کە پیاوێکی زۆر چاك و خواناس و موسلمانە، ئەویش ووتی: دەی هەروایە، بەلام وەللاهی ئەگەر دایبنێم ئەو ە کوڕانی عبد الملك ناهێلن بە ئاسنی سەرۆکایەتیان بکات و، ئاژاوەی بۆ دروست دەکەن، مەگەر کەسێ لەوان دوای ئەو دیاری بکەم، ویەزیدی کوڕی عبد الملك لێرە نیە، ووتی: زۆر چاکە ئەو دیاری دکەم ، چونکە ئەو بێ دەنگ و ڕازیان دەکات، منیش ووتم: باڕای تۆ بێت.

دەلێ: بەدەستی خۆی نووسیرحمه الله ئەمە نوسراوی سولەیمانی کوڕێ عبد الملك، بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز، من ئەوم داناوە ببێتە خەلیفە لەدوای خۆم، دوای ئەویش یەزیدی کوڕی عبدالملك، گوێگر و گوێڕایەڵ بن، لە خوا بترسن، ناکۆکی نەکەوێتە نێوانتان، تا دوژمنانتان تەماحتان تێ نەکەن، نامەکەی مۆر کرد.

ناردی بە دوای بەڕێوبەری پۆلیس دا - کەعبی کوڕی حامیە - ئەویش ئامادە بوو پێ ووت: فەرمان دەربکە هەموو کەس و کارەکەم کۆ ببنەوە، پاش ئەوەی هەموو کەس و کارەکەم کۆبونەوە، سولەیمان بە ڕەجائی ووت: ئەم نامەیەم بەرە بۆیان، ئاگاداریان بکە، کە ئەوە نامەی منە، فەرمانیان پێ بدە، کە بەیعەت بکەن بەو کەسەی کەمن دامناوە.

دەلێ: ڕەجاء وای کرد کاتێ ڕەجاء ئەم قسانەی بۆ کردن وتیان: گوێمان لێ یەو گوێڕایەڵین، ووتیان: دەچنە ژوورەوە سلاو لە ئەمیری باوەڕداران دەکەیت، ووتی: زۆرباشە.

کاتێ چوونە ژوورەوە سولەیمان پێ ووتن: ئەم نامەیە- ئاماژەی بۆ نامەکەی ناو دەستی ڕەجاء کرد- پەیمانی منە، گویگرو گوێڕایەڵی بن، ئەوەی من دیاریم کردوە بەیعەتی خۆتانی پێ بدەن، دەڵێ: هەرهەموویان یەك یەك بەیعەتیان دا، پاشان نامەکەی دەرهێناو مۆرەکەی پێشاندان.

رەجاء دەڵێ: کاتێ لێ بوونەوە عمری کوڕی عبدالعزیز هاتە لام و پێ ووتم: ئەی (أبا المقدام) لە نیوان من سولەیماندا پەیوەندی دۆستایەتی بەتینمان هەبوو، ئەو لەگەڵمندا زۆر باش بوو، زۆر دەترسم ئەم کارەی بەمن سپاردبێت- سویندت دەدەم بە خوا لەبەر خاتری ڕێزو خۆشەویستیەی نیوانمان - ئەگەر منی دەستنیشان کردوە با ئێستا فریا بکەوم و بڕۆ بۆلای و خۆم ڕزگار بکەم و، ڕازی بکەم کە یەکێکی تر دابنێت، چونکە ئەترسم کار لەکا ربترازێت و ئەوکاتە نەتوانم خۆم لەم بەرپرسیایەتیە دەرباز بکەم.

ڕەجائیش ووتی: نەخێر، وەڵلاهی یەك پیتی ئەو نامەیەت پیشان نادەم،دەڵێ عمر بە توڕەیی یەوە هەستاو ڕۆیشتە دەرەوە.

رەجاء دەڵێت: لە دەرەوە هشامی کوڕی عبد الملکم پێ گەیشت ووتی: ئەی رجاء نێوان من و تۆ دۆستایەتی و خۆشەویستی یەك هەی، پێم بڵێ: ئایا منی دیاری کردووە؟ ئەگەر منی دیاری کردووە ئەو زانیم؟ ئەگەر کەسی تری‌دیاری کردبوو ئەوا باقسەکی تێدا بکەین، وێنەی من ناتەواوی تێدا نی یە و باوەڕناکەم لەم کارە بێ بەشم بکەن، دەی پێم بڵێ: خوا شاهید بێ لای کەس ناوت نابەم، ڕەجاء دەڵێ: سەرێکم بادا، ووتم: وەڵلاهی یەك پیتت بۆ نادرکێنم، ئەویش ڕۆیشتە دەروەو بەڕێگاوە دەشتەکانی دابەیەکدا و دەیووت: ئەگەر بەمنی نەدەیت ئەی بەکێ دەدەیت؟ ئایا لە بنەماڵەی عبدالملك دەری دەکەیت؟ دەی ساوەڵلاهی من وەك چاوی بنەماڵەکەی عبدالملك وام.

چوومە ژوورەوە بۆ لای سولەیمانی کوڕی عبدالملك، دەبینم وا خەریکە دەمرێت، هەرکە مردن نارەحەتی دەرکرد ڕوویم دەکردە قیبلە بە هۆش خۆی

دەهاتـەوە دەی ووت: هێـشتا کـاتم مـاوە ئـەی ڕەجـاء، چـیم لێ دەکـەیت وام لێ بکە(أشهد أنَّ لا إله إلاّ الله واشهد أنَّ محمداً عبده ورسوله) دەڵێ: ڕوویم کردە قیبلەو گیانی دەرچوو، منیش دەستم هێنا بەچاوەکانیداو بەپـەردەکی سـەوز داپۆشـی و دەرگاکەم داخست، خیزانەکەی جوابی ناردبوو لەتەندروستی دەپرسی، منیش ووتم: خەوتووەو خۆی داپۆشیوە نوێنەرەکـەی سـەیرێکی سولەیمانی کـرد داپۆشـرابوو، دڵنیا بوو لەوەی خەوتوە و گەڕایەوە بۆلای خێزانەکەی سولەیمان و دڵنیای کردەوە کە خەوتووە.ڕەجاء دەڵێت: کەسێکم لەبەر دەرگا کـە داناوە خـۆم ڕۆیشتم و پـێم ووت: نە هێڵێت کەس بچێتە ژوورەوە بۆلای خەلیفە، منیش ڕۆیشتم و جوابم نارد بۆ بەڕیوبەری پـۆلیس کـەعبی کـوڕی حامـد العـسی و هـەموو بنەماڵـەی خەلیفـەی بـۆ کۆکردمەوە، لەمزگەوتی (دابق) کۆبوونەوە ووتم: ئادەی بەیعـەت بدەنـەوە، وویتـان چیە دووبارە بەیعەت بدەینەوە !

منیش ووتم: ئەمە ئەمیری باوەڕدارانە و بەیعەت بدەن بـەو کەسـەی ئـەو دیـاری کردووە دەی، ئەوانیش دووبارە بەیعەتیان دایەوە، یەك یەك تا تـەواو بـوون، ڕەجـاء دەڵێ: جوان بۆم دەرکەوت کە دوای مردنیشیان بەیعـەتیان نـوێ کردەوەبۆیـە پـێم ووتن: فەرموون بچنە لای هاوڕێکەتان چـونکە گیـانی سـپاردووە، هـەموویان بەیـەك دەنگ ووتیان: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ).

منیش نامەکەم کردەوە بۆم خوێندەوە و کاتێ گەیشتمە ووشەی (عمری کـوڕی عبدالعزین) هشام خۆی پێ نەگیرا و هاواری کرد: هەرگیز بەیعەتی پێ نادەین.

دەڵێ: ڕەجائیش پێ ووت: وەڵڵاهی ئەدەم لە گەردنت و سەرتە دەپەڕێنم، دەی هەستە بەیعەتی پێ بدە، ئەویش هەستاو بە خۆڕاکێـشان و نابـەدڵ بەیعـەتی پێـدا، منـیش دەسـتی عمـرم گـرت و بردمـە سـەرمینبەرەکەو پـێی نـاخۆش بـوو بۆیـە هەردەیووت:(إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ) وە هیشامیش لەبەر ئەوەی خەلیفەیی بـۆ ئـەو نەبوو دەیووت: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ )، کاتێ هیشام گەیشتە لای عمر ووتی: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ )مەبەستی ئەوەیە، کە ئەم کارە دەرچووە لەنەوەی عبدالملك بۆ

لای تۆ، عمریش ووتی: بەڵێ: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ)دەکەم وا من توشی ئەم کارە کراوم پیشم ناخۆشە.[1]

(أبو الحسن الندوی) لەسەر ئەم هەڵوێستە گەورەیەی ڕەجائی کوڕی حەیوە دەڵێت:رەجاء چاکە یەکی وای تۆمار کردە لە ئیسلامدا، نەمدیوەهیچ هاوڕەیەکی خەلیفەو پاشاکان بەئەندازەی بەسوودو کەڵك بووبن بۆپادشاکان لەم پیاوە،هەلی دەست کەوت و قۆستی یەوە خزمەتێکی گەورەی پێشە کەش بەئیسلام کرد.[2]

دەی ڕەحمەتی خوا بڕژێ بەسەر ڕەجائی کوڕی حیویوەدا کە بەرنامەیەکی جوانی داڕشت بۆ هەموو ئەو کەسانەی هاوڕی یەتی خەلیفە و پادشاکان دەکەن، کە چۆن دەبێت سەری ئیسلام بەرزکەنەوە و هەل بقۆزنەوە بۆ خزمەت بەئاینی خواو خوای عزوجل و قیامەت بخەنەوە بیریان.

### ١ـ نەخشەی عمر بۆ ئیدارەی دەوڵەت لە دو توێی یەکەمین ووتاریدا :

عمر(ﷺ) سەرکەوت بۆ سەر مینبەر، لەگەڵ یەکەمین دیداریدا لەگەڵ ئوممەت لە دوای وەرگرتنی پۆستی خیلافەت، ووتی: ئەی خەڵکینە، من تووشی ئەم کارە گەورەیە کراوم بەبێ ئەوەی ڕام وەرگیرا بێت، یان حەزم لێ کردبێت یان ئوممەت هەڵی بژاردبم، من ئەوا ئەو بەیعەتەم گەڕاندەوە بۆتان کە خرا بووە ئەستۆم، خۆتان کەسێك هەڵبژێرن، خەڵکەکەش بەیەك دەنگ هاواریان دەکرد: ئەوا هەڵمان بژاردیت ئەی ئەمیری باوەڕداران، تۆش بە پیرۆزی و خۆشی یەوە سەرۆکایەتیمان بکە...ئا لیرەدا هەستی کرد دەرباز بوون نیە لەو بەر پرسیاریەتیەی تیوەی گلاوە.

بەردەوام بوو لەسەر ووتارەکەی وتیایدا نەخشەو سیاسەتی کاری بۆ ئەممەت ڕوونکردەوە،[3] ووتی: پاشان... پاش پێغەمبەرەکەتان پێغەمبەری دیکە نایەت،

---

١ ـ التأریخ الطبری(٧/٤٤٥)، الطبقات(٥/ ٣٣٥ـ ٣٣٨).

٢ ـ رجال الفكر و الدعوة للندوي (١/٤٠).

٣ ـ عمربن عبدالعزیز و سیاسته في رد المظالم، ماجد فیصل لا ١٠٢.

پاش هاتنه خوارەوەی قورئان هیچ کتێبێکی تر دانابەزێت، و ئەوەی حەلاڵی کردووه، قیامەت قیامەت حەلاڵەو من فەرمان دەرکەرنیم، بەڵکو فەرمان جێبەجێ کەرم و، من شەرع جێ بەجێ دەکەم، من بیدعەو شتێ نوێ دا ناهێنم[1] بەڵکو جێ بەجێ کەرم و، شوێن کەوتەم، وەکەس بۆی نی یە لە شتێکدا سەرپێچی خوای تێدا بێت بەقسەی کەس بکات وەمن چاکترتیتان نیم، من یەکێکم هەر وەك ئێوە ئەوە نەبێت کەبار من لەباری ئێوە قورس ترە.

ئەی خەڵکینە هەرکەسێ دەیوێت هاوڕێ یەتیمان بکات بابە(٥) مەرج بێتە پێشەوە، لە پێویستی ئەوکەسانەی ئاگادارمان بکاتەوە، کە خۆیان ناتوانن بگەن پێمان، لە کاتی خێرو چاکە دا پشتگیریمان بکات، کاری خەیریشمان بۆ دەستنیشان بکات، تا بیکەین، لە لاماندا لە پشتە ملە غەیبەت و باسی خەڵکیان بۆنەکات، کارێکێش پەیوەندی بەوەوە نی یە با توخنی نەکەوێت.

ئامۆژگاریتان دەکەم بە تەقوای خوا، چونکە تەقواو لە خوا ترسان بەباری هەمووشتێکن، لە تەقوای خوا باشتر هیچ شتێك نی یە، بۆ قیامەتتان کار بکەن، چونکەهەر کەسێك بۆقیامەتی کار بکات خوای ـ عزوجل ـ کاری دونیای بۆ ئاسان و مسۆگەردەکات، کە ژیانی نهێنی خۆتان چاك بکەن خوا ژیانی ناو خەڵکتان چاك دەکات، مردنتان لەبیر بێ و خۆتانی بۆ حازر بکەن پێش یەخەتان پێ بگرێت. مردن هەموو چێژو خۆشی یەکان دەتەپێنێت...

ئەم ئوممەتە لە خوای ـ عز و جل ـ لە پێغەمبەرەکەی ﷺ لە کتێبەکەیدا ناکۆکیان نی یە، بەڵکو دینار و درهەم نێوانی تێك داون و، من وەڵلاهی بە ناڕەوایی بەشی یەك بەکەس نادەم، بەناڕەوایش کەسی لێ بێ یەش ناکەم.

پاشان بەدەنگێکی بەرزتر هاواری کرد تا خەڵکی زیاتر بیبیستن، ووتی: ئەی خەڵکینە، هەرکەسێ گوێ ڕایەڵی خوا بکات دەبێت گوێ ڕایەڵی بکرێت، هەرکەسێکیش سەرپێچی خوا بکات دەبێ بەقسەی نەکرێت، دەی ئێوەش

---

[1] ـ مەبەستی شتی تازە نا ئاخنمە ناو ئاینی ئیسلام.

گوێڕایەڵیم بکەن تا گوێ ڕایەڵی خوا دەکەم و ئەگەر سەرپێچی خوام کرد لەسەر ئێوە نی یە گوێڕایەڵیم بکەن، ئەگەر هەریم و ناوچەکانی وەك ئێوە گوێڕایەڵ بوون ئەوا من ئەمیریتان دەکەم و ئەگەر ئەوان مانە جەڕێیان دەکرد ئەوە من گەورەیی ئێوە ناکەم،[1] ئەوەی ووت و دانیشتەوە.

ئابەو جۆرە بە یەعتی خەلافەت بە عمری کوڕی عبدالعزیز درا لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی جومعەی (١٠)مانگی سەفەری ساڵی ٩٩ی کۆچی.[2]

لەم ووتارە سیاسی یەی عمرەوە نەخشەی کاری دەوڵەتی نوێمان بەرچاو دەکەوێت لەوانە:

أ - پابەند بوونی با قورئان و سوننەتەوە، ئەو ئامادەنی یە بۆ گوێ گرتن لە دەمەقاڵە لەمەسەلە شەرعی و ئاینی یەکاندا، چونکە ئەو حاکمێکی جێ بە جێ کارە، ئاینی ئیسلامیش زۆر ڕۆشنە لەلایەن حەلاڵ و حەرامە وەو هەموو بیدعە و داهێنانی لە ئایندا ڕەدکردەوە...

ب - ڕێگەی والاکرد لەبەردەم هەموو کەسێکدا کە بیەویت لێ ی نزیك بێتەوەو ببێتە هاوڕێ ی بەلام بەو(٥)مەرجەی کەلە لەوتارەکەدا دیاری و هەرەکەسێك ئەومەرجانەی تێدا نەهاتنە دی نابێ لێ ی نزیك ببێتەوە، چونکە زۆرباش دەیزانی هاوڕی و دروست بیتانەی ئەمیر چ ڕۆڵێکی هەیە لەسەر ئەمیر لەسەر میللەتێکیش و چ لەسەر شێوازی حوکمڕانی یەکە وای بەباش زانی خەڵکەکە لەوە ئاگاداری بکاتەوە کەسەر قاڵی نەکەن و وبهێڵن حوکمی میللەت بکات لە ژێر ڕۆشنایی شەریعەتی خوادا، بەبێ ئەوەی بەیەکجاری دوریان بخاتەوە، چونکە ڕەوایە بۆ هەموو ئەوانەی ئێنە پێشەوە بەمەرجێ یارمەتی دەروهاوکاری بن لەکاری خێردا و لەگەیاندنی پیداویستی هەژاراند.[3]

---

١ - الطبقات(٥/٣٤٠)سیرة عمر بن عبدالعزیز(إبن الحکم)لا ٣٥-٣٦. لەگەڵ هەندێ جیاوازیدا.

٢ - عمری کوری عبدالعزیز (إبن عبد الحکم) (٥/ ٣٤٠).

٣ - البدایة والنهایة (١٢/ ٦٥٧).

ج ـ خەڵکەکەی ئاگادار کردەوە لەترسناکی دنیا ئەگەر خراپەی تێدا بکەن و داوای لێ کردن، تا نهێنی یەکانی خۆیان بەخاوەێنی بهێڵنەوە و لەمردنیش بترسن و پەندی لێ وەربگرن.

د ـ بە لێنێکی لەسەر خۆی فەرزکرد، کە هیچ شتێك نەدات بە کەسێك مافی خۆی نەبێت و، هیچ شتێکیش ناگرێتەوە لە خاوەن مافەکان، ئەویش مافی ئەوەی پێدان، کە گوێ ی بکەن، تا ئەو گوێ ڕایەڵی خوا دەکات و ئەگەر سەرپێچی خوای کرد، گوێڕایەڵی نەکرێت.

ئەمە بوو هێڵەکانی سیاسەتی عمر و، لەیەکەمین ووتاریدا و ڕشکارانە پێش کەشی کردن لە مزگەوتدا و، ئەم نامەیەشی بەدرێژی و لەسەر دووانەوە ناردی بۆ یەکە یەکەی هەرێمەکان، کە بە دووشێواز بۆی دەناردن:

١ـ نووسی بۆ کار بەدەستەکانی و ئەوەی بۆ ڕوون کردنەوەکە دەبێت چۆن هەڵس و کەوت بکەن لە ژیانی تاکە کەسی و ژیاننیان لەگەڵ میللەتدا، دواتر بەیارمەتی خوا لەسەر ئەم خاڵە دەدوێنن.

٢ـ نووسی بۆ ئەمیرو بەرپرسەکانی ناوچەکان و نەخشەی سیاسی کاری بۆکێشان و چونیەتی هەڵس و کەوتکردنی دیاری کردن لەگەڵ گەلدا وەك مەسڵمان یان وەك ناموسڵمانەکان، کە لە و ناوچانەدا دەژیان و، عمر لەم نامەیەدا وەك شارەزاو پسپۆڕێکی بواری شەرع و بنچینەی ئیسلام قسەی دەکرد لەگەڵیاندا.[1]

## ٢. سور بوونی لەسەر کارکردن بە قورئان و سوننەت:

ئەوەی نەخشە و پلانی سیایی عمر جیا دەکاتەوە ئەوەیە، کە زۆر سوربو لەسەر ئەوەی، کە کار بە قورئان و سوننەت بکرێت، زانست و زانیاری لەناوگەلدا بلاو بکرێتەوە و لەئاینی ئیسلام تێ بگەیەنرین و لەسوننەتی پێغەمبەر شارەزا و ئاشنا بکرێن، عمریش ئەوکارانەی لەو ڕوانگەیەوە دەکرد کەباش دەیزانی کاری سەرەکی خەلیفە پاراستنی ئاین و بەڕیوەبردنی سیاسەتی وڵاتە.[2]

---

١ ـ الاحکام السلطانیة والولایات الدینیة لا٥.

٢ ـ الأحکام السلطانیة والولایات الدینیة لا٥.

ئەو وای دەبینی، کە گەورەترین ئەرکی سەرشانی ئەوەیە بنەماکانی ئاینی ئیسلام بەگەل ئاشنا بکاتەوە هانیان بدات، تا کردەوەی پێ بکەن و دەگێڕنەوە سەری، لەیەکێ لە ووتارەکانیدا ووتویەتی: ئیسلام کۆمەڵێك سنرو و شەرع و سوننەتی داناوە هەرکەسێ کاریان پێ بکات ئەوە بە تەواوتی باوەڕ دارە، ئەوە بەنیوە ناچل کاریان پێ بکات ئەوە باوەڕکەی ناتەواوە، ئەگەر بژیم ئەزانم چۆن فێرتان دەکەم و واشتان لێ دەکەم کاری لەسەربکەن و ئەگەر مردیشم خۆ من بە تەمانیم بەردەوام هاوڕێتان بم.[1]

هەروەها دەڵێت: ((هەموو داهێنراوێك ـ بدعە ـ لەسەردەستی مندا خوابیمرێنێت و هەموو سوننە تێکیش لەسەر دەستی مندا زیندووی بکاتەوە ئیتر بالەسەر حسابی پلەپلە گوشتی من بێت تا دەگاتە دوا هەناسەم، لەپێناو خوادا هێشتا کەمە)).

لە شوێنێکی تردا دەڵێت: ((سوێند بە خوا لەبرەئەوە نەبێت کە سوننەتێ زیندوو بکەمەوە، یان مافێك بگێڕمەوە بۆ خاوەنەکەی حەزم نەدەکرد هەناسەیەك بژیم)).

لەبەر ئەم هۆیانە بوو، کە عمرؒ بە پەلە دەستی کرد بە جێ بەجێ کردنی ئەم کارە گەورە و گرانە و زانایانی بەناو دەوڵەتی ئیسلام دا بڵاو کردەوەو، تا هەموو خەڵکی لە ئیسلام و شەرعی خوا وسوننەتی پێغەمبەرﷺشارەزا بکاتەوە... هانی والی و کاربەدەستەکانی هەموو هەرێمەکانی دەر هەریمەکانی، تا ئەو پەڕی توانا هەوڵ بدەن زانست و زانیاری بڵاو بکەنەوە.

لە نامەکانیدا کە دەینارد بۆ کاربەدەستەکانی پێ ی دەووتن: فەرمان بدەن بەزاناو دانا و لە ئیسلام و شەرع و تێگەیشتوەکان کەزانست و زانیاریەکەیان بکەینەوەوە بەردەوام باکۆڕ و وانەیان هەبێت.[2]

نامەی تری دەنوسی بۆ هەندێ لە کاربەدەستەکانی پێ دەووتن: پاشان فەرمان بدە بەسەر ئەهلی عیلم زانستدا کە زانستەکانیان بڵاوبکەنەوە لە ناو

---

١ ـ سيرة عمرى بن عبدالعزيز (إبن عبد الحكم).لا ٦٠.

٢ ـ سيرة عمرى بن عبدالعزيز (إبن عبد الحكم). (٧٣).

مزگەوتەکانیانـدا، چـونکە سـوننەتی پێغەمبـەرﷺ مرێنـراوە.[١] هـەروەك فـەرمان دەردەکرد بۆ سەرجەم وولاتە یەکگرتوەکانی ئیسلام تا مووچەی تایبەت ببڕنەوە بۆ زاناکان تا خۆیان یەکلابکەنەوە بۆ بلاکردنەوەی زانست.[٢]

ئیش و کاری زاناکانی تەنها لە بلاو کردنـەوەی زانـست و زانیـاری قـورغ نـەکرد، بـەڵکو هەنـدێ لەهەریمـەکانی دایـە دەسـتی هەنـدێ لـە زاناکـان و هەنـدێکی تریـان بەمەسەلەی داد وەری و دادگاوە خەریك دەکرد، ئەمـە لەگـەڵ هانـدانی تـەواوی بـۆ زانایاو بانگخوازەکان، تابانگەوازی ئیسلامی بلاوبکەنـەوە و مەشـخەڵی جیهـاد بـەرز ڕابگرن.

ئەم گرنگی دانە تایبەتی یەی عمررحمه الله بـەم بوارانـەی وای لێ کردبـوو لەبەرنامـەو پرۆگرامی دەوڵەتدا لە خەلیفەکانی پێش خۆی و پاش خۆی جیا بـوو، چـونکە ئـەو تەنها خەلیفەیەك بوو، کە پێ ی وابوو بلاوبونەوەی تێ گەیشتنی ئیسلامی و زانینی شەرع و ڕۆشنبیرکردنی جەماوەر فاکتەرێکی سەرەکیە لە سەقامگیر بوونی وولات و بلاوبوونەوەی ئاشتی و نەهێشتنی سەرکەشی و کودەتا کردن و هەروەها هۆکارێکی گرنگیشە بۆ پاراستنی مێشکی لاوەکانی ئوممەتی ئیسلام لەوەی ڕیچکەو بیرۆکـەی لارو ڕوخێنـەرەکان کـاری تـێ بکـەن و پاشـتریش لـە فەڵـەق بخاتـە نـاو ڕیزەکـانی میللەت، وەك ئەوەی خەواریج[٣] و کەسانی تریش کردیان.

## ٣. ڕاوێژ لە دەوڵەتەکەی عمری کوڕی عبد العزیزدا:

خـوای –عـز و جـل– دەفـەرموویت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ الـشوری: ٣٨، واتـە: واتـە: ئـەم کەسـانەی هـاتوون بەدەم بانگـەوازی خـواوە نوێـژ ڕپادەکـەن و کاراکانیـان بەڕاپرسـی و ڕاوێـژ کـردن

---

١ ـ سيرة عمر بن عبد العزيز (إبن جوزي)لا ٧٦.

٢ ـ البداية وانهاية، له کتێبی أثر العلماء في الحياة السياسة لا ١٧٩ وەرگیراوە.

٣ ـ أثر العلماء في الحياة السياسية(١٨٠).

دەکەن و لەو سامانەیشی پێمان بەخشیون لێ ی دەبەخشن.

عمری کوڕی عبدالعزیز زۆر گرنگی دەدا بەکاراکردنەوەی بنەمای ڕاوێژکردن لەماوەی خیلافەتەکەیدا، دەربارەی شورا دەڵێت: ڕاوێژ کردن و گفتو گۆکردن دەروازەیەکی ڕەحمەتە، کلیلی نگێ‌ی و بەرەکەتە، هەرگیز ڕأو بۆچوونەکان لەگەڵ ئەودوانە دا بە هەڵە ناچن، سوربوون خاودەکەنەوە.[1]

یەکەمین هەنگاوێك بۆ ئەو مەستە ئەوکاتە بوو، کە وەلیدی کوڕێ عبدالملك کردی بە ئەمیری شاری مەدینە خێرا ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری لەزاناو دانا و خواناسەکانی ناوشار هەڵبژاردو بەردەوام بێ پرسی ئەوان هەنگاوی نەدەنا.[2]

دەی کەسێك لەئاستێکی بەرپرسیاریەتی کەمدا بتوانێت بە بنەمای شورا بخاتەوە گەر ئەو بێگومان شایانتر بێت بەجوانترین و تەواوترین شێوە کاری پێ بکات ئەگەر ئاستی بەرپرسیاریەتی یەکەی بەرز تر بوویەوە بۆ کارێکی زۆر گەورەتر کەسەرکردایەتی گشتی موسڵمانانە، بنەمای شورا هەر لە یەکەمین ڕۆژی خیلافەتی بەئاشکرا دیار بوو، کەبەخەڵکەکەی ووت: ئەی خەڵکینە، من تووشی ئەم کارە گەورەکراوم، بەبێ ئەوەی ڕأی خۆم یان داواکاری خۆم یان وویستی موسڵمانی لەسەر بوبێت، من ئەوا واز لە بەیعەتە دەهێنم پێم دراوە، ئێوە بە ئارەزووی خۆتان یەکی بکەن بە گەورەی خۆتان، هەموو خەڵکەکەش بەیەکدەنگ ووتیان: ئەوا هەڵمان بژرادیت ئەی ئەمیری باوەڕ داران، بە تۆڕازین و دەی تۆش سەرکردایەتیمان بکە بەفەڕو بەرەکەتەوە.[3]

ئابەو شێوەیە عمری کوڕی عبد العزیز توانی ئەو داب و نەریتە نامۆیەی هێنرا بووە ناووڵاتی ئیسلام کە یاسای هەڵبژاردنی سەرۆکی کرد بوو پشتاو پشت و بنەماڵە، ـ ئەو کردیە بەیاسای شوراو دایەوە دەستی گەلی موسڵمانان، هەر بەوەش

---

١ ـ أدب الدنيا والدين ماوردي لا(١٨٩).

٢ ـ النموذج الإداری المستخلص من ادارة عمری بن عبدالعزیز٢٨٣.

٣ ـ سيرة و مناقب عمرى بن عبدالعزيز، لا ٦٥.

ڕازی نەبوو، کە موسڵمانان هەڵبیژێرن، بەڵکو هەر لە یەکەم ووتارەکەیدا ئەوەشی دەبڕی کە دەبێ هەرێمەکانیش ڕایان لەسەر ئەوە هەبێت و دەڵێت: بە چواردەوریشتاندا کۆمەڵێ شارو هەرێم هەیە ئەگەر ئەوانیش وەك ئێوە بەیعەتیان بەمن دا ئەوا باشە، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبوون پێم ئەوا من گەورەتان نیم، پاشان دابەزیە خوارەوە.[١]

نامەی نارد بۆ هەموو هەرێمەکان ـ الأمصار ـ هەر هەموویان بەیعەتیان پێ دا، بۆ ئەم مەبەستە نامەی نارد بۆ یەزیدی کوڕی مولهیب و داوای وەرگرتنی بەیعەتی لێ کرد و پاش ئەوەی لەنامەکەدا بۆی ڕوون کرد بوویەوە کە بەهیچ شێوەیەك من حەزم لەم پۆستە نەکردوە، ئەویش خەڵکەکەی بۆ کۆکردەوە و بەیعەتی لێ وەرگرتن بۆی.[٢]

بەمەدا ڕوون دەبێیەوە، کە عمر رحمه الله هەر بەوە ڕازی نەبوە، کە ئامادەبووانی پایەتەخت دەنگی پێ بدەن جوابیشی نارد بۆ سەرجەم هەریمەکان بۆ ئەنجام دانی ئەو مەبەستە.

لەو هەڵوێستەی عمر ئەم خاڵانەی خوارەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

أـ عمر ئەوەی دەرخست کەسەرجەم خەلیفەکانی ئوممەوی بە شێوەیەکی ناشەرعی هەڵبژێراون کە بەیاسای پشتاو پشت و کوڕاو کوڕ!.

ب ـ کەسێك لەگەورەترین شت کە خیلافەتە ئەم بنەمایە جێ بەجێ بکات، ئەوە زۆر ئاسایی ترە، کەلە شتەکانی تردا جێ بەجێ دەکات.

ج ـ عمر رحمه الله ڕاوێژی دەرکرد بەزاناکان و داوای ئامۆژگاری لێ دەکردن، وەك: سالمی کوڕی عبدالله و محمدی کوڕی کعب القضبي ورجاء کوڕی حەیوە و کەسانی تریش و دەڵێت: ((من تووشی ئەم کارە کراوم، و ڕاوێژم بۆ بکەن)).[٣] هەروەك چۆن

---

١ ـ البداية وانهاية(١٢/ ٦٥٧).

٢ ـ تأريخ الطبري له (النموذج الإداري والمستخلص من عمر لا ٢٨٥.

٣ ـ سيرة ومناقب عمر بن عبدالعزيز لا ١٦.

پرس و ڕای دەکرد بەژێر مەندو عاقڵەکان بۆ ئەو دوومەسەلەیە.[١]

عمر رحمه الله هەوڵی دا دارو دەستەو چواردەورەکەی کەسانی چاك بن، بۆیە هەر کە بەرپرسیاریەتی وەرگرت خێرا زاناو لە خواترس و شەرع زانەکانی لە خۆی نزیك کردەوە، ئەوکەسانەشی دوور خستەوە کەبەرژەوەند پەرست و دونیا خۆربوون هەر بەوەشەوە نەوەستا کە چوار دەورەکەی چاك وپاك بکاتەوە، بەڵکو پێ ووتن: ئەگەر منیش لامدا ڕاستم بکەنەوە.

بە عمری کوڕی موهاجیری ووت: ئەگەر منت بینی لە حەقم لادا ئەوە ملیوانی کراسەکەم بگرە و ڕام بکێشە و ڕام وەشێنە بڵێ: ئەی عمر، چی دەکەی؟[٢]

ئەم ڕێڕەوەش، کە عمر گرتیە بەر هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ سەرخستنی پرۆسە چاکسازی و نوێ خوازی یەکەی، چونکە چوار دەورە پاکەکەی پشتیان دەگرت و هاوکاری بوون لە ڕاست کردنەوەی هەنگاوەکانی و دروستی بڕیارەکانی.[٣]

یەکێ لە هۆکارە سەرەکیەکانی سەرکەوتنی عمری کوڕی عبدالعزیز لە هەڵگرتنی ئەو بەرپرسیاریەتیە گەورەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەهلی عیلم و چاکەی لە خۆی نزیك کردەوەو دڵی پێیان دەکرایەوەو ئەمەش بو بەهۆی ئەوەی خێرو بێری گەروە ڕژا بەسەر ئیسلام و موسڵماناندا.

### ٤. داد پەروەری لە دەوڵەتەکەی عمردا:

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾[ النمل: ٩٠]، واتە: خوای - عز وجل - فەرمان دەدات بە داد پەروەری و چاکە کردن.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ فَلَا

---

١ - النموذج الإداري لا ٢٨٥.

٢ - أثر العلماء في الحياة السياسة لا ١٧٥- ١٧٧.

٣ - هەمان سەرچاوە لا ١٨٧.

تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ النساء: ١٣٥، واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە بەپەری تواناو بەداد پەروەری و یەکسانی بەبەرپابکەن، لەبەر خوا ئەگەی ر دژی خۆتان دایك و باوك و خزمەکانتان بێت....

داد پەروەری دوو شێوازی هەیە:

شێوازی نەهێشتن: ئەم جۆرە هەموو ئەو هەنگاوانە دەگرێتەوە بۆ نەهێشتنی ستەم و ناداد پەروەری وبوارنەدان بە خواردنی ماف و شکاندنی حورمەتی ناموس و سامانەکان، لابردنی هرەستەمێك، کە کرابێتە سەریان و گەڕانەوەی ماف بۆیان و سزادانی ئەوکەسەیش کە ستەمەکەی ئەنجام داوە.[1]

شێوازی چاکی - الإجابية - ئەمەش تایبەتە بە دەوڵەتەوە، هەستێت بە پاراستنی مافی تاکە تاکەی کۆمەڵگا، مسۆگەر کردنی بژێوی ژیانیان، تا وایان لێ دێت ناتوانای پشت گوێ خراو، لاوازی واز لێ هێنراو هەژاری بێ هیوا، ترساوێکی هەڕەشەلێکراو نەمێنێت، ئەمەش لەکارو پێویستی یە کانی حاکمە لە ئیسلامدا.[2]

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله هەستا بە بەرپاکردنی ئەم پایە مەزنە و ئەم بنەما ترسناکە بە جوانترین و تەواو ترین شێوە، وای بۆ دەڕوانی کە بەرپرسیاریەتی و دەسەڵات ئەوەیە هەستی بە دابین کردنی مافەکانی خەڵکی و ڕازی بوون بەو مەرجانەی لە کاتی بەیعەتدان هەیانبووە، هێنانەدی بەرژەوەندیە ڕەوا کانیان، و (خلیفە) کرێکارە لەلای ئوممەت و دەبێت هەموو داوا کاری یە ڕەواکانیان بهێنێتە دی بەپێ ی مەرجەکانی دەنگ دان - البیعە-.[3]

عمر رحمه الله هەمیشە حەزی بەوەدەکرد، کە زیاتر و زیاتر بزانێ دەربارەی پێشەوای داد پەروەر و ڕەوشتەکانی، ئەو کارانەی، کەپێویستە خۆی پێ برازێنێتەوە، بۆیە

---

١ - عمری بن عبدالعزیز خامس الخلفاء الراشدین عبد الستار الشیخ لا ٢٢.

٢ - نظام الإسلام محمد مبارك لا (٤٥، ٤٦).

٣ - عمری بن عبدالعزیز الخلیفة الخامس لا ٢٢٣.

نامەی نووسی بۆ (حەسەنی بەسری)و لەوبارەیەوە پرسیاری لێ کرد، ئەویش لەوەڵامدا پێ ی ووت: پێشەوای دادپەروەر ئەی ئەمیری باوەڕدارن وەك باوکێکی بەسۆز وایە بۆ کوڕەکەی، تا منداڵن هەوڵیان بۆ دەدات، کە گەورەش بوون فێریان دەکات، لەژیانیدا هەردەستی پیانەوەیەو و پارەیان بۆ هەڵ دەگرێت بۆپاش مردنیشی.

وێنەی پێشەوای داد پەروەر ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك دایکێکی چاك و بەسۆز وایە، کە زۆر بە بەزەییە لەگەڵ کۆرپەکەیدا، نارەحەی هەڵیدەگرێت، بەنارەحەی دەیبنێت و بەمنداڵی گۆشی دەکات، شەونخونی لە پێناودا دەکێشێت لەگەڵ ئارامی ئەودا بەئارامە، جارێ شیری دەداتێ و جارێ لێ ی دەگرێتەوە، زۆر دڵخۆشە بەلەش ساغی یەکەی، خەفەتبار دەبێت بە ئێش و ئازارو سکاڵاکانی.

وێنەی پێشەوای داد پەروەرو ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك سەرپەرشتی کاری هەتیوان وایە، خاوەن گەنجینەی هەژاران، منداڵە ساواکانیان گۆش دەکات.

وێنەی پێشەوای دادپەروەری ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك دڵ وایە لەنێوان ئەندامەکانی لەشدا بەساغی ئەو ئەوانیش ساغ دەبن و بەتێکچونی ئەو ئەوانیش تێك دەچن.

پێشەوای دادپەروەری ئەی ئەمیری باوەڕداران نوێنەرێکە لەنیوان خواو بەندەکانیدا، و گوێ بۆ قسەی خوا دەگرێت و پاشان دەیدات بە گوێ ئەواندا، بۆ خوا دەڕوانێت و، پاشان بەوانیشی پێشاندەدات خۆی دەداتە دەستی خواو، پاشان ئەوانیش دەداتە دەستی خوا، ئەی ئەمیری باوەڕ داران ئەو کارەی پەروەردگار داویەتی یە دەستت، وەك ئەو بەندە یە مەبە، کە گەورەکەی متمانەی پێ کردوە و ماڵ و منداڵەکانی خۆی داوەتە دەستی، کەچی ئەو دەیانفەوتێنێ وسەرگەردانیان دەکات، هەموویان هەژارو دەخات وسامانەکەشیان لەناو دەبات.[١]

---

١ - عمری بن عبدالعزیز - عبد الستار الشیخ لا ٢٢٤.

## أ- لابردنی ستەم لەسیاسەتی عمردا:

### * ئەمیری باوەڕداران لە خۆیەوە دەست پێ دەکات.

بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو پرۆگرامەی بۆ خۆی داڕشتبوو بۆ گەڕانەوەی مافەکانی بۆ شوێنی خۆیان لابردنی ئەوکارانەی بەزوڵم و ستەم کرابوون عمر رحمه الله لە خودی خۆیەوە دەستی پێ کرد. (إبن سعد) دەڵێت: کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز ویستی زوڵم و ستەمەکان هەڵبگرێ ووتی: جێگاری خۆیەتی سەرەتا لە خۆمەوە دەست پێ بکەم.[1]

ئەم کارەشی وای لێ کرد ببووە سەرمەشق و ڕەچەشکێنی بۆ خەڵکانی تر، هەرچی هەبوو لەزەوی و زارو شت و مەك تەنانەت ئەنگوستیلەیکی دەستی، کە نقمێکی گەورە بوو - کاتی خۆی وەلیدی کوڕێ عبد الملك لەو سامانانەی کەلە هەریمی ڕۆژئاواوە بۆی هاتبوون بەخشیبویە عمر- وازی لە هەمووشت هێناو هەمووی خستە خەزێنەی موسڵمانان.[2]

ئەم هەنگاوەشی نا، تا هیچ گومانێ لەدڵەکاندا نەهێڵێتەوە و بۆ خۆیشی دڵنیایی تێدا بوو کە هەموو ئەو شتانەی هەیەتی بۆنی حەرامیان لێ نەیەت تەنانەت ئەوشتانەی کە بەوەڕەسە بۆی مابوونەوە، بەتایبەتی ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەی کەباسیان لەوە دەکرد لەسەردەمی خەلیفەکانی ئەمەویدا چ ناهەقی گەلێگ ڕوویدا، ئەوەندە بەڕاستی بوو لەم بوارەدا تەنانەت ڕووکەشی شمشێرەکەی لە زیوو بو، لای برد بەئاسن ڕووکەشی کردەوە و عبدالعزیزی کوڕی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: شمشێرەکەی باوکم بەزیو ڕووکەش کرابوو، بۆیە لای برد و ڕووکەشی ئاسنی کردەوە.[3]

واز هێنانەکانیشی لەسامەنەکانی - بەشێوازی جۆراو جۆر بوو، یان ئەوە بوو - ئەگەر حەڵاڵی خۆی بوایە - ئیشی پێان نەبووایە وەك: خزمەتکارەکانی و جل و

---

١ - الطبقات (٥/٣٤١).

٢ - هەمان سەرچاوە.

٣ - هەمان سەرچاوە(٥/٣٥٥)، عمر وسياسته في رد المظالم لا ٢٠٥.

بەرگ و عەتر و بۆنە خۆشەکانی و هەمووشتە زیادەکانی دەفرۆشت، پارەی ئەوشتانەی گەیشتە(٢٣) هەزار دینار هەمووی خستە پێناوی خوا ـ السبیل ـ[١] وەیان دەی گەڕاندەوە بۆ خاوەناکانیان وەك ئەوەی بەزەوی یە قەدەغەکراوەکانی خۆی کرد کە خۆی (بنی ئوممەیە) بەدیاری پێیان دابوو.

(إبن جوزی) لە (إسماعیلی کوڕی حەکیم)ی ڕیواتکردووە دەڵێت: کاتێ خەڵکەکە لای عمری کوڕی عبدالعزیز بڵاوەیان لێ کرد و ئەویش ڕۆیشتەوە بۆ شکاندنی سەرخەوێك ـ قیلولە ـ هەر ئەوندەی زانی جار چیەك هاوار دەکات و دەڵێت: ((وەرن بۆ نوێژی جەماعەت))و هەموو: بەتەواوی تێك چووین و گومانی ئەوەمان برد لە جێ یەکەوە شتێکی گەورە ڕووی دابێت.

جویرەی یە دەڵێت: کەچی هەر ئەوە بوو عمر موزاحیم ی بانگی کرد ووتی: موزاحیم ئێمە هۆزەکەمان ـ بنی ئوممیە ـ پارەو سامانێکی زۆریان پێداوین، وسوێند بە خوا مافی ئەوەیان نەبوو بیدەن بە ئێمە و ئێمەش مافی ئەوەمان نەبوو لێیان وەربگر، و ئەو پاڕانە بوون بەهی من و منیش جگە لە خوا کەس بەسەرمەوە چاودێر نە بووە.

موزاحیمش پێ ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران دەزانیت چەند کورت هەیە؟ کە هەموویان ئاوان و ئاوان ـ واتە دەست کورتن ـ دەڵێ: عمر ئاو لە چاوەکانی هاتە خوارەوە و فرمێسکی نەدەوەستایەوە دەیووت: ئەیاندەمە دەستی خوا؟!

پاشان موزاحیم هاتە دەرەوە و چوو بۆلای عبد الملکی کوڕی عمر، کە بۆ قەیلولە کردن ڕاکێشا بوو، هەستایەوە و بە(مزاحیم)ی ووت: چی تۆی هێناوە ئا لەم کاتەدا؟ ئایا شتێك ڕووی داوە؟ ووتی: ئەو ڕووداوە چی یە؟ و (مزاحم)یش مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە ئەیش پێ ی ووت: ئەی تۆ چی وەڵامی باوکمت دایەوە؟ مزاحم ووتی: ووتم: ئەی ئەمیری بڕاوا داران چەند کوڕت هەیە؟! چەندێ وهەندێ ـ دەست کورتن ـ عبدالملك ووتی: ئەی ئەو چی پێ ووتیت؟ دەڵێ: چاوی پڕ بوو لە

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(٥/٣٥٥)، عمر وسیاسته في رد المظالم لا ٢٠٥.

ئاو و دەستی کرد بەگریان و ووتی: ئەیاندەمە دەستی خوای تەعالا، عبد الملکیش ووتی: تۆ وەزیرێکی خراپیت ئەی موزاحیم.

پاشان بە خێرایی خۆی گەیاندە بەردەرگای باوکی و داوای چوونە ژوورەوەی کرد، دەرگاوانەکەیش ووتی: دەی بۆ ڕەحمێکی پێ ناکەن لە هەموو شەو ڕۆژدا ئەم سەعاتەی هەیە تیایدا کەمی بحەوێنێتەوەو عبد الملکیش ووتی: ڕێگام بدە هەی قوڕم ساق، عمر گوێ لە گفتوگۆکەیان بوو ووتی: ئەوەکێ یە؟ ووتی: (عبدالملك)ە، عمر ووتی: ڕاێگای بدەن بابێتە ژورەوە، چوە ژورەوە و عمر ڕاکشا بوو، بۆ سەرخەوی (قەیلولە) ووتی: خێرە وا لەم کاتەدا هاتوویت؟ (عبدالمك) ووتی: (مزاحم) هەندێ شتی بۆ باس کردووم، عمریش ووتی: ئەی ڕای تۆ چی یە لەو بارەیەوە؟ ئەویش ووتی: ڕام وایە جێ بەجێ بەکەیت.

دەڵێ: عمر دەستەکانی بەرزکردەوەو، پاشان ووتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی وای کردوە لەنەوەکانی من کەسانێك هەن هاوکارم دەبن لە ئیش و کاری ئاینەکەمدا، بەڵێ کوڕی خۆم کاتێ نوێژی نیوەڕۆم کرد، تۆ هەستە و بڕۆسەر مینبەرەکە بە ئاشکرا و لەبەرچاوی هەموو خەڵکی سامانەکەت بگێڕەوە.

عبدالمکیش ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕ داران: چاکی دەڵێت: دەڵێت: ئەگەر دوای بخەیت بۆ نیوەڕۆکی دەڵێت: نیەتت نەگۆڕێت، عمریش ووتی: خەڵکەکە ئێستا بڵاوەیان لێ کرد وەو چونەتەوە بۆ قەیلولە، عبد الملکیش ووتی: جارچی یەکەت باهاورا بکات(وەرن بۆ نوێژی کۆمەڵ)، ئەو کاتە هەموو خەڵکی کۆدەبنەوە، جار چیەکە جاڕی داو ووتی: (الصلاة جامعه)، واتە: وەرن بۆ نوێژی جەماعەت.

دەڵێ: منیش بەرە مزگەوت ڕۆیشتم و لەوێ عمری کوڕی عبدالعزیز هات و سەرکەوتە سەر مینبەر، حەمد و سەنای خوای کرد و، پاشان ووتی: پاشان... ئەوە هۆزی ئێمەیە- مەبەستی ئومەوی یەکانە- بەخششی زۆریان داوە پێمان، سوێ، بەخوا مافی ئەم هەمووشتەمان نەبوو ئەو هەمووشتەمان بدەنێ، ئێمەش مافی ئەوەمان نەبوو لێیان وەربگرین، هەموو ئەوشتانە دراوە من یەك کەسیش چاودێر نەبوو بەسەرمەوە، دەی ئەوا من ڕەدەم کردەوە و لە خۆم و بنەماڵەکەماوە دەستم

پێ کردوە، ئادەی نامەکە بخوێنەرەوە.

گۆزەیەکیان هێناو ئەو نوسراوانەی تێدا بوو دەڵێ: موزاحیم هەمووی خوێندەوەو کاتێ تەواو بوو دایە دەستی عمر کەمەقەسێکی بەدەستەوە بوو لەسەر مینبەرکە دانیشتبوو، دەستی کرد بە پارچە پارچەکردنی نووسراوەکان، پاشتر موزاحیم وەرەقەیەکی تری دەرهێنا و خوێندی یەوە لەپاش تەواو کردنی دایە دەستی عمرو، عمریش خەریکی دڕاندنی بوو، پاشتر نوسراوێکی تری دەرهێنا و عمریش لێ ی وەردەگرت و دەی دڕاند و بەوشێوەیە بەردەوام بوون، تا بانگی نیوەڕۆی فەرموو.[١]

لەو ملك و قەردەغانەی کاتی خۆی بە خشرابوون ن بەعمر، واعمر گەڕاندیەوە بۆ(بیت المال)، کەژی وەرس لە وڵاتی یەمەن و چەند قەدەغەیەك(قاغە) لەمامە.[٢] و ئەمەو لەگەڵ زەوی (فەدەك)و (خەیبەر)[٣] و سوەیدا، هەموویان گەڕاندنەوە بۆ خەزێنە تەنها (سوەیدا)نەبێت، عمر(رضي الله عنه)دەیووت: هەرچیم هەبوو هەموویم گەڕاندنەوە بۆ موسڵمانان تەسوەیدانەبێت، کە زەویەکە من بەپارەو مووچەی خۆم هێ اوەتەوە بەرهەم و بچوکترین مافی موسڵمانای بەسەرەوە نی یە،لەو پارەیەم، کە(٢٠٠)دینار بوو لەگەڵ موسڵماناندا وەرم دەگرد چکم کردوە.

زەوی فەدەك دەکەوێتە باکور شاری مەدینە، ساڵانە نزیکەی (١٠,٠٠٠)دیناری خێردەدا یەوە، کاتێعمر(رضي الله عنه) خیلافەی کەوتەدەست، هەواڵی ئەوزەوی یەی پرسی و لێ ی ورد بوویەوە و پاشان باسی ئەو زەویەی کرد لەسەردەمی پێغەمبەری پێغەمبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم)و، پاش ئەویش لەسەردەمی ئەبوبەکری صدیق و عمر و عثماندا(رضي الله عنه)... لەسەر ئەوە نامەی نوسی ئەبو بەکری کوڕی عەمری کوڕی حەزم و پێ ووت: پاشان، من زۆر ورد بوومەتەوە لەزەوی یەکەی فەدەك و بۆم دەرکەوتووە کە بە من نابڕێت و نیازم کردوە بیگەڕێنمەوە سەر شێوازی سەردەمی پێغەمبەر و

---

١ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز لا (١٠٧ ، ١٠٨).

٢ ـ عمر بن عبدالعزيز سياسته في رد المظالم(٢٠٧٠).

٣ ـ هەمان سەرچاوە.

أبو بكر و عمر و عثمان، واز لەو بەنامانە بهێنم کەدوای ئەوان کاری لەسەر کراوەو بۆ ئەو بەستە بیگەڕێنەوە و بیدە دەستی کەسێك لە موسڵمانان کە بەرهەمی بێنێت، والسلام.[1]

(کەتیبە)کە قەڵایەك بوو لە قەڵاکانی خەیبەر، کاتێ عمر بووبە خەلیفە نامەی نارد بۆ کاربەدەستەکەی بەشاری مەدینەوە، کە ئەبو بەکری کوڕی محمدی کوڕی عەمر بوو پێ ووت: بەدوادا چونێکی کەتیبەکەم و بزانە لە پێنج یەکەکەی پێغەمبەری خوا بووە یان موڵکی تایبەتی پێغەمبەرﷺ خۆی بوو؟

ئەبو بەکریش پرسیاری لە عەمرەی کچی عبد الرحمن کرد و ئەویش ووتی: پێغەمبەر خواﷺ کاتێ سوڵحی کرد لەگەڵ (بەنی ئەبی الحقیق) ـ (نەتئە و شەق)ی کرد بە پێنج بەشەوە و کەتیبە یەکێك بوو لەو پێنج بەشە، عمری کوڕی عبد العزیزیش گەڕاندیەوە بۆ شێوازی سەردەمی پێغەمبەری خواﷺ.

ئەو زەویەشی گەڕاندەوە بۆ ئەو پیاوە میسری یەی لەکاتی خۆی عبدالعزیز باوکی لەشاری حەلوان بە نارەوا لێ ی وەرگرتبوو، ئەو خانوەشیکە عبدالعزیزی کوڕی مەڕوان کاتی خۆی لە ڕەبیعی کوڕی خاریجەی کڕی بوو، کە هەتیوێك بوو خۆی گەورەی کردبوو، عمر گەڕاندی یەوە بۆ ڕەبیعە پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت، کە لەشەرعدا دروست نی یە سەرپەرشتیار مۆڵکی هەتیوەکانی ژێردەستی خۆی بکڕێتەوە.

پاشن هەموو ئەوداهاتەی لەکەژی وەرسەوە لە یەمەن دەستی کەوت، گەڕاندیەوە بۆ(بیت المال)لەگەڵ ئەو دەست کورتی پێویستی زۆرە خۆی و ماڵ و منداڵی بەو پارانە، بەڵام ژیانی ئەو دونیای بەلاوە مەبەست بوو، نەك ژینی کورتی دنیا، هەروەك فەرمانی دابە موزاحیم، کە هەموو ئەوداهاتانەی ساڵانە لە بەحرەینەوە بۆی دەهات بیگێڕێتەوە بۆ خەزینەی موسڵمانان.[2]

---

١ ـ الطبقات(٥/٣٨٩)و عمر وسياسته في النظام (٢٠٨).

٢ ـ الطبقات لا ٢١٢.

ئا بەو شێوەیە عمر‌رحمه الله لە خۆیەوە دەستی پێ کردو خۆی کردە سەرمەشق و ڕەچە شکێن لەو بوارەدا لەبەرچاوە، گەلەکەی و هەموو ئەو موڵکانەی گێڕایەوە بۆ خەزێنەی موسڵمانان کە بۆنی ئەوەیان لێ دەهات بەناڕەوا گەیشتبێت بەو ویان گومانی هەبوو لەوەی بە تەواوی حەلاڵی ئەوبێت، هەمووی گەڕاندەوەبۆ خاوەنەکانیان،ئەمەش لە ڕوانگەی دەست گرتنی بەوە بوو بە بنەمای زوهید و دنیا نەویستی و باوەڕی تەواوی بەوەی کە گەڕاندەوەی ئەو شتانەی بەزوڵم گەیشتبوو بەو بەشێکە لە تەقوا و لە خواترسان و، دانانی شتەکان لە شوێنی خۆیاندا.

هەرکە بەتەواوی ڕزگاری بوو لە هەموو ئەوشتانەی گومانی لێیان هەبوو، کەمانی ئەوەی تێیدا بێت ـ ناوڕی دایەوە بەلای خێزانەکەیدا ـ فاطمەی کچی عبدالملك ـ کە خاوەنی ئاڵتون و جەواهیر بوو، پێ ووت: ئەمە چۆن گەیشتە دەستی تۆ؟ ووتی: ئەمیری باوەڕداران پێ بە خشیووم.

عمریش‌رحمه الله پێ ی ووت: یان ئەوەیە دەی خەیتەوە (خەزێنەی موسڵمانان) یان ڕوخسەتم بدە لێت جیا ببمەوە، چونکە پێم خۆش نی یە من و تۆ و ئەو خشڵ و گەوهەرانە لەیەك ماڵدا بین.[1]

عمر‌رحمه الله زۆر لەسەر خۆ هۆکاری ئەمەی بۆ ڕوونکردەوە و پێ ووت: ئەزانم مەسەلەی ئەم خشڵ و زێڕو زیوەو ئەزانم باوکت چی لێ کردووە، دەی ڕیگام پێ دەدەی بیخەمە ناو دارە مەیتێك و لەو پەڕی (بیت المال) دابنێم و پارەی تر سەرف بکەین ئەگەر پێویستمان بووسەرفی بکەین، ئەگەر پێش تۆ مردم ئەوا پێت بدەنەوە، فاطمەش ووتی: چۆنت پێ خۆشە وای لێ بکە.

عمر‌رحمه الله پێش فاطمە گیانی سپاردو یەزیدی برای فاطمە بوو بە خەلیفەو دووبارە خشڵەکەی بۆ ناردەوەو، بەڵام فاطمە وەری نەگرتەوەو ووتی: من هەرگیز شتێك وەرناگرمەوە، کە پێشتر بە خشیبێتم، بەڵام یەزید دابەشی کرد بەسەر خێزانەکانی خۆی و خێزانی کوڕە کانیدا.[2]

---

١ ـ الطبقات لا ٢١٢.

٢ ـ سیرة عمربن عبدالعزیز(لإبن عبدالحکم) لا(٥٢ ، ٥٣).

### * گەڕاندنەوەی موڵکە ناڕەواییەکانی بەنی ئومەیی یە:

ئەگەر عمر رحمه الله لەگەڕانەوەی ئەو موڵك و سامانەی دا لە خۆی و خێزانەکەی و ئامۆزاکانی و خاڵۆزاکانی و براکانی یەوە لە بنەماڵەی ئەوممەوی دەستی پێ کرد، لەگەڵ بە خاك سپاردنی سولەیمانی کوڕی عبدالمکی ئامۆزایدا شتێکی زۆر سەرسوڕ هێنەری بینی، ئەویش ئەوەبوو دەبینی خەلیفەکانی پێش خۆی، کە هەموو، یان مام و ئامۆزای بوون - زۆری دیمەنی زیادە ڕەوی و ئیسرافیان هێناوە بەسەر خەلیفەدا کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ شتی وانە بووە یان لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدیەکاندا، ماڵ و سامانی:ی بێ شوماریان خەرج دەکرد لەپێناوی ئەوەدا، کە لەبەرچاوی میللەت بە گەورەو جێگاری شانازی دەربکەون.

لەو دیمەنانە: ئەسپ سوارانی خیلافەت کەپێك هاتبوون لە کۆمەڵێکی زۆر لە ئەسپ و ئێستر و گوێدرێژو هەر وڵاخێکی کەسێك سەرپەرشتی دەرکد کەسێك ڕەشۆکەی گرتبوو.

هەروە لەو دیمەنانە: کۆمەڵێك چادرگەو ژوور و فەرش و ژێر خەر کە ئامادەکرابوون بۆ خەلیفەی نوێ، و چاوی هەڵتەقی بوو هەموو بەو هەمووە دەستە جل و بەرگە نوێ یە و شوشە عەترو کرێنمانەی، کە برمردنی خەلیفەی پێشو هەموو دەبنە موڵکی ئەو، بەبێ ئەوەی قەترەیەك ئارەقی لە پێناودار شتبێت، هەموو ئەمانەش کە لەوکاتەدا گەلێك پیویستی بەو سامانانە بوو تا پێداویستی موسڵمانانی پێ دەربکات بەو شێوەیەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ڕوونیان کردۆتەوە.

بۆیە ئەم شتگەلە جوانەی درایە دەست خێرا هەمووی دایەدەستی موزاحیم و ووتی بێ:ی: هەموویان بفرۆشە و پاراکە بخەرە ناو خەزێنەی موسڵمانان.[١]

عمر رحمه الله سیاسەتێکی دیاری کراو نەخشەبۆکێشراوی هەبوو لەمەسەلەی گەڕاندنەوەی پارەو موڵکی بنەماڵەی ئومەوی یەکان ڕابۆیە لەپاش بەخاك سپاردنی سولەیمان هەموو هاتنەوە خزمەت خەلیفەی نوێیان وەك عادەتیان لەگەڵ

---

١ ـ عمر بن عبد العزيز وسياسته في رد المظالم لا ٢١٣.

خەلیفەککانی پێشتردا، بۆئەوەی هەر لەوکاتەوە لەو مەسەلەیە لەو کاتەوەی ئاگاداریان بکات، ئەوەبوو عبدالملك نەیهێشت بێتە ژوورەوە و بەباوکی ووت: فەرمانت بەچی یە؟ ئەویش ووتی: پێیان بڵێ باوکم سەلامتان لێ دەکات، پێتان دەڵێت: ﴿قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾(الزمر: ١٣).

پاشتر جارێکی تر داوای لەباوکی کرد، کە زووبکات لە جێ بەجێ کردنی لێ سەندەوەی موڵك ماڵی ئومەوەی یەکان، کە بەناڕەوا دەستیان کەوتبوو عمریش پێ ووت: ئەم هۆزو بنەماڵەی تۆ ئەم شتانە، یان گرێ گرێ دەست کەوتووەو هەرکاتێ بمەوێت هەوڵ بدەم لێیان بسەنمەوە دەترسم بەیەکجارو پێکەوە هەڵتەقێن پێمانداو جەنگ و خوێن ڕشتن بەرپا بکەن دژمان.

دەی وەڵڵاهی لەناوچوونی دنیا مەبەلاوە ئاسان ترە لەوەی بەهۆی منەوە ئەوەندی کەڵەشاخ گرفتێك خوێن بڕژێت، ئەی تۆ عبدالملك باوە ڕازی نیت کە باوکت هەموو ڕۆژێك سوننەتێك زیندو دەکاتەوە و- بیدعە- یەك گوڕدەنێ - تابزانیت خوا چی دەکات لەنێنان ئێمەو ئەواندا و خوایش باشترین حوکم ڕایانە.[1]

پاشان زیاتر سیاسیەتەکانی خۆم لەم بارەیەوە ڕوون کردەوە، کاتێ (عبد الملك)ی کوڕی پێ ی ووت: چی ڕێ لێ گرتبوویت و ناهێڵی ئەوێ دەتەوێت جێ بەجێ ی بکەیت؟ دەی سا وەڵڵاهی زۆر ئاسایی لەلام من و تۆپێکەوە لە مەنجڵێکدا بکوڵێنن. عمر پێ ی ووت: تۆیش؟ ووتی: بەڵێ.

عمریش ووتی: سوپاسی بۆ ئەو خوایەی ڕۆڵەیەکی وای پێ داووم، کە پێشتگیر و هاوکارمە لە ئیش و کاری ئاینەکەمدا، بەڵام ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت جێ بەجێ بکەین لەوە دڵنیانیم کە بەدڵیان بێت، ئەگەر بە دڵشیان نەبوو ناچارم دەکەن پەنابەرم بۆ شمشێر، دەی خێر نی یە لە چاکەیەکدا بەشمشیر بهێنریتەکایەوە، کوڕی خۆم من خەڵکی وردە وردە ڕادەهێنم و ئەگەر تەمەنیش ڕێگاری نەدام ئەوە داوا دەکەم لەخوا ئەو خواستانەم بێنە دی، چونکە خوا دەزانێت من نیازم چی یە.[2]

---

١ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز، إبن الجوزي لا (٢٦٠ـ ٢٦٣).

٢ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز، إبن الجوزي لا(٢٦٢ـ٢٦٣).

ئابەو شێوەیە عمررحمه الله سیاست و ڕێزی پڕلە حیکمەت و ژیرانەی گرتەبەر بۆ هێنانە دی ئەو ئاواتانەی، بۆجێ بەجێ کردنیشی گەورەترین و ترسناکترین ڕێگای گرتە بەر کە ئەوەبوو لەخۆیەوە دەستی پێ کرد و پاشان خانەوادەی خۆی پاشتر بنەماڵەکەی کە خاڵۆزاو ئامۆزاوانی بوون و کۆی کردنەوە و داوای لێ کردن کە هەرچی یەکیان بە ناڕەوا پێدراوە بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان.[1]

هەر لە ڕۆژانی یەکەمی خیلافەتدا بەتەواوەتی بەنی ئومەیەی ڕووت کردەوە لە زۆربەی موڵك و سامانەکانیان، کە لەڕۆژانی ڕابردوودا گەشەی کردبوو، چونکە بنەماڵەی فەرمان ڕەواکان بوون...))، وا ئەمڕۆ ماڵەکانیان لێ دەسەنرێتەوە و دەخرێتەوە(بیت المال)و دادپەروەری ڕێرەوی ڕێرەوی خۆیدەگرێیەوە؛ سامانی موسڵمانان واد دەگەڕێتەوە بۆ موسڵمانان، تایبەت نابێت بە کۆمەڵێکەوە یان حیزبێکەوە و خەڵکی تری لێ بێ بەش بکرێت، و ماڵ و سامانەکانیش لە هەموو جۆرەکان بوون، بەهەموو شێوازێك هۆکارێك کۆکرا بوونەوە، عمررحمه الله لەبەنی ئومەیەی سەندەوە و هەموو تاپۆکانیشی دڕاندن و گەڕاندنیەوە بۆ شوێنی دروستی خۆیان:

لەوانە: موڵکی بەناڕەوا دەست کەوتوو، خەڵات و دیاری، موڵکی تایبەتی و جیاو زەوی وزار و قەدەغەکان، هەر هەمووی کرا بە پارە و کۆکرایەوە کە لە مەزەندەی عمر دا لایەکی سامانی هەموو ئوممەت بووو بەنیوەی (بیت المال)دادەنرا.[2]

چەند ڕۆژێکتێ تێپەڕی و (بەنی ئوممەیە)بینیان وا لە هەموو موڵك و سامانێك بێ بەش کران جگە لەوەندە نەبێت کە مافی ڕەوای خۆیان بو، دەستیان بە دروستکردنی هاشەو هوشە دژی ئەم سیاسەتەی عمر کرد و نەیاری تەواوی خۆیان ڕاگەیاند، ئەی وەڵامی عمر چی بوو؟.

(دەی وەڵلاهی ئاواتە خوازم لەسەر زەویدا ناعەدالیەتێك نەمێنێ من نەگێڕمەوە شوێنی خۆی و ئاواتە خوازم هەرناعەدالەتی یەك ڕاست کەمەوە لەبەرامبەرەیدا پارچە یەك لە لاشەم بمێنێت و ئازاری تەواو بچێژم و پاشانیش وەك خۆی لێ

---

۱ ـ عمر بن وسیاسته في رد المظالم ۲۱۵.

۲ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز لإبن الجوزی لا ۱۱۵.

ببێتەوە، یەك ناعەدالەتی نەمێنێت ڕاستم نەکردبێـەوە لـە دەروونـی خـۆم دەپرسم دەربارەی).[١]

بەڵام نەوەکانی بەنی ئوممەیە بێ هیوا نەبوون و چۆکیان دانەدا دەربـارەی ئـەم مافانـەی ئومـەتی ئیـسلام، کـەهیچ ڕۆژێـك لـە ڕۆژان نـەهاتووە بـە خەیاڵیانـدا بـەو شێوەیە لێیان بسەنرێتەوە، بۆ ئـەو مەبەسـتە کۆبوونـەوە داوایـان کـرد لـە کـوڕە گەرەی وەلید کرد کە دەمڕاستیان بـوو تـا لـەو بارەیـەوە شـتێك بـۆ عمـری کـوڕی عبدالعزیز بنوسێت.

ئەویش نامەی نوسی بۆی ووتـی: پاشان... تۆڕێرەوی هەموو خەلیفەکانی پـێش خۆتت فەرامۆش کرد و لە پرۆگرامی ئەوان لات داوکارەکانیانت ناونا ـ ناعەدالـەتی ـ مظلمة ـ کەئەمەش بە چاوی سوك سـەیرکردنی خۆیـان و سیاسـەت و کارەکانیانـە، جنێویشە بۆ ڕۆڵەکانی دوای خۆیان، ئەوکارەش مافی تۆ نی یە، ئەوەی خوا ویـستی بگەیەنرێت تۆ بچڕاندت، هەڵوێـستی نـاڕەوات نوانـد لەگـەڵ خزمانتـدا، هـەمووپارەو موڵك و سامانی پاش ماوەی قورەیـشی یـەکان مافـەکانیانت داگیر کـرد بەسـتەم و ناڕەوا خستتەوە خەزێنـەکانی خـۆت، دەی لـەخوا بترسـە ئـەی کـوڕی عبـدالعزیز و بگەڕێرەوە بۆلای، ئەگەر ئاوا ستەم و نان بڕاوی بهێنی بەسـەر خزمەکانتـدا گومـان مەبە ئەو کورسی یەت تاسەر بـۆ بمینتـەوە، سـوێند بەوکەسـەی محمـدیﷺ کـردە خاوەنی پەیام و کەڕامـەت، بـەم کـارەت تـۆ خـۆت لـە خـوا دوور دەخەیتـەوە، کـە خۆیـشت بـە بەلاسـەیری دەکـەیت، دەی هـەر وایـشە، دەی کـەمی لـە ئـازەزوات و نابەدڵی یەکانت وەره خوارەوە)[٢].

لەم نامەیدا ناڕەزانی نەوەکانی ئوممەیی یە دەردەخات بەرامبەرە کارەکانی عمر:

* پێـچەوانەی خەلیفـەکانی پـێش خـۆی کـردوە و بەسـوك و ناتـەواو سـەیری کردووەن.

---

١ ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز(إبن عبد الحکم) (١٤١ـ ١٥١).

٢ ـ عمر بن عبدالعزیز، صالح العلی لا ١٩٤.

* به خراپ سەیرکردنی ڕۆڵەکانی دوای خۆیان.
* کارەکانی ناڕەوان و لەگەڵ هەقدا یەك نا گرنەوە.
* نان براو کردنی بنەماڵەکەی هەڕەشەیەکە بۆ پۆستەکەی وەك خەلیفە.

بێ گومان ئەم کارەی عمر کوڕی عبد العزیز هەڕەشەیەك بوو ڕووبەڕووی بنەماڵەی ئوممەی یەکان دەبوویەوە هیزو دەستەڵاتی لاواز دەکردن، وایان لێ دەکردن هەنگاوی تر بگرنەبەر، کە هەڕەشە بێت بۆ خەلیفەی سەرحوکم، ئەمەش جێگاری مەترسی گەورەی چ خۆی و چ بۆ ئەسڵی خیلافەت.[1]

وەڵامی عمر رحمه الله بۆ ئەم نامەیە زۆر توند بوو، هەموو وشەیەکی وەك بڵێسەیەکی ئاگر وابوو: ((وەیل بۆ خۆت و بۆ باوکیشت، ئای کەشکات لێ کەر ماف خوارونتان زۆرە لەڕۆژەی قیامەتدا، .. خۆت بگرە پە لەمە کە، ئەگەر تەمەن ڕێگا بدات و مافەکان هەموو بگرمەوە شوێنی خۆیان... ئەوکاتە ئاورێك لە تۆ و بنەماڵەکەت ئەدەمەوە، گۆڕەپان سپی دەکەمەوەلەسەر بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا، ئەی ئەوانەی بە درێژایی ژیانتان هەقتان پشت گوێ خستووە)).[2]

* بنەماڵەی ئومەوی یەکان پەنا بۆ گفتوگۆیێ ئاشتیانە دەبەن:

پاش ئەوەی ڕۆڵەکانی ئەمویی یە بێ هیوا بوون لە خۆگرتن بەرامبەر ئەم نەیاری یەیەکگرتووەیان وزانیان سودی نی یە، پەنایان برد بۆ شێوازی دانشتن و گفتو گۆو لەیەك حاڵی بوونی نەرم ونیان، بەڵکو بەو هۆیەوە بگەنە ئەو مەبەستەی خۆیان پێان خۆشە و قسەی لەگەڵدا بکەن و خزمایەتی وسیلەی ڕەحمی بخەنەوە بیر.

ئەویش بەم شێوازە وەڵامی دانەوەو ووتی: (سامانی تایبەتی خۆم لە خزمەتتاندایە، بەڵام موڵك و سامانی گشتی موڵکی هەموو موسڵمانانە و ئێوەش یەکێکن لەوان، وەڵلاهی ئەگەر کار وای لێبێت هەموو سەر زەووی ئەم بۆ چوونەی ئێوەیان هەبێت، منیش دنیایەك سزای خوایان بەسەردا دەبارێنم).[3]

---

١ ـ عمر بن عبدالعزیز، صالح العلی لا ١٩٥.
٢ ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن عبد الحکم)لا ١٤٧ـ ١٥١.
٣ ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز(إبن الحکم)، لا ١٤٧ـ ١٥١.

جارێکیـان هیـشامی کـوڕی عبـدالملك دەڕواتـە لای، پـێ دەڵێـت: ئـەی ئـەمیری باوەڕداران من نوێنەری خزمەکانتم بۆلات، هـاتووم ئاگـادارت بکـەم لـەوەی، کە لـە ناخیاندایە، ئەا دەڵێن: تۆچی دەکەیت لە حوکمەتەکەتدا ئازاد بەو بیکـە، بـەڵام واز بێنە لەو حوکم فەرمانانـەی، کـە خەلیفـەکانی پـێش تـۆ داویانـە، عمر هـەر لەوێـدا وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: ئەگەر دوو کتێبم بۆ بهێنی یەکێکیان لە معاویە و ئـەوی تریان لە عبدالملکەوە بێت: کار بەکامیان بکەم بەڕای تۆ؟ ووتی: بەوەی پێشتریان. عمریش وەڵامی دایەوە: دەی من هیچ کتێبێـك لـە کتێبەکـەی خـوا پێـشتر نـابینم و منیش چ کاری ئێستام و چ کاری خەلیفەکانی پێش خۆم لەسەر ئـەو کتێبـە پێـڕەو دەکەم.[1]

## * بنەماڵەی ئومەوی یەکان ئەم جارە پوری فاتیمەی عمر دەنێرن:

کاتێ پیاوان دەستە وەستان بوون لەوەی عمر نەرم بکـەن و بـۆلای خۆیـان ڕای بکێشن ناچار بوون پەنا بەرن بۆ فاطمەی کچی مەڕوان، ئەم پورەی عمر زۆر ڕێـزدار و خاوەن کەسایەتیەکی گەورە بوو، لە هـەموو کاتێکدا بـۆی هـەبوو بـچێت بـۆ لای خەلیفەکان و هیچ داواکاری و پێداویستی ڕەد نەکراوەتەوە، زۆر ڕێزیان لێ دەگرت و بەگەروە سەیریان دەکرد، عمریش پێش خیلافەت بەو شێوەیە بۆی دەڕوانی، کاتـێ فاطمە هات بۆ لای ڕێزی تەوای لێ ناو پـشتی یـەکی پێـداو لـەلای خـۆی داینیـشاند، فاطمەیش ووتـی:

خزمەکانت سکاڵات لێ دەکەن و واباست دەکـەن، کـە تـۆ لـە خێـرو بێـری پـێش خۆت بێ بەشـت کـردوون، عمـریش ووتـی: هـیچ مـافێکم لێ زەوت نـەکردوون مـافی خۆیان بوو بێت هیچ مافیکیشم لێ نەسەندوون، کە مافی خۆیان بوبێت.

فاطمەش وتی: من دەمبینین باسیان دەکردیت،من زۆر دەترسم لەدژت هەڵسن و ڕۆژێکی ڕەشت بەسەر بهێنن.

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە، لا ١١٨ـ ١١٩. ملامح الانقلاب الإسلامی في خلافة عمر بن عبدالعزیز د. عماد الدین خلیل، لا ١١٧ـ ١١٨.

عمريش ووتی: ((كل يوم أخافه - دون يوم القيامه- فلا وقانی الله شره))، واتـه: ئەگەر جگە لەڕۆژی قیامەت لەڕۆژێکی تر بترسم، دەی خوا لەشەڕو خراپەی ئەو ڕۆژە نەم پارێزێت.

پاشان دوای کرد - یەك دیناری (ئاسن) و ئاگیرێك و مەقەڵەیەکی بۆ بهێنن و کاتێ بۆیانی هێنا سکڵەکانی گەش کردەوەو دینارەکەی خستە ناوی تاسور بوویەوە، پاشان دینارەکەی گرت بەدەستی یەوە و بەپوری ووت: پورێ گیان ئایا دڵت بۆ برازاکەت ناسوتێ - واتە بخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

ئەم دیمەنە کاریگەرە کاری کردە سەر دڵ و دەرونی پوری فاطمەو لای کردەوە بۆ لای عمر داوای لێ کرد لەسەر ووتەکانی بەردەوام بێت.

ئەویش دەستی کرد بەقسە وەك بڵێی تابلۆیەکی ڕەنگین لە داد پەروەری ئیسلام بنەخشێنێ تا بتەقێتەوە و خێرو بێری بۆ هەمووان بێت، ووتی:

خوای تەعالان محمد ﷺ ی ناردووە تارەحمەت و بەزەیی بێت بۆ هەموو خەڵکی سەر زەوی، بۆ ئەوەی نەناردووە تا ببێتە سزاو نارەحەتی بۆیان و، پاشان خوای گەورە گەڕانەیەو بۆ لای خۆی لەپاش خۆی ڕووبارێکی سازگاری بۆ بەجێهێشتن، تا بەیەکسانی وئاوی لێ بخۆنەوە، لەپاش ئەویش أبوبکر ڕوبارەکەی وەك خۆی هێشتەوە پاش بەردەوام ئەو ڕوبارە ئاوی دەبەخشیە تینوان، تا یەزید و مەڕوان و عبدالملك و وەلید و سولەیمانی کوڕێ درایە دەستی من ئاویان لێ دەخواردەوە تا خیلافەت گەیشتە دەستی من و ڕووبارەکە بە وشکی درایە دەستی من و ئاوی نەدەبەخشی یە خاوەنەکانی و منیش بە نیازم ئەو ڕووبارە سەر لەنوێ وەك جاران لێ بکەمەوە.

فاطمة ووتی: بەسیە، من تەنها ویستم قسەیەکت لەگەڵدا بکەم، مادام تۆ نیازی ئەوەت هەیە، دەی من هەرگیز هیچ ناڵێم و گەڕایەوە لایان هەواڵەکەی بۆ گێڕانەوە.[1]

لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە، کە فاطمة پاش ئەوەی لەلای عمر هاتە دەرەوە بە (بنی ئومەیی یە)ی ووت: خۆتان بە خۆتان کرد، ئێوە لەنەوەکانی عمری کوڕی

---

١ ـ الكامل في التأريخ (٣/ ٢٧٠).

خطابتان خواست، وا ڕۆڵەیەکی وەك باوانی لە دایك بوو)... و هەموویان بێ دەنگ بوون.[١]

### * (بنی ئوممەیە) یەك ڕیزی نەیاری تێك دەدەن:

خێرا ئەو کۆبونەوەیەو یەکڕیزیەیان تێك چوو و بڵاوەیان لێ کرد، دوای ئەوەی بێ هیوا بوون و بۆیان دەرکەوت، کە عمر زۆر بەڕاستیەتی لە گەڕاندنەوەی سامانی وولات خزمەتی گەل، ئیتر ووتیان: دوای ئەمە هیچ شتێك کەڵکی نی یە.

پاشا ئەوە هەریەکەیان ویستیان بە تەنها هەوڵ بدەن بۆ وەرگرتنەوەی سامانی لەدەست چوویان، بەڵام عمر توانی بەرامبەر کۆمەڵێکی زۆر بوەستێت و بە ئارەزووی ئەوان نەکات، ئیتر زۆر ئاسانە یەك یەك بێ دەنگ بکات وتێیان بگەیەنێت کەپارە و سامانی ئوممەت شتێك نی یە، کە بەقسەی لەسەر بکرێت هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان.[٢]

أ- گەڕاندنەوە مافەکان بۆ خاوەنەکانیان:

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله هەروەوە نەوەستا کە ماڵ و موڵکەکانی (بنی أُمیه)وەربگرێتەوەو بیخاتەوە(بیت المال)، بەڵکو هەنگاوێکی تری ناو لەناو ئوممەتی ئیسلامیدا ڕای گەیاند، کە کێ هەر سکالایەکی هەیە لەسەر ئەمیری هەرێمێکم، یان تاکێکی بنەماڵەی ئومەیی یە یان ستەمێکیان لێ کردبێت، با بێتە پێشوەو بە بەڵگە بیسەلمێنێت تا مافی بۆ بگێڕینەوە ... ئیتر کۆمەڵێکی زۆر سکالانامەیان پێشکەش کرد و، بەڵگەکانیان خستە ڕوو، عمریش پاش لێکۆڵینەوە یەك یەك موڵکەکانی پێدانەوە لە کێڵگەو زەوی و ژار و ماڵ و سامان.[٣]

جارێکیان والی بەسەر پیاوێ:ی نارد بۆلای عمر کوڕی عبدالعزیز، تا سکالای خۆی بکات لەوەی کەزەویەکانی داگیر کراون و عمریش زەویەکەی بۆگێڕایەوە و

---

١ ـ الكامل في التأريخ (٣/ ٢٧١).

٢ ـ ملامح الانقلاب الاسلامى في خلافة عمر، لا١١٩.

٣ ـ ملامح الانقلاب الاسلامى في خلافة عمر، لا ١٢٠.

پیشی ووت: چەندت سەرف کردوە لەبەسرە تا گەیشتوتیە لای من؟ کابرایەکەش ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ دەربارەی کرێ ی ڕێگەکەم دەپرسیت، کە هەموو زەویەکەت بۆ گێڕامەوەتەوە، عمر وەلامی دایەوە: من مافەکەی خۆتم بۆ گێڕایتەوە، پاشان فەرمان دەدات(٦٠)دەرهەمی بدەنێ لەباتی مەسروفی ئەم سەرو ئەوسەری ڕێگا.[١]

(إبن موسی) دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز بەردەوام تامرد هەر موڵك و سامان دەگێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان.[٢]

ڕۆژێك کۆمەڵێکی موسڵمانان هاتنە خزمەتی عمر و سکالایان لەسەر (روحی کوڕی ولیدی کوڕی عبدالملك) تۆمار کرد، کە گوایە کۆمەڵی دووکانی لێ زەوت کردووەم، شایەتیان هێنا بوو لەسەر، عمریش فەرمانی دابە(روح)، کە دوکانەکانیان بۆ بگێڕێتەوە و داوای تاپۆکەی وەلیدی نەکردو (روح)یش هەڕەشەی لێ کردو عمریش پاسەوانەکەی خۆی ئاگادار کرد، کە شوێنی (روح) بکەوێت بزانێت دەیداتە و، یان نا ئەگەر نەیدایەوە بدات لەملی و، (روح)یش لەگیانی خۆی ترساو خێرا دوکانەکانی هەموو گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان.[٣]

زەویەکیش کە هەندێ لەعەرەبە دەشتەکیەکان زیندوویان کرد بوویەوە پاشتروەلیدی کوڕی عبدالملك لێ ی سەندبوون و بەخشیبوویە یەکێ لە خزمەکانی، عمر رحمه الله لێ سەندەوە گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانی خۆی ووتی: پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموویەتی: ((من احیا ارضا میتة فهي لە))*، واتە: هەرکەسێ زەویەکی مردوو زیندو بکاتەوە ئەوە دەبێتە ملکی ئەوی، پێغەمبەری خوا ﷺ (بیت المال)ی زۆر خۆشویستووە هەموو مافەکانی بۆگێڕاوەتەوە، جارێك ووتی: بە فاطمەی کچی علی کوڕێ أبو طالیب رضي الله عنه: (ئەی کچی علی، وەڵلاهی لە هەموو سەرزەویدا کەسم

---

١ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز، لإبن عبدالحکم، لا ١٤٦، ١٤٧.

٢ ـ الطبقات(إبن سعد)(٥/٣٤١).

٣ ـ سیرة عمر(إبن الحکم)، لا ٦٠.

* صحیح جامع الالباني ژ ٢٧٦٦.

ئەوەندەی ئێوە خۆش ناوێت ئەی (آل بیت)، ئیوەم لە هەموو کەس و کارەکانی خۆم زیاتر خۆشم دەوێت)[١].

ب ـ لابردنی هەموو والی و کاربەدەستە ستەم کارەکان:

کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله بوو بە خەلیفە، دەستی کرد بە لابردنی هەموو ئەو والی و فەرمانڕەوا و کاربەدەستانەی کەستەمیان لە موسڵمانان کردبوو، لە پۆستەکانیان لای بردن، یەکێ لەوانە: (خالدی کوڕی ریان)، کە بەر پرسی گشتی پاسەوانەکانی سولەیمانی کوڕی عبد الملك بوو بە فەرمانی سولەیمان دەیدا لە ملی هەرکەسێك ئەو بیویستایە و لەباتی ئەودا(عەمری کوڕی موهاجیری ئەنصاری) دانا، بە خالیدی ووت: ئەی خالید ئیتر ئەو شمشێرە لە خۆت بکەرەوە، ئەی پەروەردگارم من لەبەر خاتری تۆ خالیدم لە کار دوور خستەوە، دەی خوایە هەرگیز بەرزی نەکەیتەوە، پاشان بە عەمری ووت: وەڵڵاهی ئەی عەمر تۆ چاك دەزانیت هیچ پەیوەندیەکی خزمایەتی لەنێوان من و تۆدا نی یەجگە لەپەیوەندی خزمایەتی ئیسلام، بەڵام بینیومیت زۆر قورئان دەوردەکەیتەوە و بینیومیت لە جێگەیەکدا نوێژت کردوە وات زانیوە کەس ناتبینێت و هەروەها چاوم پێت کەوتوە چەند جوان نوێژ دەکەیت ئەم شمشێرە بگرە و بیەبە بەرپرسی یەکەمی پاسەوانەکانم[٢].

ئابەو جۆرە بەرپرسە ستەمکارەکانی لابرد، ئەمەش شێوازی بووە لە هەڵبژاردنی والی و قازی و نوسەرەکان و...هتد، دەگەڕابە دوای کەسێکی شیاو و صالح دا چ لەبواری خواناسی یان لەبواری دەستپاکیدا و کاتێك ڕەخنەی گرت لەیەکێك لە والی یەکانی خۆی و بەدار حەیزەرانەکەی دەستی ئاماژەی بۆ ناوچاوی کابرا کرد و پێ ی ووت: ئا ئەمەت منی خەڵەتاند، واتە: زۆر سوژدە بردنەکانت، ئەم نیشانەیەش لە ناوچاوەوە نیشانەی زۆر نوێژ کردن و خواناسینە، خۆ عمررحمه الله بەرواڵەتی کەس نەخەڵەتاوە، بەڵکو خستونی یە تە ژێر تاقیکردنەوە وە، بۆیە

---

١ ـ سيرة و مناقب عمر(إبن الجوزي)، لا ١٣١. السياسة الإقتصادية المالية لعمر بن عبد العزيز، لا ٤٥.

٢ ـ سيرة عمرى بن عبدالعزيز (إبن الجوزي)، لا ٥٠.

جارێکیان پیاویکی بینی زۆر نوێژی دەکرد، ویستی تاقیبکاتەوە تا بزانێت شیاوە بیکات بە والی جێگایەك، بۆ ئەو مەبەستە کابرایەکی نزیکی خۆی بۆ نارد و ئەویش چوو بۆلای و پێی ووت: فلان کەس تۆچاك دەزانیت من دەستم دەڕوات لەلای ئەمیری بڕواداران، چیم بۆ دەکەیت ئەگەر ڕازی بکەم بتکات بە والی ولاتێك؟ کابرا ووتی: مووچەی یەك ساڵم دەدەمەتۆ، پیاوەکەی عمر گەڕایەوە و هەواڵی تاقیکردنەوەکەی بۆ گێڕایەوە و ئەویش وازی لێ هێنا، چونکە لە تاقیکردنەوەکەدا دەرنەچوو.[1]

یەکێکی تر لەوانەی ، کە ئەمیری بڕواداران لای بردن (أسامە)ی کوڕی (زید التنوجی)بوو، کەبەرپرسی دارایی میسر بوو، زۆر ستەمکار بوو، جۆرە سزایەکی میسریەکانی دەدا، کە پێچەوانەی سزاکانی قورئانی پیرۆز بوو، لەومەسەلە خیلافیانەدا، کە زاناکان لەسەری کۆك نەبوون و بەتەواوی لێپێچینەوە تێدا نەدەکردو یەکسەر دەستی دەبڕی، عمر فەرمانی دەرکرد بۆی، کە هەرساڵەو لەهەرێمێك زیندان بکرێت و کۆت و زنجیریش بکرێ تەنها کاتی نوێژەکان بیکەنەوە، لەمیسر ساڵی یەکەمی تەواو کرد و ساڵی دووەمیش لەفەلەستینی زیندانی کرا، پاش ئەوە عمر لە دونیا دەرچوو زەیدی کوڕی عبدالملك هاتە سەر کورسی خیلافەت و گێڕانەوە سەرکارەکەی لە میسر!.[2]

عمر رحمه الله نامەی ناردو تێدا ـ یەزیدی کوڕی ئەبی موسلیم لەوالێتی ئەفریقیا لابرد، کاربەدەستێکی خراپ بووە و بەجۆری سەیری سوڵتانی کردوە وەك خوا ـ لە هەموو گەورەو بچوکێکدا گوێڕایەڵی کردوە ئیتر باستەمیشی تێدا بوو بێت لەگەڵ ناهەقی، ئەم پیاوە بەدەم زیکرو یادی خواوە سزای خەڵکی داوە و فەرمانی دەدا بەگرتنی کۆمەڵی کەس و لەبەردەمیدا سزایان بدەن و ئەویش دەیووت: (سبحان الله والحمد لله) کوڕەکە بزانم چۆنیان لێ دەدەیت، شوێنی سزادانەکەی لەلەشیاندا دیاری دەکرد، پاشان دەیووت: (لا إله إلا الله والله اکبر)ئەی کوڕەکە بزانە چۆن دەدەیت

---

١ ـ فقه عمری بن عبدالعزیز د. محمد شفیر(١/٩١).

٢ ـ سیرة عمری بن عبدالعزیز (إبن الحکم)،لا ٣٢.

لەئەو شوێنەی و ئەوشوێنەی بۆ دیاری دەکرد، ئەوحاڵەتەش بەخراپترین حاڵەت دادەنرێت و نامەی نارد بۆعەزل کردنی.[١]

ئابەو جۆرە عمر بەردەوام بوو لەلابردنی والی یەستەم کارەکان و دانانی پیاو صالحان لە جێگەیاندا و ـ بەویستی خواـ دواتر باسی هەڵس کەوتی عمر لەگەڵ والی یەکانیدا دەکەین لە بابی (فقه عمر)دا.

## ج ـ لابردنی ستەم لەسەر (موالی)[٢]یەکان:

مەوالی یەکان لە پێش سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیز دا ڕووبەڕووی جۆرەها ئەشکەنجە دەبوونەوە، ئەوەشیان، کە موسڵمان دەبوو سەرانەی لە سەرنەدەکەوت، هەروەك قەدەغە کرابوو لەسەریان کۆچ بکەن لەجێ یەك بۆ جێ یەکی تر وەك مەوالی یەکانی عیراق و میسر و خۆڕاسان.

لەسەردەمی (عبدالملك)داو لەسەردەمی حەجاج دووچاوی ستەمی گەورە هاتن و ئەوکەسەی موسڵمان دەبوو جیزیەی لەسەر لانە دەبردن نەیدەهێشت لەلادێکانی خۆیانەوە، بۆ شوێنەکانی تر کۆچ بکەن، هەر هۆی ئەوەش بوو، کە لە داخاندا بەشداریان کرد لەشۆڕشەکەی(إبن الأشعث)دا لەدژی حەجاج، لەمیسرو خۆراسانیش هەر بەو شێوەیە بوو.

هەرکە عمر چووە سەر حوکم هەموو ئەو ستەمانەی لەسر هەڵگرتن و نامەی نارد بۆ کاربەدەسەکەی و پێ ی ووت: هەرکەسێ لەمەوالی یەکان موسڵمان دەبێت لە جولەکەو گاورو ئاگرپەرست ی ناوچەی جەزیرە ئیتر تێکەڵی موسڵمانانی بکەو لەو ناوچەیەی خۆی دوری بخەرەوە و حسابی موسڵانیان بۆ بکە، و تێکەڵی موسڵمانیان بکەو دڵنەواییان بکە جگە ماڵو زەویەکانیان، چونکە ئەوە (فەیئ) موسڵمانانە، بەڵام ئەگەر پێش ئەوەی ناوچەکەیان ڕزگار کرابێت موسڵمان بووبن ئەوە (فەیئ)نی یە، بەڵکو موڵکی خۆیانە و ئەوە فەیئ خوایە بۆ هەموو موسڵمانان.[٣]

---

١ ـ سیرة عمری بن عبدالعزیز(إبن عبدالحکم)، لا ٣٢، ٣٣.

٢ ـ موالی: ئەوکەسانەن، کە پێشتر ئەهلی ذیمە بوون و موسڵمان بوون، وەرگێڕ.

٣ ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز، لا ٧٨، ٧٩.

نامەشی نارد بۆ کاربەدەستەکەی لە میسر(حەییانی کوڕی شورەیح) پێ ی ووت: سەرانە هەڵگرە لەسەر هەرکەسێکی ئەهلی (ذمة)کە موسڵمان دەبن، خوای تەبارەك و تەعالا دەفەرمووێت: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، واتە: ئەگەر گەڕانەوەو نوێژیان کردو زەکاتیان دا ئەوا وازیان لێ بهێنن، چونکە خوا لێبوردەو بەبەزەیی یە.

بەڵام ئەم کاربەدەستە نامەی نووسیەوە بۆ عمر و پێ ی ووت: پاشان... موسڵمان بوون زیانی داوە لە کەم بوونەوەی جیزیە وسەرانە و تەنانەت من(٢٠)هەزار دینارم لە حارث ی کوڕی نابتە قەرز کردووە بۆ مووچەی ئەهلی دیوان، مەگەر ئەمیری باوەڕداران خۆی بیبژێرێت.[1]

وەڵامی عمریش بۆی بەم شێوەیە بوو: پاشان... نامەکەتم پێ گەیشت، من کاتی خۆی تۆم کرد بە بەرپرسی سەربازی میسر ئەشمزانی کە ناتوانیت، من فەرمان داوە بەسەر نێرراوەکەمدا، کە (٢٠)قەمچی بدات لەتەوقی سەرت، سەرانە(الجزیە)هەڵگرە لەسەر هەرکەسێك موسڵمان دەبێت، خوا لەناوت بەرێت بۆ خۆت و بۆ چوونت، خوای گەورە محمدی ناردووە بۆ ڕێنموینی و هیدایەت، نەك بۆ پارە کۆکردنەوەو جیبایەت، بەتەمەنم عمر شایەنی ئەوەنی، خوا بۆی بکردایە، هەموو خەڵکی لەسەردەستی ئەودا موسڵمان ببونایە.[2]

لە ڕیوایەتی(إبن سعد)دا هاتووە: پاشان... خوای گەورە محمدی ناردوە وەك بانگ خوازێك، نەك بۆ پارە چنینەوە، ئەگەر نامەکەمت پێ گەیشت و ئەهلی (ذیمە) هەموو هاتنە ناو ئیسلامەوە سەرانەیان شکاند، ئەوا شتەکانت کۆکەرەوە وەرەوە).[3]

---

١ ـ الخطط، منفریزی(١/٧٨). وعمر بن عبدالعزیز وسیاسته في رد المظالم، لا ٢٣٣.
٢ ـ الخطط ـ مقریزی(١/٧٨). و عمر بن عبدالعزیز وسیاسته في رد المظالم ٢٣٢.
٣ ـ الطبقات إبن سعد(٥/٣٨٤).

خۆ ئەم کاربەدەستەی میسر تەنها نەبوو لەم کارەیدا، کە داوای کرد لە عمر تا سەرانە بسەنێ لەوانەشی کە موسڵمان دەبن، ئەوەتا کاربەدەستەکەی کوفەیش کەناوی ـ عبدالحمیدی کوڕی عبدالرحمن ـ بوو هەمان داواکاری هەبوو، کە پێ ووت: ڕێگەمان بدە تا ئەوسەرانە زۆرەیەیی کەلە سەریانە با لێیان بسەنین لە جولەکەو گاورو مەجوسەکان ئەوانەی کە موسڵمان دەبن.

وەڵامی ڕونی عمری پێگەیشت، کە پێ ی ووت:نامەت بۆ ناردم دەربارەی جولەکەو گاورو مەجوسەکانی خەڵکی حیرە، کە گوایە سەرانەیەکی زۆریان لەسەر کەڵەکە بووە، داوام لێ دەکەیت، کە دوای موسڵمان بوننیان هەر لێیان بسەنم، (دەی گوێ بگرە) خوای تەعالا محمدﷺ ناردووە بەبانگخواز بۆ لای ئیسلام و بۆ پارە وەرگرتنی نەناردوە، هەرکەسێ لەو گەلانە موسڵمان دەبن ئیتر جگە لە زەکات سەرانەیان لەسەر نی یە، میراتەکەشی بۆ خزمەکانی دەبێت ئەگەرلەناو خۆیاندا میراتی یەکتری بەرن، ئەگەر وەرەسەیەنەبو ئەوە میراتەکەی دەخرێە (بیت المال)ەوە دابەش دەکرێت بەسەر موسڵماناندا، هەر ڕووداوێکیشی بەسەردا بێت وئەوە لە (بیت المال)ی موسڵمانان بۆی دەبژێردرێت و خوێنی دەدرێت، والسلام).[١]

هەروەك نامەیەکیشی پێ گەیشت لەلایەن ـ والی شاری بەسرەوە، کە ناوی ـ (عدی کوڕی ارطاة)بوو نووسیبوی: پاشان...خەڵکێکیی زۆر هاتونەتە نێو ئیسلامەوە بەو بۆنەیەوە داهاتمان نەماوە) عمریشرحمه الله لە وەڵامدا بۆی نوسی: لەنامەکەت تێ گەیشتم، سا وەڵڵاهی ئاواتە خوازم هەموو خەڵکی موسڵمان ببونایە تاوای لێ دەهات من و تۆ ناچار دەبوین بچین زەوی بکێڵین و ڕەنجەشانی خۆمان بخۆین).[٢]

هەروەها ئەو یاسایانەی هەڵوشاندەوە ، کە هەندێ لە والی یەکان بەتایبەت حەجاج دایهێنابوو کەنابێت مەوالی لە دێکەی خۆیان باربکەن بۆ جێ یەکی تر،عمر ڕێگەی دان بەئارەززی خۆیان بۆ تۆی باردەکەن بیکەن. ئیتر هەموو مافەکانی

---

١ ـ الخزاج لابي يوسف، لا ١٤٢.

٢ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن جوزي)، لا ٩٩،١٠٠.

خۆیان پێ درایەو دڵنیـایی و ئـارامی جارێکی تـر گەڕایـەوە بۆیـان لـە چـێژو تـامی یەکسانی و دانانیان بە هاوەڵانی نمرەیەك بەهرەمەند بوون.[١]

**د ـ لابردنی ستەم لەسەر (أهل الذمة):**

(أهل الذمة) هەموو ئەو ناموسڵمانانە دەگرێتەوە لەسەر ئاینی خۆیان دەمێنەوە، بەڵام لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامی دەژین و لەسـەردەمی (عبـدالملك) دا هـەزار دینـاری تـری لەسـەر سـەرانە کـەی خـەڵکی (قـبرص) زیـاد کـرد، کـە کاتـێ خـۆی معاویـە(ڕەزای خـوای لێ بێـت) ڕزگـاری کـردو پاشـان لەگـەڵیان ڕێـك کـەوت لەسەر(٧٠٠٠)دینار، کەساڵانە بیدەن و چاکیش بن لەگەڵ موسڵمانان و هەرەشـەیش لە دوژمنە ڕۆمانیەکان بکەن.

خەڵکی (قبرص)یش بـەردەوام بەوچەشنەیان دەکـرد تاسـەردەمی (عبـدالملك)و ئەویش هەستا بەزیاد کردنی(١٠٠٠)دینار لەسەریان واتە کـردی بـە هەشـت هـەزار و بەو شـێوەیە مایـەوە تاسـەردەمی (عمـری کـوڕی عبـدالعزیز)و ئـەویش بەیـەکجاری لەسەری هەڵگرتن.[٢]

هەروەك سەرانە زیـاد کرابـوو لەسـەری (ئـەهل الذمـة)ی عـیراق و عمـر ئەوەشـی لەســەر لابــردن لــەو ڕوانگەیــەوە ئەمــەی کــرد وەك پابەنــد بــوونی بەسیاســەتی خۆشەویست کردنی ئیسلام و لابردنی ستەم و ناعەدالەتی لەسەر نـا موسـڵمانەکانی ژێـر دەسـتی وڵاتـی ئیـسلام بـۆ ئـەوەی چـێژ لەبەختـەوەری ژیـان لـەژێر سـایەی شەریعەی ئیسلامی لێبوردەدا وەربگرن.

ئەوەی ئەمە دەسەلمێنێت ئەو نامەیەی بـوو، کـە نـاردی بـۆ کـار بەدەسـتەکەی بەسەر شاری بەسرەوە (عدی کوڕی أرطأة) پێ ی ووت: پاشان... خوای تەبارەك و تـەعالا سـەرانەی لەسـەر ئـەو کەسـانە دانـاوە، کـە ڕازی نابێـت بێتـە ناوئیـسلام و

---

١ ـ عمر بن عبدالعزيز وسياسته في رد المظالم، لا ٢٣٤.

٢ ـ فتوح البلدان، لا ١٥٩.

بەسەرکەشـی خۆیـان لـەناو کوفردادەمێنێتـەوە و خۆیـان زەرەر مەنـد دەکـەن، سەرانەیش هەڵگرە لەسەر ئەوکەسانەی ناتوانن بیدەن، و وازیان لێ بهێنە باخەریکی کشت و کاڵ بن، چونکە ئەوە زۆر رۆڵی هەیە لە چاك کردنی گوزەران موسڵمانان‌اندا و بەهێز بوونیان بەرامبەر دوژمنەکانیان.

جوان سەیر بکە وورد بەرەوە لە (أهل الذمة) و بزانـە کامیـان پـیر بـووەو تـوانی ئیشی نەماوە کاسبی بۆ ناکرێـت، تۆڵـە لـە (بیـت المـال) مووچـەی بـۆ دیـاری بکـە تاژیانی پێ بگوزەرێنێ، چونکە کەسێك لە موسـڵمانان بەندەیـەکی هـەبێت و بـچێت بەساڵدا و توانای کاری نەمێنێت لەسەریەتی بیژێنێت و خزمەتی بکات تـامردن یـان تا ڕزگاری دەکات لەبەندەیی، لە عمری کوڕی خطابەوە بیستوومە، کـە دای بـەلای پیـاوێکی پـیردا لـە (أهـل الذمـة) وە نەوەسـتاوە، بـەڵکو فـەرمانی دەردەکـرد هـاو کاریشیان بکەن. دەستی پان کردبوویـەوە بـۆ سـواڵ کـردن، عمـر پـێ ی ووت: بـێ ویـژدان بـووین لەگەڵتـدا ، کـەتا لاو بوویـت سـەرانەمان لێ سـەندوویت کەچـی لـە پیربوونتدا پشت گوێمان خستوویت! پاشان لـە خەزێنـەی موسـڵمانن مووچـەی بـۆ بڕیەوە تا بەجوانی پێ ی بژی.[١]

تەنانەت سیاسەتی عمری کوڕی عبداعزیز لـەلابردنی سـتەم و ناڕەحـەتی یـەکان لەسەر (أهل الذمة) تا نامەی نارد بۆ کاربەدەستەکەی بەسەر کوفەوە و پێ ی ووت: ورد بەرەوە و بزانە کەسێك لە (أهل الذمة) ناتوانێت زەویەکەی ئاوەدان بکاتەوە تۆ لە (بیـت المـال) کۆمـەکی بخـەرە بەردەسـتی تازەویـەکانی بخاتـەوە گـەڕ، چـونکە ئەوانمان بۆ ساڵ و دووساڵ ناوێت.[٢]

هەروەك لەپێش سەردەمی عمردا(أهل الذمة)تووشی ستەم و ناڕەوایی هاتبوون و کچەکانیان کرابوونە کەنیزەیەك لـە ناوچـەی (لیواتـە)لـە ئـەفریقیا، بـەڵام عمـر ئـەم ستەمەی لەسەر لابردن.

---

١ ـ الأموال (أبي عبيدة) لا ٧٥.

٢ ـ الأموال (أبي عبيدة).لا ٣٢٠.

(إبـی عبیـده) دەڵێـت: عمـری کـوڕی عبـدالعزیز دەربـارەی (لەواتیـە کچەکان)نووسیبووی: هەرکەسێ هەرکامیانی دەست دەکەوێت ئەوە نرخیان نی یە، بـەڵکو نرخـی ئەوەیـە، کـە نـاو سـیان حـەڵاڵ دەکـەن بـۆ خۆیان،پاشـان ووتـی: هەرکەسـێ یـەکێ لـەو کـچانەی لایـە بابـچێت و لـەباوکی بیخوازێـت و ئەگـەر ڕازی نەبوون، با بیگەڕێنێتەوە بۆ کەس و کارەکەی.

(أبو عبیـده)دەلێـت: (کـچە لەواتیـەکان) تاقمێـك بـوون لـە بەربـەری یـەکان، وا دەزانم پـەیمان نووسـرابوو لەگەڵیانـدا و هـەر ئەوانەیـشن، کـە (إبـن شـهاب) باسـی لێوەدەکات، کە عثمانی کوڕی عفان رضي الله عنه سەرانەی لەبەربەرییـەکان سـەندووە، پـاش ئەوەی ئاژاوەیەکیان دروست کرد ئیتر ئافرەتانیتـان کـرا بەکـەنیزەك، عمـریش بـەو شێوەیەی کردو نامەی نارد بۆ ئەو مەسەلەیە.[١]

عمـری کـوڕی عبـدالعزیز رحمه الله فـەرمانی دەرکـرد بـۆ والی و کاربەدەسـتەکانی تـا بەبەزەیی و نەرم نیان و بە سۆز بن لەگەڵ خەڵکیدا، نەیهێـشتووە سـزای بەسـرەیی یەکان بدرێت بۆ ئەوەیی (خـەراج) یان لێ بسەنن، کاتـێ والی یەکـەی عمـر شـاری بەسەرەوە، (عدی کوڕی ارطأة) نامەی بۆ نووسی ووتـی: کەسانێك هەن لەلای ئێمەو بەئاسانی سەرانە وخەراجەکانیان نادەن مەگەر بەوە نـەبێ کـە بیـانگرین و هەنـدی سزاو ئەشکەنجەیان بدەین.

عمریش رحمه الله وەڵامی دایەوە ووتـی: پاشان سەیرە و زۆریش سەیرە، کـە تـۆ داوای ئەوە دەکـەیت ڕێگـات بـدەم ئەشـکەنجەی خـەڵکی بـدەیت، وەك ئـەوە وابێـت مـن قەڵغانی تۆبم لە ئـاگری دۆزەخ، وا دەزانیـت ڕازی بـوونی مـن لـە تـوڕە بـوونی خـوا دەتپارێزێت، هەر کەنامەی منت پێ دەیشت هەرکەسێك بەشێوەیەکی جوان داهاتی زەویەکانی بۆ هێنایـت لێ ی وەربگـرە و ئەوەشـی ملـە جـەڕێ کـرد سـوێندی بـدە، چونکە سوێند بە خوا ئەوەباشترە کە ئـەوان بـەناپاکی یەکـەیان وەربگەڕێنـەوە بـۆ لای خوا نەك ئێمە بەسزادانی ئەوانەوە بگەڕیینەوە، والسلام.[٢]

---

١ ـ فتوح البلدان ل٢٢٦، ٢٢٧.

٢ ـ الخراج ابي یوسف، ١٢٩.

هەروەها عمر هەموو ئەو زەوی و خانو و کەنیسانەی لێیان داگیر کرابوو بۆ ی گەڕاندنەوە.[١] وەیکێ تر لەو ستەمانەی بەناڕەوا لە (أهل الذمة) کرابوون لایبرد، ئەویش ئەوە بۆ هەر موسڵمانیك هەبوو هەرکاتێ پێویستی بەکارێك هەبووو بە ئەوانی بکاتت و ژێر باریان بخات مادەم لەبەندەکانی ڕێکەوتنامەکەدانە هاتبێت.[٢] نامەی نارد بۆ کاربەدەستەکانی و پێ ی ووتن: کاری ژێر بارخستن و بەکارهێنانی (أهل الذمة) واز لێ بهێنن، چونکە دەچێتە خانەی ستەمکاری یەوە.[٣]

ئابەو جۆرە عمری کوڕی عبدالعزیز هەموو جۆرەکانی ستەمی لەسەر (أهل الذمة) هەڵگرت و بەوشێوەیە جارێکی تر دڵئارامی و دڵنیایی و سکونەتی گێڕایەوە بۆ ناو دڵەکانیان، بۆی ڕوون کردنەوە کە دەتوانن بە هەموو دڵنیایی و بێ خەمی یەکەوە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا ژیان بەسەربەن، بچوکترین ستەم و پشتگوێ خستن و بەسوك سەیرکردن نابینن، مافی خۆیان دیاری یە و ئەوەشی لە سەریانە دیاری یە لەودەستورو یاسایەدا قورئانی سوننەتی پێغەمبەرە ئازیزەکەی دایانڕشتووە.[٤]

### ٥ـ بەرپاکردنی داد پەروەری لەناو خەڵکی سەمەرقەندا:

کاتێ هەواڵی چوونە سەر حوکمی عمری کوڕی عبدالعزیز گەیشتە ووڵاتانی (ماوراء النهر) واتە: وڵاتەکانی ژێر دەستی ڕوسیا، هەموو کۆبوونەوەو بە (سلیمانی کوڕی (أبی السرّی) یان ووت: (قتیبە) ناپاکی لەگەڵدا کردووین و بەزوڵم و ناڕەوا ووڵاتی لێ داگیر کردووین، وا ئەمڕۆ خوا داد پەروەری و یەکسانی گێڕاوەتەوە ـ بەدانانی عمر ـ ڕێگامان بدە باوەفدێکمان برۆین بۆ لای ئەمیری بڕوا داران و سکاڵای

---

١ ـ عمر بن عبدالعزیز وسیاسته في رد المظالم، لا ٢٤٥.

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز(إبن الحکم)، لا ٨٣.

٤ ـ عمر بن عبدالعزیز وسیاسته في رد المظالم، لا ٢٤٨.

ستەم لێکراویمانی بخەینە بەردەست، ئەگەر مافی خۆمانیێ دەمان داتـەوە، ئێمـەش زۆر پێویستمان پێ یەتی.

سولەیمانیش ڕێگای دان و ڕۆیشتن بـۆ لای عمـر و عمـریش نامەیـەکی پێدان بـۆ سـولەیمان و تیایـدا نووسـی: خـەڵکی سـەرمەقەند، سـکاڵای ئـەوەیان بـۆ هێنـاوم کەستەمیان لێ کراوەو قتیبـه ـ سـەرکردەی سوپای ئیـسلام بـووو لـەو ناوچـانەدا ـ هەڵی کوتاوە سەریان و لە زەویەکانیان دەری پەڕاندوون، ئەگـەر ئـەم ئەگـەر ئـەم نامەیەت پێ گەیشت خێـرا باقـازی دانیـشێ و لەمەسـەلەکەیان بکۆڵێتـەوە و ئەگـەر وابووو ئەوان باسی دەکـەن ئـەوە سوپای ئیسلام لەناوچـەکەیان بکـەرەدەرەوە و بگەڕێنەوە ئەو ناوچەیەی کەپێشتر لێی بوون.

سولەیمانیش قازی یەکەی خۆی دانا بـۆ لێکۆڵینـەوە و لەئاکامـدا حـوکمی دا بـە وەی سوپای ئیسلام ناوچەکەیان چۆڵ بکەنەوە، لەو کاتەدا خەڵکی ـ زونـد ـ بەیـەك دەنـگ هاواریـان کـرد: بـەڵکو ڕازیـن بمێننـەوە لـەناو مانـدا و سـەرلەنوێ جـەنگمان ناوێت، بەو شێوەیە ڕازی بوون.

ئەهلی (الرأی) ووتیان: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئەو سەربازانەدا تێکەڵیمان کردوەو تێکەڵییان کردوین و ئەوان لە ئێمە و ئێمـەش لـەوان دڵنیاییـت، ئەگـەر دادوەریەکـە لەبەرژەوەندی ئێمە بوو ئەوە دەبێت دوبارە پێکـەوە بجەنگێنـەوەو کـێش دەڵێـت: کێ سەر دەکەوێت و خۆ ئەگەریش لەبەرژەوەندی ئێمە نەبو ئەوە ڕقو کێنـەمان بـۆ گەلەکەمان دە خولقێنین، بۆیە ڕازی بوون و وازیان لەشکاتەکەیان هێنا.[1]

ئایـا کـام یـەکێ لـە دەوڵەتـە پێـشکەوتووەکانی سـەدەی بیـست و یـەك ئـاوا لەبـەردەم هـەق و داد پەروەریـدا سـەردادەنوێنێت؟ ومافەکـە دەگێڕێتـەوە بـۆ ئـەو لایەنەی کە تێك شکاوە؟! ئایا کام حاکم و کام سەرکردە تا ئەمڕۆلە هـەموو دنیـادا ئاوا گوێ بگرێت بۆ هاواری سـتەملێکروان ئەوانـەی مافیـان زەوت کـراوە، وەك ئـەو بەدەمەوە هاتنە خێرا یەی عمری کوڕی عبدالعزیز؟

---

١ ـ تأریخ الطبري(٧/ ٤٧٢).

بەڵکوعمر ئەو پیاوە بوو، کە خۆی تەرخان کردبوو بۆپشتگیری کردنی هەق و داد و یەکسانی لە هەموو گۆشەیەکی ئەم زەویەدا، بەبێ ئەوەش شەریعەت و ئاینی خوا هێزو پێزو ماناو مەبەستەکانی خۆی وون دەکات.[١]

ئەمەش نمونەیەکی باڵایە لە داد پەروەری عمر، لەم بەسەر هاتەشدا ئەم خاڵانە تێ بێ نی دەکەین:

+ خەڵکی ئامادەییان هەیە سکاڵا پێش کەش بکەن و لە مافی خۆیان داکۆکی بکەن هەرکاتێ بزانن فەرمانڕەوایەکی داد پەروەر گوێیان بۆ دەگرێت، بڕوانە لەو ستەم لێکراوانە، کەچۆنبەدرێژای حوکمی وەلید و سولەیمان ئەو بارەیان قبوڵ کردەوە، تا پاش هاتنی خەلیفەی عادل و داد پەروەر مەسەلەکەی خۆیان خستە بەردەس دەوڵەتی ئیسلام.

+ عمری کوڕی عبدالعزیز کێشەکەی پشت گوێ نەخستن، بەڵکو بەرزی کردەوە بۆ دادگای شەرعی، ئەمەش نمونەیەکی ملکەچ کردنە بۆ ئیسلام و خۆدەربازکردنە لە ئارەزووپەرستی، خۆ دەیتوانی وەك زۆرێك لەبەرپرسەکان بکات، دەست بکات بە نامە ناردن و تیایدا هەڕەشە و گوڕەشە بکات و داوا بکات سەری ئەو تاوانبارانەم بۆ بهێنن و پاشان کۆمەڵێ سزای گونجاویان بدات بەسەردا، بەڵام عمر وانا کات، بەڵکو خۆی تەرخان کردوە بۆ لابردنی زوڵم و ستەم و بەرپاکردنی عەدل و داد یەکسانی، ئەمەش نایەتەدی تەنها بە پەیڕەوی کردنی شەرع و گەڕانەوە بۆی.

+ئەو هۆزە چاریان نەما هەر، کە نامەکەی عمری کوڕی عبدالعزیزیان پێ گەیشت و تیایدا بۆ ژیر مەند و گەورەکانیان دەرکەوت، کە لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر ئەوان خەسارۆمەندن ئیتر حوکمیان بۆ بدرێت یان دژیان بدرێت و، بەڵام گرنگ ئەوە بوو هەستیان کرد بەداد پەروەری و یەکسانی حوکمی ئیسلامی.[٢]

---

١ ـ ملامح الإنقلاب الإسلامي في خلافة عمر بن عبد العزيز، لا ٦٨.

٢ ـ التأريخ الإسلامي(١٥، ١٦/ ٦٢).

## و- بەڵگەی زۆری ناوێت بۆ گەڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان:

چونکە عمر باش دەیزانی، کەئەمیرو والی یەکانی پێش خۆی زوڵم و ستەمی تەواویان لەو خەڵکەی ژێردەستیان کردوە هەر کەسێك سکاڵا دەکات لە ئەوپەڕی ڕاستی وەیەتی، بۆیە زۆر دەکۆڵیەوەو داوای بەڵگەو شایەتی زۆری لێ نەدەکردن، بەڵکو بەکەمی بەڵگە ڕازی دەبوو، هەرکە سەیری سکاڵاکەی بکردایەو بۆی دەربکەوتایە بۆنی ڕاستگۆیی لێ دێت خێرا مافەکەی بۆ دەگێڕایەوە و زۆر ماندووی نەدەکرد لەگەڕان بە دوای بەڵگەو شایە و شتی تردا.

(إبن الحکم) باسی دەکات کە (أبو الزناد)دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز قبوڵی سکاڵای کردوە بەکەم ترین بەڵگەوە، هەرکاتێ بۆی دەربکەوتایە، کە لەڕاستی یەوە نزیکە تره کاری لەسەر دەکرد و زۆری لێ نەدەکرد بە هێنانی کۆمەڵی بەڵگەو شایەت و شتی تر، چونکە ئەیزانی هەموویان ڕاست دەکەن و چی دەربارەی ئەو والیانە بگوترایە ڕاست بوو، چونکە زوڵمی زۆریان کردبوو، تاوای لێ هات (بیت المال) عیراق هیچی تێدا نەماو تاپی بوو، لەشامەوە پارەو سامانیان بۆ هێنا و پریان کردەوە.[١]

چەند جوانە ئەوکارەی عمری کوڕی عبدالعزیز! چەند جوانە تا دەکرێت شت لەسەر خەڵکی ئاسان بکرێت! چونکە کورت کردنەوەی کات و بازایەنەدانی هەوڵەکانی تێدایە،[٢] هەر وەك چۆن لەم کارەی عمرەوە بنەمایەکی گرنگ دەردەهێنین لەبنەماکانی لێپێچینەوە لە کێشە دادوەری یە ئاسایی یەکان و لە نێوان بنەمای لێپێچینەوە لە دادوەری یە ئیدارا یەکاندا، عمری کوڕی عبدالعزیز دای هێنا، چونکە لەهەندێ حاڵاتدا هێنان بەڵگەی مەلموس و شایە وەك مەحاڵ وایە، بەڵکو ئەوندە بەسە ئەگەر زوڵمەکە زۆر ئاشکرا بوو لەلای دادوەرەکە، ئەوە حوکمی خۆی دەربکات و بەهەندێ بەڵگەی کەم.[٣]

---

١ ـ سيرة عمر بن عبد العزيزإبن الحكم لا ١٠٦ـ ١٠٧

٢ ـ فقه عمر بن عبد العزيز(٢/٥٥٨).

٣ ـ الطبقات الكبرى لابن سعد(٥/٣٤٥).

## ز- لابردنی باج - المکس -:

لەبەر ئەوەی باج سەندن ستەم و بەسوك سەیرکدرنی تێدا بوو، چونکە سەرانە و باج لە خەڵکی دەسەنرێت بەبێ بوونی هۆیەکی شەرعی، لەبەر ئەوەی کەسەکە ئەگەر مسوڵمان بێت زەکاتی لەسەرە و ئەگەر (أهل الذمة)یش بێت(جزیە)و دەیەك و داهاتی لەسەرە، بۆیە عمر بەرگری کرد لەوەی باج لەکەس بسەنرێت، هەروەك چۆن لە محمدی قەیسە وە هاتووە کە ووتویەتی: کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز هاتە سەرحوکم باجی لەسەر هەموو زەوی و زار و دوکان و خانوویەك لابرد و سەرانە - جزیە - یشی لە سەر مسوڵمان لابرد.[١]

هەروەها عمر رحمه الله نامەیەکی نارد بۆ والی بەسرەو پێ ووت: ((لەسەر خەڵکی هەڵگرە... و باج وەر گرتن، چونکە بە تەمەنم ئەوە(مکس) نی یە، بەڵکو (بخس)ە واتە سوکایەت کردنە بەخەڵکی - خوای گە ورەش دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ هەر کەسێك زەکاتی ماڵەکەیدا لێ وەربگرە و ئەوکەسەیشی نەیدا دەیدەینە دەستی خوا.[٢]

نامەیەکیشی نارد بۆ کاربەدەستەکەی لە فەلەستین کەناوی - عبدالله ی کوڕی عەوف بوو پێ ی ووت: سواری ئەسپەکەت ببە و بڕۆ بۆ ئەو خانووەی کە پێ ی دەڵێن: (المکس) واتە: باجی خانوویەرە - و بیڕ و خێنە و پاشان خۆڵ و بەرد و دارە کەیش بدە بەدەم دەریاوە با تۆزیشی نەمێنێ.[٣]

بەمەی پێشودا بۆمان دەردەکەوێت کە مەبەست لە مەکس ئەو پارەیە کە دوکانداروکان دەسەنرێت لە بازاڕدا، هەر ئەوانەش دەگرێتەوە، کە گومرگ وەردەگرن و دەیخەنە سە رئەوشت و مەك و کاڵایانەی لە دەرەوە دێنە ووڵاتە وە و لەم سەردەمەی خۆماندا و عمری کوڕی عبد العزیزیش ئەوەی بەستەم و ناڕەوا لە قەڵەم دەدا.[٤]

---

١ - نظام الحکم في الشریعة والتأریخ الاسلامي(٢/ ٥٦٥).
٢ - هەمان سەرچاوە(٥/ ٣٨٣).
٣ - سیرة عمر بن عبد العزیز لابن الجوزي لا ١١٣.
٤ - فقه عمر بن عبد العزیز د. محمد شقیر(٢/ ٥٦١).

بەڵگەیشی ئەو ئایەە پیرۆزەی قورئانە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ واتە: شت و مەکی خەڵکی کەم و بێ نرخ مەکەن و لە وڵاتیشدا خراپە و گەندەڵی بەپارمەکەن.

ئەمڕۆ حکومەتەکان لەسەر خوێن و ئێسقانی گەلەکەیان دەستەڵاتەکەی خۆیان ڕاگیر کردوە و باجیان لەسەر هەموو شتێك داناوەو کرێ لە هەموو کەس دەسەنن چ دوکان بێت یان خانوو یان هتد....هەر بە بەمەشەوە ناوەستن، بەڵکو وەك خۆیان دەبوایە لە دەرەوەی وڵاتەوە هەموو کاڵاو شمەك و پێداویستی یەکی وڵاتەکەیان بهێنایەوە بەنرخێکی هەرزان بیاندایە بەهاوڵاتیان، بەڵکو وەك ئەوش ناکەن، ئەگەر سەرمایەدارێك هەستێت بەگرێ بەست لەگەڵ کۆپانیایی وڵاتێکداو بیەوێت شت بێنێتە وڵاتەوە حوکمەت زۆر بەخێرا ئەوەندە گومرگی لەسەر دادەنێ، کە کابرایی بازرگان و سەرمایەدار ناچاردەکات، کە ئەویش نرخی شتەکان بەرزکاتەوە بیخاتە سەر هاوڵاتی هەژارو داماو.[1]

### ح ـ گەرانەوەی داگیرکراوەکان و دەرکردنی زەکات لێیان:

عمری کوڕی عبدالعزیز بڕیاری هەرچی شتێکی خەڵکی دەستی بی سەردا گیراوە خراوەتە (بیت المال) بدرێتەوە بە خاوەنەکانیان تەنها زەکاتی یەكساڵیان لێ دەربکەن.[2]

مالیك کوڕی ئەنەس لە (أیوب السجتانی)یەوە دەگێڕێتەوە، کە: عمری کوڕی عبدالعزیز هەموو داگیرکراوەکانی (بیت المال)ی گێڕایەوە بۆخاوەنەکانیان، ئەوانەی مابوونەوەو فەرمانی دەرکرد زەکاتی هەموو ساڵ کانی لێ دەربکەن، بەڵام پاشتر نامەیەکی تری بۆ ناردن و تیادا ووتی: لەمەسەلەکە زیاتر قوڵ بومەوە دەبینم مالێکی (ضمار)ە[3] تەنها زەکاتی یەك ساڵی لێ دەردەکرێت.[1]

---

١ـ ووتەی وەرگێر.

٢ـ فقه عمر بن عبد العزیز د. محمد شقیر(٢/ ٥٦٦).

٣ـ (ضمار) ئەوماڵەیە خاوەنەکەی بەتەمای نەماوە.

عەمری کوڕی مەیمون دەڵێت: والی یەك لە سەردەمی (عبدالملك)دا دەستی گرت بەسەر سامانی پیاوێکدا، کەناوی ـ أبو عائیشةـ بوو، کە بە(٢٠)هەزار مەزەندە دەکراو خستیانە (بیت المال) لەسەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزدا کوڕی ئەو پیاوە هات و سکاڵای بەرزکردەوە، عمریش نووسی بۆ مەیمون، کە ماڵەکەی بۆ بگێڕنەوەو تەنها زەکاتی ئەم ساڵی لێ دەربکەن، خۆ ئەگەر ماڵێکی(ضمار) دەبوایە نەبوایە زەکاتی هەموو ساڵەکانم لێ دیاری تایبەتی دانابوو بۆ هەرکەسێك دەبێتە دەلیلی کاری خێر، یان ڕێگرتن لە خراپەو تاوانێك، یان ئاژاوە بکات بۆ جێگایەك ستەم لێکراوێکی لێبێت و خاوەنەکەی نەوتوانێت هاواری خۆی بگەیەنێت.

بۆ ئەوبەمەستە نامەیەکی نووسی و فەرمایشتی دەرکرد، کە لەوەرزی حەج کردن و شوێنە گشتی یەکان و بۆنەو ئاهەنگەکاندا بخوێنرێتەوە، کەتیاندا هاتبو:

پاشان ... هەرکەسێك هەواڵی ستەم لێکراوێکیان پێ بگەینێت، یان هەرکارێك خێرو بەرژەوەندی تاکێك، یان کۆمەڵێکی تێدا بێت، لە نێوان ٢٠٠تا٣٠٠ سەد دیناری پێ خەلات دەکەین، بەپێ ی کارەکەی و ناڕەحەت بوونی لەو پێناوەدا، ڕەحمەتی خوا لە هەرکەسێك بە ئەرکی نازانێت ناڕەحەتی قبوڵ بکات بوە هیوایەی خوای گەورەمافێك بگرێتەوە بۆخاوەنەکەی،یان ناڕەوابیەك لەگۆڕ بنێت، یان بەرپا بکات.[٢]

چێژو خۆشی وەردەگرت لە چەرمەسەریەکانی هێنانەدی دادپەروەری و بەختەوەری بوونی خەڵکی لە ژێر سێبەریدا، لەو بارەیەوە دەڵێت: ((واللہ لوددت لو عدلت یوماً واحداً وأن الله تعالی قبضنی ))[٣] واتە: وەڵاهی ئاواتەخوازم تەنها یەك ڕۆژ داد پەروەربم ئیتر خوای تەعالا گیانی بکێشامایە.

لەماوەی زۆر کەمی خەلیفایەتی یەکەیدا داد پەروەری یەکی بێ وێنەی بەروبووم داری هێنایە کایەوە، بەلام دەروونە بەرزو بلندەکەی هەر بۆ زیاتری دەڕوانی،

١ـ الطبقات الکبری لابن سعد(٥/ ٣٤٢).

٢ـ هەمان سەرچاوە لا پەڕە ٢٢٧.

٣ـ تذهیب الأسماء واللغات(٢/٢٣).

ئەوکارانەی دەیکردن بەکەمی دەزانی و دەیووت: ئەگەر(٥٠)ساڵیش لەناوتاندا بمێنەوە هێشتا ناتوانم بەتاوەتی دادپەروەری بەرپا بکەم.[١]

تەنانەت گیانلەبەرانیش بێ بەش نەبوون لە دادپەروەری و لابردنی ناهەقی و ستەمکاری، فەرموون لەگەڵ چەند دیمەنێك لەوبارەیەوە:

+ بەکار هێنانی لەغاوی قورس و نەقیزە سەر ئاسنی* قەدغە کردبوو عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله هەمیشە ئەوەی دووپات کردەوە، کە بە ڕەحم و بەزیی بن لەگەڵ گیان لەبەراندا، هەرگیز سزاو ئەشکەنجەیان نەدەن، ئەبویوسف دەڵێت: عبداللەی کوڕی عمر دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله ئەوەی قەدەغەکردبوو، کە سەری ئەو قەمچی یانەی بەکار دەهێنرێت لەگەڵ گیانلەبەراندا ئاسنی پێوە بکرێت، قەدەغەشی کردبوو لەغاوی قورس بکرێتە دەمر وڵاخەوە.[٢]

+ وڵاخ و باری قورس لێنانیان:

هەواڵی پێگەیشت، کە کەسانێك هەن باری قورس لە وڵاخەکانیان دەنێن، کە زیاتر لە توانای خۆیان، ئەمەش لە شاری میسر ڕویدابوو، بۆیە نامەی نووسیبوو بۆ والی یەکەی و قورسترین ئاستی باری وڵاخی بە(٦٠٠) رطل دیاری کرد بۆی، داوای لێ کر ئەم بڕیارە لەناو خەڵکدا بخوێنێتەوە و جێ بەجێ ی بکات.[٣]

ئەم شتانەی پێشتر باسمان کرد نمونەیەك بوون لەهەوڵ و تێکۆشانی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەپێناو بەرپاکردنی ئەو دادو یەکسانی یەی، کە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ داوای دەکەن، دژایەتی کردنی ستەم و ناهەقی تا سەر ئێسقان و گەڕاندنەوەی ماف بۆ خاوەنەکانیان.

---

١ــ تأريخ إبن عساكر لة عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ لا ٢٢٧ وەرگێڕاوە.

* نەقیزە: ئەو دارەیە، کە وڵاخدار هەڵیدەگرێت و لەوڵاخەکانی دەدات بەسوکی لەڕێگادا بۆ ئەوەی خێرا تر بڕۆن - وەرگێڕ -

٢ــ مصنف إبن أبی شيبة(١٢/ ٣٣٢).

٣ ــ فقه عمر بن عبد العزيز د. محمد شقير(٢/ ٥٧٥)

### ٥ـــ یەكسانی:

خوای تەعالا دەفـەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾الحجـرات: ١٣، واتـە: ئـەی خەڵكینـە ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێ یەك دروست كردوە، پاشـان كردومـانن بەكۆمەڵـە گـەل و هۆزێك بۆ زیاتر یەكتر ناسین، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خـوا ئـەو كەسـانەن زیـاتر تەقواو لەخوا ترسانیان هەیە.

پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرموویەتی: ((أیها الناس، ألا أن ربكم واحد، وأن أباكم واحد، ألا لافضل لعربی علی أعجمي، و لاعجمی علی عربـی، و لا أحمـر علـی أسـود، ولا أسود علی أحمر إلاّ بالتقوی)) واتە: ئەی خەڵكینە، پەروەردگارتان یەكە، لە یەك باوكیشن، كەواتە هیچ عرەبێك لە عەجەمی زیاتر و هـیچ عەجـەمێكیش لـە عـەرەبی زیـاتر نـین، پێـست سـورەكانیش هیـچیان لـە ڕش پێـست زیـاتر نـی یـە، ڕەش پێستەكانیش هیچیان لە سـورەكان زیـاتر نـین، مەگـەر بـە تـەقواو لـە خـوا ترسـان نەبێت.

عمری كوڕی عبدالعزیزرحمه الله لە دەوڵەتەكەیدا ئەم بنەما ئیسلامی یە مەزنـەی جـێ بەجێ كردوە، یەكـەمین هـەنگاوێك نـای بـۆ جـێ بـەجێ كردنـی ئـەم بنەمایـە، ئـەو سوێندە بوو، كە خـواردی ووتـی: وەڵاهـی دەبێـت خـۆم و خـەڵكی لـە یـەك ئاسـتی بژێویدا بژین.[١]

لەو بارەیەوە دەڵێت: یان وەڵاهی ئاواتە خوازم لە منەوە و لە نزیكەكانی منـەوە دەست پێ بكەن، كە من لەوانم، تاوامان لێ دێت ژیـانی ئێمـەو ئێـوە وەك یـەكی لێ بێت، بەڵام وەڵاهی ئەگەر لەمە زیـاتر مەبەسـتێكم هەبوایـە زمـانێكی پـاراوم هەیـەو بەهۆكارەكانیشی زۆر شارەزام.[٢] هیچ كەسێك لـە ئێـوە پێویـستی یـەكی خـۆیم پـێ

١ـــ النموذج الإداری المستخلص لا ٢٩٧.

٢ـــ سیرة عمر بن عبدالعزیز(إبن الحكم)، لا ٨٣.

ناگەینێت، من لە خۆی زیاتر پێم خۆش نەبێت ئەو پێداویستی یەی بۆ تەواو بکەم بەپێ ی توانام.[١]

عمر رحمه الله یاسای یەکسانی لەناو خەڵکدا جێ بەجێ کرد، چ لە بواری مافەکاندا، یان لە هەرگۆشەو لایەنێکی ژیاندا، لە دابەش کردنی پۆستەکان و دیاری کردنی بەرپرساندا هیچ جیاوازی یەکی نەکردوە لە نێوان یەکێك و یەکێکی تردا، هەرگیز شتێکی بە یەکێك نەداوە، کە مافی خۆی نەبوبێت.

هەستا بەیەکسان کردنەوەی ئەمیرو ئەشرافی بەنی ئومەیی یە، لەگەڵ خەڵکەکەی ترداو هەمو بەخشش و ماڵە تایبەت یەکانی لێ سەندنەوەو مووچەکەی کردنەوە بە ئەندازەی موچەی خەڵکی و کاتێ لەو بارەیە قسەیان لەگەڵدا کرد، ئەویش لە وەڵامدا ووتی: پارەی خۆم بەشی هەمووتان ناکات، پارەی - بیت المال - یش تەنها مافی ئێوە نی یەو ئێوەش وەك هەموو موسڵمانێکی تر مافتان هەیە تیایدا وەك مافی دوورترین کەس.

سیاسەتی دارایی عمر لەسەر بنەمای یەکسانی دامەزرابوو، ئەوە خەزێنەی موسڵمانە و موڵکی گشتی یە، بۆ هەر یەکە وەك خەڵکانی تر دەستی بۆ بەرێت، تایبەت نی یە بە لایەنێکی دیاری کراوی ناو خەڵکی.

لەو کارانەی، کە دەیویست بنەمای یەکسانی جێ بەجێ بکات تیاندا، ئەوەبو کاتێ بینی، کە ئەمیرەکانی بەنی ئومەیە خاوەنی زەوی و زارێکی زۆر بوون، هەموویشی قەدەغەی خۆیان بوو، هەموو موسڵمانانی لێ بێ بەش بوو.

عمر ووتی: زەوی قدەغەکراو حەڵاڵی هەموو موسڵمانانە... سەرکردەش وەك هەموو موسڵمانێکی تر وایە، خوا باران بۆ هەموو بەندەکانی دەبارێنێت، هەموویاندا تیایدا یەکسانن.[٢]

١ــ تأريخ الطبرى لة النموذج الإدارى لا ٢٩٧ وەرگیراوە.
٢ ــ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن الحكم)، لا ٨٣.

هەروەك یەکسانی خستە نێوان موسڵمانان و ئەو جولەکەوگاورانەی موسڵمان دەبوون لە ئەهلی جزیە، ئەو ساردو سرپەی نێوان هەردوو شکاند... ووتی: هەر جولەکەیەك، یان گاوریان، یان مەجوسی یەك موسڵمان ببێت و ئاوێتەی موسڵمانان بێت لە هۆزەکەی خۆی بپچڕێت ئەوە دەبێت تێکەڵی بکەن و دڵنەوایی بکەن.[1]

(إبن سعد) دەگێرتەوە دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیزﷺ عەرب و مەوالی بەیەك چاو سەیر دەکرد لە ڕۆزی و موچەو بەخششین دا، بەڵام تەنها(٢٥) دیناری بڕیبویەوە وەك موچە بۆ مەوالی یەکان.[2]

لە بواری یەکسانی موسڵمانان لە بەردەم دادگاو حوکمی شەرعدا بە شێوەیەکی گشتی، لەم بوارەشدا ئەو بەڵگەمان بەسە، کە موسڵمانێك دێت وبێ ترس لەبەردەم ئەمیری باوەڕداراندا شکات لە عبدالعزیزی باوکی دەکات، دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ــ عبدالعزیز ــ مەبەستی باوکی عمر ــ کاتی خۆی زەویەکی لەمن سەندوە بە زۆرم و ستەم! عمریش بەبێ هەڵچون و تورەبوون، زۆر لەسەرخۆ بە ڕویەکی خۆشەوە پێ ی ووت: ئەزانم شەریکم هەیە لەوێ، ئەم قازی یە لەنێوان بێت، عمر چوو بۆ لای دادوەرەکە، ئەویش حوکمی کرد لەدژی عمر، عمریش پێ ی ووت: دەی مەسروفی زۆرمان تێدا کردوە، قازیش وتی: دەی سودی لێ وەرگرتووە لە باتیدا ئەمە لە باتی ئەو، عمریش وتی: بەدادوەرەکەی ئەگەر ئابەم شێوەیە حوکمت دەنەرکردایە هەرگیز نەمدەهێشت لە حوکمەتەکەمدا کاری داد وەری بکەیت، فەرمانی دەرکرد زەویکە بگەرێنێتەوە بۆ کابرای میسری.[3]

عمری کوڕی عبدالعزیزﷺ زۆر سەنگی دادەنا بۆ بنەمای یەکسانی لە نێوان موسڵماندا، تەنانەت لە مەسەلە گشتی یەکانیشدا، لەوانە فەرمانی دەرکرد، کە هیچ کەس تایبەت نەکرێت لە نزاو دەعای خێرداو باقی موسڵمانانی لێ بێ بەش بێت، بۆ ئەو مەبەستە نامەی نووسی بۆ ئەمیر جەزیر و پێ ی ووت: بیستومانە کۆمەڵێ لە

---

١ــ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن الحکم)، لا ٧٩.

٢ــ الطبقات(٥/ ٢٧٥).

٣ــ عمر بن عبدالعزیز وسیاسته فی رد المظام. لا ٢٩٨.

چیرۆك خوانەکان لەپێش چیرۆکەکانەوە هەندێ صلوات دەنێرن بۆ ئەمیرەکانیان، لەگەڵ صلاوات دانیان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەگەر نامەی منت پێ گەیشت، فەرمان بدە بە چیرۆك خوانەکان، کە لەسەرەتاوە صلاواتێکی تایبەت لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن و، پاشان دوعای خێر بۆ سەر جەم موسڵمانەکان بکەن و کەسی لێ بەش نەکەن، واز لە شتی تر بهێنن.[١]

لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە تاچ کاتێك عمر لە خەمی ئەوەدا بووە جیاوازی کۆمەلاتی نەمێنێت و خەڵکی یەکسان بن و کەس لەکەس زیاتر نەبێت، تەنانەت ناهێڵێ دووعاشمان بۆ کەسانێکی تایبەتی بکرێت و باقی ئوممەتی ئیسلامی بێ بەش بکرێت، چونکە موسڵمانان هەموو وەك یەك پێویستیان بە دوعایە وە کۆمەکی پەروردگارە، خوای تەبارەك وە تەعالاش دەوڵەمەندە بەشی هەمووی دەدات.[٢]

ئەوە پرۆگرامی یەکسانی یەی، کە دروشمەکەی هەڵگرتبوو، تەنهای دروشم نەبوو، وەك لە پێڕەوی ناخۆی حیزب و لایەنە دونیانی یەکاندا دەنوسرێت بەبێ ناوەرۆك و کردەوە.

عمر رحمه الله هەر لە خۆیدا جێ بەجێ ی کرد، بۆ نموونە جارێکیان لە شاری مەدینە پیاوێك جنوێی دابە عمرو عمریش بەجۆرێ هەڵس وکەوتی لەگەڵ کرد ئەوەی جنێو بەکسێکی ئاسایی درابێت، دەگێرنەوە پیاوێك لە شاری مەدینە حوکمێکی بەسەردا دراوە، دیاربوو ـ بۆیە کاتێ والی شاری مەدینە (ئەبوبەکری کوڕی محمد)بوو بەر نوێژی بۆ کردن ـ ئەم پیاوە شمێشرەکەی هەڵکێشاو نوێژەکەی بە خەڵکەکە بڕی، ئەبو بەکریش نامەی نارد بۆ عمر و هەواڵەکەی بۆباس کرد، ئەویش لەو بارەیەوە نامەیەکی نوسی بۆ ئەبو بەکر، ئەویش بە دەنگی بەرز نامەکەی عمری خوێندەوە، پیاوەکەش زۆر تورەبوو جنێوێکە دا بە ئەمیری باوەڕداران و نامەکەی و ئەوەشی نامەکەی هێناوە، ئەبو بەکریش لە سەرەتاوە نیازی کرد بدات لە ملی و بیکوژێت،

---

١ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز ابن الجوزی ل٢٧٢.

٢ـ النموذج الإداری المستخلص من إدارة عمر. ل ٢٩٩،

بەڵام خۆی گرت و هیچی نەکردو بەندکردنی ڕازی بوو، بۆیە نامەی نارد بۆ عمر و لەو هەواڵە تێ گەیاند و عمریش نامەی بۆ نوسی و تیادا ووتی: ئەگەر ئەو پیاوەت بکوشتایە منیش تۆم دەکوشتەوە لە باتی ئەودا، ئەی نازانی کەس ناکوژێت بەتاوانی جنێودان بەخەڵکی جگە لە پێغەمبەری خواﷺ، کاتێ ئەم نامەیەم دەگاتە لات بیخەرە بەندی خانەوە، موسڵمانان لە خراپەی بپارێزە، لەهەموو دەرکەوتنی هیلالێکدا واتە(١٥) ڕۆژ جارێك ـ دوای تەوبەو پەشیمانی لێ بکە، ئەگەر پەشیمانی دەربڕی ئازادی بکە.[١]

عمرﷺ هەربەو خۆیەوە نەوستا لە جێ بەجێ کردنی بنەمای یەکسانی و جیاوازی دروست نەکردن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، بەڵکو فەرمانیشی دەرکرد بۆ والی و کار بەدەستەکانی لەو بارەیەوە ئامۆژگاری کردن، نمونەی ئەوە ئەو نامەیە، کە ناردی بۆ والی مەدینە و تیایدا پێ ی وت: بڕۆرە ناو خەڵکی و تێکەڵیان بکە و لە کۆڕو کۆبونەوەکنیاندا دانیشە و قسەی خۆشیان لەگەڵدا بکە، هەرگیز یەکێکت لە لا خۆشەویست ترو لە پێشتر نەبێت لە کەسانی تر، کەس نەڵێت فلان لە خانەوادەی ئەمیری باوەڕدارانە، چونکە ئەمڕۆ لە بەرنامەی مندا خانەوادەی ئەمیری بڕوا داران و کەسانی تر وەك یەك وان، بەڵکو گومانی ئەوەش دەبەم ئەگەر بەرەبەرەکانیمان لەگەڵدا بکرێت کەسانی تر هەن لە پێش ئێمەوەن.[٢]

ئەمەبوو هەندێ لەو هەڵوێستانەی عمر، هەر چەندە جیا جیان، بەڵام بە هەموویانەوە ئەو مانایە دەبەخشن، کە عمر زۆر خەمی ئەوەی بووە بنەمای یەکسانی جێ بەجێ بکات لە دەوڵەتەکەیدا.[٣]

---

١ــ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن الحكم)، لا ١٤٢.

٢ـ الطبقات (٥/٢٤٢) النموذج الإداري لا ٢٠١

٣ــ النموذج الإداري لا ٢٠١

## ٦ـ سەربەستی یەکان لە دەڵەتی عمری کوڕی عبدالعزیزدا:

بنەمای ئازادی و سەربەستی لەوبنەماسەرکی یانە بوو، کە دەوڵەتەکەی عمری لە سەر دامەزرابوو، ئەم بنەمایەش واتە دابین کردنی سەربەستی بۆ خەڵکی بەگشتی لە چوار چێوەی شەریعەتی ئیسلامیدا، کە هیچ دژایەتی یەك نە بێت لە نێوانیاندا، عمر گرنگی داوە بە هەموو شێوەکانی سەربەستی مرۆڤایەتی و لەو شێوە جیاجیانەدا، ئەوانەی جێگیر کرد، کە لەگەڵ ڕێنمونی یەکانی ئیسلامدا یەکیان گرتەوە، ئەوەشی لەگەڵ ئیسلامدا یەکی نەگرتایەتەوە ئەوەی دەهێنایەوە سەر شێوازی سروشتی خۆی لەگەڵ ڕێمنونی ئیسلامدا دەی گونجاند، فەرموون لەگەڵ هەندێ لەو سەبەرستیانەی عمری کوڕی عبدالعزیز بە خشیبوی بە کۆمەڵگە:

أـ ئازادی فکری و ڕادەربڕین:

عمر رحمه الله زۆر سوربووە لە سەر ئەوەی بنەمای ئازادی بیرو باوەڕ لەناو کۆمەڵگەد بچەسپێنێت، سیاسەتیشی بەرامبەر گاور وجولەکە بریتی بوو لە بەڵێن بردنەسەر بەوەفایی و پابەند بوون بە ڕێکەوتنامە و بەرپاکردنی داد پەروەری لە گەڵیاندا، هەڵگرتنی ستەم لەسەریان تەنگاو نەکردنیان لە بواری بیروباوەڕ و ئاینانەوە، ئەمەش لە ژێر ڕۆشنایی ووتەی خوای گەورە، کە دەفەرموێت:﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ واتە: لە هەڵبژاردنی ئایندا زۆر کاری نی یە.

عمر رحمه الله شێوازی قسەی خێرو بانگەوازی دەگرتە بەر لە گەڵ پادشاکانی هیندستان و ئەو هۆزانەی، کە موسڵمان نەبوون، یان لە ئیسلام دەرچوو بوون، لەمەو لایش بەدرێژی (إن شاء الله)لەسەر ئەمە دەدوێین.

عمر هەرگیز رۆژێ لە ڕۆژان زۆری نەکردوە لە گاورەکان، تا موسڵمان بن.

لایەنی سەربەستی فیکری لە سەربەستی ڕادەبڕین داخۆی دەبینێتەوە پانتایەکی گەورەی دەوڵەتەکەی عمری گرتبویەوە، تەنانەت لە گەڵ والی و کار بەدەستەکانیشدا ڕەخساندبووی، بەجۆرێ، کەبواری ڕەخساندبوو بۆ هەموو ستەم لێکراوێك، کە شکات و سکاڵای خۆی بکات بەبێ ترس و بەوپەڕی ئازادی و سەر

بەستی یەوە وازی هێنابوو لە خەڵکی، کە چی دەڵێن بیلێن، قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبو بەکری صدیق ﷺ ڕاستی ئەمەی دەربڕی و ووتی: ئەمڕۆ دێنە گۆ هەموو ئەوانەی پێشتر نەدەهاتنە گۆ[1] ئەگەر پێچەوانەی شەرع نەبن.

ب - سەربەستی سیاسی: عمر ﷺ ئەو سەربەستی سیاسی یەی ئیسلام فەراهەمی هێناوە بۆ موسڵمانان بەر جەستەی کرد لە دوڵە تەکەیدا، کە ئەو بنەمایەش دەڵێت: نابێت گوڕێرایەڵی کەس بکەیت لە هەرشتێکدا، کە سەرپێچی خوای تێدا بێت، ئیتر با ئەو کەسە ئەمیر بێت، یان والی، یان هەر بەر پرسێکی تر، عمر هەر لە یەکەمین ڕۆژی خەلافەتی یەوە ئەوەی ڕاگەیاند کە سەر بەستی فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە دەداتە هەموو دانەیەکی کۆمەڵگەی ئیسلامی و دژیایەتی واقعی ستەمکار بکەن، ئیسلام ڕازی نابێت بەبێ دەنگی بەرامبەر زوڵم و ستەم.

ڕۆژێکیان وتارێکی دا وتی: بێ وەیی بۆ کەس نی یە لە سەر پێچی کردنی سوننەتدا، گوێ ڕایەڵیش بۆ کەس نی یە لە سەرپیچی کردنی پەروەردگاردا، ئێوە بەوکەسەی لە دەستی زوڵم و ستەمی ئەمیرەکەی هەڵدێت پێ ی دەڵێن: یاخی، بەڵام خۆی لەڕاستیدا باسی سەرەکی ئیمامە ستەمکارەکەیەتی.[2]

گەورەترین بەڵگە لەسەر ئەوەی عمری کوڕی عبدالعزیزدا سەربەستی سیاسی تەواوی دابوو بەگەلی موسڵمان ئەوەبو، کە بەراستەو خۆ پاش هەڵبژاردنی بە خەلیفە، رووی کردە جەماوەرە موسڵمانەکەو پێ ی وتن: من لە خلافەت واز دەهێنم و سەربەستی دەدەم بە ئێوە بە ئارەزووی خۆتان کەسێکی گونجاو بکەن بە ئەمیری خۆتان.

---

١ـ الطبقات لإبن سعد(٥/ ٢٤٤).
٢ـ سيرة عمر لابن الجوزي لا٠ ٢٤

سەربەستی سیاسی لە دوو خاڵدا خۆی دەبینێتەوە:

١ــ هاوەبەشی کردنی خەڵکی لە هەڵبژاردنی سەرۆکداو ئەوەش لە ڕێگەی ئەهلی(حەل و عەقد) و بەیعەت دانی موسڵمانان و ڕەزامەندیان.

٢ـ دەربڕینی بۆچون و ئامۆژگاری بۆ بەر پرس و فەرمان ڕەواکان، ڕەخنەگرتن لە کارەکانیان و ئیدانەکردنیان بە پێوەری ئیسلام[١] عمر ئازادی سیاسی لەم دوو بوارەدا کار پێ دەکرد و سەربەستی دایە دەستیان لە هەلبژاردنی خەلیفەدا پێش قسەی خێرو ئامۆرژی.[٢]

ج ـ ئازادی تاکەکەسی (الحرية الشخسية): عمر رحمه الله زۆر هەوڵی دەدا تا ئازادی بگەڕێتەوە بۆ هەموو تاکە تاکەیەکی کۆمەڵگەی ئیسلامی، دەیبینی کۆسپ دروست کراوە لە ڕێگەی ئازادی کۆچکردندا، کە ئەمڕۆ پێ ی دەڵێن: (سەربەستی هاتوچۆ)، ئەویش کۆمەڵێ ڕێ و شوێنی گرتەبەر بۆ ئازادکردنی هەرکەسێك، کە بیەوێت بۆ هەرکوێ بگوازێتەوە.

لەوبارەیەوە دەڵێت: دەربارەی کۆچ کردن ئێمە سەربەیتی تەواو دەین بە هەرکەسێك و بۆ هەرکوێ دە چێت و بۆ دەشتەکەیەکیش هەیە، کە مەڕو ماڵات بفرۆشێت و بڕاتە شار، دەتوانێت لە لادێ یەوەکەوە کۆچ بکات بۆ جیهاد و کوشکتاری دوژمنانمان، هەرکەسێکیش وابکات ئەوە چاوی لە کۆچەریان کردەوەو پاداشت و دەستکەوتی ئەوانی بۆ هەیە.[٣]

هەروەك لە یەکێ لە نامەکانیدا، کە بۆ کار بەدەستێکی خۆی ناردبوو، ووتی: دەرگای کۆچ کردن بکەرەوە بۆ ئەهلی ئیسلام.[٤]

تەنانەت لە شتانێکیشدا ڕەچاوی ئازادی کردووە، کە کەم کەس هەیە بیری لێ

---

١ــ النموذج الإداری المستخلص من إدارة عمر. لا ٢١٢

٢ــ هەمان سەرچاوە.

٣ــ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن الحکم)، لا ٧٩

٤ـ هەمان سەرچاوە لا ١٨٨

دەكەنەوەو گرنگی پێ دەدەن، ئەویش دووشتە:

١ـ خێزانەكەی، هاورێكەی تەمەنی ـ فاطمەی كچی عبدالملك ـ ئەو كچە پاشا بەناز پەروەردەیە، بواری ئازادی و سەربەستی بۆ دەرەخسێنێت هەر لە یەكەمین رۆژی دەست بەكار بوونی یەوە پێ ی دەڵێت: فاطمە، یان لایەنی من هەڵبژێرە ـ چۆنم دەوێت وابژین بۆ خوا ـ یان ئازاد بەو خۆت سەربەستی لەلای من دەمێنیەوە، یان لێم جیا دەبیتەوە، چونكە دەیزانی ژیانی تێك دەچێت، بە ووتەی دنیای یەكان ژیانی یەك پارچە دەبێتە دۆزەخ! ئەویش لایەنی عمری هەبژارد و پاداشتی رۆژی قیانی ویست، لەم كارەشیدا چاوی لە مامۆستای مرۆڤایەتی كرد ـ محمد مصطفی ﷺ ـ، كە هەموو خێزانەكانی سەرست كرد لە نێوان هەبژاردنی دنیاو خۆشیەكانی، یان رەزامەندی خواو رۆژی قیامەت و هەموویان قیامەتیان هەڵبژارد و داوای جیابوونەوەو ـ طلاقیان ـ نەكرد.[1]

٢ـ هەرچی جاری یەی هەبوو، كە عادەتی خەلیفەكانی پێشوو بوو هەریەكەیان كۆمەڵێ جاریەو خزمەتكاری كچیان هەبوو، ـ لەگەڵیان كۆدەبوونەوەو چێژیان لێ وەردەگرن ـ بەڵام عمری كوری عبدالعزیز رحمه الله هێنانی داینان و سەرپشكی كردن لەمانەوە، یان ئازاد بن برۆن بەئارەزوی خۆتان بژین و خۆیان بە تاواوی سەر بەست بن و ئەمیش لەكەنیزەكی ئازادیان دەكات.[2]

(إبن عبدالحكم) دەگێرێتەوە: عمری كوری عبدالعزیز رحمه الله جاریەكانی خۆی كۆكردەوەو ئازادی پێدان لەوەی دەمێننەوە، یان دەرۆن، چونكە كارێكی گەورەم بۆ هاتۆتە پێش ـ كە خەلافەتە ـ ئەترسم نەتوانم مەیلتان پێ بدەم ئەوانەتان بە ئازادبوون رازی دەبن ئازادی دەكەم، ئەوەشتان دەمێنتەوە بەتەمای هیچ نەبێت لێم، ئەوانیش دەستیان كرد بەگریان و بێ هیوا بوون لێی.[3]

---

١ـ ووتەی وەرگێر.

٢ـ النموذج الإداری المستخلص من إدارة عمر. لا ٢١٠

٣ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن الحكم) لا ١٢١

ح ـ ئازادی بازرگانی و کاسبی کردن:

وەك باسێك لە سەربەستی ئابووری و ئازادی بازرگانی کردن و بەکار هێنانی خەڵکی سەرمایەکانیان لەهەر پرۆژەیەکی قازانج داردا سەربەستن و بابگەڕێن بەناو زەویداو لەخێرو فەزڵی خوا بەهرەمەندترین و چ لەووشکانی،یان چ لە دەریا.

لە نامەیەکدا، کە بۆ کاربەدەستانی خۆی ناردبوو ئەم ئازادی و سەربەستی یە ئابوری یەی بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵگە سەلماند، پێ ی ووتن ڕێگر مەبن لە بەردەم سەرمایەدار و دەوڵەمەندو کاسبکاراند، کە هەوڵی قازانج دەست مایەی زیاتر بدات، نووسی بۆ یەکێ لە والی یەکان پێ ی ووت: (لە گوێ ڕایەڵی کردنی پەروەردگار ئەوەیە، کە هەموو خەڵکی بانگ بکەن بۆ لای موسڵمان بوون ... ڕێگری کەس نەکەن لە خستنە گەڕی پارەوە سامانیان لە بازرگانیدا چ لە دەریادا، یان لە ووشکانی، نە بەرگریان لێ بکەن، نە دوشیان بخەن لە کارەکەیان.[١]

هەروەها نوسی: دەریایش وا دەبینم هەروەك ووشکانی یە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ الجاثية:١٢، هەرکەسێك دەیەوێت لە ڕێگای دەریاوە بازرگانی بکات ڕێگای بدە، وا نازانم بۆمان هەبێت ببینە ڕێگر لە نێوان خەڵکی و دەریادا، چونکە ووشکانی و دەریایی بەخشتی خوایە بۆ مرۆڤەکانی فەراهەم هێناوە تاسود مەند بن لە خێر و بێری، دەی ئیر چۆن بۆمان هەیە ڕێگربین لە نێوان بەندەکانی خواو بژێوی ژیانیان.[٢]

لە جێ یەکی تر دەڵێت: پردی زۆر لێ بدە تا خەڵکی لێ ی بپەڕنەوەو بەبێ ئەوەیمەسروفەکەیشی بخەیتە سەرکەس، چونکە کاربەدەستە گەندەڵەکان زۆر نایاسیان کردوە، کە کەسیش پێ ی نەووتوون کاری وابکەن.[٣]

لە لایەك سنوردار کردنی سەربەستی بازرگانەکان و دانانی نرخ لەسەر

---

١ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن الحكم) لا ٩٤.

٢ـ هەمان سەرچاوەلا ٩٨.

٣ـ الإدارة الإسلامية عمر كرد لا ١٠٥.

شمەکانیان لە سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله دەستکاری نرخی نەکرد، أبو یوسف دەڵێت: عبدالرحمنی کوڕی شەوبان لە باوکی یەوە بۆی گێڕاینەوە، کە ووتی: وتم بە عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله ئەی ئەمیری باوەڕداران نازانم هۆی چی یە وا نرخی کاڵاکان لە سەردەمی تۆدا بەرزبۆتەوە کەچی لەسەردەمەکانی پێش تۆدا هەرزانتر بووە ؟عمریش ووتی: دەی فەرمانڕەواکانی پێش من(ئەهلی ذمة)یان بەکار دەهێنا زیاتر لە توانای خۆیان، ناچاریان دەکردن هەرچی شتیان هەیە بخەنە بازارو بیفرۆشن، بەڵام من زۆر لە کەس ناکەم لە توانای خۆی زیاترم ناوێ لێ ی، خەڵکی چۆن دەیانەوێت، با بەو جۆرە شتەکانی بفرۆشێت، منیش پێم ووت: ئەی چۆنە نرخی شمەك و کاڵاکان دیاری بکەیت، عمریش ووتی: ئەوکارە مافی ئێمە نی یە و پەروەدگار نرخ دادەنێت وبەس.[1]

ئەم سیاسەتە ئابوریەی عمری کوڕی عبدالعزیز بەرهەمی هەبوو، چ گەڕاندنەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان، چ سەربەست کردنی خەڵکی بۆ بازرگانی و کاسبی ڕێك و پێك، بە جۆرێ هەلی کارکردن و بەرهەم هێنانی ڕەخساندبوو بۆ هەموویان، هەموو ئاستەم و بەربەستەکانی لە بەردەمدا لابردبوون، ئەمەش ئاسایی یە، کە جموجوڵی بازرگانی دروست دەکات و سەرمایەی خەڵکی بەرەو زیاد بوون دەڕوات و دواتریش زەکاتی زیاتر دەترێت بە(بیت المال) ئەمەش وا دەکات چینە هەژارەکان ببوژێنێتەوە، کەمێ هەست بە خۆشی ژیان بکەن و بتوانن شتەکان بکڕن، بەم کارەش بازرگانەکان کاڵاکانیان لە فرۆشتن و کڕینی بەردەوامدا دەبێ، ئەمش وادەکات بازرگان زیاتر شمەك بهێنێ و جوڵەی بازرگانی زیاد بکات و دواتر ئابووری وڵات بەرەو بووژانەوە بڕوات و ژیانی خەڵکی خۆش ببێت.[2]

---

١ـ سيرة إبن الحكم لا ١٠٢

٢ـ السياسة الإقتصادية والمالية لعمر بن عبدالعزيز لا٤٨.

# بەشی دووەم

# گرنگترین سیفاتەکانی عمر و مەشخەڵە نوێ گەریەکەی

## یەکەم: گرنگترین ڕەوشتەکانی

کەسایەتی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بریتی یە لە کەسایەتی سەرکردەیەکی سەرنج ڕاکێش، خاوەنی کۆمەڵێك سیفاتی ڕەبانی بووە، لەو سیفاتانە:

باوەڕی بتەو و دامەزراوی بە خوای پەروەردگار و گەورەیەکەی هەبووە، باوەڕی بە پاشە ڕۆژو گەڕانەوە بۆ قیامەت، ترسانی لە خوای گەورە، بونی زانستێکی دەوڵەمەند، متمانەی تەواوی بە خوا، سەرمەشقی، ڕاستگۆی، لێ هاتووی، ئازایەتی، پیاوەتی، دونیا نەویستی، خولیای قوربانی دان، نەرم و نیانی، گوێگرتن بۆ ئامۆژگاری، لەسەر خۆی، ئارامی و ورە بەرزی، لێزان، ئیرادەیەکی بەهێز، دادپەروەری، بەتوانا لەچارسەرکردنی کێشەکاندا، توانای نەخشەدانان و ئاراستەکردن وڕێکخستن و چاودێری کردن، کۆمەڵێ سیفاتی تریش.

بە هۆی ئەو کۆمەڵە ڕەوشتە خوایانەی، کە پەروەردگار پێ ی بەخشی بوو توانی هەستێت بە بەرپاکردنی پرۆژە مەزنە چاکسازی یەکەی و نوێ کردنەوەی زۆرێك لە ئاسەوارەکانی سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان، کە بەهۆی هاتنی کۆمەڵێ پاشای کورسی دۆستەوە لە ناو چووبوون و لە بیرکرابوون، توانی زاڵبێت بەسەر هەموو گرێ و کۆسپەکانی ڕێگادا، هەوڵ بێ وێنەکەی بەرەوبومی خۆی بەخشی چ لە ئاستی تاك، یان کۆمەڵگەیان، یان دەوڵەت.

تاوای هات ئەم بەرنامە چاکسازی و نوێ خوازیەکەی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لە سەردەمی خۆیدا بوو بەمەشخەڵێك و نەوەکانی دوای خۆی لە کاری سەر لە نوێ هێنانەوەی ئیسلامدا چاویان لێ کرد، ئەوەتا نورالدین الزنگی لەسەر هەمان

هەنگاوەکانی عمر کاری خۆی دەکرد و توانی سەرکەوتنێکی مەزن بۆ ئومەتی ئیسلامی دەستەبەر بکات بەسەر گاورە داخ لە دڵەکاندا، ئەمەش دوای خوا دەگەڕێتەوە بۆ مامۆستا لێ هاتووەکەی، کە ناوی(الشیخ أبی حفض عمر محمد الخضر) بوو لە ساڵی ٥٧٠ی کۆچیدا گیانی بەخوای خۆی سپارد، کە هەستا بە نووسینی ژیانی عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه‌الله وناردی بۆ(نورالدین الزنگی) و داوای لێ کرد هەنگاو بە هەنگاو بە شوێن پێدکانی ئەو دابڕواتەوە لە کاری بانگەواز و جیهادا.

## گرنگترین سیفەتەکانی عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه‌الله ئەمانەبوون:

### ١ـ زۆر زۆر لە خوای گەورە ترساوە:

گەورەترین پاڵنەرێك، کە پاڵی پێوە دەنا بۆ ئەو ڕەوشتە مەزنە، ئەو باوەڕە پتەوەی بوو بە ڕۆژی دوای و ترسانی لە خواو شەیدایی بەهەشت، ئەگەر ئەم باوەڕ پتەوەیشی نەبوایە، کە عمری کوڕی عبدالعزی پێ ناسرابوو، هەرگیز نەیدەتوانی ئابەو جۆرەو لاوێکی وەك عمر، کە هەموو شتێکی لەبەر دەست دابوو لە دەسەڵات و سەربەستی و پلەو پایە و سامانی زۆر بێ ئەندازە، شەیتانیش بەو هەموو وەسوەسەو فێڵبازیەوەیەوەو نەفسی بەدکاریش بە هاندانەکانی یەوە بۆ خراپە ــ ئا بەو جۆرە بەوردی لێپرسینەوە لەگەڵ دەروونی خۆیدا بکات و ڕاوەستێت لە سەر ڕێگای ڕاست.[1]

زۆر شەیداو تینووی بەهەشت بوو، دونیای پشت گوێ خستبوو لە پێناو قیامەتدا، باوەڕی تەواوی هەبوو بەو وتە خوای عزوجل، کە دەفەرمووێت:﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ﴾غافر: ٣٩) واتە: ئەی هۆزەکەم ئەم ژیانەی دنیا خۆشی یەکی کاتی و قیامەت ژیانی حەوانەوەهەتا هەتایی یە.

١ـ رجال الفكر الندوی و لە النموذج الإداری - وەرگێڕاوە ـ ل٤٠١.

عمر رَحِمَهُ اللَّهُ بەسروشتە پاکەکەی خۆی و بیروباوەڕە خاوێنەکە یەوە هەستی بەوە کردبوو، کە دوارۆژی موسڵمان گرنگە مرۆڤ لە پێش چاوی بگرێت و لە دونیا زیاتر هەوڵی بۆبدات و لەو بارەیەوە نامەی نووسی بۆ (یەزیدی کوڕی مولهیب)و پێ ی ووت: ئەگەر حەزم لە ژن بکردایە، یان ماڵ کۆکردنەوەم مەبەست بوایە، چونکە ئەوەی لە دەستی مندا بووە لە دەستی هیچ کەس کەسدا نەبووە، بەڵام ــ ئەوەی توشی بووم بەرپرسیاریەتی و خەلافەت ــ لێپرسینەوەی گەورە، موحاسەبەی توندی لەسەرە، مەگەر بۆ کەسێك خوا ڕەحمی پێ بکات.[١]

عمر رَحِمَهُ اللَّهُ زۆر ترسی خوای گەورەی لە دڵدابوو، فاطمەی خێزانی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: سوێند بە خوا نوێژو ڕۆژوویەکی وای نەبووە لە سنور بەدەر، بەڵام وڵلاهی کەسم نەدیوە وێنەی عمر بێت لە خوا ترساندا، لەناو جێگەکەیدا یادی خوای دەکرد، لە ترساندا وەك چۆلەکە ڕادەچڵەکی و باڵە فیزی دەکرد، تاوامان لێ دەهات بڵێین: سبەینێ خەڵکی بێ خەلیفە دەمێننەوە.[٢]

مەکحول دەڵێت: ئەگەر سوێند بخۆم سوێندم ناکەوێت، کە نەم دیوە کەسێك وێنەی عمری کوڕی عبدالعزیز دنیانەویست و لە خواترس بێت.[٣]

لەبەر ئەو لە خوا ترسانەی بوو، کە هەمیشە گریان و فرمێسکی حازر بوو، جارێکیان پیاوێك دێتە خزمەت عمر و لەو کاتەدا مەقەڵی یەکی لەبەر دەمدا بوو، عمریش پێ ی ووت: ئامۆژگاریم بکە؟ ئەویش ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران سودی چی یە بۆتۆ؟ ئەگەر هەموو خەڵکی بخرێنە ناو بە هەشتەوە، ئەگەر تۆ بخرێتە ناو ئاگرەوە، یان چ زیانێکی هەیە بۆ تۆ، ئەگەر هەموو خەڵکی بخرێنە ناو ئاگری دۆزەخ، ئەگەر تۆ لەناو بەهەشت دابیت، دەڵێ: عمر ئەوەندە گریا[٤] تا بەتکەی فرمێسکەکەی مەقەڵی یەکەی کوژاندەوە.

---

١ـ تأريخ الطبرى لة النموذج الإدارى لا ١٤٠.
٢ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن عبد الحكم) لا ٤٢.
٣ ـ تأريخ الخلفاء سيوطى لا٢٢١.
٤ـ سيرة عمر لابن الجوزى لا ٩٠.

هەموو ترسێکی عمرﷺ لە ڕۆژی قیامەت بووە، هاواری دەکردە خواو دەیووت: ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەزانیت من جگە لە ترسی ڕۆژی قیامەت ترسێکی تر لە دڵمدا هەیە، هەرگیز ترسم نەشکێنیّ.[1]

ڕۆژی قیامەت، ئەو ڕۆژە ترسناکەیە، کە گۆڕانکاریەکی ڕیشەیی لە ژیانی عمردا دروست کرد، ئەو ڕۆژەبوو، کە دەربارەی دەیوت: دووچاربوون بە دواڕۆژێکەوە ئەگەر ئەستێرەکان دووچاری بوونایە هەموو دەکەوتنە خوارەوە، ئەگەر کێوەکان دووچاری بونایە دەتوانەوە،ئەگەر زەویش دوچاری ببوایە لەت و پەت دەبوو، ئایا نازانن لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ماڵێکی تر نی یە، ئێوە هەردەبێت بەرەو لای یەکێکیان بڕۆن.[2]

بەڵێ ترسان لە خوای گەورە، تێڕوانینی ئاشکرا بۆ ژیان و نەمان و نەمری، هەست کردن بەڕۆژی لێپرسینەوە، کاریگەری دیمەنەکانی بەهەشت و دۆزەخ وادەکات لە فەرمانڕەوا و بەرپرسەکان، کە بلەرزن لە ترسی ئەوەی بە ئەندازەی موویەك لە بەرنامەکەی پەروەردگارن لابدەن.[3]

تێگەیشتن و هەست کردن بە بوونی ڕۆژی قیامەت و باقی سیفاتە بیروباوەڕیەکانی تر وا دەکات لە سەرکردە، کە هیچ هەنگاوێك نا نێت و هیچ لێدوانێك نادات و هیچ کارێك ناکات، بەڵکو پەیوەستی دەکات بە ڕەزامەندی خواوە.

بەڵام بە داخەوە لەلایەن زۆریّ لە سەرکردەکانی ئەمڕۆوە هەوڵیان نەداوە ئەو باوەڕە لە دڵیاندا بچەسپێنێنن و ئەوەش بناغەی هەموو سەرکەوتنێکەو دەبێت ئەم سیفەتانە لە سەرکردەکاندا هەبن، گەورەترین سیفاتی عمری کوڕی عبدالعزیز ئەو باوەڕە دامەزراوەی بوو بەخواو بەڕۆژی دوایی، ترسانی لە ڕادەبەدەریشی لە خوای عزوجل و ڕۆژی ترسناکی قیامەت.[4]

---

١ــ تأريخ الخلفاء سيوطى لا٢٢٤.
٢ــ سيرة عمر لابن الجوزى لا ٣٢
٣ــ ملامح الإنقلاب عمادالدين خليل لا ٤٥.
٤ــ النموذج الإدارى لا ١٤٢.

## ٢ـ دنیا نەویستی ـ الزهد ـ :

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لە ڕێگەی ژیانی لە خزمەت قورئانی پیرۆز و ڕێمونیەکانی محمد الأمین ﷺ و بیرکردنەوەی سەرەنجامی پوچی ئەم دونیایەیە، کە جێگای تاقیکردنەوە یە، کێڵگەیەکە بۆ دواڕۆژ، یان لێ کردبوو، کە زاڵبێت بەسەر دونیاو نەخش و نیگارو جوانی و باق و بریقەکانیدا، بە جوانی بوو بەملکەچ و گوڕایەڵی پەروەردگاری چ لە ڕواڵەت و چ لەدڵ و دەروونیدا، گیشتە کۆمەڵە ڕاستیەك لە دڵیدا جێگربوون و وایان لێ کرد پشت لە دونیا هەڵبکات، لەو ڕاستیانە:

أ ـ یەقینی تەواوی پەیدا کردبوو، کە مرۆڤ لەم زەوی یەدا شێوەی غەریبێکە، یان ڕێبواری ڕێ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((کن فی الدنیا کأنك غریب أو عابر السبیل))[١] لە دنیادا وە غەریب، یان وەك ڕێبوار بژی.

ب ـ ژیانی ئەم دنیایە لەلای پەروەردگار هیچ کێش و نرخی نی یە، مەگەر بۆ گوێ ڕایەڵی پەروەردگار بەکار بهێنرێت، لەم بارەیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لو کانت الدنیا تعدل عند الله جناح بعوضة ما سقی منها کافراً))[٢] واتە: ئەگەر ژیانی دونیا بەئەندازەی باڵی مێشولەیەك لەلای خوا سەنگی هەبوایە نەیدەهێش کافر ئاوی لێ بخواتەوە.

ج ـ کورتی ژیانی دنیاو تەواو بوونی وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((بعثت أنا والساعة کهاتین وأشار إلی السبابة والوسطی))[٣] واتە: نێوان هاتنی من هاتنی ڕۆژی دوایی وەك ئەم دووپەنجەیە وایە، ئاماژەی کردپەنجەی شایەتمان و پەنجە بەرزەی تەنیشتی.

د ـ ڕۆژی دوایی یەکە بەردەوام دەمێنێتەوە و جێ حەوانگەی مرۆڤە.

لەبەر ئەم هۆیانە وکۆمەڵێ هۆی تر عمری کوڕی عبدالعزیز پشتی لە دونیا

---

١ـ الترمذی کتاب الزهد ژ ٢٣٣٣.حدیث صحیح

٢ـ الترمذی ژ (٢٣٢٠).

٣ـ مسلم کتاب الفتن و أشراط الساعة ژ ١٢٣ ـ١٢٥.

هەڵکرد، یەکەمین پلەی دونیا نەویستی ئەوەیە مرۆڤ خۆی لە حەرام بپارێزێت، پاشان لە شتە حەڵاڵەکان و پەرزترین پلەی زوهدیش ئەویە خۆ دور گرتنە لە شتی زیادە، کە بە نەبونیشی زیان ناکەیت.[١]

مەسەلەی دونیا نەویستی عمر پەیوەند بوو بە کتاب و سوننەتەوە، بۆیە وازی لە هەموو کارێك هێنابوو، کە سودی بۆ ڕۆژی دوایی نەبوو بێت، دڵی خۆش نەبوو بەگەورەترین شتی، کە خەلافەت بوو ــ هەرگیز دڵتەنگ نەدەبوو بە لەدەست چوونی شتێکی دونیایی، وازی لە خۆشی و ڕابواردنەکانی هێنابوو، هەموو خەمێکی لەلای ڕۆژی دوایی بوو، ئەوەی لە لای خوای (عزوجل) بۆ باوەڕدار ئامادەکراوە.[٢]

مالیکی کوڕی دینار دەڵێت: خەڵکی دەڵێن مالیکی کوڕی دینار دنیا نەویستە، بەڵکو دنیانە ویستی ڕاستەقینە عمری کوڕی عبدالعزیز بوو، کە دنیا هاتە بەردەستی و ئەو وازی لێهێنا.[٣]

إبن عبدالحکم دەڵێت: کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز بوو بە بەرپرس و فەرمان ڕەواو پشتی لە دنیاویستی هەڵکردو وازی لە هەموو خۆشیەکانی هێناو خواردنی چێشتی جۆراوجۆری لابرد لەسەر خوانی خۆی، هەرکاتێ خواردنێکی بۆ دروست بکرایە بەشتێ دایان دەپۆشی، ئەگەر حەزی لێ بکردایە دەستی دەکرد بەخواردنی.[٤] هەرگیز گوێ ی بۆ خواردن و جۆرەکانی نەداوە، تەنها ئەوە نەبێت برسێتی و تێنوێتی خۆی پێ لابردبێت.

مەسروفی ڕۆژانەی خۆیماڵ ومناڵەکەی تەنها(دوو) دەرهەم بووە، وەك دەگێڕنەوە ــ لە ساعی کوڕی زیاد کە: ڕۆژانە عمر دوو دەرهەمی بۆ ماڵ و مناڵەکەی خەرج دەکردووە.[٥]

---

١ ــ النموذج الإداري المستخلص من إدارة عمر. لا ١٤٨.

٢ــ الأثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١/ ٤٦).

٣ــ حلية الأولياء(٥/ ٢٥٧).

٤ــ سيرة عمر (إبن الحكم) لا ٤٢.

٥ــ الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١/ ١٥٥).

هەرگیز جگە جل و بەرگی زبر هیچی کەی لەبەر نەکردوە، وازی لەجوانی و باق و بریق و ڕەنگاو ڕەنگەی خەلیفەکانی پێش خۆی هێنابوو، فەرمانی دا هەمووی بفرۆشن گشت پارەکەی خستە خەزێنەی موسڵمانان.[1]

هەر بەو شێوەشی کرد لەگەڵ کەنیزەك و خزمەتکارەکانیداو هەرچی کەنیزەك بوو، ئەگەر داگیرکرابوون گێڕانی یەوە بۆ خاوەنەکانیان، هەرچی خزمەتکاریشی هەبوو هەمووی دابەش کردن بەسەر ناسیاو نەخۆش و کەم ئەندامەکاندا، دژی هەموو زیادە مەسرەف کردن و کەشخەیەتی یەك بوو.[2]

هەرچەندە هەندێ لە نووسەران زیادە ڕەوی دەکەن لە مەسەلەی دونیانەویستی عمردا، بە تایبەتی لە بابەتی ـ ژن هێناندا ـ إبن عبدالحکم دەڵێت: فاطمەی خێزانی ووتویەتی: لەوەتی بوو بە خەلیفە تەنها سێ جار خۆی شۆردوە لەبەر لەش گرانی ـ جنابة ـ هەتا گەیشتە پەروەردگار، دەڵێن: تامردوە خۆی بۆ لەش گرانی نەشۆردوە، هەر چەندە ئەمانە دژی ئەوەن، کە عمری کوڕی عبدالعزیز زۆر حەزی کردوە دەست بگرێت بە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوەو جێگای باوەڕ[3] نی یە، کە واز لە سوننەت هێنابێت و بکەوێتە زوڵم ناهەقی کردن بە خێزانی، چونکە ژن نەهێنان و واز هێنان لە ڕابواردن لەگەڵیاندا هیچ پەیوەندی یەکی بە زوهدی ئیسلامی یەوە نی یە، شتێکی نامۆیە بەکۆمەڵگەی ئیسلامی، ئەوە هەندێ لەو تاقمانەی لە ئیسلام دەرچوون شانازی پێوەدەکەن و بە زوهدی ئیسلامی دادەنێن، لەو بارەیەوە کۆمەڵێ سەرگوزشتە دەهێنن، کە ئەگەر وردبێتەوە لێ ی بۆت دەردەکەوێت، کە هیچ پەیوەندی یەکی بە زوهدەوە نی یە، لەو بارەیەوە قسەو ئامۆژگاری سەیرو سەمەرەیان هەیە، لەوانە:

* هەرکەسێ وازلەژن و خواردنی خۆشی بهێنێت کەرامەت لەسەر دەستی دەردەکەوێت!

---

١ـ الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١/ ١٥٥).

٢ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز لا ٥٠

٣ـ هەمان سەرچاوە لا٥٠

* هەرکەسێ ژنی هێنا ئەوە دنیاویستی هێناوەتە ماڵی خۆیەوەو لە ژن هێنان خۆتان بپارێزن!

* پیاو ناگاتە پلەی ڕاستگۆیان ـ الصدیقین ـ تا واز لە ژن لە ژنەکەی نەهێنێ، وەك بێوەژنی لێ بکات، منداڵەکانیشی وەك هەتیو خۆی بەرزکاتەوە بۆ پلەکانی وتەکان.

* ڕزگاریان نابێت، ئەوکەسەی بەبێ جێگەی ژن خەوی لێ نەکەوێت.

* هەرکەسێك ژنی هێنا ئەوە حیسابی دنیا پەرستی بۆ بکە.[١]

ئەمەو چەندان ووتەی سەیر و سەمەرەی تر، کە بەگشت شێوەیەك پێچەوانەی ئیسلامە، کە ئاینی وەسەت و ناوەندی یە، ئێغەمبەری خوایش ﷺ فەرموویەتی: ((فمن رغب عن سنتي فليس مني))[٢] واتە: هەرکەسێ لە ڕێرەو سونەتی من لابدات لە من نی یە، واتە: بەشوێن کەوتەی من دانانرێت.

کەواتە بەگشتی زوهدو دنیانەویستی عمری کوڕی عبدالعزیز لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا بوە هەرچی ڕیوایەتێك دەگێڕنەوە لێ ی و دژی ئەو دوو کانیاوە ساف و سازگارە بێت، ئەوە هەڵبەستراوەو جێگای متمانە نی یە.

زوهدو و دنیانەویستی عمری کوڕی عبدالعزیز، کە لە پەیدا کردن و کۆکردنەوەی پارەوساماندا لەوە دابوو، کە ئەو پڕاوپڕ پێچەوانەی خەلیفەکانی پێش خۆی بوو، پێچەوانەی بەر پرس و فەرمانڕەوکانی ئەمڕۆشە، کە بە لاتی دەچنە سەر حوکم و قارونی واز لە پۆستە، کە دەهێنن![٣]

کاتێ چووە سەر حوکم (٤٠٠) هەزار دیناری هەبوو، بەڵام کاتێ چووە سەر کورسی حوکم و لە پاش وەفاتی تەنها(٤٠٠) دیناری لێ بەجێ ما وخۆ ئەگەر تەمەنی درێژتر بۆایە ئەو برەش کەمی دەکرد[٤]، بە درێژایی ژیانی مووچەی لە (بيت المال)

---

١ــ الطبقات للشعراني (٢٤/١)

٢ــ فتح الباري على صحيح البخاري (٩/ ١٠٤)

٣ــ ووتەی وەرگێڕ.

٤ــ حلية الأولياء(٥/ ٢٥٧)

وەرنەگرتووە.[١]

عمر رحمه الله لە زاهید و دنیانەویستەکانی سەردەمی خۆی بووە، ئەگەر نەهێڵن زاهیدترینتان بووە، هەموو جارێ دەیوت: دنیا ئەوندە خۆشی تێدا نی یە بە ئەندازەی ناخۆشی یەکانی، خۆشی کەم و خەفەتی زۆر.[٢]

دەربارەی زوهدەکانی زۆری لێ دەگێرنەوە(شیخ أبو حفض عمر بن محمد الخضر العلاء) نزیکەی (٢٨) ڕیوایەتی لەسەر هێناوەتەوە.[٣]

زوهدی عمر گەیشتبووە ئاستێك، کە زۆر ئەستەمە کەسی پێ بگات لەو کەسانەی لە ناو ژیانی خۆش و (های لایف) دا چەقیوون لەم سەردەمە خۆماندا کە مادەپەرستی هەموو کون قوژبنێکی ئەم ژیانەی گرتوتەوە، تاوای لێ هاتووە پێوانەی کەسایەتی یەکان بەوە دەکرێت، کە چەندی هەیە و چۆن دەژی، سەرکردە و فەرمانڕەواکانی ئەمڕۆ، ئەگەر وەك عمر رحمه الله زاهیدو دنیانەویست نابن خۆ ئەوەندە بەسە بۆیان هەڵپەهەڵپە نەکەن و سامانی خەڵکی بۆ خۆیان و لایەنگریان حەلاڵ نەکەن و، هەوڵ بدەن بەنانی حەلاڵ و کاسبی پاك خۆیان بژێن و بتوانن حەزە دنیایی یەکانیان کەمێ سەرکوت بکەن، تا ئەوانیش وەك عمریان لێ بێت و بە تەمای شتێکی زۆر گەورەترین لە دونیای هیچ تیا بەسەر و کاتی و چاویان بەبەهەشتی بەرین بێت.[٤]

کۆتایی بەباسی زوهدی عمر بەڕوداوێك دەهێنمەوە، کە جارێکیان بە(موزاحیم)ی ووت: حەزم لە حەج کردنە، پارەوشتت لە لایە؟ ئەوش ووتی: (١٥ــ ١٦) دینارێکم لە لایە، عمریش ووتی: دەی ئەوە کەی بەشم دەکات، کەمێ مانەوە، پاشان موزاحیم ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران خۆت حازربکە بۆ حەج، چونکە

---

١ــ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن الجوزی) لا ١٨٦.
٢ــ النموذج الإداری المستخلص من إدارة عمر.
٣ــ الکتاب الجامع لسیرة عمر بن عبدالعزیز(١/٢٦٦ــ ٢٧٨)
٤ــ مدارج السالکین (٢/ ٣٤٠)

حەفدەهەزار دینارمان لە ئالی مەڕوانەوە بۆ هاتووە، عمر ووتی: بیخەرە خەزێنەی موسڵمانانەوە، چونکە ئەگەر حەڵاڵ بێت بەشی خۆمانمان لێ بردەوە، خۆ ئەگەر حەرامیش بێت، ئەوپرژەمان بەسە، کە بەرمان کەوتووە لێ ی (واتە با حەجیشی بەسەرەوە نەکەین).

موزاحیم دەڵێت: کاتێ عمر هەستی کرد زۆر پێم ناخۆ شبوو، کە ئەو پارەیە بەکار ناهێنێ لە حەڵاڵدا پێ ی ووتم: بێ قەزابی موزاحیم! قورس نەبێت لەلات ئەم کارەم، من لەبەر خاتری خوا دەیخەمە (بیت المال) من خاوەن دڵ و دەرونێکم کەسێکی بەرز بینم حەز لە شتێکی بەرزتر دەکەم، تاوام لێ هاتووە حەز لە بەرزترین پلەو مەقام دەکەم، ئەمڕۆ شێت و شەیدای بەهەشت بووم.[١]

### ٣ـ بێ فیزی عمری کوڕی عبدالعزیز ـ تواضع ـ:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا ﴾ الفرقان: ٦٣ واتە: بەندە ڕاستەقینەکانی خوا ئەوانەن، کە لە سەرخۆ بەسەر زەویدا ڕێ دەکەن.

إبن قیم دەڵێت: بە شێوەی لە سەرخۆو نەرم نیان بەویقارەوەو بەبێ فیزی بەسەر زەویدا ڕەدەبن.[٢]

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ دەفەرموێت: ((إن الله أوحى إليّ أن تواضعوا حتى لا يخفر أحد على ولا يبغى أحد على أحد))[٣] واتە: خوای ـ عز وجل ـ نیگای بۆ کردووم، کە دەبێت ئەوەندە بێ فیز بن تاواتان لێ دێت کەستان پۆست بەسەر کەستانەوە لێ نەدەن و کەسیشتان دەست درێژی نەکە سەر کەسی ترتان نەکەن.

ئەم ڕەوشتە جوانە یەکێك بوو لە ڕەوشتە بەرزەکانی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله

---

١ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن عبد الحكم) لا ٦٣.
٢ـ مدارج السالكين(٢/ ٢٤٠).
٣ـ مسلم ژ ٢٨٦٥.

زوهـدو دنیانەویـستی بـەرەو تـەوازع و بـێ فیـزی بـرد؛ چـونکە مـەرجی زوهـدی ڕاستەقینە تەوازع و بێ فیزی یە بۆ خودا.[١]

عمررحمه الله لە هەموو لایەنەکانی ژیانیدا تـەوازع و بـێ فیـزی نوانـدوە، ئەمـەش زۆر پێویـستە بـۆ سـەرکردەیەك لـە خـوا ترسـی و ئومێـدەواری بەهەشـت، بـشیەوێت گەلەکەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن.[٢]

هەر بێ فیزی یەکانی عمر جارێکیان پیاوێك بانگی کرد ووتی: ئـەی جـێ نـشینی خوا لەسەر زەویدا، عمر ووتی: بێ دەنگ بە شـتی وانـەڵێت، مـن کـاتی خـۆی بـاوك دایکم ناویان ناوم عمر، ئەگەر بەو ناوە بانگـت بکردبمایـە وەڵامم دەدایـەوە و، مـن کاتێ نازناوم بۆ خۆم دانا(أبا الحفص)م پێوتراوە، ئەگەر بـەو نـاوە بانگـت بکردایـە وەڵامم دەدایتەوە، کاتێ منتان کرد بەسەرگەورەی خۆتان و پێتان ووتم: ـ ئـەمیری باوەڕداران ـ ئەگەر بەوناوەوە بانگت بکردبمایـە وەڵامـم دەدایتـەوە، بـەڵام بـانگ کردنم بە جێ نشینی خوا لەزەوی دا! من ئەوکەسەنیم، بەڵکو جێ نشینەکانی خـوا لەسـەر زەوی، داود، پێغەمبـەرمانﷺ و هـاو وێنـەکانیان[٣] مەبەسـتی لـەو ئایەتـە پیرۆزەیە، که دەفەرموێت: ﴿يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَـٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ص: ٢٦.

هەر لە بێ فیزیەکانی، ئەوە بوو قەدەغەی کردبوو لەسەر موسڵمانان لە حزوریدا ڕابووە ستن، دەیووت: ئەگەر ئێوە بە پێوەبن منـیش بـە پێـوە دەبم، ئەگـەر ئێـوە دانیشن من دادەنیشم، بەڵکو خەڵکی لەبەردەمی پەروەردگاری جیهاندا ڕادەوەستن، هـەموو جـارێ بـە پاسـەوانەکانی خـۆی دەووت: ئێـوە دەستپێـشخەری مەکـەن لـە سڵاوکردنتان لێمان، بەڵکو ئێمە دەبێت سەرەتا سڵاوتان لێ بکەین.[٤]

زۆر بـێ فیـز بـووە، تەنانـەت لـە چـاك کردنـەوەی قەنـدیل و چـراکانی خۆیـدا،

---

١ــ عمری بن عبدالعزیز الرحیلی لا ١٥٠.

٢ــ عمری بن عبدالعزیز ی (الرحیلی) لا ١٥٠.

٣ــ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن عبد الحکم) لا ٤٦.

٤ــ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن عبد الحکم) لا ٣٤ــ ٣٥.

شەوێکیان کۆمەڵێك کەسی لە لا بوو بۆکارێك، لەو کاتەدا چراکەی کوژایەوە، خۆی هەستا ڕۆیشت چاکی بکاتەوە، پێیان ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ بەئێمەنالێیت بۆت چاك بکەینەوە؟ عمر ووتی: دەی من چیم زەرەر کرد! ڕۆیشتم هەر عمری کوڕی عبدالعزیز بووم، هاتیشمەوە هەر عمری کوڕی عبدالعزیز بووم.[١]

بێ فیز بووە تەنانەت لەگەڵ کەنیزك و خزمەتکارەکانیدا، جارێکیان بە کەنیزکەی خۆی ووت: کەمێ باوەشێنم بکە، دەڵێ: باوەشێنی هێناو دەستی کرد بە باوەشێن کردنی، کردنی بەم باوەشێ کردنەوە چاوەکانی چوونە خەوە، عمر بەئاگا هاتەوە بینی وا کەنیزکەکە دەم و چاوی سور هەڵگەڕاوە و ئارەقێکی زۆری کردوە و خەوی لێ کەوتووە، عمریش رحمه الله باوەشێنەکەی هەڵگرت و دەستی کرد بەباوەشێن کردنی کەنیزەکەکە، کەنیزکەش بەخەبەر هاتەوە دەستی گرت بە تەوقی سەریەوە هاوێرێکی کرد، عمریش پێ ی ووت: ئێ چی بووە؟ تۆش وەك من مرۆڤیت، وەك منیش گەرمات دەبیت، حەزم کرد کەمێ باوەشێن بکەم، وەك چۆن تۆمنت باوەشێت کرد.[٢]

بە سروشتی خۆی حەزی لەقسەکردن نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا زانایەکی زمان پاراو قسە زانان بووە ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەفسی شانازی بەخۆیەوە بکات، یان خەڵکی وا گومانی پێ بەرن، هەردەم دەیووت: قسە ناکەم لە ترسی ئەوەی شانازی بەخۆمەوە نەکەم.[٣]

پیاوێك هاتە لای پێ ی ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران خەلیفەکانی پێش تۆ خەلافەت جوانی کردبوون، بەڵام تۆ خەلافەتت جوان کردوە، وەك شاعیر دەڵێت:

وإذا الدر زان حسن وجوهكان للدُّر حسن وجهك زينا.

---

١ـ هەمان سەرچاوە ل٣٩٧.

٢ـ أخبار أبا الحفض للاجرى ل ٨٦,

٣ـ هەمان سەرچاوە ل ٨٤.

بەڵام عمر پشتی لێ هەڵکرد[١] پیاوێکیش پێ ی ووت: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە لە باتی ئیسلام، عمریش ووتی: بەڵکو خوا پاداشتی خێری ئیسلام بداتەوە لە باتی من[٢]، پیاوێکیش هاتە خزمەتی عمری کوڕی عبدالعزیز ئەویش لەناو کۆمەڵێك کەسدا دانیشتبوو و ووتی: سەلامت لەسەر بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، عمریش فەرمووی: با سڵاوەکەت گشتی بێت هەمووان بگرێتەوە.

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله ئابەوجۆرە ژیاوە، باڵی سۆزی ڕاخستووە بۆ باوەڕداران، خۆی بەرز ڕانەگرتوە لەناو بەندەکانی خودا، خەلیفایەتی نەیگۆڕێ و لوت بەرزەکەی نەکرد، بەڵکو زیاتر بێ فیزو خاکی بوو، خۆی چرای خۆی چاك دەکردەوەو لەسەر زەوی دادەنیشت لەناو خەڵکیدا نەی هێشتووە پۆلیس و پاسەوانەکانی لە پێشی یەوە بڕۆن، زۆر توڕەدەبوو لە هەرکەسێك بەگەورە سەیری بکردایە، یان سڵاوی تایبەتی لێ بکردایە لە ناو خەڵکیدا، ڕازی نەبووە خۆی لە خەڵکی جیابکاتەوە لە خواردندا، لە خواردنەوەو جل و بەرگ و وڵاخەکەیدا.[٣]

### ٤ــ خۆپاراستنی لە گوناه ــ الورع ــ:

یەکێکی تر لەو سیفەتانەی عمری پێ ناسرابوون ئەو خۆپاراستنەی بوو لە گوناه، وەرع واتە: دورکەوتنەوە لە هەر شتێك زیانی هەبێت، ئیتر هەموو حەرامەکانی خواو ئەو شتانەیش، کە بۆنی حەرامیان لێ دێ ــ الشبهات ــ چونکە زیان بەخشن، هەرکەسێك خۆی لە (شبهات) بپارێزێت ئەوە ناموس و ئاینەکەی دەپارێزێت، هەرکەسێك خۆی لە - الشبهات - نە پارێزێت بێ گومان دەکەوێتە ناو حەرامەکانەوە، وەك ئەو شوانەی مەڕەکانی لە نزیکی قەدەغەکراوێکەوە بلەوەڕێنێت و گومانی ئەوە دەکرێت، کە بکەونە ناویەوە.[٤]

---

١ــ سير أعلام النبلاء(٥/ ٢٦)
٢ــ سير أعلام النبلاء(٥/١٤٧)
٣ــ الطبقات(٥/٣٨٤ ).
٤ــ عمر بن عبدالعزيز عبد الستار الشيخ لا ١٢٣.

(ورع) لە بنەڕەتدا بەوە دەوترێت، كە خۆ لە گوناھ بپارێزێت، بەڵام پاشتر مانای واز هێنان لە هەندێ حەڵاڵیان بۆ داتاشیوە.[1]

وەك بەڵگە لەسەر ئەوەی عمر دیاردەی خۆپاراستن لە هەندێ حەڵاڵ بۆنی حەرامی لێ بێت، دەگێرنەوە، كە عمر زۆر حەزی لە هەنگوین كردووە ڕۆژێك داوا دەكات لە خێزانی، كە هەنگوینی بۆ بهێنێ، بەڵام هەنگوینیان نەبوو، بەڵام پاش كەمێك هەنگوینیان بۆ پەیدا كرد زۆر زۆر خۆش بوو لە لای و بە خێزانی ووت: ئەمەتان لە كوێ بوو؟ووتی: دوو دینارم دا بە خزمەت كارەكەم و سواری وڵاخی نامە بردنكە بوو ڕۆیشت بۆی كڕین.

عمرﷺ سوێندی خوارد، دەبێت ئەو هەنگوینەم بۆ بهێنن، ئەوانیش هیزەكەیان هێا، كە هەنگوینەكەی تێدا بوو ناردی بۆ بازاڕ فرۆشتیان بە زیاتر لە دوو دینارو دوو دیناری خێزانەكەی دایەوەو پارە زیادەكەشی خستە خەزێنەی موسڵمانانەوە، ووتی: تۆ وڵاخی موسڵمانان بەكار دەهێنی بۆ حەزێكی عمر![2]

دووبارە نموونە لەسەر وەرعی ئەمیری باوەڕداران ئەوەیە، كە خزمەتكارێكی هەبوو چەند جارێك لە مەنجەڵێكدا ئاوی گەرمی بۆ دەهێناو ئەویش دەستنوێژی پێ گرت،ڕۆژێ بەخزمەتكارەكەی ووت: ئەوە ئاو دەبەیت بۆ چێشتخانەی موسڵمانان و بە ئاگری ئەوێ ئەم ئاوەم بۆ گەرم دەكەیت؟ ووتی: بەڵێ، خوا چاكت بۆ بكات، عمر ووتی: هەموو شتێكت لێ تێك داوین، پاشان فەرمانی دا بە موزاحیم، كە مەنجەڵەكەی بۆ پڕ بكات لە ئاو، پاشان بیخاتە سەر ئاگر بزانێت چەند داری تێ دەچێت و ژمارەی ڕۆژەكانیش چەند بووە، كە ئەو خزمەتكارە لەوێ ئاوەكەی گەرم كردووە، پاشان بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانە داری كڕی و خستی یە چێشتخانەی موسڵمانان.[3]

---

١ـ الفتاوى(١٠/ ٦١٥).

٢ـ أخبار أبي الحفص للاجرى لا٥٤

٣ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (إبن عبد الحكم) لا ٤٠.

نمونەیەکی تر لەسەر خۆپاراستن و(ورع)ی عمر ئەوەبوو، کە هەرگیز دیاری لە کاربەدەستەکانی خۆی وەرنەگرتووە، یان لە(أهل الذمة)، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەك سەر بۆ بەرتیل خواردن بکێشێت، لە عەمری کوڕی موهاجیرە دەگێڕنەوە دەڵێت: جارێك عمری کوڕی عبدالعزیز زۆر حەزی لە سێو کردوە، دەیووت: ئای کەمێ سێومان هەبوایە، چەند بۆن و تامی خۆشە، پیاوێکی خزمی خۆی سێوێکی بە دیاری بۆ نارد، کاتێ سێوهێنە گەیشتە لای عمر پێ ی ووت: چەند بۆنی خۆشە بەڵام ئەی خزمەتکار لایبە ـ نایخۆم ـ بە خاوەنەکەشت بڵێ: عمر زۆر سڵاوت لێ دەکات و پێت دەڵێت: دیارییەکەت گەیشت زۆر سوپاست دەکەم، منیش ووتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەوە ئامۆزاتە و لە بنەماڵەی خۆتانە، خۆ ئاگاداریشیت، کە پێغەمبەری خواﷺ دیاری وەرگرتووە، بەڵام خێری وەرنەگرتووە، عمریش ووتی: بێ قەزابی یاخوا! دیاری بۆ پێغەمبەر دیاری بووە، بەڵام ئەمڕۆ بۆ ئێمە بەرتیلە.[1]

نمونەیەکی تریش ئەوەیە، کە عمررحمه الله بۆ خۆی ڕەوا نەزانیوە ئەو عەترانە بۆن بکات، کە لە هەرێمەکانەوە دەهاتنە خەزێنەی موسڵمان لە پایتەخت، کاتێ عەترێکی زۆریان لە بەر دەستیدا دانا خێرا دەستی برد لوتی خۆی گرت، پێیان ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران خۆ ئەوە تەنیا بۆ نەو هیچی تر، عمریش ووتی: عەتر تەنها بە لوت سودی لێ وەرناگیرێت.[2]

هەروەها موڵکی دەوڵەتی بەکار نەهێناوە بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی خۆی، دەڵێن چرای (بیت المال)ی بە کار نەهێناوە بۆ ئیش و کاری دەوڵەت و و هەرکاتێ ئیشەکان تەواو بونایە دەی کوژاندەوەو بۆ کاری خۆی چرای ماڵی خۆی بەکار هێناوە.[3]

مێژوونووسەکان نمونەی زۆریان باس کردوە لە(عمر)دا، لەلای ئەو خۆپاراستن لە سامانی موسڵمانان با لەشتی زۆر بچوك و کومیشدا بێت، ئەوە دەچێتە خانەی

---

١ـ سيرة عمر لابن الجوزي لا ١٩٧.

٢ـ هەمان سەرچاوە لا٢٠٠.

٣ـ كتاب الورع لابن أبي الدنيا لا ٧٤.

خۆپارستن لەو شتانەی بۆنی حەرامیان لێ دێت، خۆی لە(شبهات) زۆر پاراستوە.[١] ئەمەش لە پێناوی پارێزگاری لە ئاینەکەی، لەلای ئەوهەموو مەسەکان لە سێ شت بە دەر نەبوون وەك خۆی دەڵێت:

١ـ مەسەکە بە ئاشکرا لە دروستە بێ خەم ئەنجام بدە.

٢ـ مەسەلەکە گوناهێکی ئاشکرایە لێ ی دوور بکەوێتەوە.

٣ـ مەسەلەیەك تیا ماویت نازانیت کامیانە خۆتی لێ بپارێزە.[٢]

عمر رحمه الله تەنانەت لە قسەو گوفتاریشدا خۆی لە گوناە پاراستووە، بۆ نمونە دەربارەی جەنگی سەفین پرسیاریان لێ کردوە، ئەویش لە وەڵامدا وتویەتی: ئەوە خوێنێك بوو خوا دەستی ئێمەی لێ پاراستووە دەی حەز ناکەم زمانیشی تێوە گلێنین.[٣]

بەمەدا روون دەبێتەوە، کە عمر خۆپارێز(وارع)بووە لە هەموو شتێکی ژیانیدا، لە خواردن و پێداویستی و حەزو سامانی موسڵمانانندا، ئەمەش لە باوەڕی پتەو هەست کردن بە لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت دروست دەبێت، تەنانەت وەرعی گەیشتبووە ئاستێك کە پێش مردن گۆڕی خۆی کڕی، تا لەدنیا هیچ شتێکی نەبێت بە خۆڕایی و لە میشی دەستی کەوتیبێت.[٤]

### ٥ـ لەسەرخۆی و لێبوردەیی و چاوپۆشی:

ئەم سێ ڕەوشتەی سەرەوە لە ژیانی عمری کوڕی عبدالعزیز دا بەرجەستە بووە، شێخێکی خەناصیرەکان دەگێرتەوەو دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز کوڕێکی هەبوو لە فاطمە، ڕۆژێك لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد و منداڵێك سەری شکادند و دەست و پێوەندەکان کوڕەکەی عمر و ئەوکەسەیشی سەری شکاند بردیان بۆ ماڵی فاطمە،

---

١ـ الآثار الواردة فی عمر بن عبدالعزیز في العقیدة(١/١٦٤).

٢ـ العقد الفرید(٤/٣٩٧).

٣ ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز(إبن الجوزي) لا ١٩٥.

٤ـ النموذج الإداری المستخلص من إدارة عمر لا ١٥٦.

عمر له ماڵێکی دراوسێ بوو گوێ ی له دەنگه دەنگ کەبوو، هاتەدەروەو ئافرەتێك هات بەرەو ڕوی ووتی بەعمر: ئەمه کوڕی منه باوکی نی یه، عمریش ووتی: موچەی بۆ بڕاوەتەوه؟ ووتی: نەخێر، عمر فەرمانی دەرکرد، که بیخەنه لیستی مناڵه موچه وەرگرەکانی (أهل ذمة)، فاطمەی خێزانی پێ ی ووت: ئەو سەری کوڕەکەی تۆی شکاندوه کەچی تۆ ئاوای لێ دەکەیت، خوا ئاواو ئاوای لێ بکات، دەی بۆ جارێکی تر سەری کوڕەکەی تریشت دەشکێنێت، عمر له سەر خۆیەکەوه ووتی: ئێوه زیرەتان پێ کردبوو.[1]

له إبراهیمی کوڕی عەبلەوه دەگێرنەوه دەڵێت: ڕۆژێکیان عمر زۆر زۆر توڕەبوو لەپیاوێك و فەرمانی دەرکرد بیهێنه بەردەستیو بەجۆرێ هێنایان جل و بەرگیان له بەردا نەهێشتبوو، به گوریس بەستوویانەوەو قەمچی یەکیشیان هێنا، عمر ووتی: بەرەڵای بکەن بابڕوات و پاشان ووتی پێ ی: بەڵام بابزانێت، من ئەگەر توڕەنەبومایه ئەمزانی چۆن ئەشکەنجەم دەدایت و ئەم ئایەتەی خوێندەوه: ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ﴾آل عمران:١٣٤.

عبدالملك دەگێرنەوه دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز به مەبەستی قەیلول کردن بۆ ماڵەوه گەڕایەوه، له ڕێگا پیاوێك هاته ڕێگای و(طومار)ێکی لول دراوی بەدەستەوه بوو، لەوه ترسا، که پاسەوانەکان نەهێڵن قسەی لەگەڵدا بکات ناچار (طومار)ەکەی فڕێ دا بۆ عمر، عمریش لای کردەوه بۆ لای و کێشای بەڕوومەتیدا خوێن هاته خوارەوه، دەڵێ: بینیم خوێن له دەم و چاوی دەهاته خوارەوه له بەر خۆرەکه وەستا بوو، له وێدا نه جوڵا تا (طومار)ەکەی خوێندەوەو کارەکەی بۆ جێ بەجێ کرد و بەرەڵای کرد.[2]

دەگێرنەوه: پیاوێك قسەی به عمری کوڕی عبدالعزیز ووت، ئەویش وەڵامی نەدایەوه، پێیان ووت: چی وای لێ کردیت وڵامت نەدایەوه؟ ئەویش له وەڵامدا

---

١ـــ سیرة عمر بن عبدالعزیز(إبن الجوزی) لا ٢٧کتاب الجامع لسیرة عمر بن عبدالعزیز(٢/٤٢٣).

٢ـ حلیة الأولیاء(٥/٢١١)

ووتی: لە خوا ترس دەمی بەستراوە.[١]

حاتەمی کوڕی قودامە دەڵێت: لەو کاتەدا، کە عمری کوڕی عبدالعزیز ووتاری دەدا پیاوێك هەستایەوەو پێ ی ووت: شایەتی دەدەم تۆ یەکێکی لە فاسقەکان! عمر پێ ی ووت: بە چیدا ئەزانیت؟ پیاوەکە ووتی: تۆ شایەتی درۆت داوەو شایەتیت لێ وەر ناگرین.[٢]

دەگێرنەوە پاش ئەوەی عمری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە، بەرە بەیانێك لەگەڵ پاسەوانەکەیدا بەرەوە مزگەوت کەوتنە ڕێ و لە ڕێگا پیاوێك خەوتبوو، عمر چاوی پێ نەکەوت و قاچی لێ هەڵکەوت، کابرا بەخەبەر هات و ووتی: ئەرێ شێت بوویت؟ عمریش ووتی: نەخێر، پاسەوانەکەشی ویستی لێ ی بدات، عمر پێ ی ووت: وازی لێ بهێنە، چی کردوە؟ تەنها پرسیارێکی لێ کردم ووتی: تۆ شێتیت؟ منیش ووتم: نەء.[٣]

دەگێڕنەوە عمری کوڕی عبدالعزیز لە هەستایە سەر پێ و دەستی کرد بە قسە پێ ووتنی و زۆر تورەی کرد، عمریش پێ ی ووت: هێ ی تۆ کابرا ئایا دەتەوێت کارێکم پێ بکەیت شەیتان لە خشتەم بەرێت و دەسەڵاتی خۆمت بەسەر دا جێ بەجێ بکەم ئەمڕۆ و سبەینێش - ڕۆژی قیامەت ــ تۆ وام لێ بکەیتەوە؟ دەی بڕۆ خوا لە منیش و لە تۆش خۆش ببێت.[٤]

دەڵێن منالێکی عمری کوڕی عبدالعزیز بەگریانەوە هاتەوە لای بۆ لای عمرو ئەویش لێ ی پرسی: چی بووە؟ ووتی: خزمەتکارەکە لێ ی دام، خزمەتکارەکەیان هێناو عمر لێ ی پرسی: تۆ لێت داوە؟ ووتی: بەڵێ، عمریش ووتی: قەیناکە بڕۆ،

---

١ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن جوزی) لا(٢٨) مەبەستی عمر ئەوەبوو لە پێداویستی لە خوا ترسەکان، کە دەمیان بگرن و دەم نەخەنە دەمی هەموو لارێك.

٢ـ کتاب الجامع لسیرة عمر بن عبدالزیز (٢/ ٤٢٤)

٣ـ هەمان سەرچاوە(٢/ ٤٢٥).

٤ـ کتاب الجامع لسیر عمر بن عبدالزیز (٢/ ٤٢٥).

ئەگەر سزای خەڵکم بدایە لەسەر ڕاستگۆی سزای تۆم دەدا، دەی بڕۆ، هیچی تری پێ نەگوت.

ئەگەر بمانەوێت هەموو ڕوداوەکانی ژیانی لە بواری لە سەر خۆیی و لێبووردەیی یەکانی یەوە باسی لێوە بکەین زۆری دەوێت، بەڵام (مشتێك نمونەی خەروارێکە)

## ٦ــ ئارامی و خۆگری عمری کوڕی عبدالعزیز:

لە ڕەوشتەکانی تری عمر رحمه الله ئارامی و خۆگری و، سوپاس گوزاری بوو، دەگێڕنەوە کاتێ عبدالملکی کوڕی دەمرێت دەچێتە سەر گۆڕەکەی و دەڵێت: قوڵی مەکەن، چونکە لەسەرەوە بێت چاکترە لەوەی لە خوارەوە بێت.[١]

دەگێرنەوە کاتێ عبدالملك ی کوڕی عمرو سهل ی کوڕی عبدالعزیزی برای و موزاحیمی یاوەری لە دونیا دەردەچن، پیاوێك لەخەڵکی شام ووتی: وەڵاهی ئەمیری باوەڕداران توشی بەڵاو تاقیکردنەوەیەکی گەورە هاتووە، کوڕەکەی دەمرێت، کە وەڵاهی کەسم نەدیوە بۆ باوکی خۆی ئەوەندەی عبدالملك بۆ باوکی چاك بێت، سەهلی برای مرد، وەڵاهی برام نەدیوە بۆ برا ئەوەندەی سەهل بۆ عمر چاك بوبێت، باسی موزاحیمی نەکرد، عمری کوڕی عبدالعزیز پێ ی ووت: ئەوە بۆ لە موزاحیمدا بێ دەنگ بویت؟ دەی وەڵاهی لەو دوانە دورتر نەبووە لێم، سێ جار ووتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی موزاحیم، وەڵاهی زۆر شتی دنیات واز لێ هێنا، باشترین وەزیر بوویت بۆ کاروباری ڕۆژی قیامەت.[٢]

حەفسی کوڕی عمر دەڵێت: کاتێ عبدالملك ی کوڕی عمر مرد لەسەر گۆڕستان عمر زۆر وەسفی چاکەی دەکرد، مەسلەمەش ووتی: ئەگەر بمایە دەتکرد بە والی و بەر پرس؟ عمر ووتی: نەء، مەسلەمەش ووتی: ئەی ئەم وەسفە چاکەی بۆ دەکەیت؟! عمر ووتی: من لەوە دەترسام، کە بە جۆرێ خۆشم دەویست، کە وەك

---

١ــ هەمان سەرچاوە.

٢ــ کتاب الجامع لسیر عمر بن عبدالزیز (٢/ ٤٣٧).

خۆشەویستی کوڕ لە بەر چاوی باوکیدا بێت.[١]

عمر‌رحمه الله لەسەر مینبەر ووتاری دەداو دەیووت: کەسێ توشی هەر ناڕەحەتی یەك بێت و بلّێت: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ) ئەوە ئەجرو پاداشتی لەلای خوا زۆر لە نەهامەتی یەکەی گەورەترو باشترە.دەڵێ: (ڕازی بوون کەمەو ئارام گرتن پاڵپشتی باوەڕدارە) دەڵێ: (هەرکەسێ بەبێ زانست کردەوەیەك ئەنجام بدات ئەوە خراپەی لە چاکسازی یەکەی زیاتر دەبێت).[٢]

عمر‌رحمه الله لە ژیانیدا لەسەر هەموو ناڕحەتیەکانی ئارامی گرتووە و خۆی دەڵێت: وەڵاهی بۆیە لەسەر ئەم کورسی خەلافەتە دانیشتووم تەنها لەبەر ئەوەیە، کە دەترسم کەسێ لەسەری دانیشێ، کە شایستەی نەبێت، ئەگەر بمزانیایە خەڵکی بە قسەم دەکەن ئەوا دەم دایە دەستی کەسی شایستەی خۆی، بەڵام هەر چۆنی ببێ ئارام دەگرم و خۆم دەگرم، تا بزانم خوا چی دەکات، یان دەروویەك دەکاتەوە.[٣]

## ٧ـ هەنگاوی پڕ متمانە(الحزم):

لەو کاتەدا، کە عمری کوڕی عبدالعزیز چووە سەر حوکم و پۆستی خەلافەتی وەرگرت لە هەموو کاتەکانی تر زیاتر پێویستی بەکەسێك هەبوو، کە سوربوون و بڕیاری یەلاکەرەوەو بە جەرگانە دەربکات، بەتایبەتی پێویستی دەکرد کۆمەڵێك والی و کار بەدەست لابرێت و نەرمی نەنوێنرێت بەرامبەر پێویستیانە خەواریج و لەسنور دەرچووان وتێك دەرانی ئاسایش و خوێنڕێژان

سستی نە نواندن لەو مەسەلانەی، کە پێویستن بۆ خزمەتی بەرژەوەندی گشتی، چاك کردنەوەی ئیش و کارەکانی موسڵمانان، جا ئەم هەنگاوانە پڕ لە متمانەی عمر

---

١ـ هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە. مە بەستی عمر ئەوە بوو، کە ئەوەندەی خۆش بوێت، کە لە خۆشەویستیدا لە موسڵمانان جیایی بکاتەوە و بەرپرسیاریەتی وشتی تری پێ بدات. وەرگێڕ.

٢ـ كتاب الجامع لسير عمر بن عبدالعزيز(٢/ ٢٤٨).

٣ـ النموذج الإداري المستخلص من إدارة عمر ـ لا ١٤٤.

شێوازە جۆراوجۆرو چەندان بواری گرتبوویەوە، وەك هەنگاونانی بوێرانەی لەگەڵ ئەمیرو والی و پیاو ماقوڵانی بنی ئومەیی یە، لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە دەیان ویست دووبەرەکی بخەنە ناو موسڵمانان و دەرچوون لە ڕێگەیان و ئاژاوەنانەوەو خوێن ڕشتن و چەندان کاری تر.

یەکەمین ئاماژەی هەنگاونانی بە جەرگ و پڕ متمانەی بەرامبەر بنەماڵەی مەڕوان کاتێ پێ ی ووتن: هەرچیتان وەرگرتووە بۆم بگێڕنەوە، ناچارم مەکەن کارێ بکەم پێم ناخۆش بێت و کارێکتان بەسەر بێنم پێتان ناخۆش بێت، کەسیان وەڵامیان نەدایەوە، ئەویش ووتی: دەی وەڵامم بدەنەوە، پیاوێك لە ناویاندا هەستایەوە ووتی: وەڵاهی دەست هەڵناگرین لەو سامانەی لە باپیرانمانەوەماوەتەوە بۆمان، نەوەکانمان هەژار ناخەین و باو باپیرانمان بێ سفەت ناکەین، مەگەر سەرمان لە لاشە بکەیتەوە.

عمریش ووتی: وەڵاهی ئەگەر لە بەر ئەوە نەبێت، کە ئەزانم هەر بەو کەسانەی، کە من مافەکانیان بۆ دەگێڕمەوە دژیایەتی من دەکەن، هەر ئێستاکە سەرو چاوتانم دەهێنا خوارەوە، بەڵام من لە ئاژاوە و ناکۆکی دەترسم، ئەگەر خوای گەورە بمهێڵێت مافی هەموو ماف خوراوێك دەگێڕمەوە بۆی(إن شاء الله).[1]

ئەگەر نیازی کارێکی بکردایە بێ گومان دەیبردە سەر، جارێکیان نامەیەکی لە هەندێ بنەماڵەی مەڕوانەوە پێ گەیشت زۆر تووڕەبوو بە جۆرێك وەك بڵێی گڕی گرتبوو، پاشان ووتی: خوا دەزانێت ڕۆژی بمێنم بۆ بنەماڵەی مەڕوان دەمێنم، وەڵاهی ئیتر باسەبڕینیشیان لەسەر دەستی مندا بێت! کاتێ وەڵامی عمریان بیست هەموو بێ دەنگ بوون، چونکە دەیانزانی چی بوێت دەیباتە سەر، بکەوێتە سەر هەرکارێك دەیباتە سەر.[2]

لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە دەیان ویست ڕیزی موسڵمانان لەت بکەن و دژیان بووەستن، شێوازی گفتوگۆ و ئاشتیانەی دەگرتەبەر، ئەو کەسانەیش(خەواریج)

---

١ــ العقد الفريد(٥/ ١٧٣).

٢ــ نموذج الإدارى المستخلص من إدارة عمر لا ١٥٨.

بوون، كە دژی (بنی أُمیة) وەستابوون بەڕابەرایەتی (شوذوب الخارجی) لە ساڵی ١٠٠ی كۆچیدا، تا بزانێت چی وای لێ كردوون بەوكارە هەستن و بزانێت بەلەگەڵیان دانیشتن بكات، بیانهێنێتەوە ناو بازنەی باقی موسڵمانانی گوێڕایەڵ، بەڵام ئەو لەسەر خۆیی یەیدا هەنگاوی بویرانەو پڕمتمانە ناوە، بەرامبەریان كاتێ مەسەلەكە گەیشتۆتە ئەوەی خۆێنی خەڵكیان ڕشتووە و خراپەیان بەرپا دەكرد، بۆ ئەو مەبەستە نامەی نووسی بۆ كار بەدەستەكەی عیراقی پێ ی ووت: نەیان جوڵێنێت نەیانخەیتە جەنگ مەگەر ئەوان دەست بكەن بەخوێن ڕشتن و خراپەو ئاژاوە نانەوە، ئەگەر وایان كرد ئەوە تۆش خۆتیان بۆ ساز بكە، بەڵام پیاوێكی ولێهاتوو بەسوپایەكەوە بنێرە بۆیان، ئەو قسانەی بۆ بكە، كە من بۆم كردوویت.[1]

ئاو بەو جۆرە بووە لە جێ بەجێ كردنی هەموو ئەو كارانەیدا، كە دەیویست بیانكات و هەموو كارێكی پێویستی لە ئاستێكی بەرزی گرنگی پێدان و هەست پێ كردندا ئەنجام دەدا، ئەو لێبڕان و قسە بردنە سەرانەی ڕۆڵی چاكیان هەبوو، لە بەڕێوەبردنی كارەكانداو جێ بە جێ كردنی ئەو هەنگاوانەی، كە دادو یەكسانی و ئارامیان بۆ كۆمەڵگە دەگێڕایەوەو ئاسەوارەكانی سەردەمی خیلافەتی ڕاشدینیان زیندوكردەوە.[2]

### ٨ـ داد پەروەری:

ڕەوشتی دادپەروەری لە ڕەوشتە ئاشكرا و دیارەكانی عمری كوڕی عبدالعزیز بوو، پێشتر باسی دادم كردوە لە دەوڵەتەكەیدا و سیاسەتەكانیم ڕوون كردووە لە بواری هەڵگرتنی ستەمەكانی پێش خۆی، هەموو زاناكان لەسەر ئەوەن، كە عمری كوڕی عبدالعزیز لە پێشەوایانی دادپەروەری یە، یەكێكە لە خەلیفەكانی ڕاشدین و پێشەوایانی هیدایەت.[3]

---

١ـ تأریخ الطبری (٧/ ٤٥٩)

٢ـ نموذج الإداری لا ١٦٢.

٣ـ البدایة والنهایة لە النموذج الإداری لا ١٦٣ وەرگیراوە.

لەوانەیە ئەم دادپەروەریەی عمر لەوە سەر چەشمەی گرتبێت، کە باوەڕی بتەوی بەوە هەبوو، کە داد پەروەری یەکێکە لە بنەمای کارەکانی خوا لە بونەوەردا، لەوەش تەواو دڵنیابوو، کە دادپەروەری بەرهەمێکی سروشتی باوەڕە، یەکێکە لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئەو باوەڕدارانەیە، کە حەزدەکەن هەق سەربکەوێت، هەروەك عمر خۆی لە سەردەمی خەلیفەکانی پێش خۆیدا ژیابوو، دەیزانی چ ناهەقیەکیان کردووە بە خەڵکی. ئەمانە لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەوەیە، کە خوای عزوجل فەرمانی داوە بەداد پەروەری و چاکە کاری و بنەمای سەرەکی هەموو ئاینێکی ڕاست و دروستی داناوە، ئێ ئیسلامیش خۆی ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لەگەشە کردنی خۆشەویستی عمر بۆ داد پەروەری و زیندوکردنەوەی بەهاکانی.[1]

فەرموون لەگەڵ نمونەیەك لە دادپەروەری عمر، کە پێشتر باسم کرد نەکردووە، ئەویش ئاجوری دەگێڕێتەوە دەڵێت: پیاوێك لە (أهل ذمة) لە شاری حیمسی (سوری)هات بۆ لای عمر پێ ی ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران داوات لێ دەکەم قورئانەکەی پەروەردگار جێ بەجێ بکە، عمریش ووتی: چی بووە؟ پیاوەکە ووتی: عەباسی کوڕوی وەلیدی کوڕی عبدالملك زەویەکەی لێ داگیر کردووم، لەو کاتەدا عەباسیش لەوێ دانیشتبوو، بە عەباسی ووت: ها عەباس تۆ چی دەڵێیت؟ عەباس ووتی: ئە میری باوەرداران وەلیدی کوری عبدالملك پێ ی داوم وتاپوشی کردووە لەسەرم، عمریش ڕووی کردە (ذمی) یەکەوڕی ی ووت:هاتۆچی دەڵێیت؟ ووتی: ئەی ئەمیری باوەرداران من ووتم کتێبەکەی خوا شایانترە کاری پێ بکەیت، تا نوسراوەکەی وەلیدی کوڕی عبدالملك، عمریش بەعەباسی ووت: دەی عەباس زەویەکەی بۆ بگێڕەوە، ئەویش زەویەکەی ـ ناچار ـ بۆ گێڕایەوە.[2]

یەکێکی تر لە هەڵوێستە پڕ لە دادەکانی عمر﵀ ئەوەیە، کە حەکەمی کوڕی عمری (الرعینی) باسی دەکات و دەڵێت: بە چاوی خۆم بینیم مەسلەمەی کوڕی

---

١ـ نموذج الإداري لا ١٦٣، ١٦٤.
٢ـ أخبار أبی حفص لا ٨٥

عبدالملك ی کوڕی مەڕوان لەگەڵ خەڵکی (دیراسحاق) دا لە ناعورە[1] لە بەر دەمی عمری کوڕی عبدالعزیز وەستابوون، عمر بە مەسلەمەی ووت: لەسەر دۆشەکەکە دامەنیشە بەرامبەر نەیارەکانت لەبەر دەممدا، بەڵکو یان تۆش وەك ئەوان بەچۆکدا بکەوە لەبەر دەممدا، یان بریکارێك بگرە بۆخۆت، ئەویش وەکیلێکی گرت، لە ئاکامدا ناعورەیشی لێ سەندەوە بۆ خەڵکی (دیراسحاق).[2]

ئەمەش نمونەیەکی زۆر کەمە لە دەریایی ئەو هەموو ڕیوایەتانەی باس لە داد پەروەری عمر دەکەن.

## ٩ــ لاڵانەوەو پاڕانەوەی عمر و گیرابوونی دوعاکانی:

عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه الله زۆر دەپاڕایەوە ودەکڕوزایەوە لەبەردەمی خوادا، هەردەم دەیووت: ئەی پەروەردگار تۆ دروستت کردووم فەرمانت پێ داوم و بەرگریشت لێ کردوم، پەیمانیشت داوە پێم کەپاداشتی چاکەم بدەیتەوە لەسەرگوێرایەڵی و فەرمانەکانت و ترساندویشمت لەسزای سەختت ئەگەرقەدەغەکراوەکانت بشکێنم دوژمنێکت بەسەردازاڵ کرووم کەلەناو سنگمدا داتناوە لەناوخوێنم داهاتو چۆدەکات ئەگەر نیازی گوناهێك بکەم هانم دەدات ئەگەرنیازی چاکەیەك بکەم ساردم دەکاتەوە وبێئاگابم ئەوبێ ئاگانابێت من شتم لەبیر بچیت ئەوە شتی لەبیر ناچێت حەزو ئارەزوواتم لە لا شرین دەکات دەمخاتە ناو شتە گوماناویەکانەوە (شبهات) وە ئەگەرتۆ لای نەدەی لێم سەرشۆرم دەکات دەی خوایە لوتی بشکێنی نەهێلی دەستی بڕوات بەسەرمدا بەهۆی(ذکر)و یادی تۆوە دەم کوت و بەندی بکەم و منیش بێمە ڕیزی پارێزرانەوە - معصومین - ولاحول ولا قوه الا بالله.[3]

---

١ــ ناعورە ناوچەیەکە (٨) میل لەحەلەبەوە دوورە.

٢ــ سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن الجوزی) لا ٩١.

٣ ـ الکتاب الجامع لسیرة عمر بن عبدالعزیز (١/ ٣٤١).

هەروەها دەیووت: ((اللهم أصلح من کان صلاح لامة محمدﷺ، اللهم أهلكْ من کان هلاکه صلاح لامة محمدﷺ)).[١] واتە: ئەی پەروەردگار چاکی بکەی ئەو کەسەی بە چاکبوونی ئەو ئوممەتی محمد چاك دەبێت، پەروەردگارم لەناوی بەرە ئە کەسەی بەلەناو بردنی ئوممەتی محمدﷺ چاك دەبێت.

دەیووت: (ئەی پەروەردگارم بێ وەییم پێ ببەخشە، تا تامی ژیانم بچێژم، لەئاکامدا لێم ببورە، تا گوناه زیانی نەبێت بۆم و، لەهەموو ناڕەحەتی یەك بمپارێزە، تا دەم گەینێتە بەهەشتەوە بەسۆزو بەزەیی خۆت ئەی بەسۆزترین و بەبەزەیی ترین کەس.[٢]

ئەی پەروەردگارم خۆشەوست ترین مەسەلە لەلای تۆ کە(یەکتا پەرستی)یە گوێڕایەڵیم کردویت، لە بێزراوترین مەسەلەش لەلای تۆ، کە هاوبەش پەیداکردنە سەرپێچیم نەکردویت،) دەی هەرچی لەو نێوانە داکراوە لێم خۆش ببە.[٣]

هەروەها دەیوت: خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی سپڵەم بەرامبەر بەخشەکانت، یان سپڵەیی بنوێنم دوای لەدەس چونیان، یان لەبیریان بکەم و باسیان نەکەم.[٤]

زۆرجار دەیووت: ئەی پەروەردگارم ڕازیم بکە بە کارەکانت، کارەکانیشم لێ پیرۆز بکە، تاوام لێ دێ حەز بەپێشخستنی شتێك نەکەم، کە تۆ دوات خستبێت، یان حەز بە دواخستنی شتێك، کە تۆ پێشت خسبێت.[٥]

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله دوعاکانی گیرا بوو، (ابن عبدالحکم)، دەڵێت: (ابن ریان) جەلاد و شمشێر وەشێنی تایبەتی وەلیدی کوڕی عبد الملك بوو، کاتێ

---

١ - الکتاب الجامع لسیرة عمر بن عبدالعزیز لا ٣٤٢.
٢ - هەمان سەرچاوە لا ٣٤٣.
٣ - سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن جوزی) لا ٢٣٠.
٤ - الکتاب الجامع لسیرة عمر(١/ ٣٤٣).
٥ - الکتاب الجامع لسیرة عمر لا (١/ ٣٤٣).

عمرڕەحمەتی خوای لێبێت بووبە خەلیفە وتی: من کارە لارو تۆەهاتەکانتم لە بیرە، پاشان ووتی: ئەی پەروەردگارم من لەسەر کار لایدەبەم و تۆش هەرگیز بەرزی نەکەیتەوە، ئیتر لەو کاتە بەدوا یەك رێزی نەماو باس و خواسی بەیەکجاری لەقوفلە وە کوژایەوە)).[١]

عمرڕەحمەتی خوای لێبێت کاتێ ئەمیری شاری مەدینە بوو ڕۆیشت بۆ حەج و لە ڕێگای پێیان ووت: لە مەککە زۆر بێ ئاوی یە، ئەویش لە خوا پاڕایەوە و، خوایش دووعاکەی گیرا کردو هەموویان ئاویان خواردەوە.[٢]

کاتێ لەگەڵ (غیلانی قەدەری)دا گفتوگۆی دەکردو وتو وێژکەوتە نێوانیان و دەستی بەرزکردەوە بۆلای پەروەردگار ووتی: ئەی پەروەردگار ئەگەر ئەم غیلانە لەسەر هەقە ئەوە باشە ئەگەر لەسەر هەق نی یە ئەوە بکرێت بەدارا، ئەوە بوو دوا جار لەسەردەمی خەفەی هشام ی کوڕی عبد الملك دا لە دار درا.[٣]

## دووەم: مەشخەڵی نوێ خوازی لەلای عمری کوڕی عبدالعزیز

ئەوی بەوردی سەرنجی ووتەی زانایان و مێژوو نووسان و ئەوانەی گرنگی دەدەن بە بواری نوێ خوازی بۆی دەردەکەوێت، کە عمری کوڕی عبدالعزیزڕەحمەتی خوای لێبێت بەیەکەمین نوێ خواز دادەنرێت لە ئیسلامدا.[٤]

یەکەمین کەس، کە ئەو وەسفەی بڕی بەبالای عمردا پێشەوا محمدی کوڕی شەهابی(الزهری)بوو، لەپاش ئەو پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە((ان الله یبعث علی رأس کل مائه عام من یصححُ لهذه الامة امر دینها))واتە: خوای گەروە لە هەموو (١٠٠)ساڵ جارێك کەسێك هەڵ دەخات، کە ئەم دینە ڕاست و دروست ونوێ بکاتەوە بۆ موسڵمانان)و لەپاشاندا ووتی: سەیری(١٠٠)ساڵی یەکەممان کرد دەبینین عمری کوڕی عبدالعزیز.[٥]

---

١ - سیرة عمر بن عبدالعزیز (إبن عبدالحکم) لا ٣٠.

٢ - البدایة والنهایة لە(الاثار الواردة) لاپەڕە (١/ ١٨٣)وەرگیراوە.

٣ - الشریعة للآجری(١/ ٤٣٨).

٤ - عون المعبود، العظیم آبادي (١١/ ٣٩٣) جامع الاصول (١١/ ٣٢٢).

٥ - سیرة ومناقب عمری بن عبدالعزیز ابن الجوزي لا ٧٤.

دوای ئەوانیش زاناکانی ئیسلام یەك لە دوای یەك عمریان بەیەکەمین نوێ خواز داناوە و هەندێ لە ئەهلی عیلمش فەرموویانە ئەو فەرموودەیە مەبەستی لە عمرو هاو وێنەکانی یەتی، کە پێغەمبەری خودا دەفەرموێت: ((ان الله یبعث علی رأس کل مائه عام من یصحح لهذه الامة امر دینها)).[١]

گومانی تێدا نی یە، کە عمری کوڕی عبدالعزیز شایستەی ئەوەیە ئەم فەرموودەیە بیگرێتەوە، چونکە ئەو زانا بوو، کردەوەکار بوو، هەموو ئاوات و مەبەست و خەمی شەو ڕۆژی زیندوو کردنەوەی سوننەتەکان و لە گۆڕنانی بیدعەو شتە تازەکان بوو، کە هێنراوەنەتە ناو ئیسلامەوە و سڕینەوەی و شکاندنی هەڵگرانی بەزمان و بەدەست.[٢]

(ابن حجر العسقلانی)دەڵێت: ئەو سیفاتانەی، کە پێویستن تازە بکرێنەوە تایبەت نەکراوە بەکومەڵی کاری خێرەوە، زەروریش نی یە هەموو ڕەوشتە چاکەکان لەوکەسەدا دەبیٚ دی، مەگەر ئەو سیفەتانە هەمووی لەعمری کوڕی عبدالعزیزدا هاتنە دی، ئەو لەسەری سەد ساڵی یەکەمدا بە هەموو سیفاتە جوانەکانەوە بگرە پێشکەوتنیشی لەو بوارەدا دەرکەوت، واحمد بەڕاستی ئەوە دەردەبڕێت، کە زاناکان ئەو فەرموودەیە دەربڕن بەباڵای عمردا، بەڵام ئەو کەسەی دوای ئەو هات ئیمام شافیعی بوو، هەرچەندە ئیمامی شافعی سیفاتی جوانی زۆری تێدا بوو، بەڵام ئەو بەکاری جیهاد و حوکمڕانی و بەرپاکردنی دادپەروەری هەڵنەساوە.[٣]

هەندێ لەزانایان پێیان وایە، کە نوێخوازی تەواو بەکەس ناوترێت، جگە لە (محمد المهدی)، کە لە ئاخر زەماندا دەردکەوێت، تا ئێستا لەناو ئوممەتی ئیسلامدا لە دایك نەبووە، هەرچەندە عمری کوڕی عبدالعزیز نزیك بوو بگاتە پلەو پایەی نوێخوازی ئەگەربیتوانیبایە خلافەت بگێڕێتەوە بۆسەردەمی خەلیفەی ڕاشیدەکان و لەڕێگەی شوراوە هەڵبژێرانایەتەوە.[٤]

---

١ ـ المجدون في الاسلام للصعدي و ٧.
٢ ـ الاثار الواردة عن عمر في العقيدة(١/ ١٧٧).
٣ ـ فتح الباري (١٣/ ٢٩٥).
٤ ـ موجز تأريخ تجديد الدين للمودودي لا ٦٩.

جیاوازی نی یە، عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بەنوێخوازی ڕاستەقینەی تەواو دابنرێت ،یان نا؟چونکە کارە مەزنە نوێ خوازیانەی پێ ی هەستاوە و ئەو ماندوبوونەگەورەیەی کێشاویەتی لەپێناو هێنانە دی ژیانی موسڵمانەتی بۆ ناو کۆمەڵگەو خاوین کردنەوەو پاك کردنەوەی، ئیسلامی کردەوە، وەك سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکان لێ کردەوە و ئەو کارەشی وای لێ دەکات، کە بخرێتە ڕیزی نوێخوازانەوە، کە تا ئێستاش زەمانە شتی وای دووبارە نەکردۆتەوە.

ئەو پلەو پایە مەزنەی، کە خیلافەت بوو یارمەتی دا ئەو کارە ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی گەورەیی ئەو کارە نوێخوازیەی عمرمان بۆ دەربکەوێت و ئەندازەی ئەو گۆڕانکاری و کۆدەتا گەورەیەی هاتبوون بەسەر خەلافەتی ئیسلامدا.

لەوانەیە لەڕاستی لا نەدەین ئەگەر بڵێین تەنها لادانێك ڕوویدا بێ لەو کاتەدا لەشێوازی حوکمڕانیدا بوو، کە پاشتر ئاکامی زوڵم و ستەم گەندەڵی لێ کەوتەوە، بەلام ژیانی موسڵمانان بەگشتی هێشتا پرشنگی پێغەمبەرایەتی پێوە دیار بوو کاریگەری لەسەری هەبوو، ئایین دەستەلات داری بوو یەکەم بەسەر دڵەکانەوە.[1]

## ١- چاکسازی یەکانی عمرو کارە نوێخوازی یەکانی:

**ا- یاسای شورا:** پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەیەکەمین ووتاریدا پاش وەرگرتنی کاری خیلافەت ئەوە بوو پاش سوپاس و سەنای پەروەردگار ووتی: ئەی خەڵکینە، من تووشی ئەو بەرپرسیاریەتی یە بووم بەبێ ئەوەی ڕای خۆمی لەسەر وەرگیرابێت، یان داوام نەکردبێت، یان حەزم لێ کردبێت دەی ئەوا من بەیعەتە دەردەچم و خۆتان سەرپشك بن کێتان بە دڵە هەڵیبژێرن)).

لەو کاتەدا خەڵکەکەش بەیەك دەنگ هاواریان کرد: ئەوا تۆمان هەڵبژارد ئەی ئەمیری باوەڕداران، بە تۆ ڕازین، کارمان بگرە دەس بەنگینی و پیرۆزی و

١ - عمر بن عبدالعزیز (الندوی)لا ١٠.

بەرەکەتەوە)).[١]

ئاب بەو کارەی، عمر هەستا بەئەنجام دانی یەکەمین کاری نوێخوازی، بەجۆرێ خۆی لەپاشای خۆسەپێن ڕزگار کرد، زۆری لێ نەکردن قبوڵی کەسێك بکەن، کە خۆیان هەڵیان نەبژاردووە، بەڵکو کارەکەی دایەوە دەستی خۆیان و کردەوەی بۆ شوراو ڕاوێژکاری.[٢]

**ب ـ سەیر کردنی وەك سپاردە:** لە زۆر لاوە پێمان گەیشتووە، کە عمر رحمه الله زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی بەترسناکی ئەمانەتەوە بڕوانێتە ئەوکارە و بەگەورە و ترسناك و پڕ لێ پرسینەوە و ئەرکی قورس ی دابنێت، هەر لەسەرەتاوە لێیان پرسی، ئەوە چی یە؟ بەغەمبار دێیتە بەرچاومان؟ لەوەڵامدا ووتی: ئەم کارەی بەسەرمندا سەپاوە شایانی هەموو غەمباری یەکە، چونکە یەك کەس نی یە، لەم ئوممەتە کەمن نەمەوێت مافی خۆی بۆ بگێڕمەوە، ئیتر سکاڵا بەرزکاتەوە، یان نا؟[٣]

هەر لەو ووتارەیدا ووتی: من باشترین کەستان نیم، بەڵام بارم لەهەمووتان قورس ترە.[٤] هەموو جارێ داوای لەکاربەدەست و والی یەکانی دەکرد، کە خاوەن دین و لێهاتووو هەڵبژێرن بۆ بەرپرسیارێتی کاروباری موسڵمانان، نامەی نارد بۆ یەکێ لەکاربەدەستەکانی و پێ ی ووت: یەك بەر پرسیاریەتی موسڵمانان ناگرێتە ئەستۆ مەگەر بەجوانترین شێوەو دڵسۆزانە بژی لەگەڵیاندا و ئەسپاردەی دراوەتەوە دەستت بە چاکترین شێوە ئاگاداری بە.[٥]

سیاسەتی خۆپاراستنی لەسیاسەتی پاراستنی سامانی موسڵمانان ـ دەوڵەت ـ لەشتی بێ هودە و إیسرافدا۔ تەنها لەسەر خۆی پێویست نەکردبوو، بەڵکو ئەمەشەی داوا دەکرد لە کاربەدەست و والی یەکانی، بۆ ئەو مەبەستە نامەی نووسی

١ ـ سيرة ومناقب عمر ابن عبدالعزيز ابن جوزي لا ٧٤.
٢ ـ التجديد في الفكر الاسلامي. د. عدنان محمدلا ٧٩.
٣ ـ سير أعلام النبلاء(٥/ ٥٨٦).
٤ ـ هەمان سەرچاوە.
٥ ـ تأريخ الطبري لە التجديد في الفكر الاسلامي لا٨١.

بۆ ئەبو بەکری کوڕی حەزم پێ ی ووت: نووکی قەڵەمەکەت باریك بکەرەوە- واتە ورد بنووسە- و دێرەکانیش لەیەکتر ی نزیك بکەرەوە - واتە دێر مەپەڕێنە - چونکە من زۆرم پێ ناخۆشە سامانی موسڵمانان بەفیڕو و بێ هۆدە خەرج بکرێت.[1]

سیاسەت و هەڵسوکەوتی حوکمڕانی لەگەڵ گەلەکەیدا زۆر بەرحم و بەبەزەیی بوە و ژیانی خۆشی بۆ دەستە بەرکرد بوون و لە سواڵ و دەست پانکردنەوە ڕزگاری کرد بوون، هەرچی لەمیزانیەی (بیت المال) زیاد بوایە بەشی دەکرد بەسەر نەداراندا،[2] (٣)درهەمی بڕیەوە بۆ هەژارەکانی شاری بەسرە، بۆبەساڵاچووەکانیش (٥٠)درهەم.[3]

داوای دەکرد لەوالی وکاربەدەستەکان هاوکاری ئەو کەسانە بن، کە نیازی حەج کردنیان هەیە، مەسروفی بگرنە ئەستۆی خۆیان.[4] نامەی نووسی بۆ کاربەدەستەکان و پێ ووتن: شوێنی حەوانەی زۆر دروست بکەن لەناوچەکەتاندا هەرڕێبوارێکی موسڵمان بەناوتاندا تێپەڕدەبێ شەو ڕۆژێك میدوانداریان بکەن و ، خزمەتی وڵاخەکەیان بکەن، ئەگەر نەخۆشیان هەبوو ئەوە دوو ڕۆژ و دووشەو خزمەتیان بکەن، ئەگەر پارەشی لێ بڕا ئەوەندی پێ بدەن، کەبگاتە وە ناوچەکەی خۆی).[5]

تاوای لێ هات لەسەردەمی عمردا کەس نەمابوو زەکات وەربگرێت، لەوبارەیەوە عمری کوڕی ئەسیر دەڵێت: وەڵڵاهی عمری کوڕی عبدالعزیز نەمرد، تاوای کردبوو لەخەڵکی، کە پیاوێك پارەو سامانێکی زۆری دەهێنا بۆ(بیت المال)و دەیووت: خۆتان چۆنی بەباش دەزانن وا سەرفی بکەن، کەچی ئەوەندە خەڵکی دەوڵەمەند بوو بوون، کەس نەبوو وەری بگرێ و کابرا هەموو پارەکەی بردەوە بۆماڵ).[6]

١ - سير أعلام النبلاء(٥/ ٥٩٥).
٢ - تأريخ الطبراني التجديد في الفكر الاسلامي لا ١٨.
٣ - تأريخ الطبراني(٧/ ٤٧٤).
٤ - هەمان سەرچاوە.
٥ - هەمان سەرچاوە.
٦ - سير أعلام النبلاء(٥/ ٥٨٨).

لەم دەوڵەتەدا ڕێزو حورمەتی موسڵمانان لەسەرووی هەموو شتێکەوە بوو، بۆ ئەو مەبەستە نامەی نارد بۆ کاربەدەستەکانی و پێ ی ووتن: بەپارەی دەوڵەت دیلی موسڵمان ئازادبکەن، ئیتر باخەزێنەکەشتان خاڵی ببێتەوە).[١]

تا ئەمڕۆش ئەو دەوڵەتە بنکە ئابووری بتەوەی عمر دروستی کرد بەڵگەیەکی مێژوویی یە بۆ ئەوکەسانەی گومانیان هەیە لە دروست بوونی ڕێسایەکی ئابووری ئیسلامی، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەرەوەی، کەشەریعەتی ئیسلام بەتەنها خۆی دەتوانێت ژیانێکی خۆش و بەختەوەر بۆ خەڵکی سەرزەوی بەگشتی فەراهەم بێنێت چ لە دونیا، چ لە لەقیامەتدا.[٢]

## ج ـ بنەمای داد پەروەری:

لەبواری دادپەروەری عمر، کەس شانی نەدەدا لەشانی زۆر بەرز بوو، بەڕاستی دەتوانم بڵێم داد پەروەری بەویراسەت بۆی مابۆوە لەباپیرە عمری کوڕی خطاب یەوە رضي الله عنه لەسەر سکەی پارەی نوسیبووی: ((خوا فەرمانی داوە بە وەفاداری و داد پەروەری)).[٣] فەرمانی دەرکردبوو، کە سزای (حدود)بەسەر کەس دا جێ بەجێ نەکرێت، گەر پاش ئاگاداری ئەو)).[٤]

نامەی نارد بۆ ئەمیری خۆراسان(جەراحی کوڕی عبداللە)و پێ ووت: ئەی کوڕی دایکی جەراح هەرگیز قەمچی نەدەیت لەموسڵمانێك، یان کەسێکی (أهل الذمة) مەگەر بە هەقی خۆی، ئاگات لە تۆڵە بێت، چونکە تۆ دەگەڕێنێتەوە بۆلای کەسێك ئاگای لەناپاکی چاوەکان و نهێنی دڵەکان هەیە، نامەیەکت دەدەنە دەست بچوکترین، تا گەورەترین گوناهی نەپەڕاندووە هەمووی لەسەر تۆمار دەکرێت، لەگەڵ (أهل الذمة)دا زۆر بە ویژدان بە فەرمان دەربکە کەس دەستدرێژیان بۆ

---

١ ـ سيرة عمر ابن جوزي لا ١٢٠.

٢ ـ خامس خلفاء الراشدين عمر بن عبدالعزيز لا ٤١.

٣ ـ التجديد في الفكر الاسلامي لا ٨٥.

٤ ـ سير أعلام النبلاء(٥/ ٥٨٨).

نەکات وسوژدەگایان تێك نەدەن.

نامەی نار بۆ کاربەدەستێکی تری و پێ ی ووت: هیچ کەنیسەو هیچ دیر و هیچ ئاگردانێك تێك مەدەن، کە لەسەری صولَح و ئاشتەواییان کردوە.[١]

باج و دەیەك لابرا و سەرانە نەما، کە حکومەتەکانی پێشوو سەپاند بوو با، خەڵکی سەربەست بکە لە کاری بازرگانیدا چ لە دەریا و چ لە ووشکانیدا، خۆت بەری بکە لە ناهەقیانەی بەنی ئوممەیە کردوویانە، خۆت بەری بکە لەو کارەکانی حەجاج و نەهێڵی کاربە دەستەکانی دوای ئەو بەسەر کارەکانی ئەودا بڕۆنەوە).[٢]

**د ـ زیندو کردنەوەی (( فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە )).**

وردە وردە خەلافەتی ئیسلامی لەو مەبەستەی لای دەدا، کە لەپێناویدادروست بوو بوو، کە ئەویش پارێزگاری بوو لەئاینی ئیسلام، عمر ئەم مەبەستەی یندوو کردەوە و ئالآکەی سەر لە نوێ بەرزکردەوەو ڕێزی خۆی پێدایەوەو لەپێش هەموو شتێکەوە حسابی بۆ کردبوو.

ئەوەی وای کرد لە عمر کەسەر کەوتووبوبێت لەم کارە مەزنەی دا ئەو ترسە گەورەیەی بوو لەخوای عزوجل ومەبەستی سەرەکی ڕەزامەندی ئەو بوو، هەروەها یارمەتی پشتگیری گەورە زانایانی ئەو سەردەمە ڕۆڵیان هەبوو لەسەرکەوتندا.[٣]

عمری کوڕی مەیمون دەڵێت: زاناکان لە خزمەت عمری کوڕی عبدالعزیز دا قوتابی بوون.[٤]

دروسی ئاینداری و خاوێنی بیرو باوەڕەکە کاریگەری سەرەکیان هەبوو لە سەرکەوتنی نوێخوازی و چاکسازی یەکانیدا، جەنگی دژی ئارەزووکاری و بیدعە

---

١ ـ سير أعلام النبلاء(٥/ ٥٨٨).

٢ ـ سيرة ومناقب عمر (١٠٧، ١٠٨).

٣ ـ التجديد في الفكر الاسلامی لا ٨٥.

٤ ـ سير أعلام النبلاء(٥/ ٥٨٨).

چێی ڕاگەیاند بوو و زۆر توند بوو لەگەڵ هەڵگرانیاندا،[١] لەمەولا (انشاء الله) بەدرێژی باسی لێوە دەکەین.

(الامام لاوزاعی) لە عمرەوە دەگێڕێتەوە، کە وتوویەتی: (( هەرکاتێ کۆمەڵێکت بینی بەدزی یەوە و بەبێ ئاگاداری موسڵمانان بەگشتی و بەچپە خەریکی شتێکن ئەوە دڵنیا بە خەریکن گومڕایی دادەمەزرێنن).[٢] و هەموو جارێ دەیووت: ژیان چ نرخێکی هەیە ئەگەر سوننەتێك زیند وو نەکەیتەوەو بیدعەو داهێنراوێك نە مێنێت.[٣]
گرنگی یەکی لە ڕادە بەدەری هەیە بە چینە جیاجیاکانی خەڵکی و ئاین و عیباداتیان، هانی کاربەدەستەکانی خۆی دەدا، کە پێش هەموو کەس لەمزگەوتدا جا ئامادەی توێژی کۆمەل بن و بۆی دەنووسین: ((خۆتان بەهیچ شتێکەوە خەریك نەکن لەکاتی نوێژەکاندا، چونکە هەرکەسێك نوێژەکانی بفەوتێنێت ئەوە زۆر ئاسی یە لەلای فەرمانی تری ئیسلام بفەوتێنێت).[٤]

کەسایەتی بەرزو سیاسەتی پڕ لەداد و خواناسی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله کاری کردبووە سەر چینەکانی کۆمەڵگا حەزو ئارەزووەکانیشی بەرەو چاکە و خواناسی هێنا بوویەوە.[٥]
(طبري) لە مێژووەکەیدا دەگێڕێتەوەو باس لە راوردێکی جوان دەکات لە نێوان عمرو خەلیفەکانی پێش خۆی و دەڵێت: وەلیدی کوڕی عبدالملك بەسروشتی خۆی حەزی لە خانووی جوان و کارگەو بیناسازی کردەوەو هەر ئەم کۆشکەکەی ڕازاندۆتەوەو، بۆیە گەلەکەیشی چاویان لێ کردەوە وەك ئەو حەزیان لە خانووبەرە بووە ڕۆژانە کابرا بگەیشتایە بەهاوڕێ یەکی دەربارەی خانووبەرەو کۆشك پرسیاری

---

١ ـ التجديد في الفكر الاسلامی(لابن الجوزي) لا ٨٦.
٢ ـ سيرة ومناقب عمر ابن عبدالعزيز ابن جوزي لا ٨٣.
٣ ـ التجديد في الفكر الاسلامی لا ٨٦.
٤ ـ سيرة ومناقب عمر ابن عبدالعزيز ابن الجوزي لا ٢٢١.
٥ ـ التجديد في الفكر الاسلامی لا ٨٦.

لێ دەکرد، بەڵام هەر کەسەردەمی سولەیمان هات، چونکە حەزی بە ژن هێنان خواردنی بەلەزەت بوو، ئەو خوەی کاری کردبووە سەر میللەت و کەسێ بگەیشتایە بەکەسێکی تری دەربارەی ژن هێنان و کەنیزەك و ئەم جۆرەشتانەپرسیاری لێ دەکرد، بەڵام هەر، کە سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیز هاتە پێشەوە ـ چونکە خواناس و قورئان خوێن و شەو نوێژ گەر بوو- کاری کردبۆە سەر گەلەکەی و کاتێ کەسێك دەگەیشتە هاوڕێکەی پرسیاری لێ دەکرد: ئەم شەو چەند ڕکەعات شەو نوێژت کرد؟ چەند ئایەتت لەبەر کردوە؟ کەی ختمەکەت تەواو دەکەی؟ کەی ختمەکەت تەواو کرد؟ لەم مانگەدا چەند ڕۆژ بەڕۆژوو دەبیت؟.[1]

عمرﷺ هەر بەوە نەوەستا، کە پابەند بوو بەئیسلامەوە و بەرپاکردنی ئاین لە دەوڵەتەکەیدا، بەڵکو گرنگیشی داوە بەو گەلانەی یشی، کە موسڵمان نەبوون و هەوڵی داوە بانگیان بکات بۆ لای ئیسلام و نامەی ناردوە بۆ پاشاکانی هندستان؟ و (ماوراء النهر)و پەیمانی پێ دابوون، کە ئەگەر موسڵمان ببن وەك موسڵمانانی تر سەیر دەکرێن و هەموو مافێکیان لەگەڵ ئەواندا دەبێت، بەو بۆنەیەوە زۆرێکیان موسڵمان بوون و ناوی خۆیان گۆڕی بۆ ناوە ئیسلامی یەکان.[2]

لەوکارانەی ، کە وەك خزمەت کردن بە ئیسلام کردنی، فەرانی دەرکر زانستە ئیسلامی یەکان بنووسرییێنەوە و بەتایبە زانسی فەرموودە، و لە داهاتوودا زیاتر لەسەر ئەم لایەنە دەڕۆین، هەموو ئەم کارە مەزنانەو ئەم پرۆژە بزورگانەی ئەنجام داوە لەماوەی کورتی خەلافەتیدا، بووبە گەوهەرێك بۆئوممەتی ئیسلام، بووبە مانگێك لەتاریکایی شەودا ڕێبواران بتوانن ڕێبازی نوێخوازی و چاکسازی بگرنە بەرو ڕێگای بۆ ئاچوخ کردن.[3]

---

١ ـ تأريخ الطبري (التجديد في الفكر الاسلامي) لا ٨٧ وەرگیراوە.

٢ ـ خامس الخلفاء الراشدين عمر بن عبدالعزيز لا ٣٠.

٣ ـ التجديد في الفكر الاسلامي لا ٨٧.

## ٢ـ مەرجەکانی نوێخوازی:

لە ڕێگەی ژیانی عمری کوڕی عبدالعزیزەوە ئەتوانین کۆمەڵێك مەرج و سیفاتی کەسی نوێخواز دیاری بکەین:

### ا- ناسراوبێت بە بیرو باوەڕی پاك و تەواوی پرۆگرامی:

یەکەمین کارو ئیشی نوێخواز ئەوەیە، کە دووبارە ئیسلام بەرەو کانیاوە سازگارەکەی بگەڕێننەوە و لەهەموو ئەوشتانەی تێ ی ئاخنراوە پاك بکرێتەوە، ئەم کارەش ناکرێت مەگەر لەسەر دەستی یەکێکدا، کە خۆی لەسەر ڕێبازی خاوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت و هاوەڵە بەڕێزەکانی و کۆمەڵی ڕزگار بوو ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردون، کە دەبن(٧٣) بەشوە و تەنها یەك بەشیان لەسەر ڕاستی یەوە، ئەو بەشەش ئەوەیە زیاتر چاکتر پابەند و پرۆگرامی پێغەمبەری خواوە ﷺ.[١]

ئەم مەرجەش لە عمری کوڕی عبدالعزیز دا بەرجەستە بوو وەك لە داهاتوودا باسی لێوە دەکەین.

### ب ـ دەبێت زانا نابێت و توانای ئیجتیهادی هەبێت:

ئەم مەرجە لە عمری کوڕی عبدالعزیز دا هاتبوە دی، ڕووبەڕووە ئەو گێرەو کێشانە بویەوە، کە لەسەردەمەکە دا ڕوویان داو هەوڵیشی دا چارەسەریان بۆ دۆزێتەوە، لەڕاستیدا: مەرجەکانی (ئیجتهاد) کردن بەو شێوەیەش ناڕەحەت نی یەکە لە کتێبەکە فیقهی و ئوصولی یەکاندا هاتووە، بەجۆری باسیان کردوە، کە مەحاڵە ئەو مەرجانەی لەکەسێکدا بێتەدی و بەجۆرێ، کە دایان ناوە دەبێت هەموو زانستەکانی بزانێت وەك ـ نەحوصرف و زمان و بەلاغەوزانستی شەرعی و وەك تەفسیر و فەرمووده و ئوصول فقه و زانستی قورئان زانستی فەرمووده و سیره و هەردوو عیلمی (منطق و علم الكلام) و کۆمەڵێ شتی تریش، کە زۆر ناڕەحەتە

---

١ ـ التجدید في الفكر الاسلامی لا ٤٦.

لەکەسێکدا بێتە دی.[١]

لەڕساتیدا، ئیجهاد کردن زۆر خۆش و ئاسانە، بۆ هەرکەسێك توانای تێڕوانینی و تێگەیشتنی هەبێت، و نوێخوازیش مەرجە، کە مەبەستەکانی شەرع بزانێت و بتوانێت لێیان حاڵی ببێت و ئەحکامی نوێیان لێ هەڵبگوزێت و شارەزا بێت بەسەردەمەکەی و تێگەیشتووبێت لە واقعیەکەی.[٢]

(المناوی) دەڵێت: لەسەر نوێخوازەکە: بەڵگەی پێ بێت و پشتگیری سوننەت بێت و توانای ئەوەی تێدا بێت، کە (متشبهات) بگرێتەوە بۆلای (محکمات)، توانای دەرهێنانی حوکمی شەرعی هەبێتن لە دەقەکانی قورئان و ماناو ئامارەکانی لە دڵێکی وریاو مێشکێکی بەکارەوە.[٣]

مەوروردی دەڵێت: یەکێ لەو سیفەتانەی دەبێت لە نوێخوازدا هەبێت ئەوەیە دەبێت خاوەنی مێشکێکی ساف و تێڕوانینێکی ورد و تێژو بیری دروست بێت، توانایەکی بێ وێنە لەمانەوە لەنێوانێکی ڕوندا لەنێوان پشت گوێ خستن ـ افراط ـ و ڕۆچوون ـ تفریط ـ دا و ڕەچاوکردنی مام ناوەندی لەو نێوانەدا و هێزی بیرکردنەوەی دوور لە کاری گەری ڕوداوەکانی سەردەم و، دەمارگیری کەچەندان ساڵە جێگیر بووەن ئازایەی یەکی وای دەوێ، کە بەهۆیەوە بتوانێ لەگەڵ ئەو ڕۆژگارە لار بووەدا لادراوەدا هەنگاو بنێت و شانشانێنی لەگەڵدا بکات.[٤]

## ج ـ دەبێت هەردوو بواری فیکری و هەڵس و کەوتی بگرێتەوە:

چونکە گەڕانەوە و ڕاستکردنەوەی فیکری خەڵکی گەورەترین کاری نوێخوازە، خۆ ئاشکرایشە لادان لە هەڵس و کەوتیشدا ڕوودەدات وەك چۆن لەفیکردا ڕوودەدات، بەڵکو زۆربەی لادانە هەڵس و کەوتی یەکان بەهۆی لادانە فیکری یەکانەوە ڕوودەدان.

---

١ ـ عون المعبود (١١/ ١٩٢).

٢ ـ التجدید في الفکر الاسلامی لا ٤٦.

٣ ـ فیض القدیر/ للمناوي(١/ ١٤).

٤ ـ موجز تأريخ تجديد الدين ـ مودودی لا ٥٢.

نوێخواز هەڵدەستێت بەڕاست کردنەوەی فیکرو هۆشەکان و ڕزگاری دەکات لەپۆخڵەواتی گومان و شوبهەکان و، زانستە بەسوودەکانو وتێگەیشتنی ڕاست و دروستی ئیسلام بڵاو دەکاتەوە،لەناو خەڵکیدا لەڕێگەی وانە وتنەوە و نووسین و هەموو کارێکی تری بەردەست، پاشان دەست دەکات بەڕاست کردنەوەی ڕەوشت و هەڵس و کەوتی خەڵکی و پاك کردنەوەی دەروونیان و ڕزگار کردنیان لە هەموو ئەو هەڵس و کەوتە باوانەی دژی شەریعەتی ئیسلامن، ڕاگەیاندنی جەنگ دژی بیدعە و خورافیات ڕابگەنێت، ڕووبەڕووی گەندەڵی ببێتەوە لە هەموو بوارەکاندا بەتایبەت گەندەڵی لەشێواز ی حوکمڕانی و بەڕێوە بردنی وڵاتدا، ئابەو جۆرە نوێخواز ووتەو کردار لەگەڵ زانست و کرداریەك دەخاتەوە.

پێشینەکان ئاماژەیان بۆ ئەم مەرجە کردوەو ووتویانە: نوێخواز سوننەت سەردەخات و بیدعە لەگۆڕ دەنێت.[١]

### د ـ دەبێت سودو کەڵکی بۆ هەموو خەڵکی سەردەمەکەی بێت:

چونکە نوێخواز پیاوی قۆناغێکی کاتی یە، بۆ ماوەی (١٠٠)ساڵ بەردەوام دەبێت، بۆیە وەك مەشخەڵ بەدەستێك وایە، کە خەڵکانێکی زۆر لەبەر ڕۆشنای یەکەیدا ڕێگا دەبڕن و ڕێگا بۆ خەڵکی ڕۆشن دەکاتەوە وتا نوێخوازێکی نوێ لە دایك دەبێتەوە، بەو جۆرە پێویستە زانست و زانیاری یەکەی هەموو لایەك بگرێتەوە، دەبێت شوێنەواری هەوڵە چاکسازی یەکانی بەهەڵس و کەوت و فیری خەڵکی یەوە دیاربێت.

زۆرجاریش بەهۆی قوتابی و ئەندامە گۆش کراوەکانی بەردەستی یەوە دێتەدی، ئەوان هەڵدەستن بەبەردەوامی کاروانە چاکسازی یەکەی کتێب و نووسین و بۆ چوونەکانی لەناو خەڵکدا بڵاو دەکەنەوە و چەندان قوتابخانە ی فیکری دادەمەزرێنن، کە هەنگاوە چاکسازی و نوێخوازیەکەی بەردەوا دەکەن، تا هاتنی نوێخوازی دا هاتوو.

---

١ ـ عون المعبود (١١/ ٣٩١).

**٣ـ فەرموودەی پێغەمبەرﷺ لەبارەی نوێخوازیەوە:**

ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ كە دەفەرموێت: ((ان الله یبعث علی رأس كل مائە عام من یصحح لهذه الامة امر دینها)).[1] ئەو وانانەی لەو فەرمودەیە وەردەگیرێت:

- ئەو فەرموودەیە یەكێكە لەو فەرمودەیە موژدە ئامێزانەی، كە مانای ئەوە دەدات پێمان، كە خوای گەورە ئەم ئاینە لەفەوتان دەپارێزێت ئیتر سەردەمەكانیش دووربكەونەوە و بەڵێنی خوایی یە، كە نوێخوازە رەبانی یەكانی بۆ دەنێرێت و لەپاش خامۆش بوون سەر لەنوێ ڕۆشنی دەكاتەوە، لەقۆناغی مت بوون دەری دەهێنێتەوە، لەڕێگای ئەو ڕێنمایی و ڕووناكی یەوە، كە هەڵی دەگرن.

ئەم فەرموودەیە ووزەیەكی پڕ لە هیوا دەبەخشێتە مرۆڤی موسڵمان، لەوە دڵنیا دەبێت، كە دوا ڕۆژ هەر بۆ ئیسلامە ئیتر با هێزی شەڕو خراپەكاران زۆر بەهێزبن و ئەهلی نەفامیش لە چڵەو پۆپەی سەركەتنشدا بت، نوورو ڕوناكی ڕۆژ هەر دەردەكەوێت، ئیتر باشەوەكانیش لەناو ڕەشایدا وون بووبن.

ئێمە لەم كاتەی ئەمڕۆماندا زۆر پێویستیمان بەپێداگرتن هەیە لەسەر ڕاڤە كردنی ئەو مانایەو، بڵاوكردنەوەی لەناو خەڵكیدا، تا شەپۆڵی ئەو بێ هیوایەی،كە هەموو دەروونەكانی گرتۆتەوە بڕەوێتەوەو خۆی نەداتە دەستی سەر شۆڕی و ملكەچی، بەیانوی ئەوەی گوایە ئاخر زەمانەو هیچ هەوڵێكی چاكسازی كەڵكی نی یەو هەروەها ئیسلام لەئاوا بووندایەو وبێ باوەڕیش لەبرەودایە! ئەوەتا نیشانە بچووكەكانی قیامەت دەركەوتن و چاوەڕوانی نیشانە گەورەكانیشی دەكەین.خاوەنی ئەم بۆ چوونە هەڵەیە بەهەڵە ڕاڤەكردنی هەندێ فەرموودە دەكەنە بەڵگەی دەستیان و جۆری مانای دەكەن، كە ئەو مانایە هەڵناگرێت.[2]

یەكێ لەو بەڵگانە ئەوەیە، كە ئەنەس ﷺ فەرموودەیەكی لەلایەن بخاری

---

١ ـ سلسلة الاحادیث الصحیحة(٢/ ١٥١).

٢ ـ التجدید في الفكر الاسلامی لا ٥٥.

ڕیوایەتی کردووە، دەفەرمویەت: ((لایأتي زمان الاّ الذي بعده شر منه حتى تلقوا ربكم)).[1] واتە: زەمانێ دێتە پێشەوە خۆزگە بە سالآنی ڕابردوو دەخوازێت، تا دەگەنەوە پەروەردگارتان، واتە پار لەئەمسال باشترە.

فەرموودەی: (( بدأ الاسلام غريباً وسيعود غريباً، فطوبى للغرباء)).[2] واتە: ئیسلام بەغەریبی هات و لەپاشەڕۆژیشدا دەبێتەوە، خۆشبەختی بۆ هەلگرانی غەریبی لەوکاتەدا.

ئیتر ئەوەیان لەیاد چوو، کە نابێت لەم فەرموودانە حالی ببین، تا ئەو فەرموودانەی تریش نەبینین، کە مژدە ئامێز ودلخۆشکەرن وەك فەرموودەی: ((مثل امتي مثل المطر لايدرى أوله خير أمر آخره))،[3] واتە: ئوممەتی من وەك باران وان و نازانرێت سەرەتاکەی خێرو چاکەیە، یان کۆتایی یەکەی، (ابن القيم)یش دەلێت: (( هۆزێك تا هۆزێکی ترو سەردەمێك ، تا سەردەمێکی تر).[4]

بۆیە مێژووی ئیسلام کۆمەلە سەردەمێکی بەخۆیەوە دیوە، پڕشنگدار و ڕووناك بووەوە، وەك سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیز و نورالدین، صلاح الدین، یوسف بن پاشفین، محمد فاتح وکەسانی تریش لەسەردەمی بیست دا.

ئەوەی شایەنە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەین لەماناکردنی ئەم فەرموودەیە و هەموو ئەو فەرموودانەی، کەباسی مژدەی هاتنەوەی ئیسلام دەکەن، بۆسەر شانۆی ژیان جارێکی ترو، ئەو فەرموودانەش هەموویان صحیحن و لەپێغەمبەری ڕاستگۆوە دەرچوون، هەردەبێت بێنە دی وەك چۆن هەوالی داوە، هەروەك چۆن ناڕاستەو خۆ داوای ئەوەمان لێ دەکات، کە ئوممەتی ئیسلام لەهەولْ و تێکۆشاندا بن، تا ئەو سەرکەوتنە مژدە دراوانە بێتە دی و سەربەرزی بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام و شوێن

---

١ ـ البخاري كتاب الفتن ژ ٦٥٤١.

٢ ـ مسلم كتاب الايمان ژ ٢٠٨.

٣ ـ سنن الترمذي ژ ٢٧٩٥.

٤ ـ مدارج السالكين لا ٥٧.

کەوتوانی و سوننەتی خوایش وایە هۆکان نایەنە دی، تا هۆکارەکان نەیەنەدی .[١]

أ ـ مەبەسی پێغەمبەری خواﷺ لەبڕگەی یەکەمی فەرموودەکە، کە دەفەرموێت: ((ان یبعث لهذە الامة)) ئەو کەسەی خوادەینێرێت تەنها بۆ خۆی و کۆمەڵێکی کەم نی یە، بەڵکو بۆ خاترو بەرژەوەندی ئوممەت دەژی و، خاوەنی هیمەت و ووزەیەکی بەرزە و هەموو خەمێکی خەمی ئوممەتەکەیەتی، هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی خۆی بەشەو ڕۆژ دەخاتە گەڕ،تا ئەم ئوممەتە لەوچەقینە ڕزگاربکات و، متمانەی بۆ یە دەگێڕێتەوە بە ئوممەتکەی و دەیخاتەوە سەر ڕێڕەوی ڕاست و دروست و، خەڵکی دەبێت لەسەر هەموو گیرو گرفتێك لەو پێناوەدا ببێتە ڕێگەی و زاڵ دەبێت بەسەر هەمو ناڕەحەتی و لەمپەریکانی ڕێ، تا دەگاتە بڵندکردنەوەی سەری ئومەت و گەڕاندنەوەی سەرکردایەتی کردنەوەی دنیا لەلایەن موسڵمانانەوە.[٢]

ب - بڕگەی دووەمی فەرمودەکە: ((ان الله یبعث علی رأس کل مائە سنة))لەسەری هەموو سەد ساڵێك دومانا هەڵدەگرێت یەکەم/ سەری ساڵ واتە یەکەمین ڕۆژەکانی و هەروەها سەری ساڵ واتە: ڕۆژەکانی کۆتایی ساڵ،[٣] زاناکان لەسەر ئەم دوومانایە جیاوازیان هەیە، بەڵام ابن حجر پێ ی وایە سەری ساڵە واتە ڕۆژەکانی کۆتایی ئەو ساڵەو ئەمەش ڕایەکی گونجاوە.

هەردووئیمامی گەورە (الزهری) و (أحمد کوڕی حنبل)پێیان وایە، کە سەری ساڵە و بەبەڵگەی ئەوەی، کەلەسەری ساڵی یەکەمدا عمری کوڕی عبدالعزیز ﷺ سەری ساڵی دووەم ئیمامی شافعی بوو، یەکەمیان لەساڵی (١٠١)ی کۆچیدا گیانی سپارد و دووەمیان لەساڵی (٢٠٤)دا گیانی سپارد و لەسەرتای سەکەدە لەدایك نەبوون ئیترچۆن نوێخوازیش بن.[٤]

---

١ ـ الاجتهاد للتجدید، عمر عبید حسنه لا ٧.

٢ ـ التجدید في الفکر الاسلامی لا ٤٦.

٣ ـ عون المعبود(١١/ ٣٨٦).

٤ ـ عون المعبود(١١/ ٣٨٦).

ج : مەرجە نوێخوازلەسەری (١٠٠)ساڵەکاندا گیان بسپێرێت؟

هەندێ لەزانایان ئەمە بەمەرج دەگرن، بەڵام ڕایەکی بەهێز نی یە، چونکە ووشەی (يبعث) واتە: دەی نێرێ نەك وەفات دە كات، مەبەستی سەرەكی ئەوەیە، کە سەری سالچی قەڕن دەبینێت و لەوکاتەشدا کردوەو نوێخوازیەکانی بەدی دەکرێت و بەچاکسازی و بەرژەوەندی گشتی ناوی دەردەکات و، مەرجیش نی یە وەفاتەکەی بکەوێتە نزیکی سەری(١٠٠) ساڵەکە، یان دەبێت زیندوو بێت، تا سەری سەدەی داهاتووە و دەڵێت.[١]

د: ئایا نوێخواز تەنیایە، یان زۆرن لەیەك كاتدا؟

ووشەی (( من يجديد لها دينها)) جێگەی پرسیار بووە لە ڕابردوودا هاتوودا و مەبەست: کە ئایا ووشەی(مَنْ) تاکێکی لێبڕاوی هەڵکەوتوە لەناو ئوممەتدا، یان ماناکەی لەوەش فراوانترە و کۆمەڵی نویخواز دەگرێتەوە لەیەك كاتدا؟

بەڵام زۆربەی زاناکان لەسەر ئەوەن، کە نوێخواز یەك کەسە و (سیوطی) ئەم ڕایەی بۆ جمهوری زانایان دەگێڕێتەوە، بەڵام کۆمەڵێکی تر لە زانایان ووتویانە ووشەی ـ من ـ لەلایەنە زمانە وانی یە دکەیەوە بۆ زیاتر لەیەك کەسە و لەو زانایانە ابن حجر وابن الاثير و الذهبي وابن كثير و المناوی و العظيم آبادي.[٢]

لە دوای لێکۆڵینەوە لە ووشەی ـ مَنَ ـ دەردەکەوێ، کە مەبەس لێ ی لەیەك کەس زیاترە و، چونکە مێژوو ئەوەیان بۆ ساغ کردۆتەوە، کە لەیەك کاتدا چەند نوێخواز هەبووە لەیەك کاتداو لەیەك سەردەمدیشدا، کاری نوێخواز زۆر قورس و گران و فرە لایەنەیە لەئیسلامدا و ئێ وڵاتی ئیسلامیش زۆر پان پۆرە و نارەحەتە لەسەر یەك کەس بەو کارە قورس و گرانە هەڵبستێت، بەڵکو موسڵمانەکان بەکۆمەڵ دەوتوانن چاکسازی و نوێخوازی سەرتاسەری دروست بکەن.[٣]

---

١ ـ التجديد في الفكر الاسلامی لا ٦١.

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ هەمان سەرچاوە.

هـ : نوێخواز ئاینداری ئوممەت نوێدەکاتەوە نەك تەنها ئایین خۆی:

ئـەوەی لەفەرموودەکـەوە وەردەگیرێـت ئەوەیـە، کـە ئـەو نوێخـوازە ئاینـداری موسڵمانان نۆێ دەکاتەوەو دووبارەگـەرم و گـوڕی دەداتەوەبـەکاروانی خواناسـی و موسڵمانەتی و ڕێرەوی پێغەمبەرﷺزیندوو دەکاتەوە و خـەڵکی بۆ بانگ دەکاتـەوە، نەك نوێ کردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام خۆی، چونکەئیسلام کۆتا ئاینی خوایە و تیرو تەواوەو کۆن بوونی بەسەردانایەت، تا کەس بیـەوێ تـازەی بکاتـەوە و دەقـی قورئـان و سـوننەت جـێگیر و بـەردەوامن و بـیرو بـاوەڕ ڕوون و ئاشـکرایە و قبـوڵی بـچووکترین گۆڕانکـاری ناکـات، بـەڵکو مەبەسـت لێ ی بەرزکردنـەوەی ئاسـتی موسڵمانانە بۆ ئاستی بەرنامەکەی خواو پەیوەست بکرێنەوە لەگەڵ ئایەنەکەیدا.[1]

---

١ ـ من أجل صحوة اسلامية د. قرضاوی لا ٢٦، ٢٧.

# بەشی سێ یەم

## گرنگی دانی عمر بەبیرو باوەڕی ئەهلی سوننەت

عمری کوڕی عبد العزیز رحمه الله گرنگی دەدا بە بیروباوڕەی ئەهلی سوننە و هەوڵی دەدا خەڵکی فێری بن وەخەڵکیش فێر بکەن و لەناو خەڵکیشدا بڵاوی بکەنەوە، و لەناو سەرچاوە ئیسلامی یەکانی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەدا وتەکانی بەئاشکرا لەو بارەیەوە بەئاشکرا دیارە دیارە: هەر لە بیرو باوەڕی و تەفسیر فەرمووە وفیقهە و شتی تریش.

مامۆستا حەیات ی کوڕی محمدی کوڕی جبریل زۆری لەو وتانەی عمری کۆکردۆتەوە و بەو بۆنەوەیە توانی بڕوا نامەی ماستەر وەربگرێت، زۆربەری ئەو کتێبانەی لەسەر عمری کوڕی عبدالعزیز نووسراون گرنگیان بەم لایەنە گرنگە نەداوە کە بەردەوام هەولی داوە بیرو ڕای موسڵمانان بەڕسات و دروستی وە لەگەڵ قورئان سونەتی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم بهێڵێتەوە.

### لەگرنگترین لایەنەکانی بیرو باوەڕ، کە عمر قسەی لەبارەوە کردووە:

### یەکەم: یەکتا پەرستی خوا ـ توحید الاالوهیە.

یەکتا پەرستی خودا ـ بینچینەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە، بەڵکو بنچینەی هەموو ئاینێکی ئاسمانایە، بەڵکو هەموو پێغەمبەران و هەموو کتێبە ئاسمانیەکان بۆ ئەو مەبەستە نێرراون، هەموو پێغەمبەرێك هەر لە ئادم عليه السلام ەوە تا دواین پێغەمبەر، کە محمد مصطفی یە صلى الله عليه وسلم بانگەشەیان بۆ کردووە، نەك هەر ئەوە بەڵکو مەبەستی سەرەکی دروست بوونی جنۆکە و مرۆڤ یەکتاپەرستی خوایە و لە و بارەیەوە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ((وما خلقت الجن والانس الاّ ليعبدون)) واتە: من جنوو مرۆڤم تەنها بۆ بەندایەتی کردنی خۆم دروستم کردووە.

سەلەفی صالّحی ئەم ئومەتە کاتی خۆی گرنگی تایبەت داوە بەم جۆرە یەکتا پەرستی خودایی یەو عمری کوڕی عبد العزیز لەم بارەیەوە بەشداری تایبەتی هەیە، پێش ئەوەی بەوردی باسی دوعاو تەبەروك و ترس و پشت بەستن و سوپاسگوزارەکانی بکەین، بابزانین یەکتا پەرسی خودایی یانی چ؟ زاناکان بەو جۆرە مانایان کردوەکە: خوای گەورە بەتەنها خۆی شایستەی ئەوەیە بپەرستڕێت و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکرێت.[١]

هەندێکی تر وای پێناسە دەکەن کە بەندایەتی کردنی خوایە، بەتەنها هاوبەشی بۆ پەیداکردنی نەکرێت و تەنها لەئەو بترسێت و ئەوت خۆش بووێت و پشت ی پێ ببەستێ.

## لەبەندایەتی یە دڵی یەکانی عمری کوڕی عبدالعزیز:

### ١ـ دوعاو پاڕانەوە:

أ ـ جارێکیان عمری کوڕی عبد العزیزرحمه الله دای بەلای پیاوێکدا کۆمەڵێك ووردە چەوی بەدەستەوە بوو، یاری پێ دەکردن و بەدەم یاریەکەوە دەیوت: پەروەردگارم حۆریم پێ بدە لەبەهەشتدا، عمر ووتی: بەخوا ژن خواستن وا نابێت، وژن خوازێکی خراپی، بەڵکو بەردەکان فڕێ بدەو لایبە و بەدڵسۆزانە دوعاکانت دەربڕە.[٢]

لەم بەسەرهاتەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە عمررحمه الله مەرجەکانی دوعا بۆ ئەو پیاوە دیاری دەکات، کە دڵسۆزی و ئامادەیی دڵ و خۆ خەریك نەکردن بەشتی ترەوە، ئەمەش قورئانی پیرۆز و سوننەت ئاماژەی بۆ دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ غافر: ١٤.

---

١ ـ شرح العقيدة الطحاوية(١/٢٩).
٢ ـ الحلية(٥/٢٨٧).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((ادعوا الله و انتم موقنـون بالإجابـة، واعلمـوا ان الله لایستجیب دعـاء مـن قلـب غافـل لاه))،[١] واتـە: بـەجۆرێ هـاوار بکـە نـەخواو لێ بپارێنەوە، کە دڵنیان لەوەی دێت بەدەمتانەوە، هەروەها بـشزانن، کـە خـودا دوعـا قبوڵ ناکات لەدڵێك بێ ئاگاو خەریك بێت بە شتی بێ هۆدەوە.

ب - عمری کوڕی عبد العزیز دەڵێت: ((ئەی پەروەردگار من لە خۆشەویست ترین شتدا لەلای تۆ، کە یەکتا پەرستی یە بەقسەم کردویت، لەبێزاروترین شتیشدا لـەلای تۆ کە بێ باوەڕی یە سەرپێچیم کردوویت، دەی هەرچیم لەو نێوەندەدا کـردوە لـێم خۆش ببە.

ئا لیرەدا ئەوەتا عمری کوڕی عبد العزیز بەگوێڕایەڵی و یەکتا پەرستی یەکانی یە لەخوادە پارێتەوە و داوای شتی تری لێ دەکات دروستە، وەك چـۆن لەفـەرموودەی (٣) کەسەکەی، تا لەئەشکەوتەکەدا ڕوویدا.[٢] ئەوان لە لەڕێگای باسـکردنی کـردەوە چاکەکانیانەوە لەخوا دەپاڕێنەوە، تا دەرگای ئەشکەوتەکەیان بۆ بکاتەوە.

هەروەك موسڵمانانیش کردەوەی چاکی باوەڕیان باس دەکرد و ئەوجا داوکاریان دەخستە خزمەتی پەروەردگار، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَـٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ﴾ آل عمران: ١٩٣.

ج - زەمین لەرزەیەك لەشام ڕوویـدا، عمـری کـوڕی عبـدالعزیز نـاوی نووسـی بـۆ ناوچەکەو ووتی: پاشـان... زەمـین لـەرزە شـتێکە، کـە ڕوو دەدات خـوای گـەوەرە لەبەندەکانی زویر بووە، نامەی نارد بۆ هەریمەکان و پێ ی وتن: لەڕۆژی ئەوەندە و لەمانگی ئەوەندا لەماڵ دەربچن، هەرکەسێ هەرچی هەیـە، بـا خێرێکـی لێ بکـات.[٣] وەك ئـادەم عليه السلام بڵێـن : ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ

---

١ - سنن الترمذي (٥/ ٤٨٣) صحیح الألباني ژ ٢٧٦.

٢ - مسلم ژ٢٧٤٣.

٣ - سیرة عمر ( ابن عبدالحکم)، لا ٦٤.

ﭐلۡخَٰسِرِينَ ﴾، الاعراف: ٢٣، بۆیە عمرﷺ فەرمانی دابەسەر هەموو ئوممەتدا لەپاش ڕوودانی زەمین لەرزەکە، کە بگەڕێنەوە بۆلای خوا و لێ ی بپاڕێنەوە خێر بکەن و دادای لێ خۆش بوون بکەن و لەماڵ دەربچن بەرەو شوێنی نوێژەو مزگەوتەکان.[١]

د: میمونی کوڕی مەهران دەڵێت: ڕۆژێك لەلای عمری کوڕی عبدالعزیز بووم دەبینم زۆر دەگری و لە خوا دەپاڕایتەوە و داوای مردنی لێ دەکات، منیش پێم ووت: بۆچی داوای مردن دەکەیت، نەکا تێك دا خوای گەورە لەسەردەستی تۆ کاری زۆر چاکی کردووە؟! سونەتی پێ زیندو کردویتەوەو بدعەی پێ لەگۆڕنای.

عمریش ووتی: دەی منیش وەك ئەو پیاو چاکانە ئەکەم کە دوای ئەوەی خوا دڵی خۆش کردو سەرگەورەیی پێ بەخشی و ئەویش ووتی: ﴿رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، یوسف: ١٠١.

داوای مردنی لە خوای گەورە کردو بە باوەڕەوەو بیگەینێتە لای صالحان، ئەوش سونەتی پێغەمبەرانەوەو بەیداغی صالحانە، هەروەها لەو کاتانەشدا کە ترساوە ئاژاوەو فیتنە ڕووبکاتە دینەکەی ئەم شێوەیە دوعایەی کردوە بەتایبەتی لەپاش مردنی سێ هاوکارەکەی، عبد الملك ی کوڕی خۆی و موزاحیمی هاوڕێ ی و سەهل ی برای، وەك لەهەندێ لەڕیوایەتەکاندا هاتووە.[٢]

## ٢- سوپاسگوزاری:

یەحیای کوڕی سەعید دەڵێت: بیستوومە عمری کوڕی عبدالعزیز ووتویەتی: باسکردنی بەخششەکان سوپاسکردنیانە.[٣]

---

١ ـ الاثار الوراده عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة (١/ ٢٢٠).
٢ ـ العقد الفريد (٤/٣٩٦).
٣ ـ مصنف ابن ابي شيبه (٨/ ٢٤٠).

هەروەها دەڵێت: بەخششەکانی خوا ڕاوەستا و بکەن بەسوپاس کردنی خوای تەعالا،[١] نامەی دەنارد بۆ هەندێ لەکار بە دەستەکانی و پێ دەوتن.... وەسیەتم بۆ تۆ ئەوەیە لەخوا بترسە و ، داوات لێ دەکەم سوپاس گوزاری ئەو بەخشش و ڕێزو زۆرانەی بە بە سەرتەوە، چونکە سوپاس گوزاری بەخششەکان بەردەوام دەکات و سپڵەییش لەناوی دەبات و ناهێڵێت.[٢]

## ٣ـ پشت بەستن بەخوا:

حەکەمی کوڕی عمر دەڵێت: عمری کوڕی عبد العزیز﷬ (٣٠٠) پاسەوانی هەبوو، کۆی کردنەوەو پێ ی ووتن: من لەخوایی یەوە باسەوانم هەیە کە نەیەڵن ئەجەلەم بێت تاکاتی خۆی و نایەڵن هیچم بەسەر بێت مەگەر شتی لەسەرم نووسرا بێت، دەی کەواتە کامتان دەمێننەوە(١٠) دینار پێ دەدەم و کێش پێی خۆشە بابڕواتە وە ماڵی خۆی.[٣]

کاتێ عمر﷬ لەگەڵ موزاحیمی هاوڕێ دا لە مەدینە دەرچوون، موزاحیم سەیرێکی مانگی کرد بینی وا لە بورچی(دوبران)دایە، پێ ناخۆش بوو ڕاستەخۆ بە عمر بڵێت، دەڵێ پێم ووت: سەیری مانگ بکە، چەند جوانە بەناوەڕاستی ئاسمانەوە دەگەشێتەوە ! عمر سەیرێکی کرد و بینی لە (دوبران)دایە و*، ووتی: موزاحیم، ئەمە ویسستت پێم بڵێت مانگ لەدوبران دایە، ئێمە لەسەر ئەساسی خۆرو مانگ لەماڵ دەرناچین، بەڵکو لەماڵ دەردەچین بەپشت بەستن بەخوای (واحد و القهار).[٤]

بەم نمونەیەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە تا چ ئاستێکی بەرز عمر هەوڵی داوە پشت بەستنی بەخوا بێت و لەگەڵ ئەوەشدا هۆکارەکانیش بەکاردێنێت.

---

١ ـ کتاب الشکر لابن ابي دنیا لا١٩٧.

٢ ـ ذم الدنیا، لابن أبي دنیا لا ٨١.

٣ ـ سیر اعلام النبلاء( ٥/ ١٣٦).

* دوبران واتە: کەوتونەتە نێوان دوو ئەستێرەوە.

٤ ـ سیرة عمر ابن عبدالحکم ٣٢.

(التوکل) واتە: پشت بەستن بەخوا لەگەڵ بەکارهێنانی هۆکار، ئەوەش یەکێکە لە بنەماکانی یەکتا پەرستی و خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ﴾ هود: ١٢٣، کەواتە هەرکەسێ پشت بەخوا ببەستێت و هۆکارەکانی واز لێ بهێنێ و ئەو کەسەیش ، کە تەنها هۆکاربەکاردەهێنێ تەوەکول و پشت بەستنیان بەخوا تەواو نی یە.[١]

## ٤ـ ترسان و ئومێدەواری:

لەیەزیدی کوڕی عەیازی جەعدەیەوە کە دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نارد بۆ سولەیمانی کوڕی ئەبی کەریمە و پێ ی ووت: شایان ترین کەس لەبەندەکانی، کە خوا بەگەورە سەیری بکات و لێ ی بترسێت کەسێکە کە ئاوا وەك من دووچاری بەرپرسیاریەتی بووبێت، کەسیش وەك من لێپرسینەوەی سەختی لەسەر نی یە و، زۆر دەترسم ئەم پلەو پایەیەی منی تێیدام هۆی لەناوچونم بێت مەگەر خوا بە ڕەحمی خۆی بمپارێزێت، بیستوومە کە بەنیازیت بڕۆیت بۆ جیهاد و ئەگەر گەیشتیتە ناو گۆڕەپانی جەنگ دووعام بۆ بکە خوای گەورە شەهیدیم بکات بەنسیب، چونکە حاڵم زۆر خراپە و ترسناکیم زۆر گەورەیە، داوا دەکەم لەو خوایەی کە دووچاری کردوم بەم بەرپرسیارێی یە ترسناکەوە کە ڕەحمم پێ بکات و لێم خۆش ببێت.[٢]

ڕەبیعی کوڕی سەبرە بە عمری کوڕی عبد العزیزی ووت: کاتێ کوڕەکەی و براکەی و موزاحیمی هاوڕێ ی لەماوەی چەند ڕۆژێکدا مردن - ئەی ئەمیری باوەڕداران، تا ئێستا کەسێکم نەدیوە لەو جێگەی تۆدا بێت و وێنەی براکەت بۆ براکەی و وێنەی مزاحیمی هاوڕێت بۆت.

عمریش ماوەیەك کە سەری دا خستبوو، پاشان سەری هەڵبڕی ووتی: ئەو چیت ووت ئەی ڕەبیع؟ ومنیش دووبارەم کردەوە بۆی، ئەویش ووتی: نەخێر سوێند بەو

---

١ ـ مدارج السالکین(٢/ ١٢٥).

٢ ـ الطبقات (٥/ ٣٩٤، ٣٩٥).

کەسەی کە ئەو سیانەی ی بردەوە، ئەوەی لەلای خوایە لە ئەجرو پاداشتی ئەوسیانە لەهەموو شتێ گەورە ترە لەلام.[1]

لەقەتادەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: عمری کوڕی عبد العزیز نامەی نارد بۆ خەلیفەی دوای خۆی و پێ ووت: ((بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، من عبدالله عمر امیر المؤمنین الی یزید بن عبد الملك، سڵاوی خوات لێ بێت، من سوپاسی ئەو خوایەت بۆ دەکەم ، کەهیچ خوایەك نی یە جگە لە ئەو، پاشان.... لەکاتێکدا ئەمن نامەت بۆ دەنوسم نەخۆشی و ئازار زۆوری بۆ هێناوم، تۆش چاکم دەناسیت، کە پرسیارم لێ دەکرێت دەربارەی هەموو ژێر دەستەکانم، پاشای دنیاو ئاخیرەت لێپرسینەوەم لەگەل دەکات، ناشتوانم بچوکترین کردەوەی لێ بشارمەوەو خۆی دەفەرموێت:﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾الاعراف:٧.

ئەگەر خوای - بەبەزەی - لێم خۆش ببێت ئەوە ڕزگار بووم لەسەختی و ناڕەحەتی دورو درێژی قیامەت، ئەگەر لێشم زویر بێت دەی قوڕ بەسەرم بۆ کرێ بڕوم، داوا لەو خوایە دەکەم، کە جگە لەو خوایەی تر نی یە - تا بەبەرزیی خۆی لەئاگری دۆزەخ بمپارێزێت و بمباتە ناو ڕەزامەندی خۆی و بەهەشتەوە.[2]

لەم وتەیەی عمرەوە ئەوەمان بۆڕون دەبێتەوە،کە ئەم پیاوە لەنێوان ترس و هیوادا ژیاوە، بێگومان کۆکردنەوەی ترس و هیوا - الخوف و الرجاء - پێکەوە لەبیروباوەڕی سەلەفی صالح بووە، ئەوەش پلەیەکی مام ناوەندە لەنێوان دڵنیا بوونی باوەڕدار لەسزای خواو بێ هیوا بوون لەبەزەیی خوا، سەلەفەی صالح ئوممەت لەخوا ترساون، بەڵام چاوەڕێی بەزەیشی بوون.[3]

ئەوانە لەو کەسانە، کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت : ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاء اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ ﴾ الزمر: ٩.

---

١ - المعرفة والتاريخ للفسوي(١٦١٠).

٢ - سيرة عمر لابن الجوزى لا ٢٤٤.

٣ - الأثار الواردة عن عمر بن عبد العزيز في العقيدة (١/ ٢٤٥).

## دووەم: عمرو ناوە جوانەكانی خوا.

ناوە جوانەكانی خوا، بریتی لەكۆمەڵی ووشە، كە مانانی تەواوی وبێ لەكەیی دەدات بەخوا بەبێ لێچواندن -المماثلة- و بەدوور ڕاگرتنی لەهەموو مانای ناتەواوی و ئەنگی یەك.[١]

ناوە جوانەكانی خوا كۆمەڵێك ناون،كەخوای گەورەیان پێ بانگ دەكرێت و، لەقورئان و سوننەتدا هاتوون، مانای پیاهەڵدان و سەناخوانی دەبەخشن.[٢]

لەڕێگەی نامەو ووتارەكانی عمری كوڕی عبدالعزیزەوە، هەندێ لەناوە جوانەكانی خوا ڕوون دەكەینەوە، پرۆگرامی عمر رحمه الله پڕاو پڕ پرۆگرامی قورئان و سوننە بوو، هەندێ لەبیرو باوەڕەكانی ئەهلی سوننە دەربارەی ناوە جوانەكانی خوا دیاری كراون، لەژێر ڕۆشنایی كۆمەڵی ووتەی عمری كوڕی عبد العزیز رحمه الله لەوانە:

١- ناوە جوانەكانی خوا ئەزەلین واتە هەر بوون و هەر دەمێنن و عمری كوڕی عبد العزیز دەڵێت: گەرەترین تێنەگەیشتن لەخوا ئەوەی واگومان بەرێت زانیاری لەپێش بەدیهێنانەوە بووە، بەڵكو هەردەم خوای گەورە بەتەنها خۆی هەموو شتێكی زانیوە و بەسەر هەموو شتێكیشدا بینەر بووە پێش ئەوەی هیچ شتێك دروست بكات و پاش ئەوەش.[٣]

عمر لەم خاڵەدا ئەوەی چەسپاند، كە هەر دوو سیفەتی - علیم و شهید - بەئەزەلی - هەمیشەیی - بۆ خوا دووپات دەكاتەوە ئەهلی سوننەو جەماعەیش هەمان بیرو ڕایان هەیە.[٤]

٢- ناوە جوانەكانی خوای تەعالا - تەوقیفیە - واتە: قوئان و سوننە دیاریان كردوە و بۆ چوونی كەسی تێدا نی ئەمەش ڕاو بۆ چوونی ئەهلی سوننەو

---

١ - نهج اهل السنة والاشاعرة في توحيد الله (٢/ ٣٩١).

٢ - الآثار الواردة(١/ ٢٧٦).

٣ - الأثار الواردة عن عمر بن عبد العزيز في العقيدة (١/ ٣٠٤).

٤ - هەمان سەرچاوە (١/ ٣٠٥).

جەماعەیە، لە ووتەکانی عمردا ئەوەبەدی دەکرێت، چونکە تەنها ئەو ناوانە بۆ خودا دەچەسپێنیٚ، کە خواو پێغەمبەر ناویان هێناوە و هەر ئەوانەش ڕاستن، چونکە دروست نی یە بەناوێك خوای گەورە بانگ بکرێت، کە لە قورئانی پیرۆزدا لەسوننەتی پێغەمبەرﷺ نەهاتبێت.[1]

٣ـ ناوە جوانەکانی خوا وەك ناوون لەهەمان کاتدا سیفاتیشن، ناون چونکە مانای زاتێك دەگەیەنن، سیفەتیشن چونکە هەریەکەیان مانایەکی تایبەتی هەیەو لەلایەن ناوەوە هەموویان یەك ناون بۆ خوای تەعالا، بەلاّم هەریەکەو مانایەکی هەیە، وەك رحمن و رحیم و حی و هەموویان ناوی خوان، بەلاّم مانای (الحی) بەمانای (الرحمن)نایەت و دوو مانای لەیەك جیان.[2]

بیرو باوەڕی زانایانی چاکی پێشوو ـ سلف الصالح ـ دەربارەی یەکتا پەرستی لەناوە جوانەکانی خودادا، بە پێچەوانەی هەندی دەستە وتاقمی بەناو سەربەئیسلام وەك (جەهمی)یەکان بوون، کە جگە لە دوو ناو نەبێت، کە (خالق، قادر)ە،ئیتر هیچ ناوێکی نادەنە پالّی خوا، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو، کە ئەو تاقمە گومانیان وابوو، یەکتا پەرستی هەموو شتیٚ دەخاتە ئەو لاوە، دان نان بە ناوانەدا دان نانە بەشتی پێش هاتوو ـ حادث ـ[3]

بەلاّم ئەمانە سەریان لیٚ تێك چووە، چونکە موسلّمانان بە قورئان و سوننەت بووە بە موسلّمان دەبێت واز لەهەموو داهێنان و لادان و ماناکردنێکی هەلّە ـ تأویل ـ بهێنن کە سەردەکێشێت بۆ بیٚ باوەڕی.خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ الاعراف: ١٨٠.

---

١ ـ الأثار الواردة عن عمر بن عبد العزيز في العقيدة (١/ ٣٠٥).

٢ ـ القواعد المثلي لا ٨.

٣ ـ منهاج السنة(٢/٥٥٦).

هەندێ لەناوەکانی خوا باس دەکەین، کە لەلەو وتارەکانی عمری کوڕی عبدالعزیز دا هاتووە لەوانە:

١- (الرب) واتە: پەروەردگار و هەمووجاری عمر بەو ناوەوە هاواری دەکرد خواو دەیوت: ((یارب انفعنی بعقلی))[1] واتە: ئەی پەروەردگار کەڵك سوود بخەرە ناو ژیریمەوە بۆم، (الرب) یەکێکە لە ناوە جوانەکانی خوا وەك خوای گەوەرە دەفەرموێت: ﴿بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ سبأ: ١٥، مانای ووشەی (الرب) واتە: سازێنەری شتەکان و، (رب الشئ) واتە: خاوەنی شت، خوایﷻ خاوەنی هەموو بەندەکانیەتی و سازێنەری کارو باریانە.[2]

٢- (الحيّ)، واتە: هەمیشە زیندوو، عمری کوڕی عبد العزیز هاوڕێیەکی هەبوو، ئاگاداریان کردەوەو، کە مردووە بەمەبەستی پرسە خۆی گەیاندە ماڵ و منداڵەکەی، ئەوانیش هەر دەگریان و هاواریان دەکرد بەسەریدا و ئەویش پێ ی ووتن: ئەم مردووەتان ڕزق و ڕۆزی ئێوەی نەداوە، بەڵکو ئەوەی ڕزق و ڕۆزی ئێوە دەدات خوایەکی زیندوو نەمرە.[3]

ووشەی (الحيّ) یەکێکە لەناوە جوانەکانی خواو لەو بارەیەشەوە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ﴾البقرە: ٢٥٥.

مانای زیندووش ئەوەیە، کە بەردەوام بووە و نەمانیشی بەسەردا نایەت، ووشەی (زیندوو) لەتەواوکاریەکانی سەرجەم سیفاتەکانی وەك( العلم) القدرە، السمع، البصرو...هتدە).[4]

٣- (الواحد القهار) عمری کوڕی عبد العزیز بە موزاحیم ی ووت: ئەی موزاحیم ئیمە بە خۆرو مانگ لە ماڵ دەرناچین، بەڵکو پشت بە خوای ( واحد القهار )

---

١ ـ سيرة عمر بن عبد العزيز، لابن عبدالحكم لا ٦٨.
٢ ـ الاثار الوارد (١/ ٢٨١).
٣ ـ هەمان سەرچاوە(١/ ٢٨٨).
٤ ـ اشتقاق اسماء الله الحسنى لا ١٠٢.

دەرەدەچین.[١]

دەربارەی ئەو ناوەی پەروەردگار قورئان دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ابراهيم: ٤٨.

مانای (واحد القهار)، واتە: تونها خۆی خاوەنی گەورەیی و ناو سیفاتی جیاو کاری گەورەو مەزنە لە هەموو جیهانیاندا، هەمووی لەژێر دەستەڵاتی ئەو دایە و بەبێ فەرمانی ئەو هیچ شتێك نە دەجولێت و نە لە جوڵەیش دەکەوێت.[٢]

٤ـ (العلي العظيم) عمری کوڕی عب العزیز نامەی دەنووسی بۆ سەرکردەکانی سوپا و لە کۆتایی نامەکەدا دەینوسی.... و لَا حَوْلَ ولا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ العلي العظيم)[٣]

ئەو دووناوە لەناوە جوانەکانی خوای گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴾البقرة: ٢٥٥، (العلی ) بڵندەو لەسەر عەرشەکەیەتی و بەرزە، بەرزە چونکە زاڵە بەسەر هەقوو دروستکراوەکانیدا، بەرزەبەوەی کە سیفاتنی تەواوی لە خۆ گرتووە.[٤] (العظيم)، واتە: بەئەندازەیەکی وا بەرزە، کە هەموو لوتبەرزو دەستەڵاتدارەکان نزمن لەبەردەمیدا و لە ئاستی پەروەردگاردا هەموو پاشاکانی دنیا سەر شۆڕن وبێ دەستەڵاتت، دەی پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەیە، کە خاوەنی گەورەیی یەکی گەورەیە.[٥]

## سێ یەم: بیرو باوەڕی عمر دەربارەی سیفاتەکانی خوا:

سیفەتەکانی خوا کۆمەڵە سیفاتێکی تەواون بەردەوام بە خواوە بەندن وەك: (علم، حکمە، بصر، اليدين، الوجە...هتد، کە هەموویان خوای گەورە دەربارەی سیفاتی خۆی لە قورئاندا، یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆی باسکردووین.

---

١ ـ سيرة عمر بن عبد العزيز، ابن عبد الحكم لا ٣٢.

٢ ـ تفسير السعدي لا ٤٢٨.

٣ ـ سيرة عمر (ابن عبدالحكم) لا ٨١.

٤ ـ تفسير السعدي، لا ١١٠.

٥ ـ هەمان سەرچاوە.

کەواتە یەکتا پەرستی خوا لەسیفاتیدا بەوە دەبێت، کە هەموو ئەو سیفاتای خوا داویەتی بە خوێنی ئیمەش بۆی بڕیاربدرین و، ئەمەش ڕەوشتی سەلەفی صالْحی ئوممەتی ئیسلامە، کە هەموو ئەو سیفەتانەی خوا بۆ خۆی بڕیارداوە ئێمەش بیدەینە پالْی و بەپێچەوانەشەوە چی لەخۆی بەدور گرتووە وئێمەش بەو جۆرە بە دورەی بگرین لێی بەبێ پرسیار کردن لە چونیەتی و لێچواندن، یان لادانی ماناکەی، یان لەکار خستنی ماناکەی.

کەواتە ڕێرەویان لە داننان بە سیفەتەکانی خودا بەبێ لێچواندنی دروستکراوەکانی و واتە بەبێ بەکارهێنانی (تشبیه)و یان لەکار خستنی(التمطیل) وەك خۆی لەقورئاندا وفەرمویێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾، واتە: دوورە لە لێچواندن نموونە، ئایەتی ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾، واتە: بەرپەر دانەوە بێ باوەڕی، یان لەکارخستنی ماناکانی یەتی.[1]

ئەوەش هەندێ لەو سیفاتانەی یە، کە دیسان خوا بۆخۆی داناوە وەك عمری کوڕی عبد العزیزیش بۆ خوادای جێگیرکردوەن.

١- (النفس)، واتە: بەمانای خوا خۆی، عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نووسی بۆ (ضحاك)ی کوڕی عبدالرحمن و پێ ی ووت: پاشان، خوای - عز وجل - ئیسلامێکی بۆ ناردوین، کە (خۆی) پێ ی ڕزای یە، لە ڕێزداریشی کردوە لەلای بەندەکانی بەوەی، کە هیچ ئاینێکی تر قبولْ ناکات جگە لەئیسلام.[2]

ئەمەش لەوە وەری گرتوە، کە خوای گەورە لەقورئاندا بۆ خۆی داناوە و فەرمویەتی: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾، واتە: خوا دەتان ترسێنێت لەخۆی، پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرموویەتی: ((لا أحصي ثناءً عليك، انت كما اثنتين على نفسك))[3]، واتە: ئەی پەروەردگارم ناتوانم بە جۆرە سەنا خوانت بم وەك چۆن خۆت وەسف و سەنای خۆتت کردوە.

---

١ - مجموع الفتاوى( ٣/٨).

٢ - سيرة عمر (ابن عبد الحكم)لا ٨٦.

٣ - مسلم ژ ٤٨٦.

٢- (الوجه)، واته: (دهم و چاو)و عمر نامەیەكی نارد بۆ خەواریجەكان و تیایدا ووتی: (سوێند دەخۆم بەخودا ئەگەر كوڕی من بوونایە، خوێنی هەمووتانم دەرشت لەپێناوی ڕووی خواو پاداشتی قیامەت).[١]

سیفەتی باسكردنی دەم و چاوو - وجە - لەو سیفەتە تایبەتمەندیانەیە، كە قورئان و سوننە باسیان كردووە، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ﴾الرعد: ٢٢. پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لەزەت و چێژی بینینی ڕوومەتی پەروەردگار دەكات و، دەفەرموێت: ((واسألك لذة النظر الى وجهك)).[٢]

٣- (القدرە)بە توانا، عمری كوڕی عبد العزیز نامەی نووسی بۆ هەندێ لە كاربەدەستەكانی ووتی: پاشان... ئەگەر جارێك توانا و دەسەڵاتت وای لێ كردیت زوڵم لەخەڵكی بكەیت، ئەوا تواناو دەسەڵاتی خوات بیر بكەوێتەوە بەسەر تۆوە، كە ئەوەی تۆ دەیكەیت دەڕوات و ئەوەی خوا دەیكات دەمێنێتەوە).[٣]

لەنامەیەكیشدا بۆ ڕەدی( قەدەری)یەكان دەڵێت: ((... توانای خوای گەورە زۆر لەوە زیاترە، كە كەسێك بتوانێت زانیاری خوا هەڵوەشێنێتەوە).[٤]

خوای گەورەیش خۆی لەقورئاندا سیفەتی توانای بۆ خۆی بڕیارداوە، ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقرە: ٢٠.

## چوارەم: ناهێڵێ گۆڕ بكرێتە مزگەوت

(اسماعیل)ی كوڕی (حكیم) لەعمر كوڕی عبد العزیز بیستووە، كە دەیووت: دواین وتەی پێغەمبەری خواﷺ ئەمەبوو: ((قاتل الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور انبيائهم مساجد، لايبقى - أوقال - لا يجتمع دينان بارض العرب))،[٥] واتە: خوا

---

١ - سيرة عمر (ابن عبدالحكم)لا ٧٥.

٢ - صحيح الالباني في صحيح سنن النسائي (١/ ٢٨٠، ٢٨١).

٣ - سيرة عمر (ابن الجوزى)لا ١٢٥.

٤ - الحلية(٥/ ٣٧٤).

٥ - البخاري،١٣٣٠.

جولەکە و گاور لەناو بەرێت، کە گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیانیان دەکرد بە مزگەوت، نابێ بمێنێ، یان فەرمووی - دووئاین نابێ لەزەوی عەرەبیدا کۆبننەوە. (حصینی) بۆی گێڕاینەوە، کە عمری کوڕی عبدالعزیز قەدەغەی کردوە قەبر بەخشت هەڵببەسترێت.[1]

ئەم فەرموودەیەی، کە عمر رحمه الله دەگێڕێتەوە ئەو ئاگاداریەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئوممەتەکەی کردووە، کە گۆڕەکان بکەن بەمزگەوت و ئەوکارەش کاری جولەکەو گاوەرو موسڵمانیش قەدەیغەی لێ کراوە چاو لەو دووتاقمە نەفرەت لێکراوو گومڕایە بکات، بەدەقی قورئانی پیرۆز، پێشتر باسمان کرد عمر بەرگری کردوە لەوەی گۆڕ هەڵبەسترێت.[2]

کاتێ وەلیدی کوڕی عبد الملك فەرمانی دەرکرد مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ نوێ بکاتەوە و لەو کاتەدا عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله ئەمیری شاری مەدینە بوو، پێ ی ووتبو، کە ئەو کارە بکات و ژورەکانی پێغەمبەر ﷺ و ژوورەکەی عائیشە رضي الله عنها، کە گۆڕی پێغەمبەری خواو دوو یارەکەی لێ بوو- بیخاتە سەر مزگەوتەکە، بەڵام عمر رحمه الله کۆتایی گۆڕەکانی بە دیوارێك لە مزگەوتەکە جیا کردەوە، تا نەوەك نوێژ خوێن ڕووبکاتە گۆڕی پێغەمبەرو نوێژ بکات، ئەمەش لەوکاتەدا بوو، کە دیواری مزگەوتەکە ڕووخا و بەو شێوەیە دروستی کردەوەو مزگەوتەکەی کرد بە پێنج ڕوکن.[3]

مەبەست لەوکارەش: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله ویستی بەژیرانە و حیکمەت خۆی دەرگاکان لەسەر هاوبەشی پەیدا کردن دوابخات؛ وەك چۆن لە ووتەی زۆرێك لەو کەسانەی لەسەردەمی دروستکردنەوەی بە مزگەوتەکەدا ئامادەبوون لەمەدینە، گومانیشی تێدا نی یە، کە مزگەوت کردنی گۆڕەکەی پێغەمبەریان هەر گۆڕێکی تر و قەدەغە کردنی پێغەمبەر ﷺ لەوکارە لەبەر ئەوە بوو، کە بەگەورە سەیر کردنی

١ - سیرة عمر (ابن الجوزی)لا ٢٤٦.
٢ - الاثار الواردة(١/ ٢٦٤).
٣ - هەمان سەرچاوە( ١/ ٢٦٥).

گۆڕەکەی ئەویان هەر گۆڕێکی تر سەردەکێشێ بەرەو هەڵخلسکان و پاشتریش بەرەو کوفر و بێ باوەڕی وەك چۆن گەلانی پێش ئیسلام چاری بوون.[١]

عمریش رحمه الله قەدەغەی ئەوەشی کرد، کە گۆڕەکەی خۆی هەڵبستن لەدوای خۆی بۆ ئەو مەبەستە وەسیەتنامەیەکی نوسیبوو، ئەمەش لەسەر دەمێکدا بوو، کە بیرو باوەڕیان پاك و بێگەرد بووە، بە بەراورد لەگەڵ سەدەکانی دواتردا، بەڵام بە تێگەیشتنە وردەکەی لەمەبەستەکانی سونەتی پێغەمبەر ﷺ و شوێن کەوتنی بەرنامەی دروست کەبەرنامەکەی پێغەمبەرو یارە ڕاشیدەکانی بوو، خوای یارمەتی دا بوو، تاوەسیەت بکات، گۆڕەکەی هەڵ نەبەستن نەوەك بکرێتە مزگەوت، واتە فریای مەسەلەکە کەوت پێش ئەوەی تەشەنە بکات.

گومانی تێدا نی یە، کە ئەو بۆ چوونەی عمری کوڕی عبدالعزیز پڕاو پڕ جێ بەجێ کردنی ئەو فەرموودە صحیحەیە کە مسلم لە جابری کوڕی عبداللە وەدەیگێڕێتەوە، کە دەڵێت: (( نهی النبي ﷺ ان یجصص القبر وان یقعد علیه وان بنی علیه ))،[٢] واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە قەبر هەڵبەسترێت، یان لەسەری دابنیشن، یان دیواری بۆ بکرێت.

## پێنجەم: مانای باوەڕ لەلای عمری کوڕی عبدالعزیز:

عەدی کوڕی عەدی دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بۆی نوسیم: (پاشان...باوەڕ کۆمەڵێك فەرزو شەرع و حدود و سننەتن، هەرکەسێك بەتەواوی ئەنجامیان بدات ئەوە باوەڕی تەواو ی هەیەو هەرکەسێکیش بەتەواوی نەیانکات ئەوە باوەڕی تەواو نەکردوە، ئەگەر بمێنم بەجوانی بۆتان ڕوون دەکەمەوە، تا کردەوەیان پێ بکەن، ئەگەر مردیشم ئەوە زۆر حەزم لەمانەوە نی یە لەناوتاندا).[٣]

جەعفەری کوڕی بەرقان دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی بۆ نوسین و پێمانی ووت: ( ... پاشان... لقەکانی ئاین و پایەکانی ئیسلام - باوەڕ بوونە

١ - مسلم ژ: ٩٧.

٢ - فتح الباري على صحيح البخاري(١/ ٢٥).

٣ - فتح الباري على صحيح البخاري(١/ ٤٥).

بەخوای گەورەو بەرپاکردنی نوێژ و دەرکردنی زەکاتە و نوێژەکانتان لەوەختی خۆیدا ئەنجام بدەن).[١]

عمرڕەزای ئەوەی ڕوون کردەوە، کە باوەڕ کۆمەڵێ فەرمانە وەك نوێژ و ڕۆژوو کۆمەڵێ شەریعەتە وەك بیرو باوەڕ ئیسلامیەکانی وەك باوەڕ بەخوا و فریشتەکان و کۆمەڵی(حدود)ەوەك مەی خواردنەوە وشەرواڵ پیسی، کۆمەڵێ سوننەتیشە وەك نوێژو ڕۆژوو سوننەتەکانی ولابردنی شتی سەرە ڕێگا و کۆمەڵێ سوننە گەلی تریش، ئەمانە بەهەموویانەوە باوەڕە پێکدەهێنن.[٢]

ئەمەی کە عمر - باسی کرد - ئەو ڕاستی یە یەکە قورئان و سوننەت و ووتەی سەلەفی ساڵحی ئوممەت ڕوونیان کردۆتەوە، باوەڕ واتە: دەربڕین بەزمان، باوەڕ کردن بە دڵ، کردەوەکردن پێ ی بەئەندامەکانی لەش).[٣]

بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی باوەڕ واتە: دەبڕین بەزمان خوای گەورە دەفەرموێت:﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ ﴾البقرە: ١٣٦. فەرموودەی پێغەمبەرەکەیﷺ،کە دەفەرموێت:((امرتُ ان اقاتل الناس حتى يقولوا لااله الاّالله فمن قال لا اله الاّالله فقدعصم منىنفسه وماله لاّبحقه وحسابه على الله)).[٤]

بەڵگەش لەسەر ئەوەی، جێگیر بوونی باوەڕ لەنێوان دڵدا ووتەی پەروەردگارە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ ﴾ الانفال: ٢، واتە: باوەڕدارەکان هەرکاتێ خوایان خرایەوە یاد دڵیان حەشۆکە دەکات. واتە: حەشۆکە کردنی دڵی بەباوەڕ ناو هێناوە.

نامەیەکشی نووسی و تیایدا ووتی: (( داوا دەکەم لەخوا بە ڕەحم و بەزەیی و فراوانی فەزڵی خۆی، کە هیدایەت دراوان زیاتر ڕێنموونی بکات و گوناهبارانیش بخاتە سەر ڕێگای تەوبە و پەشیمانی)).[٥]

---

١ ـ الاثار الواردة(١/ ٥٤٣).
٢ ـ الاثار الواردة (١/ ٥٤٥).
٣ ـ هەمان سەرچاوە(١/ ٥٤٤).
٤ ـ مسلم ژ ٣٢.
٥ ـ الطبقات( ٦/ ٣١٣).

## شەشەم: باوەڕ بەڕۆژی قیامەت.

قسەکردن دەربارەی ڕۆژی دوایی زۆر لایەن دەگرێتەوەو، هەموو ئەو ڕووداوانەی دوای مردن دێنە دی وەك سزای گۆڕ و خۆشی یەکانی و زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە و پاداشت و سزا و بەهەشت و دۆزەخ، عمر دەربارەی ئەو بابەتانە ووتەی هیەو لەوانە:

### ١ـ سزای گۆڕو خۆشی یەکەی:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بە پیاوێك دەڵێت: (( فلان کەس، دوێنێ سورەتی ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ﴾م خوێندەوە، ئایا زیارەت کەر چەندی بمێنێتەوەو، پاشان ببرێت بۆ بەهەشت، یان دۆزەخ.[١]

جارێکیان ووتاری دەدات و دەیووت: ((ئەی خەڵکینە، ئایا نابینن ئێوە شت و مەکی لەناو چووەکان بەکاردەهێنن و لەماڵی مردواندا دەژین و لەخانەو ماڵی لەناوچوواندانەکە جاران دراوسێتان بوون و، تا دوێنێ لەگەڵتاندا بوون، کەچی ئەمڕۆ لەگەڕەکی خامۆشاندان، لەنێوان ئەوەیان، تا ڕۆژی دوایی لەخۆشی و نازونیعەمتی گۆڕدان، یان تا قیامەت لەناو ناخۆشی و سزای ناو گۆڕدان).[٢]

جارێکی تر لە(خەناسیرە) ووتاری دەداو دەیوت: ((هەموو ڕۆژێك ماڵئاوایی لە کەسێك دەکەن و بەخاکی دەسپێرن، گیان دەسپێرن و تەمەنی تەواو دەبێ، پاشان ئەیخەنە ناو جەرگەی زەویەوەو بەبێ پشتی دۆشەك ڕاجەکشێنن، لەخۆشەویستانی و لەهەموو شێ جیا بوویەوە، بەرەو ڕووی لێپرسینەوەو خاکنشین بو، دووچاری کردەوەکانی خۆی بوو، لە دوای خۆی زۆری بەجێ هێشتووە و، بەڵام بۆ خۆی هەژارو نەدارە.[٣]

---

١ ـ الحلية(٥/ ٣١٧).
٢ ـ سيرة عمر (ابن الجوزى)لا ٢٥٩ـ ٢٦٠.
٣ ـ سيرة عمر (ابن الجوزى)لا ٢٥٩ـ ٢٦٠.

**٢ـ باوەڕ بە زیندوو بوونەوە دابەزینی خوا بۆ ساحەی مەحشەرو لێپرسینەوە:**

عمری كوڕی عبدالعزیزرحمه الله لە خەناسیرە ووتاری دەدا و دەیووت: ئەی خەڵكینە، ئێوە بەهەوانتە دروست نەبوون، هەروایش وازتان لێنا هێنرێت، ئێوە گەڕانەوەیەكتان هەیە بۆلای خوا و خواش دادەبەزێتە گۆڕەپانەوەكە بۆ لێپرسینەوەو یەكلا كردنەوەی مەسەلەكان.[1]

هەروەها نامەی نووسی بۆ هەندێ لە كاربەدەستەكانی و ووتی: (.. پاشان.. لە بەر چاومە وابەندەكان گەڕانەوە و بەردەمی خواو، ئەویش ئاگاداری كرد لە هەمووشتێك، پاداشتی خراپەكارانی بەخراپە و چاكە كارانیشی بەچاكە دایەوە).[2]

جەریری كوڕی حازم دەڵێت: ئەو نامەیەم خوێندەوە، كە عمری كوڕی عبدالعزیز نارد بووی بۆ عەدی، كە نووسیبووی: ((... وبزانە، كە كەس لە توانایدا نی یە هەموو كێشە و مەسەلەكان نێوان خەڵكی چارەسەر بكات و هیچ نەهێڵێتەوە، بەڵكو هەندێكی دوادەكەوێت بۆ ڕۆژی لێپرسینەوەـ یوم الحساب ـ)[3]

نامەیەكی نوسی بۆ عەدی كوڕی ارطاة ووتی: (پاشان... شەوێكێت دەخەمەوە یاد، كە بەیانی یەكەی ڕۆژی قیامەتە، ئای چ شەوێكە! ئای، كە بەرەبەیانێكە! لەسە ربێ باوەڕان زۆر قورس و ناڕەحەتە).[4]

هەروەها نامەی دەنووسی بۆ هەندێ لە سوپاكانی و پێ ی دەووتن: (.. پاشان... ئامۆژگاریتان دەكەم لە خوا بترسن و بەردەوام لەگوێ ڕایەڵی ئەو دابن، هەر كەسێ حەزی لەبەهەشە و لەدۆزەخ هەڵدێ دەی هەر ئێسا ئا لەم ڕۆژە بەتاڵانەدا، تەوبە یەكی وەرگیراو و، گوناهێكی لێ خۆش بوو، پێش ئەوەی ئەجەل بێت و تەمەنت كۆتایی بێت، ئەم كاتە بێ كاریانەیانەت بەكاربهێنە، چونكە خوا بۆیە بواری فەراهەم هێناون، تا لەڕۆژی قیامەتدا تاوانباریان بكات و هیچ پارەو

١ ـ سیرة عمر (ابن عبد الحكم)لا ٤٢.

٢ ـ ذم الدنیا لابن ابي الدنیا لا ٨١.

٣ ـ في الزُهد هناد السری (١/ ٢٩٩ـ ٣٠٠).

٤ ـ سیرة عمر (ابن الجوزی) لا١١٥.

پول و فيديه يەك وەرناگيرێت، فيڵ و فڕ دەوەرى نامێنێت، شاراوەكان ئاشكار دەكرێن، شەفاعەتى تكاكاران دەوريان نامێنێت، خەڵكى بەكردەوەكانيانەوە بەرەو ڕووى دەڕۆن، هەريەكە بەپێ ى كردەوەكانيان بڵاوەى لێ دەكەن بۆ ماڵەكانيان، دەى خۆشبەختى بۆ ئەو كەسانەى گوێڕايەڵى خوا يان كرد، وەيل بۆ ئەو كەسانەى سەرپێچى خوايان كرد).[١]

باوەڕ بەڕۆژى دوايى و زيند بوونەوە و ئەوەى، كە خواى - عز وجل - هەموو خەڵكى كۆدەكاتەوەو حيكمەت لەو ڕووداوە گەورەەى و ناڕەحەتى و ئاستەمى لەسەر بێ باوەڕان، لە ووتارەكانى عمرى كوڕى عبدالعزيز داهاتوە و گومانى تێدانى يە باوەڕى بە ڕۆژىى قيامەت لەگرنگترين بيرو باوەڕ ئيسلامى يە.

### ٣- كێشانە - الميزان.

عمرى كوڕى عبدالعزيز رحمه الله دەڵێت: ئايا حاڵەتى مرۆڤى مردووانتان نەديووە؟! دەم و چاويان نەماوە، ناوى لەبير كراوە، وەك بڵێ ى هەرگيز لەناو خەڵكيدا نەبووەو ماڵ و حاڵى ئاوەدان نەكردۆتەوەو ، دەى لەڕۆژێك بترسن، كە قورسايى زەڕەيەك كردەوە وون نابێت لەسەر كێشانە و تەرازوو دادەنرێت).[٢]

دەڵێ: (.. پەنا دەگرم بەخوا شتێكتان لێ قەدەغە بكەم و خۆم نەيكەم، كاسپى يەكەم: (بجدل الشافعى) لەباوكى يەوە دەگێڕێتەوە، كە هاوڕێ ى عمر بووە دەڵێ: (مايە پوچ بێت، داماويم لەوەى ئاشكرا بێت، ،ەژاريم لەوى بەسەردا بێت، كەهەژارو دەوڵەمەندى بەكێشانەو پێوانەى ئەوى دى دەردەكەوێت). عمرى كوڕى عبدالعزيز بينى ئايەتى ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ...﴾ الانبياء: ٤٧ ، كۆتايى خوێندەوە لاشەى لار بويەوە خەريك بوو دەكەوت بەلا.[٣]

---

١ - سيرة عمر (ابن الجوزى) لا٢٢٥.
٢ - هەمان سەرچاوەلا ٢٣٤- ٢٤٤.
٣ - سيرة عمر (ابن الجوزى)لا ٢٥٥.

هەموو ئەم ڕووداوانەی پاش مردن وەك زیندوو بوونـەوەو كۆبونـەوە لەمەحـشەر داو دابەزینی پەروەردگار ـ دابـەزنێك شایستەی خـوا بێـت ـ بـۆ یـەكلا كدرنـەوەو لێپرسینەوە، دانانی كێشانە، كە كێشانەیەكی ڕاستی و بەرجەستە یـەو كـردوەوەی بەندەكانی پێ دەپێورێت.[١]

(ابن مجمر) دەلێت: ئەبو ئیسحاقی زوجاجی دەڵێت: هەموو ئەهلی سونن لەسـەر ئـەوەن، كـە لەقیامەتـدا میـزان و تـەرازوو دادەنرێـت، كـردەوەی بەنـدەی پـێ دەپێورێت، ئـەو تـەرازوە زمـانی هەیـە و دوولای هەیـە بـۆ كێـشانی كـدرەوەكانی، هەرچـەندە (موعتەزیلـە) ڕایـەكی سـەیریان هەیـە لەسـەر ئـەو تـەرازووە و دەڵـێن: مەبەسـت لەتـەرازووی كردەوەكـان داد پەروەرییـە، بـەم ووتیەشـیان پێـچەوانەی قورئان و سـوننەت دەكـەن، چـونكە خـوا زۆر لـەوەش گـەورەترە، كـە تەرازوویـەك دابنێت و كردەوەی بەندەكانی بەبەرچاوی خۆیانەوە بكێشێت چاك وخراپی خۆیـان ببین و شایەت بێت لەسەیان.[٢]

ئەم تەرازووەخوای یەش زۆر ووردە، كەم و زیاد ناكات و،خوای گەورەش دەربارەی دەفەرموێ:﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ﴾الانبیاء: ٤٧.

### ٤ـ حەوزی كەوسەر:

عمری كوڕی عبـدالعزیز ﷺ نامـەی نووسـی بـۆ بەرپرسـی دیمەشـق پـێ ی ووت: پرسیارم بۆ بكە لە (ئەبو سەلام) لەوەی، كە لە (ثوبان)ی خزمەتكاری پێغەمبـەری خـواﷺ دەربـارەی (حـەوز)ی ـ كەوسـەر ـ چـی بیـستووە؟ ئـەگرە ووتـی بـەڵێ بیستوومە بۆم بنێرە با بێت بۆ لام.[٣]

---

١ ـ الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز (١/ ٤٥٧).
٢ ـ فتح الباري (١٣/ ٥٣٨).
٣ ـ البدایة والنهایة لة (الاثار الواردة)، (١/ ٤٦٢).

لەڕیوایەتێكی تردا هاتووە، كە عمری كوڕی عبدالعزیز ناردی بەدوای - ئەبو سەلامی حەبەشیدا- ئەویش هات بۆ لای ووتی: ڕێگا زۆر هیلاكی كردم و عمریش ووتی: مەبەستمان ماندوو كردنت نەبوو، بەڵام پێم گەیوە، كە تۆ دەربارەی حەوز فەرمودەیەكت لە(ثوبان)ەوە بیستووە، حەزم كرد لەدەمی خۆتەوە بیبیستم، ئەویش ووتی: لە (ثوبان)ەوە بیستم دەیووت: لە پێغەمبەری خوامﷺ بیستووە، كە فەرموویەتی: (( ان حوضی من عدن الی عمان بلقاء،[1] ماءه اشد بیاضاً من اللبن، و أحلی من العسل، واكوابه عدد نجوم السماء، من شرب منه شربة لم یظمأ بعدها ابداً، واول الناس وروداً علیه فقراء المهاجرین))،[2] واتە: ئەو حەوزەی من درێژیەكەی لەعەدەنەوە، تاعمانی بە لقانە و ئاوەكەی لەشیر سپی ترو لە هەنگوین شیرینترو پەرداخەكانی بەئەندازەكانی ئەستێرەكانی ئاسمانەو هەركەسێ یەك جا ر لێی بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت، یەكەمین تاقم، كە دەچنە سەری هەژارانی كۆچەریانن.

گومانی تێدانی یە باوەڕ بوون بە حەوزی كەوسەر یەكێكە لە بیرو باوەڕەكانی ئەهلی سوننە و جەماعە، بەبەڵگەی ئەو دەقانەی ڕاستەو خۆ باسی دەكەن و تاوای لێ هاتووە لە زۆر ی فەرموودەكانیدا بووە بە ( تەوا تور).[3]

## ٥- پردی سیرات - الصراط -:

عمری كوڕی عبدالعزیز نامەیەكی نووسی بۆ برایەكی - موسڵمانان - و پێ ی ووت: ئەی برای خۆم، تۆ زۆربەی ماوەی گەشتەكەت بڕیووە و ماوەیەكی كەمت ماوەتەوە، دەی برای خۆم ئاگات لە پەڕینەوەكان بێت، كە وەحی بۆ پێغەمبەرەكەت كراوە لە قورئاندا، كە تۆ دەبێت بەسەر - پردەكەدا بڕوێت - بەڵام نەوتراوە، كە ئایا دەگەیتە ئەو بەرەوە، یان دەكەویتە خوارەوە؟ نەكەی دنیا

---

١ - (الاثار الواردة)، (١/ ٤٦٣).

٢ - سیرة عمر (ابن الجوزی)لا ٣٧.

٣- تەواتور:واتەژمارەیەكی زۆرجیاجیا گێڕاویانەتەوە، كە گومانی تری تیا نامێنێ. وەرگێڕ.

بتخەڵەتێنێت، دونیا ماڵی ئەو کەسەیە، کە ماڵی نی یە، پارە و سامانە بۆ ئەوکەسانەی پارەو سامانیان نی یە.[١]

ئەم ووتەی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بەڵگەیە لەسەر باوەڕ بوون بە پردی سیرات، ئەمەش دوای نارەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت و لەو ڕۆژە دژوارەدا، کە خەڵکی دەدەن بەسەر ئەو پردەدا، کە بەسەر هەموو دۆزەخدا کێشراوە، لەموو باریکتر و لە شمشێر تیژترە، هەموو خەڵکی دەبێ بەسەریدا تێپەڕ بن و لە یەکتا پەرستان، تا گونهباران و سەر پێچی کەران و دوو ڕووەکان، بەر چاویان تاریك دەبێت و لە موسڵمانان جێ دەمێنن بەبەر بەستێك ناهێڵن لەگەڵ موسڵماناندا بچنە ئەو بەرەوە، هەر موسڵمانەو بەپێ ی کردەوەی چاکی خۆی نووری بێ دراوە بۆ ڕۆشن کردنەوەی بەر پێ ی خۆی، دەڕۆن بەسەر پردەکەدا هەندێك وەك هەورە بروسکە هەندێك وەك با، هەندێکیش بەهەزار حاڵ دەپەڕنەوە جارێ دەستیان بەر دەبێت و جارێك قاچیان بەر دەبێت و خۆیان دەگرنەوەو پرژی ئاگریان بەر دەکەوێت.[٢]

قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ئەم پردەیان باسی کردوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ مریم: ٧١، واتە: هەموو یەکێکتان دەبێت بدەن بەسەر ئەو پردەدا و ئەمەش بڕیارێکی نەگۆڕی پەروەردگارتە.

هەر لە سورەتی مریم یائەتی (٧٢) دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾، واتە: پاشان ئەهلی تەقوا و ڕزگار دەکەین لێ ی وستەمکارانیش لە نیواندا دەهیلێینەوە.

پێغەمبەری خواشﷺ دەفەرموێت: (( لایلج النار أحد بایع تحت الشجرة))، واتە: ئاگری دۆزەخ بەری کەسێك ناکەوێت، کە لەژێر درەختەکەدا بەیعەتی داوە، لەوێدا حەفسە- خێزانی- ووتی: ئەی خوای گەورە نافەرموێت: ﴿ وان منکم الا واردها ربك

١ - سیرة عمر (ابن الجوزي)لا ٣٨.
٢ - شرح الطحاویة لا ٤٧٠. لة (الاثار الواردة)، (١/ ٤٦٨)وەرگیراوە.

حتماً مقضیاً﴾، واتـه هـەموو کەسێك دەبێـت بـڕوات بەناویـدا؟ پێغەمبـەریش ﷺ فەرمووی: ئەی نەتبیستووە دەفەرموێت: (( ثم نجی الذین اتقوا ونذر الظالمین فیها جثیاً))؟ واتە: ئاماژەی بەوە کرد، کە تێپەڕبوون بەسەر دۆزەخدا مانای ئەوەنی یە دەخرێتە ناوی یەوە، ووشەی (ورود)، واتە: تێپەڕین بەسەر پردی سیرات دا.[1]

کەواتـە دوو جـۆر تێپـەڕ بـوون هەیـە بەسـەر دۆزەخـدا: یەکـەم: تێپـەڕ بـوونی باوەڕداران بەسەر پردەکەدا بۆ ئەوە بەرەوە و عمریش ئەمەی دوایی مەبەست بوو.

## ٦ـ بەهەشت و دۆزەخ:

عمری کوڕی عبدالعزیز جارێکیان دەستی کـرد بـەگریان و فـاطمـەی خێزانیـشی دەستی کرد بەگریان و، پاشان چی لەماڵەکەدا بوو دەستیان کرد بەگریان، کەسیش نەیدەزانی بۆچی دەگرین، پاش ئەوەی ئارامی هیوری هاتەوە بەسـەریاندا، فـاطمـە ڕووی کردە عمـرو پـێ ی وت بـەقوربانت بم ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران ئـەوە بۆچـی دەگریایی؟

عمریش ووتی: ئەی فاگمە بیری ئەو ساتە وەختەم کرد، کە خـەڵکی گەڕانەتـەوە بەردەسـتی خـوداو دەسـتەیەکیان بـۆ بەهەشـت دەڕوات و دەسـتەیەکیان بـۆ نـاو ئاگر... پاشان هاوارێکی کرد و لەهۆش خۆی چوو.[2]

سوفیان دەگێڕێتەوە دەڵێت:ڕۆژێکیـان عمـری کـوڕی عبـدالعزیز رحمه الله زۆر مـات و بێدەنگ بوو کاتێ هاوڕێکانی قسەیان دەکرد پێکەوە، بۆ ئەو ماتی یەی پرسـیاریان لێ کردووتیان: ئەی ئەمیری بڕواداران ئەوە چیە وا بێدەنگی؟

ئـەویش لەوەڵامـدا ووتـی: بـیرم لەخـەڵکی نـاو بەهەشـت دەکـردەوە، کـە چۆن سەردانی یەکتریان دەکەن و، بیرم لە خەڵکی ناو دۆزەخ دەکردوە، کە چۆن هاوار و بۆڕە بۆڕ دەکەن تێدا، پاشان دەستی کرد بەگریان.[3]

---

١ ـ شرح الطحاویة لا ٤٧١.

٢ ـ الرقة والبکاء لا ٧٦.

٣ ـ سیرة عمر (ابن الجوزی)لا ١٢٥.

هەروەها نامەی نوسی بۆ هەندێ لەسوپاکانی ئیسلام و پێ ی وتن: چاك بزانن ئەگەر بەندە خوا لێ ڕازیبێت و بڕواتە بەهەشتەوەهەرچی بەڵاو نەگبەنی دونیای بەسەر دادێت گرنگ نی یە، هەر وەك بەندەیەك خوا لێ ی بڕەنجێت و بیخاتە دۆزەخەوە چ سودێکی هەیە بۆی هەموو نازو نیعمەتە و خۆش گوزەرانی یەکانی دنیای؟ خەڵکی بەهەشت هەست بەنارەحەتی یەکانی دنیا ناکەن و خەڵکیدۆزەخیش هەست بەخۆشی و لەزەتەکانی دنیا ناکەن و ئەو شتانە هەموویان هەروەك نەبووبن وایە.[1]

(فضل)ی کوڕی (ربیع) دەڵێت: لە (فضیل)ی کوڕی (عیاض)م بیست دەیووت: جارێکیان کار بەدەستێکی عمر رحمه الله سکاڵای خۆی دەکرد بۆ عمر، عمریش نامەی بۆ نووسی و پێ ی ووت: ئەی براکەم، بیر لە شەونخونی نی یە نەبڕاوەو دورودێژەکان دۆزەخ بکەرەوە، دەخیلت بم نەکەی پشت هەڵبکەیت لەوەی لەلای خوایەو لەئاکامدا بێ بەش و بێ هیوا بمێنیتەوە، هەر کە نامەکە گەیشتە ئەو پیاوە و، خوێندیەوە، بەخێرایی وڵاتانی بڕی و خۆی گەیاندەوە لای عمر،عمریش ووتی: ها خێرە بۆچی هاتویتەوە؟ کابرا ووتی: نامەکەت دڵی دەرهێنام، تا ئەو ڕۆژەی خوا گیانم دەکێشێت هیچ پۆست و بەرپرسیاریەتی یەك وەرناگرم.[2]

ئەم باوەڕەی عمر بەبەهەشت و دۆزەخ لەوەوە سەرچاوەی گرتیبوو، کە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ﴾الانفطار: ١٣، ١٤، واتە: چاکەکارەکان لەناو نازو نیعمەتی بەهەشتدا دەبن و، خراپەکارەکانیش دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

یان پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (( ان احدكم إذا مات عرض عاليه مقعده بالغداة والعشي، ان كان من اهل الجنة فمن اهل الجنة، وان كان من اهل النار فمن اهل النار، يقال: هذا مقعدك حتى يبعثك الله يوم القيامة)).[3] واتە: هەر یەکە لە ئێوە

---

١ ـ سيرة عمر (ابن الجوزی) لا ١٢٥.

٢ ـ هەمان سەرچاوە لا ١٢٤ـ ١٢٥.

٣ ـ مسلم ٢٨٦٦.

بمرێت هەموو ئێوارەیەك سەرەنجامی خۆی پێ پیشاندەدرێت، ئەگەر بەهەشتی بێت بەهەشت و ئەگەر دۆزەخی بێت دۆزەخی پێ پیشاندەدرێت، پێی دەڵێن: ئەمە شوێنی خۆتە، تا ئەو کاتەی زیندو دەکرێتەوە.

## ٧ـ بینینی خوای گەورە لەبەهەشتدا:

عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نووسی بۆ هەندێ لەسەر بازەکانی و پێ ی ووتن: پاشان... ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی لەخوا بترسە و دەس بگرە بە فەرمانەکانی یەوە و ئاینەکەی لە گۆش بگرە، قورئانەکەشی بکەرە بەرنامەی ژیانت، هەر لەخوا ترسانە، کە خاوەنەکانی لەخەشم و تورەیی خوا دەپارێزێت، هەر بەو هۆیەشەوە دەبنە (ئەولیاء)و بەرزیان دەکاتەوە، هەر بەو هۆشەوە بوونەتە هاوڕێ ی پێغەمبەران و بەو بۆنەیەشەوە ڕوویان جوان دەبێت و تەماشای پەروەردگار و خولقێنەرەکەیان دەکەن.[1]

ئەم باوەڕەی عمریش لەقورئانی پێغەمبەرەوە سەرچاوەی گرتبوو، مە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ القيامە ٢٢ـ ٢٣. واتە: کۆمەڵە دەموچاوێك جوان و گەشاون لە ڕۆژی قیامەتدا و بۆ خوای گەورە دەڕوانن.

(مهیب) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە پێغەمبەری خوایان پرسیﷺ دەربارەی مانای ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ یونس: ٢٦، واتە: بۆ ئەوکەسانەی چاکە کارن چاکەو خۆشی هەیە لەگەڵ شتی تریشدا، لەوەڵامدا فەرمووی: ((اذا دخل اهل الجنة الجنة واهل النار النار ينـاد منـاد: يا اهـل الجنـة، ان لكم عند الله موعداً يريد ان ينجزكموه، فقالوا: الم تبيض وجوهنا و تثقل موازيننا و تجرنا من النار، قال: فيكشف الحجاب فينظر اليه، فوالله ما اعطاهم الله شيئا احب اليهم من النظر الى ربهم عزوجل)).[2]

---

١ ـ الرد على الجهمية للدارمي.

٢ ـ مسلم ٢٩٧.

واتە: دەربارەی ووشەی (شتی زیاتریش هەیە) پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردو ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: هەرکاتێ بەهەشتی یەکان خرانە ناو بەهەشتەوە و دۆزەخییەکانیش فڕێ درانە ناو دۆزەخەوە، هاوار چی یەك هاوار دەکات: ئەی خەڵکی بەهەشت، خوای گەورەر پەیمانێکی تری ماوەو دەیەوێت بۆتان بەرێتە سەر، هەر هەموو وتیان: کوا چی ماوە؟ دەم و چاومان سپی و جوان بووە و کێشانەی کردەوەی چاکمان قورس کراوە و لە ئاگریش پارێزراوین، دەفەرموێت: پەردە لادەدرێت و هەموو تەماشای خوای پەروەردگار دەکەن.سوێند بەخوا هیچ نازو نیعمەتێکی پێ نە داون لەبەهەشتدا ئەوەندەی تەماشا کردنی پەروەردگار خۆش و بەچێژ بێت لەلایان.

## حەوتەم: دەستگرتن بە قورئان و سوننەت و ڕێرەوی خەلیفەی ڕاشیدەکانەوە:

### ١ـ دەستگرتن بەقورئان و سوننەتەوە:

کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بو بە خەلیفە نووسی: پاشان... من وەسیەتان پێ دەکەم تەقوای خواتان هەبێت و دەست بگرن بە قورئانەوە و پابەند بن بە سوننەت و ڕێنموونی یەکانی پێغەمبەرەکە یەوە ﷺ.[1]

هیچ کەس بۆی نی یە لە خزمەت و قورئان و سونەتدا رای خۆی بسەپێنێ، یان کاری پێ بکات، بەڵکو دەبێت دەقاو دەق جێ بەجێیان بکات.[2] ( ئەوەی لەدڵمدایە بۆ ئومەتەکەی محمد ﷺ ئەوەیە، کە شوێن قورئان سوننەت بکەون و لە هەواو ئارەزووات دوور بکەونەوە، کار کردن بەشتی تر جگە لە قورئان نەڕێزو نەکەڕامەی دونیاو ئاخیرەتی تێدانی یە.

باچاك بزانێت ئەوەیدەیەوێت بزانێت،کە بەخواحەزدەکەم گیانم دەربچێت و، بەڵان خەڵکی لەسەر شتێکی تر جگە لە قورئانی پەروەردگار ەکەیان و سوننەتی

---

١ ـ سیرة عمر ابن عبد الحكم لا ٦٥.

٢ ـ هەمان سەرچاوەلا ٦٨، هەمان سەرچاوەی دوەم (١/ ٢٨٧).

پێغەمبەرەکەیان گۆشی یەکەم و شوێن شتێکی تریان ئەخەم، ئەو دوو سەرچاوەیەی، کە خەڵکانێکی پێش ئێمە لەسەری ژیان و هەر بەوشێوەیەش خوای گەورە گیانی کێشان، بێ نرخ ترین و خەمناك ترین کەس لام ئەوکەسانەن، کە دەیانەوێت پێچەوانەی ئەو ڕێبازە بن.[١]

لە شوێنێکی تردا، دەڵێت: (( خوا کۆمەڵێك فەرزو و کۆمەڵێك سوننەی داناوە هەر کەسێك کاریان پێ بکات دەگاتە سەر فرازی و هەر کەسێکیش وازیان لێ بهێنێت لەناو چووە).[٢]

دەڵێت: (( خۆزگە خۆم و ئێوەشم وا لێ دەکرد کارتان بە قورئانی پیرۆز دەکرد، هەرکاتێ سوننەتێکم جێ بەجێ بکردایە و ئەندامێکم تیا بچوایە، تا لە کۆتاییدا گیانم دەر بچووایە).[٣] نامەیەکی نووسی بۆ خەواریجەکان - تیایدا پێ ووتن: ((پێغەمبەری خوا ﷺ وچوار یارەکەی دوای خۆی کۆمەڵێ سوننەتیان بەجێ هێشتووە بۆمان، دەست پێوە گرتنیان دەست گرتنە بە قورئان وەو هێزو گوڕ و تینە بۆ ئاینەکەی خوا، بۆ کەس نی یە، دەستکاری کردن و گۆڕینیان، یان هەوڵ بدرێت بە پێچەوانەی یانەوە کار بکرێت، هەر کەسێ ئەو ڕێگایە بگرێتە بەر ئەوە ڕێنموێنی کراوە، هەر کەسێکیش بەتەمای سەر کەوتن بێتپێیان ئەوە بێ سەرکەوتووە، هەر کەسێکیش وازیان لێ بهێنیت و ڕێبازیکی تر بگرێتە بەر ئەوە خوا دەستی لێ بەر دەدات و دەیخاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە، کە خراپترین شوێنە).[٤]

ئەو ئاسەوارانەی لە عمری کوڕی عبدالعزیز نقلْ کراوە بۆمان دەربارەی دەستگرتنی بە قورئان و سوننەتەوەو ئەو پەڕی هەوڵ و تێکۆشانی لەپێناو جێگیر کردنیان، ئیتر با لەوپێناوەشدا پارچە پارچەی ئەندامەکانی لەشی لێبێتەوە، ئەوەش ، کە عمر بۆی چووە ئەسڵی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە و باوەڕ هیچ مانایەکی

---

١ - سيرة عمر لابن عبد الحكم لا ٧١.

٢ - سيرة عمر لابن عبد الحكم لا٣٩.

٣ - هەمان سەرچاوەلا ١٣٠.

٤ - سيرة عمربن عبدالعزيز( لابن عبدالحكم) لا٤٠.

نامێنێت لەگەل ئەو کارەدا نەبێت، وەك خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ النساء: ٦٥.

پێغەمبەری خوایشﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (( یاأیها الناس، اني قد تركت فيكم ما ان اعتصمتم به فلن تضلوا بعدی ابداً، كتـاب الله، وسنتي))،[١] واتـە: ئـەی خەڵکینە، من دووشتم لەناودا بەجێ هێشتوون دەستیان پێوە بگرن هەرگیز گومڕاو سەر گەردان نابن: قورئانەكەی پەروەردگار و سوننەتەكانی من).

## ٢ـ دەستگرتن بو سوننەكانی خەلیفە ڕاشیدینەكان:

حاجبی كوڕی خلیفه (البرجمی)دەڵێـت: عمـری كـوڕی عبـدالعزیزم بینـی، كاتـێ خەلیفـە بـوو، ووتـاری دەداو و دەیـووت: ئـەوەی پێغەمبـەری خـواﷺ دوو جـێ نیشینەكەی دوای خۆی دایان ناوە،بۆئێمـە ئاینـەوەدەبێت كاریـان لەسـەر بكـەین و لێیان لانەدەین، ئەوەی خەڵكانی تردوای ئەوان دایان ناوە دەیدەینە دەستی خوا.[٢]

عمرﷺ پاش ئەوەی بووبە خەلیفە نامەی بۆ نارد سالمی كوڕی عبـداللەی كـوڕی عمری كوڕی خطابﷺ پێ ی ووت: لەعمری كوڕی عبـدالعزیزەوە بـۆ سـالمی كـوڕی عبدالله، پاشان... من دوچاری ئـەم كـارە گەوەرەیـە كـراوم بـەبێ ئـەوەی پرسـێك بەخۆم كرابێت و بەبێ ویستی خۆم دراوە بیەسەرمدا، خوایش باش ئەوە دەزانێـت، هەر كە ئەم نامەیەم گەیشتە دەستت خێرا ژیان و بەسەر هاتی عمری كوڕی خطـابم بۆ بنووسەوەو بۆم بنێرە لەگەڵ موسڵمانان و ئەهلی (الذمة)دا چۆن ڕفتاری كردوەن چونكە بەنیازم ئەگەر خوا كۆمەكم بێت وەك ئەو بكەم، والسلام).[٣]

---

١ ـ الموطأ للامام مالك(٣/ ٩٣).

٢ ـ الحلية(٥/ ٢٩٨).

٣ ـ سيرة عمر لابن الجوزي لا١٠٨.

عەون ی کوڕی عبدالله دەڵێت: عمری کوڕی عبد العزیز پـێ ی ووتم: ئایا عمری کوڕی خطاب و (ابن عمر ی کوڕی )کەسێکی چاك و قبوڵ کراون لەلای تۆ؟ ووتم: بەڵێ، ئەویش ووتی: دەی ئەوان بەم شێوەیەی تۆ (الله اکبر)یان نەکردووە.[١]

لە زوهری یەوە دەگێڕنەوە ووتویەتی: پیاوێك بە عمری کوڕی عبدالعزیزی ووت: من بەسەر خۆشی خێزانەکەم تەڵاق داوە، زوهەری دەڵێت: عمر پـێ ی وابوو، کە داری حدی لێ بدرێت و، ژنەکەشی لێ جیا بکرێتەوە، تا ئەوە بوو (أبان)ی کوڕی عوسمان لەباوەکی یەوە بۆی گێڕایەوە، کە (شێت و سەرخۆش طلاقیان ناکەوێت، عمریش ووتی: ئەتانەوێت وابکەم! کەچی ئەم پیاوە لە (عثمان)ی کوڕی عفانەوە جۆرێکی ترم بۆ دەگێڕێتەوە؟! ئیتر ئەوە بوو داری حەدی لەبەر خۆشی یەکەی لێی داو، بەڵام خێزانەکەی دایەوە.[٢]

عمری کوڕی عبدالعزیز دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ و چوار یارەکەی دوای خۆی کۆمەڵێ ڕێڕەو سوننەتیان داناوە، ئیش پێ کردنیان دەستگرتنە بە پەرتووکەکەی خوداوە و وزەیشە بۆ ئاین، بۆ هیچ کەس نی یە بیانگۆڕێت، یان دەستکاریان بکات، یان سەیری ئەو ڕایانە بکات، کە پێچەوانەیا نن، ئەوەی هیدایەتیان پـێ وەر بگرێت هیدایەت دراه دەبێت و ئەوەی بیەوێت سەر بکەوێت پێیان بێ گومان سەر دەکەوێت، هەر کەسێکیش وازیان لێ بهێنێت و ڕێگایەکی تر بگرێت جگە لە ڕێبازی موسڵمانان، ئەوە خوا وازی لێ دەهێنێ و دەیخاتە ناو دۆزەخەوە، کە خراپترین جێگایە.[٣]

بەوشێوەیە عمری کوڕی عبدالعزیز دەستی گرتبو بە سوننەت و ڕێڕەوی پێغەمبەری خوا ﷺ و چورا جێ نیشینە ڕاشیدەکەیەوە و، شێوەو شێوازی جوانی خەلافەتی ڕاشیدەینی گێڕایەوە، لەسەر ڕێڕەوەیان دەڕۆیشت، توند دەستی گرتابو

---

١ ـ مصنف عبد الرزاق(٢/٦٦).

٢ ـ هەمان سەرچاوەلا (٤/ ٣١).

٣ ـ سيرة عمر لابن عبد العزيز لا٤٠.

پێیانەوە، لەکاتی جیاوازی و ناکۆکیدا دەگەڕایەوە سەر ڕای ئەوان و بەو شێوەیە حوکمی موسڵمانان و (اهل الذمة)ی دەکرد، هەروەك لە پەرستشەکان و مامەڵەکاندا لێیان دەرنەدەچوو.

هەموو گرنگی یەکی دابوو بەشێوازی حوکمڕانی و ڕێڕەوی دوو جێنیشینەکەی یەکەم، ابو بکر و عمر رضي الله عنهما پێ ی وابوو دەست گرتن بەسونەتەکانی ئەوانەوە وەك دەستگرتن وابووە بەسونەتی پێغەمبەری خواوە ﷺ، هەرچەندە هەر کەمەسەلەیەکی ببیستایە لە خەلیفەی سێیەمەوە خێرا کاری پێ دە کرد وەك باسمان کرد، لەسەر ڕێڕەوی خەلیفەی چوارەم هەنگاوی دەنا لە هەڵس و کەوتی لەگەل (خەواریجەکان) بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ منداڵ و خێزان و ماڵ و سامانیدا دەکرد وەك چۆن ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالیب رضي الله عنه بەو شێوەیەی کرد لەگەڵیاندا.[1]

نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو پێ ی وابوو ئەو کەسانەشی، کە لەپێغەمبەری خوا ﷺ و ڕێڕەوی خەلیفە ڕاشیدیەکان رضي الله عنهم دەردەچێت ئەوە لە ڕێگەی موسڵمانان دەرچون و بەو تاقمە لەناو چووەکانی دادەنان، هەرچی سوننەت و ڕێڕەی چوار یارەکە هەیە هەمووی لە سوننەتی پێغەمبەرەوە وەریان گرتووە و هەموو حەرامەکانیان حەرام دەکرد و حەڵاڵەکایان حەڵاڵ دەکرد.

سەلەفی ساڵح لەسەر ئەوەن، کە لەبیرو باوەڕ و حوکمەشەرعی یەکاندا پێویستە لە ڕێڕەوی جێ نیشینە ڕاشیدینەکانیان لانەدەین، ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی فەرموودەش داوای ئەوە دەکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾ النساء: ١١٥.

پێغەمبەری خوایش ﷺ دەفەرموێت: (( فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين

---

١ ـ (الاثار الواردة) عن عمربن عبدالعزيز (٢/ ٦٣٧).

المهديين من بعدي، عضو عليها بالنواجذ، وايّاكم و محدثات الامور، فان كل محدثه بدعه))، [١] واته: لەسەر سوننەکانی من و جیٚ نیشینە ڕاشیدە ڕێنموونی کارەکان بڕۆن لە دوای خۆم و توند بەدانەکانتان دەستیان پێوە بگرن دەخیلتان بم دوور بن لەشتی تێکەڵ کراو بە ئاین، چونکە هەموو تێکەڵکاری یەك بیدعەو داهێنراوە.

حذیفة رحمه الله دەڵێت: لەلای پێغەمبەری خواﷺ دانیشتبوین فەرمووی: ((من نازانم چەندێکی تر لەناوندا دەژیم، دەی شوێن پیٚ ی ئەو دووانە بگرنە بەر، کە دوای خۆم دین))، مەبەستی لە ئەبو بەکرو عمر بوو. [٢]

## ٣ـ دەستگرتنبەسروشت پاکی یەوە ـ الفطرة ـ:

جەعفەری کوڕی دبرقان دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز و پرسیاری هەندیٚ شتی لیٚ کرد، لە هەواو ئارەزووەوە بوو، عمریش پیٚ ی ووت: ئاینی سەر دەمی منداڵی ـ الفطرة ـ وەربگرە لە قورئان خوێنان و عەرەبە دەشتیەکی ییکان و هەمووشتێکی تر بخرە ئەو لاوە. [٣]

عمر لەم ووتەیەی سەرەوەیدا مەبەستی ئەوە بوو، کە مرۆڤەکان لەسەر ئاینی ڕاست و دروست لە دایك دەبن و لادان و خلیسکان لەڕێگەی هۆکاری دەرەکی یەوە تووشی مرۆڤ دەبێت و ئەمەش قورئان ئامازەی بۆ کردوە وەك دەفەرموێت:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴾ الروم: ٣٠.

پێغەمبەری خواشﷺ دەفەرموێت: (( مامن مولود الاّ يولد على الفطرة، فأبوا يهودا انه او ينصرانه او يمجسانه، كما تنتج البهيمة العجماء))، کەواتە مرۆڤ لەسەر فیترەتی پاك و باوەڕ بەخوا لە دایك دەبێت: ((هل تحسون فيها جوعاء)) هەروەك چۆن حوشتر حوشترێکی تەواوی دەبێت و نابینن یەك قاچ، یان یەك دەستێکی

---

١ ـ سنن الترمذي( ٥/ ٤٤) حديث حسن صحيح.

٢ ـ سنن الترمذي( ٦١٠/٥) صحيح سنن الترمذي للالباني( ٣/ ٢٠٠)(( انى لا أدري ما بقائى فيكم، فاقتدوا بالذين من بعدي)).

٣ ـ شرح اعتقاد أهل السنة ژ٢٥.

ببێت، ئەبو هورەیرەش دەڵێت: (( فطره الله التي فطر الناس عليها، لا تبديل نخلق الله، ذلك الدين القيم)).[١]

سروشی پاك ـ فطرة السليمة ـ دان دەنێت بە دروستکەرەکەیداو خۆشی دەوێت و ملکەچی دەبێت و بەدڵسۆزی دینداری بۆ دەکات، هێزێکی وای تێدایە ئەوە قبوڵ بکات، شەریعەتەکەی ڕازی و ببێت و، خەڵکە کەشی پێ ڕازی بکات، ئەو سروشتە پاکە بەم شەریعەتە دەزانێت و لەگەوەروە بچووکی ئاشنایە، بەڵام کاری پێغەمبەران ئەوەیە بەئاگای بێنێتەوە و بۆی ڕۆشن بکاتەوە و ئەو هۆکارانەی پێ بناسێت، کە وا دەکات لەسروشتی پاك لابدات و شوێن ڕاستی نەکەوێت.[٢]

## هەشتەم: هەڵوێستی دەربارەی هاوەڵانﷺ و ناکۆکی نێوانیان:

لە عبد الرحمن ی کوڕی قاسم، ئەویش لە لە باوکی یەوە دەگێڕێتەوە، کە دەڵێت: ئەو قسەیەی عمری کوڕی عبدالعزیزم زۆر بەدڵە، کە دەڵێت: (( پێم خۆش نەبوو، کە هاوەڵانﷺ جیاوازیان تێ نەکەوتایە، چونکە ئەگەر هەموو یەك بۆ چوون و قسە بوونایە، ئەوا خەڵکی دەکەوتنە نارەحەتی و تەنگی یەوە، ئەوانە کۆمەڵەپێشەوایەکن شوێن پێیان هەڵدەگیرێت و، هەکەسێ بەقسەو ڕای هەرکامیان بکات، بۆی هەیە و لە فراوانیدایە).[٣]

ئەبو عمرﷺ دەڵێت: ئەمە لەو شتانەدا بەو جۆرەیە، کە بواری ئیجتهادیان تێدا هەیە،[٤] پرسیاریان لەعمری کوڕی عبدالعزیز کرد، دەربارەی علی و عثمان و جەنگی صفین و ئەوناکۆکیانەی لەناویاندا ڕووی دا، ئەویش لەوەڵامدا ووتی: ئەوە خوێنێك بوو خوای گەورە دەستمانی لێ پاراست، دەی منیش پێم ناخۆشە زمانمی تێوە گلێنم.[٥]

---

١ ـ بخاري ژ ١٣٥٨.

٢ ـ شفاء العليل لا ٦٢٩، ٦٣٠.

٣ ـ جامع بيان العلم (٢/ ٩٠١، ٩٠٢).

٤ ـ الاثار الواردة (١/ ٤١٠).

٥ ـ الطبقات (٥/ ٣٩٤).

له محمدی کوڕی النضر دهگێڕنهوهکه: جارێکیان باسی ناکۆکی ناو هاوهڵانی پێغهمبهریانﷺ کرد لهلای عمری کوڕی عبدالعزیز دا و ئهویش ووتی: (( ئهوه کارێکه خوا دهستی ئێوهی لێ پاراستووه، دهی بۆچی زمانتانی لێ ناپارێزن؟!)).[١]

عمری کوڕی عبدالعزیز وهك ههموو سهلهفی صالحی ئوممهت ـ سور بوو لهسهر ئهوهی مێژووی هاوهڵان بهپاکی و بێگهردی بمێنێتهوه و چاکهکانیان باس بکات چۆن وانهکات ئهوهتا خوای گهوره دهفهرموێت: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾الفتح: ١٨، واته: بهڕاستی خوای گهوره لهو باوهڕدارانه خۆش بووه، که لهژێر درهختهکه بهیعهتیان پێ دایت و خوایش باش دهزانێت چی له دڵیاندا ههیه و ئارمی باراندە سهر دڵهکانیان و بهسهرهوتنی گهورهو ـ فتح مكه ـ پاداشتیان دهداتهوه.

بیرو باوه ڕی ئههلی سوننه لهسهر ئهوهیهکه: نابێت ناوی هیچ هاوهڵێکت پێغهمبهرﷺ ببرێت مهگهر به چاکهو بێ دهنگ بوون لهو شتانهی له نێوانیاندا ڕووی داوه، ئهوانه له ههموو کهس زیاتر شایسهی ئهوهن بههانهیان بۆ بهێنرێتهوه جوانترین گومانیان پێ ببرێت.[٢]

ابن حهجهریش دهڵێت: ئههلی سوننه ههموو لهسهر ئهوهن، که نابێت تانه لههیچ هاوهڵێك بدرێت بههۆی ئهو ڕووداوانه نێوانیانهوه، ئیتر بابشزانرێت کامیان لهسهر ههق بوون، چونکه خوا لهو کهسانه خۆش بووه،که له (ئیجتهاد)دا ههڵه دهکهن، نهك ههر ئهوهنده، بهڵکو یهك پاداشت بۆ ئهوکهسه ههیه، که له (ئیجتهاد)دا ههڵه دهکات و، دووپاداشت بۆ ئهو کهسهی، که دهیپێکێت.[٣]

---

١ ـ ههمان سهرچاوه(٥/ ٣٨٢).

٢ ـ الثمر الداني في تقريب المعاني لا ٢٣.

٣ ـ فتح الباري (١٣/ ٣٤).

## نۆیەم: هەڵوێستی دەربارەی ( أهل البیت ):

(ابن القیم)دەڵێت: زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا، کە ووشەی (أهل البیت) کێ دەگرێتەوە لەسەر چوار بۆ چوون:

یەکەم: هەموو ئەوانە دەگریتەوە، کە خێریان - صدقه - پێ ناشێت و لەوبارەیەوە سێ ڕایان هەیە

١- نەوەکانی الهاشم نەوەکانی المطلب.

٢- تەنها نەوەکانی هاشم.

٣- نەوەکانی هاشم و بەرەو ژووتر.

دووەم: کەس و کاری پێغەمبەر بریتی یە لە: نەوەکانی و خێزانەکانی یەتی بەتایبەت

سێ یەم: هەموو شوێن کەوتوانیەتی، تا ڕۆژی قیامەت.

چوارەم: هەموو لە خواترسەکانی ئوممەت دەگرێتەوە.

بەڵام (ابن قیم) ڕای یەکەم بەڕسات دەزانێت و هەموو ئەوکەسانە دەگرێتەوە، کەزەکاتیان پێ ناشێت، هەر چەندە شیعەکان ڕایەکی جیاوازیان هەی، کە پێچەوانەی دەقەڕاست و دروستەکانن و پێچەوانەی هەموو عورف و عادەت و زمانی عەربین، کە دەڵێت: (أهل البیت) تایبەتە بە(علي و فاطمة، حسن، حسین، نەوەکانیان!).

چونکە ووشەی(أهل البیت) لەقورئاندا لەناو ئەو ووتانەدا، کە لەگەڵ خێزانەکانی پێغەمبەری خوداﷺ کراوە وەك لە سورەتی الاحزاب ئایەتی(٣٣) دەفەرموێت: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾.

لەکتێبی ئەمیری باوەڕدارن علی کوڕی ئەبو طالب دا بەدرێژایی لەسەر ئەو تێگەیشتنەی شیعەکان ڕۆیشتووم دەربارەی خانەوادەی پێغەمبەری خواﷺ یە.

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله مافی تەواوی دەبەخشیە خانەوادەی پێغەمبەر، چ لەلایەنی مادی و چ لەلایەنی دەروونی، بەبێ کەم و زیاد مافی ڕەوای خۆیانی پێ دەدان.[١] و هەموو ئەو ستەم و ناڕەواییانەی دژیان کرا بووهەڵی گرت لەسەریان و زۆر باش بوو لەگەڵیان دا بەو پەڕی مانای باشی.

جویر یەی کوڕی ئەسماء دەڵێت: کاتێ ناوی عمری کوڕی عبدالعزیز برا لەلای فاطمەی کچی علی کوڕی ئەبو طالیبدا زۆر زۆر داوای لێخۆشبوون و بەزەیی بۆ کرد، لە خوای گەورە، دەیووت: کاتێ عمر ئەمیری مەدینە بوو، چوم بۆ لای ئەویش لەبەرمن هەموو پاسەوان و میوانەکانی کردە دەروە و بە تەنها من و خۆی ماینەوەو پێ ی ووتم: ئەی کچی عەلی، وللاهی لە هەموو سەرزەویدا خانەوادەیەك نی یە ئەوەندەی ئێوە خۆشم بوێت، ئێوەم لەکەس و کاری خۆم خۆشتر دەوێت.[٢]

عبدالله ی کوڕی محمدی کوڕی عەقیل ی کوڕی ئەبو طالب دەڵێت:یەکەمین ماڵ و سامان عمری کوڕی عبدالعزیز بەخشی یی‌وە، ماڵ و سامانێك بوو، عمر بۆ ئێمەی نارد (أهل البیت)و پیاو ژنانمانی بەیەکچاو سەیر دەکرد وەك یەکی پێدان و بۆ منداڵیش وەك ئافرەتانی پێدا و هەریەکە (٣٠٠٠)دینارمان بەرکەوت، نامەی بۆ نووسین ووتی: ئەگەر بمێنم بۆ تان دەبێت هەموو مافەکانی خۆتان بۆ بگێڕمەوە).[٣]

حسینی کوڕی صالح دەڵێت: باسی زاهید و دنیا نەویستەکانیان کرد لە لای عمری کوڕی عبدالعزیز دا، یەکێك دەیووت: فلان کەس، یەکێکی تر دەیووت: نەخێر فلان کەس، عمریش وتی: دنیا نەویسترین کەس لە هەموودنیادا علی کوڕی ئەبو طالیب رحمه الله.[٤]

عمری کوڕی عبد العزیز وەك هەموو یەکێك لەسەلەفی سالح زۆر مەبەسی بوو مافی تەواوی خانەوادەی بەرێزی پێغەمبەری خوا بدات، ئەمەش وەك گوێڕایەڵێك بۆ

---

١ ـ الاثار الواردة (١/ ٤٢٩).
٢ ـ الطبقات (٥/ ٣٦٦).
٣ ـ الطبقات (٥/ ٣٦٢).
٤ ـ سيرة عمر لابن الجوزي لا ٢٩٢.

فەرمانی پێغەمبەرﷺ، کە فەرموویەتی: ... واهل بیتي، اذکرکم الله في أهل بیتي))،[١] واتە: دەخیلتان بم کەس و کارەکەم خواتان وەبیردەهێنمەوە چاکبن لەگەڵ کەس و کارەکەم.

(ابن تیمیه) دەڵێت: لەبنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعە یەکە(أهل البیت)ی پێغەمبەری خوایانﷺ خۆش بوێت و مافی تەواوی خۆیانیان پێ بدەن و ، ئامۆژگاری پێغەمبەریان لەم بارەیەوە جێ بەجێ بکەن، خوای گەورەره اه (فیئ)ەو (پێنج) یەك بەشی تایبەتی بۆ داناون و فەرمانی پێداوین لەگەڵ سەڵاوات داندا لەسەر پێغەمبەرﷺ سەڵاواتیش لەسەر ئەوان بدەین.[٢]

پاشان (ابن تیمیه)باسی ئەو مافانە دەکات، کە عمری کوڕی عبدالعزیز گێڕایەوە بۆیان وەك و زەویەکەی فەدەك و گەڕانەوەی (پێنج یەك) بۆیان و بەشداریکردنیان لە فەیئدا.[٣]

بەڵام ئەوەی هەندێ کتێبی مێژووی باسی دەکەن، کە گوایە کار بەدەستەکانی بەنی ئوممەیە لەپێش عمردا خراپ بوون لەگەڵیانداو لەسەر مینبەر جنێویان داوە بەعلیرضي الله عنه! ئەمە شتێکە و (ابن سەعد) باسی کردوە ڕاست نی یە:

(ابن سعد) دەڵێت: علی کوڕی محمد لە لوط ی کوڕی یحیی وە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: والی و گەورە بەپرسەکانی(بەنی ئوممەیە)لەپێش عمری کوڕی عبدالعزیز جنێویان بە علی دەدا لەسەر مینبەر و هەرکە عمری کوڕی عبدالعزیز چووە سەر حوکم ئەوەی نەهێشت.[٤]

ئەم گێڕانەوەیەش لاوازە، چونکە عای کوڕی محمد ـ المدائني ـ پیاوێکی لاوازە بووە، مامۆستاکەیشی لوط ی کوڕی یحیی گێل بووە(واە)جارجار شتی لەبیر چووە، یحیی کوڕی معین دەربارەی، دەڵێت: جێگەی متمانە نی یە، (ابو حاتم)یش

---

١ ـ مسلم ژ ٢٤٠٨.
٢ ـ الفتاوی (٣/ ٤٠٧).
٣ ـ الاثار الواردة (١/ ٤٣٣).
٤ ـ سير أعلام النبلاء(٥/ ١٤٧).

دەڵێت(متروك الحديث) واتە: حەدیثی لێ وەرنەگیراوەو، (دار القطنی)یش دەڵێت: هەوال گێڕەوەیەکی لاوازە، خاوەنی (المیزان)یش پێ ی دەڵێت: هەواڵ گێڕەوەیەکی هیچە و متمانەی پێ ناکرێت.[١] هەمووز ڕاویەکانیشی لەلاوازەکان و فەوتاوەکان و نەناسراوەکانە.[٢]

شیعەکان موعاویەرضي الله عنه بەوە تاوانبار دەکەن، کە گوایە لەسەر مینبەر لەعنەتی لەعلی کردووەو، جنێوی پێ داوە! ئەم قسەیەش ڕاست نی یە و هیچ بنەمایەکی ڕاستی تێدا نی یە، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە و پشت شکێنە ئەوەیە، کە نووسەر لێکۆڵێەرەوەکان ئەم درۆیەیان لەگەڵ ناڕاستی یەکەیدا نقل کردوە، بەبێ ئەوەی لێکۆڵینەوە و بیخەنە ژێر تیشکی ڕەخنەوە، لە ڕاستیدا هەرگیز هیچ ڕیوایەتێکی ڕاست و دروست لەو بارەیەوە نەهاتووە.

ئیتر بەهیچ شێوەیەك نابێت ، پشت ببەستریت بەکتێبەکانی (الدمیری) و (الیعقوبی) و( ابی فرج الصفهانی)، لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی ڕاست ئەوانە هەموو بەدرۆ دەخاتەوە.[٣] ڕاستی ئەوە دەسەلمێنێت، کە موعاویەرضي الله عنه ئەو پەڕی ڕێزی بەخشیوەتە عەلی کوڕی ئەبو طالیبرضي الله عنه و (أهل البیت)ە خاوێنەکەی.

بەسەرهاتی لەعنەت کردن لە علیرضي الله عنه لەسەر مینبەرەکانی (بنی أمیە) ناگونجێت لەگەڵ سروشتی ڕووداوەکان بێت و ڕەوشتی لایەنە ناکۆکەکان، ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ئەو نوسراوانەی لەسەردەمی حوکمی (بنی أمیە)دانووسراون هیچ مەبەستیش لەو نوسینانە لەوانەیە بۆ ناشیرن کردنی شورەتی ئەمەیەویەکان لەبەرچاوی جەماوەری موسڵمان.

مەسعودی لە (مروج الذهب)دا ئەوەینووسیوە و ئەویش لەنووسەرە شیعەکانە، ئەو درۆ و دەم هەڵبەستانە دزەیان کردۆتە ناو و مێژووی ئەهلی سوننەوە، هیچ

---

١ ـ المیزان (٣/ ٤١٩).

٢ ـ دفاعا عن السلفية لا ١٨٧.

٣ ـ الحسن والحسين، محمد رضا لا ١٨٠.

ڕیوایـەتێکی صـحیحی تێـدا نـی یـە، هـەموویان ناتـەواون لـە نقـڵ کردنـی لەسەنەدەکەیدا، یان لەدەقی ووتەکاندا و نی شتێکی ڕوون و ئاشکرایشە ریوایـەتێك ئەو ناتەواویانەی هەبێت لەلای زاناو لێکۆڵینەرەوەکانی مێژوو هیچ نرخێکیان نی یە.

موعاویەیش زۆر دوورە لەئاواتانەیەکەوە بەتایبەی خواناسی و موسڵمانەتی ئـەو هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خـواﷺ ڕوون و ئاشـکرایە، لـەناو ئوممـەتی ئیـسلامیدا خاوەنی ژیانێکی پڕ سەروەری و، هەنـدێ لـە هـاوەڵان وەسـف و سـەنای چـاکەیان کردووەو و پیاو چاکانی تابعین پیایدا هـەڵیان داوە و شـایەتی زانـایی و ئاینـداری و داپەروەری و نەرم ونیانی و هەموو ڕەوشتە چاکەکانی تریان بۆ داوە.[١]

دەربارەی موعاویـەرضي الله عنه بـێ گومـان ئـەم شـتانە هـاتوون، دەی ئـیتر مەحاڵـە بـۆ کەسێك ئەمە ژیـان و سـیرەتی بێـت، کـە داوا لەخـەڵکی بکـات لەسر مینبـەرەکـەی پێغەمبەری خواو لەکاتی نوێژ هەینیشدا لەعنـە لـە علـی کـوڕی ئـەبو طالـب بکـات، هەرکەسێ شێوازی موعاویە بزانێت لەبەڕیوە بردنـی حـوکم و ئـەو ناوبانگـەی دەری کردبوو لەنەرم و نیانی و لێبوردەیی وساسیەتی جوانی لەگەڵ میللەتدا، بۆی ڕۆشـن دەبێتەوە کەچ درۆیەکی ئەوەندە گەورەیەماویەوش لەنـەرم نیایـدا، کـە بـە نموونـە هێنراوەتەوە.[٢]

دەربارەی ئەم درۆ گەورەیە بەدرێژی دواوم لەکتێبی (خەلیفی پێنجەم حەسـەنی کـوڕی علـی کـوڕی ابـی طالـب)داو باسـی ئـەو پەیوەندیـە جوانـەم کردوە لـەنێوان موعاویەو نەوەکانی عەلیدا بەتایبەت پاش ئەوەی بووە بە ئـەمیری بـاوەڕداران و چ ڕێز و خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی هەبوو لەنێوانیاندا.

هەر وەك لەو کاتەدا لەهـەموو سـەردەمەکانی دواتـر لـە کۆمـەڵگای - موسـڵمان - پابەنـد بـوون بەشـەریعەتی ئیـسلامەوە و سـوربوون لەسـەر جـێ بـەجێ کردنـی

١ - الانتصار للصحب والآل - رحيلى - لا ٣٦٧.

٢ - خامس الخلفاء الراشدين حسن بن على ابي طالب لا ٣٠٣.

ڕێنموونی یەکان، بۆیە زۆر دوورو مەحاڵە لەو بەرە ناوازەیە، کە جنێو و نەفرەت وە قسەی ناشیرین بەیەك بڵێن.

لەکاتێکدا، کە پێغەمبەری خوایش ﷺ، قەدەغەی کردوە لەسەر موسڵمانان قسەبە مردووی بێ باوەڕانیش بڵێن و عائشە.

دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: (( لاتسبوا الاموات، فانهم قد افضوا الی ما قدموا )).[1] واتە: قسەی ناشیرین بە مردووان مەڵێن، ئەوانە گەیشتنەئاکامی ئەو کردەوانەی لە دنیا کردبوویان، دەی دەبێت تاوانی ئەوکەسە چەند گەورە بێت، کە قسەی سوك بڵێ و نەفرەت لە دۆستانی خوا بکات!.

١ ـ البخاري ژ ٦٥١٦.

# بەشی چوارەم

## هەڵوێستی عمری کوڕی عبدالعزیز دەربارەی خەواریج ـ شیعە ـ قەدەریە ـ مورجیئە ـ جەهمیە

### یەکەم: خەواریج

ئەم تاقمە لەساڵی ٣٧ی کۆچیداو لەسەردەمی خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبو طالیب دا دەرکەوتن لە دوای جەنگی سەفین و قبوڵ کردنی تەحکیم لەلایەن علی یەوە رضي الله عنه ـ لەکتێبی ـ ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو طالیب دا بە درێژی لەسەریان ڕۆیشتووم، لێرەشدا بەکورتی لەسەر گرنگترین بیرو باوەڕ و بۆ چوونەکانیان دەدوێم:

١ـ بەکافر زانینی هەردوو خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ عثمان و علی! هەر دوو حەکەمەکەی موعاویە و علی، کە ناویان (ابو موسی الاشعری) (عمرو کوڕی عاص)!

٢ـ دەرچوون لەدژی ئەمیری ستەمکار دروستە.

٣ـ خاوەنی گوناهی گەورە کافر دەبێت و لە دۆزەخەدا دەمێنێتەوە بە هەمیشەیی.[١]

ئەم سێ بنەمایە ناوەکرۆکی بیرو باوەڕی خەواریجەکان بوو و لەوبارەیەوە هیچ ناکۆکی یەکان لەنێواندانی یە مەگەر لەشێوازی جێ بەجێ کردنیدا.[٢]

(ابو الحسن الاشعری) دەڵێت: هەموو خەواریج لەسەر ئەوەن، کە علی لە قبوڵ کردن تحکیم دا کافر بووە، بەڵام لەوەدا جیاوازیان هەیە، کە ئایا کافر بوونەکەی هاوبەش پەیدا کردنە بۆ خوا یان نا.

---

١ ـ وسطية اهل السنة بين الفرق ٢١٩.

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

هەموو لەسەر ئەوەن، کە هەموو گوناهێکی گەورە کافر بوونی لەدوایە جگە لە تاقێمێکان نەبێت بە ناوی (النجدات)و[1] جگە لەم تاقمە هەموویان پێیان وایە خاوەنی گوناهی گەورە بەهەمیشەیی لە ئاگردا دەمێننەوە.[2]

(المقدسی) دەڵێت: سەرچاوەی ئەو بۆچونەمان لەوەوە وەرگرتوە: کە علی کافر بووەو، لەعثمانی کوڕی عفان بەرین و،بەگوناە کردن خەڵکیکافردەکەن و ، دەرچون لەدژی پێشەوای ستەمکار بەڕەوادەزانن.[3]

خەواریجەکان تاوتاو بوون، تاوێك زۆر چالاکانە دژایەتی دەوڵەتی ئەمەویان دەکردو جابەجاریش کپ دەبونەوە، بەڵام زۆربەی کات دەوڵەت سەردەکەوت بەسەریاندا و هێزی وپێزی تێك دەشکاندن.

تائەوەبوو عمری کوڕی عبدالعزیز چووە سەر حوکم ودەستی کرد بە گفتوگۆی ئاشتیانەو لێکوڵینەوەی زانستیانە، جاربەجاریش لەکاتی پێویست دا هێزی دژیان بەکار دەهێنا.

عمر زۆر ڕقی بووەلە دەمەقاڵەی بێ ئەنجام و، بەجوانترین شێوە لەگەڵیان دانیشتنی دەکردو بەجوانترین شێوە دەمەقاڵەی لەگەڵ دەکردن، دەیووت: ئەوەی ئاینەکەی بەکار بهێنێت بۆ دژایەتی کردنی خەڵکانی تر ئەوە لەسەر شتێك دانامەزرێت.[2] وەجارێکی تردەیوت:لەدەمەقاڵەی بێت، چونکەنەقین دەکوژێنێتەوەو نەحیکمەت وکەڵکەکانیش دەردەخات[3] ودەڵێت((بەڕاستی سەرفرازەئەوکەسەی

١ ـ النجدات: دەستەی نەجدەی کوڕی عامری حەنەفی یە لەساڵی ٦٩ی کۆچیدا کوژرا.
٢ ـ المقالات (١/ ١٦٧، ١٦٨).
٣ ـ بدء التأريخ (٥/ ١٢٥).
٢ـ ابن ابي دنیاکتاب الصمت وآداب اللسان.
٣ـ سیر عمر لابن الجوزی لا ٢٩٣.
٤ـ هەمان سەرچاوە لا٢٩١.
٥ـ الاثارالواردةعن عمر ٢,٦٩٣.
٦ـ سیرة عمرابن عبدالحکم لا٧٥.

دووربێت لەدەمەقاڵەوتوڕەبوون وچاوچنۆكى[٤] عومەر .ڕ.بەرگرى دەكردلەدەمەقاڵى ووشك و بێ ئەنجام وهانى گوفتوگۆو وتووێژى دەدا بەجوانترین شێوە، لەمبارەیەوە عمر كۆمەڵێك وتەو هەڵوێستى بەناوبانگى هەیە لەگەڵ خەواریجەكاندا، وەمێزگردى لەگەڵداكردون وهەموو شوبهەو بەڵگەكانیانى هەڵوەشاندۆتەوە بەبەڵگەى ڕاست و دروست وهەقى بۆرۆشن كردونەتەوە .ئەوەش لەبەر شخۆشەویستى عمروشوێن پێهەڵگرتنى پێشینەچاكەكان(السلف السالح)ڕحمەتى خوایان لێ بێت...[٥]

## ١ـ هەڵوێستى عمر لەدەرچونى خەوارج.

لەهیشامى كورى یەحیا غەسانى یەوە ئەویش لەباوكیەوە دەگێڕێتەوە عمرى كوڕىى عبدالعزیزنامەى نوسى بۆ خەواریجەكان پێى ووتن:ئەگەر هەرهۆزێك ڕایان هاتە سەر ئەوەى بۆهەرشوێنێكى سەرئەم زەویە- ولاتى ئیسلامى - باربكەن خۆیان سەربەستن بەمەرجێ بۆخراپەكارى نەبێ دژى كاربەدەستان و بۆ ئازاردانى(ئەهل ذیمە)نەبێت لەدژى كەس دەرنەچوبێتن و، یان بۆجەردەییورىى و ڕێگرى لەوكاتەداخۆیان ئازادن، بەڵام ئەگەر مەبەستیان جەنگ بێت دى سوێند بەخوائەگەر شیرین ترین ڕۆڵەى خۆیشم لەموسوڵمانان هەڵگەڕێتەوە خوێنى دەڕێژم تەنهالەبەرخاترى خواورۆژى دوایش ئەوكارەدەكەم[٦] لەریوایەتێكى ترداهاتوە وتویتى پێیان:سوێند دەخۆم بەخوا ئەگەرئێوەڕۆڵەو جەرگى خۆیشم بونایە،ولەم نازو نیعمەتەى بۆمیللەت مان دەستەبەركردوە لەسەردەمى دەسەلاتى مندا، دەمدالەملتان وخوێنم دەڕژاندن لەپێناوى خواو پاداشتى ڕۆژى دوایى دا،پاشان ئەم ئایەتەى خوێندەوە ﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾القصص: ٨٣ ئەمەش ئامۆژگارى منە بۆئێوە ئەگەرپێتان خۆشەوەو ئەگەر ئەشتانەوێت ناپاكیم لەگەڵ بكەن ئەوە پێشتریش ناپاكى كراوە لەگەڵ ناصیحاندا، والسلام علیكم ورحمه الله وبركاتەلەمەى پێشەوە هەڵسوكەتى عمرمان بۆدەردەكوێت لەگەڵ خەواریجەكاندا لەگەڵ ئەوەشدا، كەخەلیفەى

موسوڵمانان بو بەڕاستی و ئەوانیش دژی ئەو دەرچوبون، کەچی هەردەستی لێ نەدەکردنەوە، بەڵکونامەی بۆدەناردن و ئاگاداری دەکردنەوە لەئاکامی دەرچون لەڕیزی مسوڵمانان، لە کاتێکدا خوای تەبارەك وەتەعالافەرمانیداوە هەمویەکبن جیانەبنەوە پێویسی کردوە، کەکەس لەکۆمەمەڵی مسولمان جیانەبنەوە ئەگەرلەسەر یەك ئەمیر پێك هاتن هەمویان لەسەریانە گوێڕایاڵی بن لەدژی نە وەستنەوە مەگەرکاتی فرمان بەگوناه بدات و کوفری ئاشکرای لێدەربکەوێ.[٢]

لەمەشداعومەرڕێڕەوی خەلیفەی چوارەم عەلی کوڕی ئەبوتالیبﷺ دەگرێتەبەر وەبەشێوەیەکی ئاشنایانەهەوڵی ئەدا بیانهێنێتەڕیزی موسولمانانەوە.[٣]

## ٢ـ گوفتوگۆومێزگردی لەگەڵ خەواریجەکاندا:

عومەری کوری عبدالعزیزرحمه‌الله نامەی دەناردبۆیان داوای دانیشتنی دەکرد لەگەڵیاندا،هەندێکیان ئامادەییان دەردەبڕی ابن عبدالحکم،دەڵێت عومەری نامەی ناردبۆخەواریجەکان ونوسی: لەعومەر ئەمیری باوەرداڕانەوە بۆئەم دەستەوتاقمە، پاشان، وەسیەتتان پێدەکەم لەخوابترسن، چونکەهەرکەسێك لەخوابترسێت خوادەروی لێدەکاتەوە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ڕۆزی دەدات،وەهەرکەسیش پشت بەخوا ببەستێت ئەواخوای بەسە خوایش کاری خۆی جێبەجێ دەکات وئەندازەی دیاری کراوی بۆهەموشتێك داناوە. پاشان: نامەی ئێوەم پێگەیشت، کەناردبوتان بۆیەحیای کوری یەحیا وسولەیمانی کوری داود، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰ إِلَى الْإِسْلَامِ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ الصف:٧ وەمن بانگ تان دەکەم بۆلای خواو ئاینەکەی وبەرپاکردنی نوێژو زەکات دان و فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە کردن ـ انشاء الله ـ ولاحول ولاقوه الابالله، بانگتان دەکەم بۆوازهێنان[١] لەوخوێن ڕشتنانەی کەپێشتر ڕووی

---

١ـ الاثارالواردة/٢/٦٩٥

٢ـ هەمان سەرچاوە ل٣.

داوه بەبێ بونی هێزێکی گەورە، ئەوەتان وەبیردەهێنمەوە، کە ئەگەر قورئان و فەرمودەمان بۆباس کردن بەشتی لاوەکی لێی لامەدەن لەکاتێکدائێمەئێوەی بۆبانگ دەکەین.

ئەمە ئامۆژگاری ئێمەیە بۆ ئێوەو ئەگەر لێمان وەربگرن ئەوە ئاواتی ئێمەیەو ئەگەر ڕەدیشی بکەنەوە ئەوە پێشتریشناپاکی لەگەڵ ئامۆژگاری کارانی کراوە، واش نابینم مافێکی خوا پێشێل کرابێت، بەندەی صالحی خوداش لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ﴾هود:٣.

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە: عمر رحمه الله نامەیەکی نوسی بۆ خەواریج، کاتێ خوێندیانەوە ووتیان: با دوو پیاو بنێرین قسەی لەگەڵدا بکەن، ئەگەر هات بەدەممانەوە ئەوەباشە، ئەگەر وایشی نەکرد خوایەك هەیە بۆی، پیاوێکیان نارد ناوی عاصم بوو لەگەڵ کەسێکی تردا لە (بنی یشکر)، کاتێ هاتنە لای عمر ووتیان: السلام علیکم، پاشان دانیشتن، عمر پێی ووتن: چی وای لێ کردوون لە دژمان دەرچن؟ بەچیمان ڕازی نین؟

عاصم ووتی: ئێمە لە هیچ شتێکی تۆ ناڕازی نین، تۆ چاکەکارو داد پەروەریت، بەڵام ئاگادارمان بکە لەم خەلافەتەت، ئایە بە ڕازامەندی و ڕاوێژی موسڵمانان وەرت گرتووە، یان بەزۆر خۆت سەپاندوە؟

عمریش ووتی: هەرگیز داوای ئەم کارەم نەکردوە، بەڵام ڕەدی ویستی کەسیشم نەداوەتەوە، پیاوێك ـ مەبەستی سولەیمان ـ ئەم کارەی بەمن سپارد، منیش هەرگیز نەبە ئاشکراو نەبەژێربەژێری داوام نەکردەوە، منیش بەو کارە هەستام کەسیش ناڕەزای دەرنەبڕی جگە لە ئێوە، ئێوەش ڕازی دەبن بە هەرکەسێك، کەداد پەروەر و بە ویژدان بێت لە نێوان میللەتدا، دەی من بەو کەسە سەیر بکەن، ئەگەر لە هەق لامدا بەگوێم مەکەن.

---

٣ـ الاثارالواردة /٢/٦٩٦ـ ٦٩٧.

ئەوانیش وتیان: یەك شتمان لەتۆدەوێت، ئەگەر بیکەیت ئەوە تۆ لەئێمەیت و ئێمەش لەتۆین، ئەگەر نەیکەیت لە ئێمە نیت و ئێمەش لە تۆ نین، عمر ووتی: چی یە ئەوە؟ ووتیان دەبینین پێچەوانەی خەلیفەکانی پێش خۆت دەکەیت لە بنەماڵەکەت و ڕێبازێکی ترت گرتۆتە بەر جیا لە ڕێگەی ئەوان و کارەکانت ناوناوە ناهەقی ـ مظالم ـ دەی ئەگەر وادەبینی تۆ لەسەر ڕاستی و هیدایەتی ئەوانیش لەسەر گومڕاین، دەی خۆتیان لێ بەری بکەو نەفرەتیان لێ بکە، ئائەم خاڵە ئێمەو تۆ پێکەوە کۆدەکاتەوە، یان جیامان دەکاتەوە.

عمریش لەوێدا دەستی کرد بە قسە کردن ووتی: من وا گومان دەبەم ئێوە لەبەر دەستکەوتی دنیایی دەرنەچوونە دەرەوە، بەڵام مەستان پاداشتی ڕۆژی دوای یە، بەڵام ڕێگەکەتان لێ تێك چووە، من هەندێ پرسیارتان لێ دەکەم دەی توخوا بڵێن: وایە ئەگەر دەیانزانن، ئەوانیش ووتیان: باشە وادەکەین، ووتی: ئەبو بەکرو عمر لە پێش ئێوە نەبوون، ئێوە خۆشتان ناوێن و شایەتی سەرفرازیان بۆ نادەن؟ وتیان: بەڵێ، ووتی: دەی ئایا دەزانن لە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ عەرەب پاشگەز بوونەوە، ئەبوبەکریش جەنگی لەگەڵدا کردن و خوێنی ڕشتن و کەس وکاری کردن بەکەنیزك و دەستیگرت بەسەرماڵ و سامانیاندا؟ ووتیان: بەڵێ وابوو.

ووتی: ئادەزانن کاتێ عمر بوو بە خەلیفە هەموو کەنیزکەکانی گێڕایەوە بۆ ناو هۆزەکانی خۆیان؟ ووتیان: بەڵێ وابوو، ووتی: دەی ئایە ئەبو بەکر خۆی لەعمر بێ بەری کرد؟ یان عمر لەئەبوبەکر خۆی بێ بەری کرد؟ ووتیان نەخێر ووتی: دەی ئایە ئێوەی لە هیچ کامیان خۆتان بەری دەکەن؟ ووتیان نەخێر، عمر ووتی: دەی پێم بڵێن: ئایا دەستەی نەهرەوان کە پێشینەی ئێوە بوون و ئێوە بەڕاست بەسەر فرازیان دەزانن؟ ووتیان: بێ گومان بەڵێ، ووتی: ئەی ئەزانن ئەهلی کوفە،کەچوون بۆیان دەستیان لێ نەپاراستن و خوێنیان نەڕشتن و سامانەکانیان نەگرتن؟ ووتیان: بەڵێ، ووتی: ئەی ئەزانن کە بەسریی یەکان بە سەرۆکایەتی عبداللّەی کوڕی واهب الراسبی[1] دەرچوون بۆلایان و دەگیشتن بەخەڵکی دەیانکوشتن و عبداللّەی کوڕی

---

١ ـ الأثار الواردة٢/ ٢٠٣.

خباب[١] هاوەڵی پێغەمبەری خوا و کەنیزکەکایان نەکوشت، پاشان نەیاندا بەسەر هۆزی (بنو قطیعة)دا و ژن و پیاویان نەکوشتن و منداڵەکانیشیان لە مەنجەڵدا نەکوڵاندن؟ ووتیان بەڵێ وابوو.

ووتی: دەی ئایا خەڵکی کوفە خۆیان بێ بەری کرد لە خەڵکی بەسرە یان بە پێچەوانە؟ ووتیان نەخێر، ووتی: ئەی ئێوە خۆتان لە هیچ لایان بێ بەری دەکەن؟ ووتیان نەخێر.

عمر پێ ی ووتن: پێم بڵێن: ئایا ئاین یەکە، یان دوو؟ ووتیان: یەکە، ووتی: دەی ئایا شتێکی بەئێوە دەکرێت، بەڵام بەمن ناکرێت؟ ووتیان نەخێر، ووتی: دەی چۆن وئێوە ئەبوبەکر وعمرتان بەدڵە و ئەدوانەش یەکتریان بەدڵ بووە، کەچی شێوازی ژینیشیان جیاواز بوو؟! کەچی بنەماڵەکەمم پێ قبوڵ نەبێت ونەفرەتیان لێ بکەم؟!

دەی ئایە، ئەگەر نەفرەت کردن لە گوناهبار فەرزبوایە دەبوایە هەربکرایە، دەی باسی خۆتم بۆ بکە کەی پێت ووتراوە: لەعنەت بکەیت لە فیرعەون و هامان؟ ئەویش ووتی: بیرم نایەت هەرگیز لە عنەتم لێ کردبن.

عمریش ووتی: بێ قەزابیت! ئایە تۆ لە عنەت لە فیرعەون ناکەیت، بەڵام دەتەوێت من لەعنەت لە بنەماڵەکەم بکەم خۆم بێ بەری بکەم لێیان؟.

بێ قەزابن! ئێوە تێ نەگەیشتوون، مەبەستێکتان هەیە، بەڵام نەتان پێکاوە، ئێوە شتێك لە خەڵك قبوڵ ناکەن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێ ی قبوڵ کردبون، ئەوەی لە ئەو دەرسا لە ئێوە ئەمینە، ئەوەی لەئێوە ئەمینە، لەو دەترسا.

کابرا ووتی: ئێمە کەی وابووین! ووتی: بەڵێ وابوون و ئێنندای پێدا دەنێن.

ئەی ئایا نازانن، کە پێغەمبەری خوا هات ﷺ بۆ ناو مرۆڤایەتی، خەڵکی هەبوو بتیان دەپەرست، بانگی کردن بۆ ووشەی (لاإله إلا الله ومحمد رسول الله) هەرکەسێ ئەو شایەتی یەی بدایە، خوێن و سامانی پارێزراو دەبوو، بێ خەم بوو، دەی

---

١ ــ الأثار الواردة٢/ ٢٠٣.

پێغەمبەرﷺسەرمەشق نی یە بۆ موسڵمانان و هەرکەسیش ئـەوەی قبـوڵ نەکردایـە جیهادی نەدەکرد؟ ووتیان: بـەڵێ، عمـر ووتـی: دەی ئایـە ئێـوە ئـەمڕۆ خۆتـان بـێ بەری ناکەن لەو کەسانەی وازیان لە بت پەرستی هێناوە، شـایەتو مانیـان هێنـاوەو نەفرەتی لێ دەکەن ودەیکوژن و خـوێنی حـەڵاڵ دەکـەن؟ بـەڵام گـەلانی تـری وەك جولەکەو گاور ئەمین و بێ ترس دەکەن و خوێنیان حەڕام دەکەن؟

عاصـم الحبـشی ووتـی: هـیچ بەڵگەیـەك وهـیچ گفتوگۆیـەکم نـەیوە لەمـەی تـۆ ڕۆشنترو ڕاستر بێت، ئەوامن شایەتی دەدەم تـۆ لەسـەر حـەقیت مـن بـێ بـەریم لـە هەرکەسێك سەرپێچت بکات.

پاشان بە هاوڕێکەی تری ووت: ئەی تۆ چی دەڵێیت؟ ووتی: لەم قسەو بەڵگانەی تۆ جوانتر شك نابەم هەبێت، بەڵام پێم خۆش نی یە بڕیارێك بدەم بەبێ موسڵمانانی برادەرم، لەوانەیە بەڵگەیەکیان پێ بێـت کـەمن نـایزانم، پاشـان عمـر فـەرمانی کـرد هەموو موچـەکانی عاصـم الحبـشی، یـان گەڕانـدەوە بـۆی و پێیـان داو لـەلای عمـر مایەوە تالەدوای(١٥) ڕۆژ گیانی سپارد، بەڵام هاوڕێکـەی تـری، کـە (شـەیبانی)بـوو خۆی گەیاندەوە خەواریجەکانی هاوڕێ ی و لەگەڵ ئەواندا پاشترکوژرا.[١]

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هـاتووە دووکـەس لـە خەواریجـەکان هـاتن بـۆلای عمـری کوڕی عبدالعزیز ووتیان: السلام علیك یا إنسان، عمریش ووتی: وعلیکمـا السلام یـا إنسانان، ووتیان: گوێڕایەڵی خـوا لـەپێش گوێڕایـەڵی تۆوەیـە؟ عمـر ووتـی: ئـەوەی ئەوە نەزانێت گومڕایە، ووتیان نابێت پـارە لـەناو دەوڵەمەنـدەکان دا کـۆ ببێتـەوە، کۆبکەیەتەوە، ووتی: ئەوەم نەهێشتووە، ووتیان: دەبێت ماڵ و سامانی خوابـدرێت بەوەکەسـانەی پێیـان دەشـێت، ووتـی: خـوای گـەورە لـە قورئانـدا جـوان ڕونـی کردۆتەوە دەدرێت بەکێ، ووتیان: نوێژەکان لـەوختی خـۆی بکرێـت، ووتـی: هـەقی خۆیەتی، ووتیان: دەبێت ڕێزەکانی نوێژی جەماعەت ڕێك و پێك بێت، ووتـی: ئـەوە تەواو کـاری سـونەتە، ووتیـان ئێمـە نێـرراوین بـۆلای تـۆ، ووتـی چیـان پـێ ووتـون

١ ـ أنساب الأشراف ٨/ ٢١١ـ ٢١٥، الأثارالواردة ٢/ ٧٠٤.

بيگەیەنن ومەترسن، ووتيان حەقى خەڵكى بدە، ووتى: خواى گەورە پێشى ئێوە ئەوفەرمانەى كردووە، ووتيان: تەنها خوا حوكمى خەڵكى دەكات، ووتى: قسەيەكى ڕاستە، ئەگەر مەبەستێكى خراپى لەپشتەوە نەبێت، ووتيان: دەست پاكەكان بۆ خەم بكە، ووتى ئەوانە پشتى منن، ووتيان: ئاگات لە ناپاكى بێت، ووتى: دز ترسێنراوە، وتيان ئەى ئارەق و گۆشتى بەراز؟ ووتى شايانى ئەهلى كوفرە، ووتيان: هەركەسێ هاتە ناو ئيسلام دڵنيا دەكرێت، ووتى: ئەگەر ئيسلام نەبوايە ئەمين و دڵنيا نەدەبووين، ووتيان: ئەوانەى پێغەمبەرى خوا پەيمانى لەگەڵدا بەستوون؟ ووتى: لەسەر ئەو پەيمانەن، ووتيان: شتێ مەدە بەسەرياندا توانايان نەبێت، ووتى: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ البقرة:٢٨٦، ووتيان خوامان بخەوە بير، ووتى: ﴿وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ﴾ البقرة: ٢٨١، ووتيان: دەى بەولاخى (بيت المال) بمان نێرەوە، ووتى: ئەمە ماڵى خوايەو حەزناكەم بۆ ئێوە بێت، ووتيان: دەى پارەى مەسروفمان پێ نى يە! دەى ئێوە ڕێبوارن(إبن السبيل)ن و لەسەرمانە مەسروفتان بكێشين.[1]

أرطاةى كورِى منذر دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە (أبو عون)م بيست دەيوت: كۆمەڵێ لە (حەروری)يەكان هاتن بۆلاى عمرى كورِى عبدالعزيزو لە مەسەلەيكدا گفتوگۆيان دەكرد، هەندێ لەو كەسانەى لاى بوون، پێيان ووت: كەمێ بيانترسێنە و دەسەڵاتى خۆتيان پيشان بدە، بەڵام عمرى كورِى عبدالعزيز گوێى پێ نەدان و بەردەوام بە نەرم نيانى قسەى بۆ دەكردن تارێكەوتن لەگەڵيدا بەجۆرى خۆراك و جل و بەرگيان بۆ مسۆگەر بكات بە درێژايى فەرمان ڕەوايەكەى، بەو شێوەيە لاى هەستان، كاتێ دەرچوون لە لاى عمر داى بە ئەژنۆى ئەوكەسەدا، كە پێشنيارەكەى كردبوو پێ ى ووت: ئەى فلانە كەس، ئەگەر دەكرا هاورێكەت بەداو دەرمان چاسەربكەيت مەگوێزە بۆ داغ كردن.[2]

---

١ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز لا ١٤٧.

٢ـ سيرة عمر إبن الجوزى.

لەڕیوایەتێکیشدا هاتووە، کە کاتێ شەوزەب کەناوی تەواوی (بسطام) بوو لە هۆزی(بنی یشکر) بە خۆی و(٨٠٠) چەکدارەوە لە دژی والی عیراق عبدالحمیدی کوڕی عبدالرحمن دەرچوونە دەرەوە، عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نارد بۆ عبدالحمیدو پێ ی ووت: مەیان ئالّسیکێنە تا خوێن دەڕژێنن، یان فەسادو گەندەڵی لە ناو زەویدا بلاّودەکەنەوە، ئەگەر وایان کرد توشی ئەو شتە یەکلایی بکەرەوە، پیاوێکی زیرەك و لێهاتوو لەگەڵ کۆمەڵێ سەربازدا بنێرە بۆ ناویان و چیم پێ وتوویت تۆش ئەوەی پێ بلێ.

عبدالحمیدیش، محمدی کوڕی عبداللە (البجلی) ناردە ناویان بە دوو هەزار چەکداری شاری کوفە و عمر چی پێ ووتبو پێ ووتن، عمریش نامەی نارد بۆ شەو زەب و پرسیاری لێ کرد لە هۆی دەرچونەکەی و داوای گەڕانەوەی لێ کرد، نامەی پێ گەیشت.

محمدی کوڕی جریر هەستاو چووە ناویان و تورەی دەکردن و بەرەو جەنگ دەیجولاّندن، عمریش نامەیەکەی بۆ نووسیبوو تیادا پێ ی ووتبوو: بیستومە لەبەر خواو پێغەمبەرەکەی لە دژی والی دەرچویت، تۆ لەکارەتدا لەمن زیاتر نیت، وەرە با پێکەوە گفتوگۆو مێزگرد بکەین، ئەگەر ئێمە لەسەر حەق بووین ئەوە تۆش وەك ئەو خەڵکە بگەڕێرەوە، ئەگەر هەقیش لەلای تۆبوو لەمەسەلەکەت دەکۆڵینەوە، بەلاّم بەستام نەجولاّ و هەر ئەوەندە بوو نامەیەکی بۆ عمر نووسی ووتی: بەڕاستی بەویژدانەوە قسەت کردو ئەوامنیش دوو پیاوی لای خۆم دەنێرم بۆلات بۆ گفتوگۆو وتووێژ.

ئەبو عوبیەدە دەڵێت: ئەو دوو پیاوەی شەوزەب ناردی بۆلای عمر، یەکەمیان: مەخدوج بوو لەبنی شیبان، دووەمیان: لە (بنی یشکر) بوو، دەڵێن: ئەم دوانەی لەگەڵ کۆمەڵێك دا ناردی بۆ لای و هاتن بۆلای عمر، بە عمریان ووت: باسی (یەزید)مان بۆ بکە! بۆچی ڕازی بویت بیتە خەلیفەی دوای تۆ؟ ووتی: کەسی تر دایناوە بە خەلیفەی دوای من، وتیان: ئەگەر تۆ ئەمانەتی یەکێکت لە لابێت،

پاشان تۆش داته دەستی کەسێکی تر، کە ئەمین نەبێت، ئایە ئەوە ئەمانە پارێزی یە، یان نا؟[١]

هەندێ ڕیوایەت ـ بەگریمان ـ دەڵێن: (بنی مروان) دوای ئەوەی زانیان ماڵ و سامان و زەوی و زارەکانی لێ سەندنەوە، لەوەش ترسان، کە ـ یەزید ـ لابەرێت و بەوەش خەلافەتیشیان لە دەست بسەنێت بۆیە ژەهریان بۆ کردە ناو خواردنەوەو شەهیدیان برد، هەر لەو ڕۆژەدا، کە وەلامی ئەو وەفدە بداتەوە گیانی لەدەست دا.[٢]

لەم ڕوداوانەی پێشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە عمری کوڕی عبدالعزیز ڕێڕەوێکی ڕاست و دروستی وای لەگەڵدا گرتنەبەر، کە هەمان ڕیگابوو، کە ئەمیری باوەڕداران علی کوڕی ئەبوو طالیب و عباس رضي الله عنهما گرتیانە بەر، وایش دیارە عمر زۆر مەبەستی بوو بیانگێڕێتەوە ناو کۆمەڵی موسڵمانان و بەو هۆیەشەوەبوو، کە دەیویست هەموو بیانوەکیان ببڕێت و بەڵگەکانیان پوچەڵ بکاتەوە لە مەسەلە ڕاست ودروست و هەقەکاندا،[٣] بەلام ئەوەبوو، ووتی: لێم گەڕێن با لەسەرخۆ بیر لەداواکاریەکەتان بکەوە، بەلام ئەبوو پێش ئەوەی وەلامیان بداتەوە گیانی سپارد.

بەلام کاتێ خەواریجەکانی عێراق ویستیان هێزبەکاربهێنن دژی سوپای والی و تونیان سوپای نیزامی عبدالحمید بشکێنن، عمریش سوپایەکی گەورەی لە شامەوە بەسەرکردایەتی مسلمەی کوڕی عبدالملك خستە ڕێ و نامەی نووسی بۆعبدالحمید و پێ ی ووت: پێم گەیوە، کە سوپاکەت ـ سوپا خراپەکەت ـ چی بەسەر هاتووە و من مسلمە ناردوەو وازی لێ بهێنە خۆی چی دەکات با بیکات.

مسلمە بە سوپا کەیەوە ڕۆیشت بۆ ئەو جێگایەی سوپای خەواریجەکانی تێدا بوو، جەنگ دەستی پێ کرد لە نێوان هەردوو لادا، لە ئاکامدا سوپایی ئەمیری باوەڕداران بە سەرۆکایەتی(مسلمە) سەرکەوت بەسەر خەواریجەکاندا.[٤]

---

١ـ تأريخ الطبري ٧/٤٦٠.

٢ـ هەمان سەر چاوەو لاپەڕە، وملامح الإنقلاب الإسلامي لا٩٧.

٣ـ الآثار الواردة٢/ ٧١.

٤ـ الطبقات (٥/ ٢٥٨).

ناچار بوونی عمر بۆ بەکار هێنانی هێز دژی خەواریجەکان وای لێ نەکرد، کە بەردەوام شێوازی توندوتیژو زبربەکار بهێنێ لەگەڵ هەموو یەکێك لەخەواریجەکان و هەرکامیان ئامادەی گفتوگۆی ئاشتیانە بوایە دەستی بۆ درێژ دەکرد لە پێناو پاراستنی خوێنی موسڵمانان دا.[١]

### ٣ــ هۆکارەکانی هەڵگیرسانی جەنگ دژی خەواریجەکان:

عمری کوڕی عبدالعزیز لەبەر ئەوە نا، کەڕایان لە گەڵدا جیاواز بوو، یان نەیاریان دەکرد و قسەیان پێ دەگوت، جەنگی دژیان ڕاگەیاند، بەڵکو هەر خۆی دەگرت، تا بەڵکو بێنەوە بە خۆیاندا و بێنەوە سەر ڕیگایی ڕاست، بەڵام پاش ئەوەی کارەکەیان گەیاندە قۆناغێکی ترسناك، کە خواردنی ماڵ و سامانیخەڵکی و توقاندنی ڕێبواران و خوێن ڕشتن، ئەوجا فەرمانی دەرکرد بەجەنگ دژیان.[٢]

### ٤ــ گەراندنەوەی شت و مەکەکانیان:

عمری کوڕیعبدالعزیزرَحِمَهُ اللهُ ژن و کچی خەواریجەکانی نەکردە کەنیزەك و ماڵ و سامانیشی حەڵاڵ نەکردن، بەڵکو فەرمانی دا هەموو شتەکانیان بۆ بگێرنەوە، نامەی نارد بۆ کاربەدەستەکەی دەربارەی خەواریج و وتی: ئەگەر خوای گەورە سەری خستی بەسەریاندا و شکاندنت هەرچی ماڵ و سامانێکیان هەیەو گرتووتە پێیان بدەرەوە.[٣] ئەمەش ڕای ئەمیری ئیمانداران علی کوڕی ئەبو طالیبرَضِيَ اللهُ عَنْهُ بوو.

### ٥ــ بەند کردنی دیلەکانیان تا دەگەڕێتەوە:

کاتێ عمررَحِمَهُ اللهُ جەنگی لە دژیان ڕاگەیاندو چی کوژرا کوژراو ئەوانی تریان بەدیل گیران و فەرمانی دەرکرد، کە لە زیندانەدا بیان هێڵنەوە تا ئەو کاتەی، کە

---

١ ــ ملامح الإنقلاب الإسلامی لا ٩٤.
٢ــ فقه عمر عبدالعزیز(٢/٤٦٩)
٣ــ هەمان سەرچاوە.

دەگەڕێنەوە سەر ڕێگای موسڵمانان و واز لەو بۆچوونە گومڕایەیان دەهێنن.[١]

تا ئەوکاتەی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله گیانی سپارد کۆمەڵێکیان لە زیندا مابوونەوە، ئەمەش بەرنامەی کاری عمر بوو لە دژی نەیارەکانی خەلافەت، کە خەواریجەکان بوون.

## دووەم: شیعەکان

شیعەبەهەموو کەسێك دەڵێن، کە وابزانێت علی کوڕی ئەبو طالیب رضي الله عنه لە هەرسێ جێنشینەکەی پێش خۆی باشترە، ئەو شایانتربووە لەوان بە جێنشینی.[٢]

لە کتێبی ــ علی کوڕی ئەبو طالیب دا رضي الله عنه بە درێژی لەسەر شیعەو بۆ چوونەکانیان دووامم ـ شیعەش چەند دەستەو تاقمێکن و هەموویان یەك نین، بەڵام ترسناك ترسناك تریان ڕۆچووەکانن(الغلاة) کەئەمانە لە ئیسلام دەرچوون، بەڵام لەوان خوارتر کۆمەڵانێکی ترن وەك ـ کیسانیە، الإمامیةو هتد...

عمری کوڕی عبدالعزیز سەبارەت بە شیعە ڕۆچوەکان ووتەی زۆری هەیە لەوانە:(من چاکیو خراپی ئەوکانی هاشم لەخۆشەویسنتی(کوثەیر)[٣]دانابێنمەوە، هەرکەسێك خۆشی بوێت ئەوەخراپە وهەرکەسێکیش ڕقی لێی بێت ئەوەچاکە، چونکەئەو پیاوە–خەشەبی–یەك بوو باوەڕی بەگەڕانەوەی علی هەبوو بۆ ژیان.[٤]

جارێکیان نامەیەکی پێدەگات لە کاربەدەستەکەیەوە لەشاری کوفەوەو گلەیی ئەوەدەکات، کە ئەو شارە گوێرایەڵی ناکەن بەباشی، عمریش رضي الله عنه لە وڵامدا ووتی: داوای گوێ ڕایەڵی چی دەکەیت لە کەسانێك کەپشتیان لە علی رضي الله عنه هەڵکرد، کە پێشەوایەکی نموویەی بووە[٥]

---

١ـ فقه عمر (٢/ ٤٧٣).

٢ـ مقالات الإسلامیین لا ٦٥.

٣ـ تأریخ الإسلام لة الأثارالواردة لا(٢/٧٢٨) وەگیراوە.

٤ـ هەمان سەرچاوە.

٥ـ تأریخ دمشق لة الأثارالواردة لا(٢/٧٢٩) وەگیراوە.

لە ئیسحاقی کوڕی (طلحة)ی کوڕی (أشعث)وە دەگێڕنەوەو دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز ناردمی بۆ عێراق و پێ ی ووتم: قورئانیان بۆ بخوێنەرەوە، بەڵام ئەوان بۆت نەخوێننەوە، فەرموودەیان بۆ باس بکە، بەڵام ئەوان بۆت باس نەکەن، زانیاریان فێربکە، بەڵام ئەوان زانیاریت فێرنەکەن.

### بەناوبانگترین ڕاوبۆچوونەکانیان:

١ـ دەڵێن: علی‌ﷺ پێویستە بکرێتە ئیمامی هەموان و لەهاوەڵان بەرێزتر سەیر بکرێت، گوایە پێغەمبەری خواﷺ بەدەقی فەرموودە ئەوەی چەسپاندوە!.

٢ـ دەڵێن: پێغەمبەران و پێشەواکان بێ گوناهن و لە گوناهی بچوك و گەورە پارێزراون!.

٣ـ دەڵێن (الولاء)و( والبراء) واتە: دۆستایەتی کردنی علی‌ﷺ و خۆبەری کردن لەهەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەتایبەتی سێ جێنشینە ڕاشیدەکان ﷺ!.

## سێ یەم: قەدەریەکان

### ١ـ پێناسەی قەدەری یە:

أـ بەمانا تایبەتیەکەی: ئەو کەسانەن، کە دەڵێن: قەدەر نی یە، واتە: ئەوە بەدرۆدەخەنەوە، کە گوایە خوا هەموو شتێکی لەسەر خەڵکی داناوە، پێشتر هەموو کردەوە گوفتارێکی دیاری کروە، دەڵێن: (لاقدر من الله) واتە: لە خواوە کردەوەو گوفتارەکان دیاری نەکراون و هەمووکارەکان سەرتان پێشتر دانەڕێژراون و، لەمەولا بە درێژی لەسەریان دەدوێین.

ب ـ مانا گشتی یەکەی (قەدەریەکان): ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە دەربارەی علیمی خواو نوسینی شتەکان و یست و تەقدیرو دانان و دروست کردن دەدوێن، ئەمەش پێچەوانەی هەموو دەقەکانی قورئان و سوننەیە دژی بۆچونی سەلەفی سالحە.[1]

---

١ـ القدرية والمرجئة لا١٩٧.

## ٢ــ سەرتایی وتەی (القدر) لە ئیسلامدا:

پێغەمبەری خوا زۆری پێ ناخۆش بووە، موسڵمانان دەم بکوتن بۆ (قەدەر)و بەبێ زانیاری تەواو لەو بارەیەوە، جابری کوڕی سمرةﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ثلاثة أخاف من أمتي: الإستسقاء بالأندا، و حيف السلطان، وتكذيب القدر))[١] واتە: لە سێ شت ئەترسم لە ئومەتەکەم، داوای باران کردن جگە لەخوا، ستەمکاری دەستە دەسەڵاتدار، بەدرۆ خستنەوەی قەدەر.

پێغەمبەری خواﷺ ئومەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لەوەی دەمەقاڵە و گفتوگۆ لە ئاینەکەیاندا بکەن، چونکە زانستی مرۆڤ سنورداره و ئامانجی هەموو قوڵ بوونەوەیەك لە دەقەکاندا سەردەکێشێت بۆ سەر گەردانی و گومڕایی.

ئەحمەد ریوایەتی کردوە لە مەسنەدا(٢/ ١٧٨) لە عەمری کوڕی شوعەیبەوەو ئەویش لە باوکی یەوەو ئەویش لە باوایەوە دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ هاتە ناو خەڵکەوەو ئەوانیش باسی (قەدەر)یان دەکرد، دەڵێ: چاوەکانی سور هەڵگەڕان وەك ئەوەی هەناری تێ تەقیبێت لە توڕەیداو فەرمووی: ((مالكم تضربون كتاب الله بعضه ببعض! ؟ بهذا هلك من كان قبلكم)) واتە ئەوە چیتانە پەرتوکەکەی خوا هەندێکی دەکێشن بە هەندێکی تردا! ؟ ئا بەم کارەی ئێوە گەلانی پێش ئێوەش لەناوچون.

تا ساڵی (٤٠)ی کۆچی تەنها دوو تاقم هەبوون لە وڵاتی ئیسلامدا یەکەم خەواریجەکان، دووەم شیعەکان، تائەوەبوو لە ساڵی (٦٢)ی کۆچیدا (معبد الجهمي) سەرەتای ئەم ئاگرەی هەڵگیرساند، پاش ئەو تەشەنەی کرد وەك (إبن تيمية) دەڵێت: (بيدعة) لە سەرەتاوە بستێکەو پاشان زۆر دەبێتە باڵێك باشتر دەبێتە میلێك و پاشتریش فەرسەخێك.[٢]

لە پاش ئەویش (غيلان)ی دیمەشقی لە ساڵی١٥٠ی کۆچی پەیدابوو بووە هەڵگری ئەم بیرۆکە گومڕای یەی، کە بە کورتی یەکەی هەموو ئەو کەسانە

---

١ــ مسند أحمد(٥/٩٠) وصححه الألباني في سلسة ألأحاديث الصحيحة ژ ١١٢٧.
٢ــ الفتاوى (٨/ ٤٢٥).

دەگرێتەوە، كە ئەوە ڕەد دەكەنەوە، كە پێش ڕوودانی كردەوە خوای پەروەردگار بزانێت ـــ پەنا بەخوا ـــ هەموو كردەوەیەكی بەندەكان تازەیەو خوا زانیاری پێشتری پێ نی یە، لە تابلۆی پارێزراودا ـ لوح المحفوظ ـــ نەینوسیوە، كەواتە لای ئەو تاقمە كردەوكان سەربەخۆن.

ئەم ووتەیە ڕۆچوونە لە مەسەلەی قەدەردا، بە جۆرێ، كە سیفەتی زانیاری و نوسین و دانانی كردەوەكان لە پەروەردگار دەكەنەوە.

٣ـ سەركردەكانی ئەم بۆ چونە ترسناكە لە پاش (معبد الجهمی) كە ئیمام ئەوزاعی دەربارەی دەڵێت: كابرایەك لە عێراق ناوی(یونس) بووەو، گاور بوو، موسڵمان بوو، پاشان گاوربۆتەوەو(معبد) لەوەوە ئەم بۆچونەی وەرگرتوە.

لەپاش ئەویش (غیلان الدمشقی) لە ساڵی ١٥٠ی كۆچیدا كوژرا، ئەم پیاوە ترسناك تر بوو لە (معبد)، چونكە هەندێ سیفاتی تریشی لە خوا دەكردەوە ـ پەنا بەخوا ـ وەك: (الإستواء) پاش ئەویش(جعدی كوڕی درهەم) لە ساڵی ١٢٤كۆچیدا دەركەوت پاش ئەویش (جهم كوڕی صفوان) لە ساڵی ١٢٨ی ك.

## هەڵوێستی عمری عمری كوڕی عبدالعزیز دەربارەی ( غیلان الدمشقی ):

عەمری كوڕی موجاهیر دەڵێت: عمری كوڕی عبدالعزیزرحمه الله هەواڵی بیست، كە غیلانی دیمەشقی دەربارەی قەدەر دەم دەكوتێت، ناردمی بەدوایدا وكاتێ غیلان هات، چەند ڕۆژێك نەیهێشت بێتە ژوورەوە بۆ لای، پاشان ڕێگەی داو هاتە ژوورەو عمری پێ ی ووت: غیلان ئەمە چیە لێت دەگێڕێنەوە؟ غیلان بێ دەنگ بوو، عەمری كوڕی موهاجیر دەڵێت: ئاماژەم بۆ كرد، كە قسە بكات، ئەویش ووتی: بەڵێ: ئەی ئەمیری موسڵمانان خوای ـ عزوجل ـ دەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ (الإنسان ١ـ ٣)

عمریش پێ ی ووت: دەی ئایەتی كۆتایش بخوێنە، غیلان خوێندی ﴿وَمَا تَشَاءُونَ

إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴾ (الإنسان ٣٠ـ ٣١)

عمر ووتی: ئەی غیلان ئێستا چی دەڵێیت؟ ووتی: من تا ئێستا کوێر بووم تۆ چاوت کردمەوە، تا ئێستا کەڕ بووم و تۆ گوێت بۆ گەڕاندمەوە، گومڕابووم و تۆ ڕێنموێیت کردمەوە.[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز غیلانی دیمەشقی بانگ کرد و پێ ی ووت: بیستومە ئەی غەیلان دەربارەی قەدەر قسە دەکەیت، غیلانیش ووتی: درۆم بە دەمەوە دەکەن ئەی ئەمیری باوەڕداران.

عمریش پێ ی ووت: ئەی غیلان ئادەی سەرتایی سورەتی: یاسینیم بۆ بخوێنە، ئەویش ووتی: ﴿يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ (يس ١ـ١٠)

لەوێدا غیلان ووتی: ئەمیری باوەڕداران وەڵاهی ئەڵێ ی یەکەم جارە ئەو ئایەتە دەبینم، تۆ دەکەم بەشایەت ئەی ئەمیری باوەڕداران، کە ئەوا تەوبەم کرد لەو شتانەی کردوومن، عمریش ووتی: خوایە ئەگەر ڕاستە تۆش ڕوەستاوی بکە، ئەگەر درۆش دەکات بیکەیت بە پەند بۆ باوەڕداران.[2]

عمر لە وتارەکانیدا ڕوونی کردەوە، کە هەرکاتێ بەندەیەك تاوانێکی کرد لەسەریەتی تەوبەو پەشیمانی دەربڕێت و داوای لێخۆش بوون بکات لە خوا،

---

١ـ الأثار الواردة (٢/٧٥٠)

٢ـ الإبانة(٢/٢٣٥)

قەدەری خوای پێ تاوانبار نەکات، نەڵێت: دەی من گوناهم چیە، کە لەسەرم نوسراوەو دەبێت بیکەم وئیتر با ویست و قەدەرو بڕیاری خوایش بێت، چونکە هیچ شتێك روونادات بەویست و ئارەزو و زانیاری ئەو نەبێت.[١]

هەروەك ڕەدی قەدەریەکانیشی لەوەدا داوەتەوە، کە دەڵێن: بەندە ویست و ئارەزوی تایبەتی هەیە، بەڵام لە دوای ویست ئارەزوی خواوە دێت.[٢]

## ٣ـ جیاوازی نێوان ووشەی (قەزا)و (قەدەر) چی یە؟

قەزاو قەدەر دووشتی پێکەوەنوساون و بێ یەکتری نایان کرێت، چونکە یەکەمیان وەك بناغە وایە بۆ دیوار، کە قەزایەو دووەمیان بە مانایی دیوارە بۆ بناغە، هەرکەسێ بیەوێت لە یەکتر جیایان بکاتەوە وەك ئەوە وایە کەسێ بڵێ: بناغە لە دیوارەکە جیا دەکەمەوە، هەمووی دەڕوخێت.

دەڵێن: (قەزا) واتە: زانیاری پێشتر لەسەر ئەو کارە لە ئەزەلدا، قەدەریش واتە: جێ بەجێ کردنی خەڵکی بۆ ئەو کارو گوفتارانەی لە (قەزا)ی خوا بڕیاری لە سەر دراوە.[٣]

(إبن حجر) دەڵێت: قەزا واتە: حوکمە گشتی یە ئەزەلی یەکان، قەدەریش وردەکاریەکانی و حوکمی گشتی و ئەزلی یەیە.[٤]

## ٤ـ ڕازی بوون بەقەزاو قەدەر:

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه‌الله دەڵێت: (ما أصبح اليوم في الأمور هوى إلا في واقع قضاء الله فيها)[٥] واتە: ئەمڕۆ هەموو ئارەزووەکانم لە جێ بەجێ کردنی کارەکانمدا هاتۆتە سەر بڕیارو قەزایخوا تیایاندا، هەموو جارێ ئەم نزایەی دەکرد: ((اللهم

---

١ـ الأثار الواردة (٢/٧٦٩ـ ٧٧٠)

٢ـ النهاية إبن الأثير(٤/٧٨).

٣ـ الأثار الواردة(١/٤٩٤).

٤ـ فتح الباري (١١/ ٤٨٦).

٥ـ الطبقات(٥/ ٢٧٢).

رضینی بقضائك، وبارك لي فی قدرك، حتی لا أحب تعجیل ما أخرت وتأخیر ماعجلت)) واتە: ئەی خوای ڕازیم بکە بە بڕیارەکانت ، پیرۆزی، کە لێم قەدەرەکانت، تاوام دێت چیت لێ دواخستووم حەزنەکەم پێشی بخەیت و چیت پێشخستووە حەزنەکەم داوی بخەیت.

عمر دەڵێت: ئەوندەم ئەم دوعایەم دوبارە کردۆتەوە وام لێهاتووە هەموو ئارەزوەیەکم لەگەڵ قەزاوقەدەری خودا گرێ داوە[1]

کاتێ عبدالملك کوڕی ئەسپاردەی خاك کرد ووتی: ڕازین بە قەدەری خواو ملکەچی فەرمانی ئەوین و سوپاس بۆ خوای هەموو جیهانیان.

کاتێ سەرە خۆشیان لێ دەکرد دەیووت: (أنا أعوذ بالله أن یکون لی محبة فی شیء من الأمور تخالف محبة الله؛ فإن ذلك لا یصلح لی بلا ئه عندی إحسانه إلیّ)[2] واتە: من پەنا دەگرم بە خوا لەوەی شتێکم خۆش بوێت پێچەوانەی خۆشەویستی خوا بێت، چونکە ئەمە نەگونجاوە لەگەڵ چاکەکانی ئەو لە گەڵمداو تاقیکردنەوەکانی بۆم.

لە وتەکانی عمرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئارام گرتن لەسەر قەزاو قەدەرو بڕیارەکانی خوا واجبەو دەبێت بەندە بەرامبەر بەخوا سەبرو ئامارامی هەبێت، بەڵام ڕازی بەقەزاو قەدەرەکانی سوننەتە و ئەو کەسانە پێ ی دەگەن، کە پلەیەکی بەرزی باوەڕدان و ئەو پەڕی متمانەو دڵنیایی بیان هەیە بەرامبەر خوای پەروەردگار.

## چوارەم: (( المرجئة )) ــ مورجیئەکان ــ

ووشەی (مرجئة) لە دواخستنەوە هاتووە، بە مانای دواخستنی کردەوەلە باوەڕ دێت[3]، ووشەی (الإرجاء) دوو مانای هەیە:

یەکەم: دواخستن وەك لە قورئاندا هاتووە: ﴿أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ الأعراف:١١٠.

---

١ــ سیرة عمر إبن عبد الحکم لا ٩٢.

٢ــ الأثار الواردة(١/ ٥٣٨).

٣ــ الفرق بین الفرق لا ٢٠٢

دووەم: بەخشینی تکاکاری.[١]

(مرجئە) وەك ئیمام أحمد‌رحمه‌الله دەڵێت: ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە پێیان وابوو باوەڕ دەبڕینە بەزمان و بەس، خەڵکی هەموو وەك یەك باوەڕیان هەیە کەسیان لە کەسیان زیاتر نی یە، کەواتە لەلای ئەوان فریشتەو پێغەمبەران ــ علیهم السلام ــ خەڵکی سادە هەموو وەك یەك باوەڕیان هەیەو باوەڕ نەزیاد دەکات و نەکەم و هەرکەسێ بە زمان شایەتومان بێهێنێ ئەوە باوەڕدارە با یەك کردەوەی چاکیشی نەبێت.[٢]

(مرجئة) تۆخەکان دەڵێن: لەگەڵ بونی باوەڕدا گوناه زیانی نی یە، هەروەك چۆن لەگەڵ بێ باوەڕیدا کردەوەی چاك دەوری نی یە، ئەمەش بۆچونی (جهم)و هاوڕێکانی بوو، یەکەم کەس لەم بارەیەوە دەوی کوتا–غیلانی دیمەشقی– بوو[٣]

زۆر ووتە لە عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه‌الله دەگێرنەوە وەك زیادکردنی باوەڕو کردەوەش بەشێکی گرنگە لێ ی، کە ئەمەش ڕدێکی گەورەیە بۆ(مرجئة)کان.

هەروەك هەمیشە لە دژی (بیدعە)وشتە پڕوپوچە داهێنراوەکان دەجەنگاو کردەوەی بەگەورە دەگرت و دەیکرد تەواو کەری باوەڕ وەك پێشتر باسمان کرد خۆی دەڵێت: ئیسلام بریتیە لە کۆمەڵێ سنور ـ حدود ــ و شەریعەت و سوننەتە، هەرکەسێك کاریان پێ بکات ئەوە بە تەواوی باوەڕی تەواو کردووە، ئەوەی بە تەواوی جێ بەجێ یان نەکات ئەوە باوەڕی تەواو نەکردوە، ئەگەر بمێنم بەجوانی بۆتان ڕوون دەکەمەوەو جێ بەجێشی دەکەم لە ناوتاندا، خۆز ئەگەر بشمرم ئەوە زۆر حەزم لە ژیان نی یە لە ناوتاندا.

عون کوڕی عبداللە، کە یەکێك بوو لە کۆمەڵەکانی ئەم تاقمەو، پاش ماوەیەك لە عمر نزیك دەبێتەوەو پەیوەندی تۆندو تۆڵی لەگەڵدا دەبەستێت و واز لە بۆچونی(مرجئة)کان دەهێنێت.[٤]

---

١ـ الملل والنحل للشهرستانی(١/١٢٩)

٢ـ موقف أهل السنة من أهل الأهواء(١/١٥٢)

٣ـ الملل والنحل (١/١٢٩)

٤ـ الأثار الواردة(٢/ ٨١٦).

## پێنجەم: ((الجهمية)) جوهەمیەكان

تاقمی جوهەمی یەكان بەناوی دامەزرێنەرەكەیەوە ناو نراوە، كە نـاوی (الجهمـی كوڕی صـفوان)ە لـە وڵاتـی خوڕاسـان وانـەی لەسەردەسـتی (جعـدی كـوڕی درهـم) خوێندوەو نوسەری(حارثی كوڕی سریح)بوو.[1]

ئەم(حارث)ەخەریكی ئاژاوە نانەوە بـوو دژی دەوڵـەتی ئومـەوی لـە خوراسـان و (جهم)یش پاگەندەی بۆ دەكرد بە خەڵكی دەناساند و داوای یارمەتی دەكرد بكرێتە والی[2] و هانی خـەڵكی دەدا كـە پـشتی بگـرن، ئـەوەبوو لـە سـاڵی (١٢٨)ی كۆچـیدا جەنگێك بەرپابوو لە نێوان سـوپایی ئـەمیری خوراسـان(نـصری كـوڕی یـسار) و لـە نێـوان هـەوادارانی (حـارثی كـوڕی سـریح)دا، (جهـم)یـش لـە نـاو سـوپاكەیدا بـوو، سەربازێكی والی هاتە پێشەوە لێ ی و شمشێرێكی كرد بە دەمیداو كوشتی.

لە گرنترین بۆچونەكانیان:

١ـ ڕایەكانی جعدی كوڕی درهم ی هـەڵگرتبوو، كـە دڵێـت: هـەموو سـیفەتەكانی خوا ڕەد دەكاتەوەو دەڵێت قورئانیش مخلوقە و كۆمەڵێ بیدعەی تریش.

٢ـ دەڵێت: مرۆڤ هیچ هەڵس وكـەوت وكـارێكی بەدەسـت خـۆی نـی یـە ویـستی سەربەخۆی نی یە، بەڵكو وەك بەرمرێك وایە بەدەم ڕەشەباوە، ئەمەش پێـچەوانەی قەدەریەكانە.

٣ـ ئیمان مانایی ئەوەیـە خوابناسـیت و بـەس، بـێ بـاوەڕیش واتـە: نەناسـین و نەزانینی خوایەو بەس.

٤ـ دەلێن: بەهەشت و دۆزەخ نامێنێن لە پاش چونی خەڵكەكە بۆناویان، چونكە پێ ی وایە هیچ شتێك نی یە جوڵەكەی بێ وەستان بێت.

جهم پیاوێكی زۆر نەشارەزا و نەخوێندەواربووە، بەڵام قسەزان و دەمەوەر بـوو، سیمسنەكان لە هندستان پسیاری كرد، كە پێناسـەی خوایان بـۆ بكـات ؟ نـەیزانی

---

١ـ حقيقة البدعة وأحكامها(١/١١٥)

٢ـ الكامل في التأريخ لە حقيقة البدعة وأحكامها(١/١١٥) وەرگیراوە.

وەڵامیان بداتەوەو ڕۆیشتەماڵەوەو پاش چەند ڕۆژی هاتەوەو پێ ی ووتن: ئەم هەوایەیە بەدەورماندا ـ پەنا بەخوا ـ لە گشت جێگایەکەو جێگایەك نی یە لێ ی نەبێت.

ئەوەی، کە دەڵێن گوایە مرۆڤەکان هیچیان بەدەست نی یەو لە لایەن خواوە هەموو شتیان بەسەردا دەسەپێت، ئەم قسەیە نابەجێ یەشیان پڕاوپڕ لە قسەی بێ باوەڕکانی پێش ئیسلام دەچێت، کە دەیان ووت: بە دەست خۆمان نی یە، کە بێ باوەڕین، بەڵکو ئەگەر خوا بیویستایە دەیکردینە باوەڕدار وەك خوای گەورە لە سەر زمانیان دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ النحل: ٣٥.

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه‌الله گرنگی دەدا بە زیندوکرنەوەی سوننەتەکانی ومراندنی هەموو بیرۆکە و بۆچونێکی داهێنراو بیدعەکان وەرگیراوە لە نەتەوەکانی وەك هندستان و رۆمان وهتد... ئەگەر سوننەتەکانی بێغەمبەری خوا زیندو بکرێتەوەو خەڵکی لە قورئانەوە نزیك تر بکرێتەوە، ئیتر خۆی بۆ خۆی ئەو تاقم و دەستە ئارەزوو پەرست و لادەرانە لە ڕاستە ڕێگەی ئیسلام دەتوێنەوەو نامێنن.

### (المعتزلة) واتە: کەنار گیرەکان

کەنار گیرەکان (معتزلة) لە سەرتای سەدەی دووەمی کۆچی یەوە لە سەر دەستی (واصل کوڕی عطاء)دروست بوو، کە خەڵکی بەسرەبوو، عەقڵ و ژیری بەکار هێنا لە مەسەلە بیرو باوەڕی یەکاندا زیاتر لە ئایەت و فەرموودە، ئەم تاقمە دەڵێت: هەموو زانستەکان لە ڕێگەی عەقڵەوە دەست دەکەون لە پێش شەرعدا[1]

٢ـ ئەم تاقمە چۆن دروست بوون؟

پیاوێك هاتە خزمەت (حسن البصری)و پرسیاری لێ کرد ووتی: ئەی پێشەوای

---

١ـ التنبيه والرد للملطی لا ٥٠

ئاین، لەم سەردەمەی ئێمەدا تاقمێك پەیدا بووە، کە خاوەنی گوناهە گەورەکان بەکافر دەزانن، تاقمێکی تریش بە پێچەوانەوە دەڵێن: خاوەنی گوناهە گەورەکان بەدەست خوایەو ئەو سزایان نادات، چونکە لەگەڵ باوەڕدا گوناه زیانی نی یە، دەی ئایا ئێمە باوەڕ بەکام لایان بکەین؟

شێخ حەسەن ماوەیەك بیری کردەوە، پێش ئەوەی وەڵامی ئەو پیاوە بداتەوە (واصل) ووتی پێ ی: من پێم وایە نەباوەڕداری تەواو نەبێ باوەڕی تەواو، بەڵکو لە نێوانە دایە، نەموسڵمانەو نەکافرە، ئەوەی ووت و هەستاو هەڵقەی وانەی خۆی گوێستەوە بۆ گۆشەیەکی تری مزگەوتەکەو لە(حسن البصری) جیابویەوەو کەناری لێ گرت.

(حسن البصری)یش فەرمووی: (واصل) کەناری لێ گرتین، لەو ساتە بەداوە ناوی نراوە، کەرانارگیرەکان: (المعتزلة)[1]

ئەم تاقمە لای ئەهلی سوننەو جەماعە بە قوتابخانەیەکی فیکری تایبەت دادەنرێن، کە قسە لەسەر عەقڵ و ژیری زاڵە بەسەر ئەو قوتابخانەیەدا، وازیان هێنا لەدەست گرتن بەدەقە شەرعی یەکانەوە، کە دەست گرتن پێیانەوە دەبێتە هۆی ڕێنمایی و واز هێنانیشی دەبێتە هۆی گومڕابون.

## کەنارگیرەکان بۆچونی تاقمە لادەرەکانیان زیندودەکردەوە:

أ‌- تاقمی خەواریج: ئەمانیش وەك خەواریج پێیان وابوو شوێنی خاوەنی گوناهی گەورە ئاگری دۆزەخە، بەڵام ئەمان بە باوەڕداری دەزانن، هەروەها وەك خەواریج باوەڕیان وابووە، کە دەرچوون لە دژی کار بەدەستی ستەمکار پێویستە بە هەموو شێوەیەك ئەگەر هەڵگرتنی چەکیش بێت.

ب ــ تەئویل کردنی دەقەشەرعیەکان، ئەمانیش وەك خەواریج هەستان بەلەکارخستنی زۆرێك لە دەقەکانی قورئان و سوننەت بەهۆی ماناکردنی یەوە بەجۆرێك، هەڵی نەگرێت.

---

١ــ أراء المعتزلة الأصولية لا ١٧

جـ ـ تاقمی (قەدەر)ی یەکان: لە قەدەریەکانیشەوە ئەوانەیان وەرگرتبوو، کە قەدەر ڕەد بکەنەوە، بەڵام بەوشێوە گشتی یەی ئەوان نا، بەڵکو کەمێ سوکیان کردەوە سیفاتی زانیاری و نوسینیان بۆ خوا بڕیاردایەوە، دەیان ووت: مرۆڤەکان بە ئەوپەڕی سەربەستی خۆیانەوە کارەکانیان ئەنجام دەدەن بەبێ بچوکریتن دەست تێوەردانی خوای تەعالا[1] لەبەر ئەوە زاناکان بەکافر و بێواڕیان لە قەڵەم نادەن وەك چۆن ڕۆچووەکان بەبێ باوەڕ دەزانن.

د ـ لە (جهم)یەکانەوە: ئەو پەیوەندی یەی تایبەتی نێوان(جهم)و هەندێ لە هاوەڵەکانی(واصل) وای کرد، هەندێ لە بیروبۆچوونەکانی جەهمی یەکان تێکەڵ بە بیری (معتزله)کان ببێت لەوانە:

أ ـ سیفات ڕەد دەکەنەوە(إبن تیمیة) دەڵێت: ئەم ووتەیە ـ ڕەدکردنەوەی سیفاتی خوا ـ کە جولەکەو گاورەکان وەریان گرتووە، یەکمین کەس (جعدی کوڕی درهم) هەڵی گرت لە ئیسلامدا و پاشان گەیشتە (جهم)[2]

بەڵام کەنار گیرەکان کەمێ سوکیان کرد وەك جهمییەکان نەبوون لە (سیفات و ئەسماء) ڕەد بکەوەنەوە، بەڵکو سیفاتیان ڕەد کردەوە، بەڵام ناوەکانیان بۆ خوا جێ گیرکردەوە.[3]

ب ـ (قورئان مەخلوقە) ئەم ووتەیە ترسناکترین ووشەبووە، (إبن تیمیة) دەڵێت: یەکتاپەرستی جهمییەکان لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە سیفاتی خوایان ڕەد دەکردەوە، دەویان ووت: خوای گەورە دەبینرێت و قورئانیش مەخلوقە واتە: نەبووە و ، پاشان هاتۆتەکایەوە.

بۆچوونی کەناگیرەکان ـ معتزلة ـ لە سەردەمی عەباسی یەکاندا بە شێوەیەکی بەرچاو تەشەنەی کرد، هەندێ لە خەلیفەکانی وەك: (مأمون) پاڵپشتیان دەکرت و ئەوانیش قوتابیان بە هەموو لایەکدا نارد بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بیرو بۆچونانەیان.

---

١ـ القضاء والقدر فی ضوء الكتاب والسنة لا١١٧.

٢ ـ الفتوى الحموية الكبرى.لا ٤٧.

٣ ـ تأثير المعتزلة فى الخوارج والشيعةلا ٢٥.

# بەشی پێنجەم

# عمر لەنێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و زانستی و بانگەوازیدا

## یەکەم: ژیانی کۆمەڵایەتی

### گرینگی دان بە خێزان و منداڵەکانی

عمر بۆخۆی لە نزیکەوە سەرپەرشتی پەروەدەکردنی منداڵەکانی دەکرد، ئەوکارە قورەسەی سەرشانی ـ خەلافەت ـ رێ ی لێ دەگرت لەهەوڵ دان بۆ گۆش کردن و پەروەردەکردنیان بەجۆرێك، کە لەسەر ڕەوشتی جوانی قورئان و سوننەت گۆش بن و لە ئیسلام شارەزا بن، ئەمەش لە ڕێگەی نامەکانی یەوە خۆیان، یان بۆ مامۆستاکانیان دەردەکەوێت.

١ـ پەیوەست کردنیان بە قورئانی کەریمەوە، عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله منداڵەکانی پەویوەست دەکرد بە قورئانەوە، هەموو ڕۆژانی جومعەیەك داوای دەکرد پێش ئەوەی خەڵکی بینە ژوورەوە بۆلای، داوای دەکرد منداڵەکانی بێن بۆ لای، بۆ ئەوەی قورئان بخوێنن، هەرکە دەیووت: ئادەی خێرا گەورەترین منداڵی دەستی دەکرد بەقورئان خوێندن، پاشان دەیووت: ئادەی، واتە: ئەوەی دوای ئەو تا بەو شێوەیە هەموویان قورئانیان دەخوێندەوە بۆی.[١]

٢ـ ئامۆژگاری منداڵەکانی دەکات: ئەوسالەی، کە تیایدا عمری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە نامەی نووسی بۆ(عبدالمليك)ی کوڕی، کە ئەو کاتە ئەو لە مەدینەی مونەوەرە بوو، لەو نامەیەدا پێ ووت: (هەرکەسێ حەزی لە بەهەشتە و لە ئاگری دۆزەخیش ڕادەکات ـ مەبەستی عبدالملك و براکانی تری بووـ ئێستا دەرگایی

١ ـ سياسة عمر فى در المظالم ل٥٢.

تەوبەو گەڕانەوە کرایەوە، گوناه کردن بوراوە لە پێش هاتنی ئەجەل و مردن، نەمانی کردەوەو کردن یەکلابونەوەی خوا بۆ لێپرسینەوەو تۆڵە سەندنەوە لە ئاکاری کردەوەکانی خەڵکی و لە شونێکدا، کە هیچ شتێك فریای کەس ناکەوێت، هیچ بیانو هێنانەوەیەك ناخوات، هەموو نهێنی یەکان ئاشکرا دەبن، تکاو شەفاعەت ناخوات، خەڵکی بەکردەوە جوانەکانیان دەرباز دەبن، دەستە دەستە بەرەو دوا مەنزڵیان دەڕۆن، دەی خۆش بەختی بۆ ئەوانەیان، کە گوێڕایەڵی خوایان کردوە، وەیل و لەناو چونیش بۆ ئەو کەسانەی، کە فەرمانی خوایان شکاندوە.[١]

لە بەشێکی تری نامەکانیدا هانی کوڕەکەی دەدات، کە یادی خوا بکات، لە شوکر سوپاسی بەردەوامی دەرنەچێت، لە هەموو کردارو گرفتارێکتدا خوا بە چاودێر بگرێت بەسەر خۆیەوەو، پێ ی دەڵێت: وئەو فەزڵ و چاکە زۆرانەی خوات لە بیر بێت، کە داویەتی بە خۆت و باوەکت، ئەگەر ئە توانیت بەردەوام زۆر زۆر زمانت بە یادی خوا بجوڵێت وابکە، چونکە باشترین ووشە بۆ ئەوەی قسە خێرەکانتی پێ بەر دەوام بکەیت سوپاس کردنی خوایە، باشترین ووشەیەکیش ووتە ناشیاوەکانتی پێ ببڕێنێتەوە سوپاس کردنی خواو یاد کردنیەتی[٢]

٣ـ هانی دەدان لێبوردەبن و گومانی چاکە بە خەڵکی بەرن: عمر رحمه الله هانی منداڵەکانی دەدا تا ئەو پەڕی لێبوردەیی لێبوردەبن و گومانی چاکەیش بەخەڵکی بەرن، هەندێ گومانی خراپ تاوانە، دەگێڕنەوە جارێکیان بە عبدالعزیزی کوڕی ووت: هەر ووشەیەکت لە برایەکی موسڵمانت بیست بە گومانی خراپەوە لێکی مەدەرەوە.

٤ـ شێوازی نەرم و نیان و گفتوگۆی ژیرانە: عمر رحمه الله بەشێوازی نەرم نیان و لەسەرخۆ هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکردن، بەڵام نەیدەگەیاندە ئاستی نازپێدان، تا خراپ دەربچن و لەدەست دەرنەچن، زۆر بەژیرانەلەگەڵیاندا دەدواو شێوازی ژیری و

---

١ ـ سیرة ومناقب عمربن عبدالعزیز لابن الجوزی لا ٢٨٩.
٢ ـ هەمان سەرچاوە.

قەناعەت پێکەری بەکار دەهێنا لە گەڵیاندا لەکاتی داوا کاریەکانیاندا.[١]

دەگێڕنەوە عبداللەی کوڕی هات بۆلای و داوای لێ کرد جل وبەرگی نوێ ی بۆ بکات لەو کاتەدا عمر خەلیفە بوو، ئەویش ناردی بۆلای (خیاری کوڕ رباح البصری) وپێ ی ووت: چەند قوماشمان لە لایەتی تۆ لێ ی وەربگرە بۆ خۆت، بەلام (عبدالله) قوماشەکانی بە دڵ نەبوو، هاتەوە لای باوکی و پێ ی ووت: من داوام لێ کردیت جلم بۆ بکەیت کەچی منت نارد بۆلای خەیاری کوڕی ریباح، ئەویش هەندێ قوماشی پێ نیشان دام، کە نەلە ئاستی من و نە ئاستی هۆزەکەشمان دا نەبوو، عمریش ووتی: پارەی ئەو قوماشانەمان هەیە لەلای ئەو پیاوە، (عبدالله)ش سەری داخست و چووە دەرەوە.

عمریش وەك باوکێکی پەروەردەکار هەڵوێستی مام ناوەندی گرت و قەناعەتیشی بەکوڕەکەی کرد فێریشی کرد، کە هەموو کاتێ مەرج نی یە هەموو داوایەکی جێ بەجێ بکرێت، بۆیە پێش ئەوەی لە چاو وون بێت بانگی کردەوە پێ ی ووت: ئەتوێت لە پارەکانی خۆت (١٠٠) درهەم مت پێ بدەم لە کاتی وەرگرتندا لێت وەربگرمەوە؟ ووتی: بەڵێ باوکە گیان، ئەویش (١٠٠) درهەمی پێداو کاتێ ساڵانەی خۆی وەرگرت (١٠٠) درهەمەکەیان لێ سەندەوە.[٢]

یان دەگێڕنەوە، کە زۆر جوان وەلامی منداڵەکانی داوەتەوەو قەناعەتی پێکردوون، دەڵێن جارێکیان یەکێك لە کچەکانی گوارەیەکی گەوهەری دەست کەوت، بەلام تاك بوو، بۆیە جوابی نارد بۆ باوکی داوای لێ کرد، کە تاکێکی تری بۆ بنێرێت تا پێکەوە بیکاتە گوێچکەی، عمریش ﷀ نە ووتی باشەو نە ووتی: نەخێر، بەڵکو مەسەلەکەی پەیوەست کرد بە ئارامی ئەو کچەوە لەسەر سکڵی سور، بۆیە (دوو سکڵی) سوری نارد بۆی و پێ ی ووتبو: ئەگەر دەتوانیت ئەم دوو سکڵە سورە بکەیتە گوێچکەت ئەوە منیش تاکەکەی تریت بۆ دەنێرم.[٣]

---

١ ـ النموذج الإداري لا١٠١.

٢ـ سيرة مناقب عمر لا ١١٢.

٣ـ سيرة عمر لابن عبدالحكم لا ١٢٤.

٥ـ داد پەروەر بوو لە نێوانیاندا: دەربارەی هەڵس و کەوتی جوانی لەگەڵ منداڵەکانیدا ئەوپەڕی هەوڵدانی بۆ ئەوەی لە نێوانیاند داد پەروەر بێت لەگەڵ زۆریشیاندا، ئەمەش بۆ ئەوەبوو نەوەکو ڕقیان لە یەکتری هەستی و کینە بگرنە دڵ بۆ یەکتری، بۆ ئەو مەبەستە وازی هێنا، کە کوڕی (حارثی)یەی خێزانی لە باوەشی خۆیدا بخەوێت، لە ترسی ئەوەی نەوك زوڵمێکی تێدا بێت لێیان.[1]

دەگێڕنەوە لە عبدالعزیز کوڕی عمرەوە، کە دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیزڕحمەاللە کوڕێکی هەبوو لە ئافرەتێکی هۆزی حاریثـة و زۆری خۆشی دەویست و لەگەڵیدا دەخەوت و دەستی دەکردەملی، دەڵێ: شەوێکیان ڕێم پێ گرت، باوکیشم ووتی: عبدالعزیزیت؟ ووتم: بەڵێ، ووتی: شتی ڕوی نەدابێت بۆچی هاتویت؟ وەرە ژوورەوە، منیش چوومە ژوورەوە، لای جل و بەرگەکانیدا دانیشتم ئەو نوێژی دەکرد... هات بۆلام و پێ ی ووتم: چیتە؟ ووتم هیچ کەس ئەوندەی باوك کوڕی خۆی نا ناسێت، تۆ کارێکی وا دەکەیت لەگەڵ کوڕی ئەم ژنە حاریثة دا، کە لەگەڵ ئێمەدا واناکەیت، منیش دەترسم بڵێن: کارێکی دیارە بۆیە وا بەوە دەکات و بەئێمەی ناکات شتێکی لەوێ بەدی کردەوە، کە لای ئێمە نی یە.

عمر پێ ی ووت: کەس قسەی وای لە لادا کردویت؟ ووتم: نەء، ووتی: ئادەی دووبارەی کەرەوە منیش دووبارەم کردەوە، پێ ی ووتم: بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە، منیش گەڕامەوە، من و ئیبراهیم و عاصم و عبداللەی برام لە ژورێکدا دەخەوتین و هەر ئەوندەمان زانی قەرەوێڵەکەی عمریان هەڵگرتبوو هێنایان بۆ لای ئێمە و کوڕی حاریثةکەی برامانی لە گەڵدا بوو پێمان ووت: ئەمە چیتە؟ ووتی: ئەوەبوو، کەتۆ بەسەرت هێنام و دەیویست بلێت: ئەمەی کردوە لە ئەترسی ئەوەی نەوەك ستەمی لە ئێوە کردبێت.[2]

٦ـ گەشەپێکردنی ڕەوشتە جوانەکان لە ناویاندا: زۆر مەبەستی بوو ڕەوشتە بەرزەکان لەناو منداڵەکانیدا گەشە بکات، هەموو هەلێکی گونجاوی بۆ ئەو مەبەستە

---

١ـ النموذج الإداري لا ١٠١.

٢ـ عمر بن عبدالعزيز وسياسته لا ٥٢.

بەکار دەهێنا، لەو نامەیەیدا، کە بۆ (عبدالملك)ی کوڕی نارد کاتێ ئەو لە مەدینە بوو پێ ی ووت: کە دوور بکەوێتەوە لە شانازی کردن و خۆ هەڵنان لە قسەو گوفتاریدا، یان خۆی لێ بگوڕێت، خۆی بەگەورتر بزانێت لە خەڵکی، پێ ی ووت: دەخلیت بم لە قسەکردندا خۆت هەڵ نەهێنێت، خۆتت لێ نەگوڕێت، یان وا بزانێت ئەو ڕێز پلەوپایەی هەتە لەبەر ئەوەیە، کە لای خوا زۆر گرنگیت، چاکەیەکەو خوا بە کەسی تری نەداوە جگە لە تۆ![1]

٧ـ منداڵەکانی لەسەر دنیا ویستی و ژیانی زبر پەروەدە دەکرد: کەسایەتی بەرزی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەوە دابوو، کەتوانی بەهەموو قەناعەتێکەوە خێزان و کوڕو کچەکانی وەك خۆی ژیانی دونیا نەویستی و خۆگرتنەوە بگرنەبەر لەکاتێکدا، کە هەموو سامانی سەر زەویان لە بەردەستدابوو، کەچی وا ڕای هێنابوون وەك خەڵکی سادە دەژیان نەك ژیانی هایلایف و بڕژێنەو بپژێنەی زۆرێك لە کوڕە پاشاکان.

هەر لە نامەکیدا بۆ عبدالملکی کوڕی نارد لە مەدینە، کە نامەیەکی بەڕاستی پەروەردەی یە، تیایدا هاتووە دەڵێت: ئەگەر خوای گەورە تاقیکریتەوە بە دەوڵەمەندی، لەو کاتەشدا دەست پێوە بگرە، خۆت بەنرم سەیر بکە لە بەر خاتری خوا، مافی لێ دەربکە ـ مەبەستی زەکات و خێر کردن و دەست پێوە گرتن ـ وە ئەو بەندە صالحەی خوا بڵێ: ﴿هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾ النحل:٤٠.

ئەم نامەیەیی عمر، ڕاستەخۆ دوای وەگرتنی پۆستی خەلافەت، کە تا ئەو کاتەش ژیانی خۆش وەزع باشییان بەردەوام بوو، عمریش شێوازێکی پەروەردەی نمونەیی گرتەبەر، پەلەی لێ نەکردن و وردە وردە بەرەو ژیانی دنیا نەویستی بردنی، سەرەتا بۆی دەسەلماندن، کە دەوەڵەمەندی تاقیکردنەوەی خوایی یە بۆ

---

١ـ سیرة مناقب عمر بن عبدالعزیز لا ٢١٤.

موسڵمانان، پاشان داوایی لێ دەکردن دەست پێو بگرێت - إقتصاد ــ پاشـان ئـەو کارەی بەستەوە بە خۆ بەکەم زانییەوە، لـە دواییـدا ئـەوەی دووپـات کـردەوە، کـە دەبێت مافی خوای لێ جیـا بکرێتـەوە، وەك زەکـات دان و خێـر کـردن و گوێڕایـەڵی خوای (عزوجل).[١]

ڕۆژێکی تر هەواڵی زانـی، کـە یـەکێك لـە کوڕەکـانی ئەڵقەیـەکی زیـوی کردبـووە دەستی، کە بە (١٠٠٠) درهەم کڕیبوی، عمریش بە پەلـە نامەیـەکی بـۆ نـاردو پـێی ووت: بیـستومە ئاڵقەیـەکی زیـوت کڕیـوە بـە هـەزار درەهـەم، خێـرا بیفرۆشـە بـە پارەکەی (١٠٠٠) برسی تێر بکەو ئەوەشی مایەوە ئەڵقەی ئاسنی چینی پـێ بکـڕەو بیکەرە دەستت لە نەقشەکەی بنوسە: ڕەحمەتی لـە کەسـێك نرخـی خـۆی دەزانێت.[٢]

تێبینی ئەوە دەکرێت، کە چۆن عمر رحمه الله فرۆشتنی ئەنگوستیلەکەی بەستەوە بـە تێر کردنی هەژارو نەدارانەوە، ئەمەش زۆر بە هێز بوو بۆ تێ گەیانـدنی نـاو کـرۆك و مەبەستەکەی و شێوازی خەرج کردنی پارەکـانی لـە داهـاتوودا، بـەو جـۆرە خـەمی هەژارو نەدارانیان لە بەرچاو بێت.[٣]

ڕۆژێکیان یەکێك لە کوڕەکانی، ژنیشی هەبوو داوای لەباوکی کرد، کە ژنێکی تری بۆ بهێنێت و خەرجی یەکەشی لە (بیت المال) سـەرفی بکـات، عمـریش کاتـێ داوا کاریەکـەی پـێ گەیـشت کـە لەنامـەدا نوسـرابوو، زۆر توڕەبـوو، بۆیـە بـۆی نوسـی: نامەکتم پێ گەیشت، کە تیایدا داوات لێ کردووم بە پارەی (بیت المال)ی موسڵمانان ژنی دووەمەت بۆ بهێنێم! لە کاتێکدا کوڕی موسڵمانان توانایان نـی یـە یـەك ژنـیش بهێنێن، هەرگیز شتی وا لەو جۆرەم بۆ نەنوسیت.... پاشـان بـۆی نووسـی: سـەیر کە ئەگەر دەتەوێت ژنی دووەم بهێنێت بزانە لـەناوماڵکـەدا قـاپ و قاچـاغی مـس و

١ــ النموذج الإداری لا ١٠٦.

٢ــ سیرة مناقب عمر لا ٢٩٨.

٣ــ لنموذج الإداری لا ١٠٦.

شتی ترمان هەبوو بیفرۆشەو ژنی پێ بهێنە.[١]

خۆ هەر بەکوڕەکانی یەوە نەوەستابوو، بەڵکو ئەم پەروەردە زبرو ڕەقە کیژەکانیشی گرتبوویەوە، بۆ نموونە عمری کوڕی عبدالعزیز کچێکی هەبوو ناوی ئامینە بوو، جارێکیان ئامینە دای بەلای عمر داو بە خێرایی دەیویست تێ بپەڕێت، عمریش بانگی لێوە کرد، ئەویش ووتی وەڵامی نەدایەوە، فەرمانی دابڕۆن بهێنێنن بۆ لام و هێنایانە بەردەستی و پێ ی ووت: هۆی چی بوو وەلامت نەدامەوە؟ ئامینەش ووتی: جلو بەرگم لە بەردا نەبوو، شەرمم دەکرد، ـ واتە: جلەکانی جوزان نەبوون و، کەڵکی ئەوەیان نەبوو سەیر بکرێن ـ ، عمریش ووتی: بەموزاحیمم: بڕۆ لەو قوماشانەی ئەو ڕۆژە بریمان کراسێکی بۆ جیا بکەرەوە.[٢]

ئەمە دەربارەی جل و بەرگی ڕۆڵەکانی، خۆ دەربارەی خواردنیشیان حاڵیان لەوە باشتر نەبوو، إبن عبدالحکم دەگێڕتەوە، کە عمر جارێکیان نوێژی عیشای دەکرد و، پاشان دەڕۆیشتە ناو کچەکانی سەلامی لێ دەکردن، ئەوەبوو لەیەکێ لەو شەوانە لە پاش نوێژ چوە ناویان سڵاوی لێ کردن، کە هەستیان بە هاتنی دکرد دەستیان گرت بە دەمیانەوە بەرەو دەرگاکە کەوتنە ڕێ، پرسیاری کرد لەسە پەرشتیارە کەیان، کە بۆچی وایان کرد؟

ووتی هیچ نەبوو بیکەن بە چێشت ناچاربوون نیسك و پیازیان خواردوە، بۆنی دەمیان ناخۆش بووەو حەزیان نەکرد ئازاری تۆ بدەن و بەبۆنی ناخۆشی دەمیان، عمریش دەستی کرد بەگریان، پاشان پێ ی ووتن: کچە شیرنەکانم، چ کەلکێکی هەیە خۆشترین و بەچێژترین خواردن بخۆن لە دونیادا و سبەینێ لەقیامەتدا باوکتان بەدەما بەناو ئاگری جەهەنم دا ڕابکێشن، ئەوانیش هەر هەموویان دەستیان کرد بە گریان، تا هاواریان لێ بەرز بوویەوە، پاشان ڕۆیشتن.

هەر لەوکاتەوە وازی لە ژیانی خۆش و ئاسودە هێنا، کە بوویە خەلیفەو بە ـــ فاطمة خانی ـــ خێزانی وت: کە ئاڵتون و زێڕو زیوەکانی بخاتە گەنجینەی

---

١ـ سيرة عمر لابن عبدالحكم لا ١٠٦.

٢ـ حلية الأولياء٥/ ٢٦١.

موسـڵمانانەوەو پـێ ی ووت: خـۆت سەربەسـت بـە، یـان ئـەو ئـاڵتون و خـشڵانە هەڵبژێرە، یان ڕێگەم بدە لێـت جیاببمـەوە، چـونکە حـەز ناکـەم مـن وتـو و ئەوانـە پێکـەوە لـە یـەك ماڵـدا بـژین، فاطمـەش باوەڕدارانـە ووتـی: نـەخێر، مـن تـەنها تـۆ هەڵدەبژێرم، چەندە ئەوەندەی تریشم هەبوایە نەم دەگۆڕییەوە بەتۆ.[١]

٨ـ گرنگی دانی بە خوێندنیان و فێرکردنیان: خوێنـدن و فێرکردنـی منداڵـەکانی گۆشەیەکی گەورەیان گتربوویەوە لە گرنگـی پێدانـەکانی و، کۆمـەڵێ ڕێ و شـوێنی زانستی وای گرتبوویەبەر، کە وەك پرۆگرامێکی زانستی دەتوانرێت پەروەردەکاران لە ژیاندا جێ بەجێ ی بکەن لە پرۆسـەی فێرکـردن و پـەروەردەدا، وردەکاریـەکانی ئەو پرۆگرامە زانستی خوازەی عمر بۆ منداڵەکانی لەو نامەیەدا بـەدی دەکرێـت، کـە ناردی بۆ مامۆسـتایەکان (سـهل کـوڕی صدقە) بـەو جـۆرەی خـوارەوە نایـا بتریـن ڕێگای بۆ ڕوون کردنەوە:

نووسی: لە عبداللە عمر بۆ (سهل)، پاشان من لە هـەموو شـارەزاییەکمەوە بـەتۆ، تۆم هەڵبژاردووە تا منالەکانم پەروەردە بەکەیت، تەنها تۆم هەڵبژاردووە لە ناو ئەو هەموو خزم و ناسیاوا نەمدا، بۆیە تۆیش بەشێوەکی کەمێ ووشك لە گەڵیان بـدوێ، ئەوە زیاتر داوایان لێ دەکات بێن بەدەمتـەوە ــ زۆر هاوڕێیـەتیان مەکـە ــ چـونکە بەرەوە بێ ئاگایی مرۆڤ دەبات، کەم پێبکەنە بە دەمیانـەوە، چـونکە زۆر پێکـەنین دڵ دەمرێنێت.

با یەکەمین شتێك لە ڕەوشتی تۆوە فێری دەبن، بیریان بێتەوە لەگوێ گـرتن لـە گـۆرانی و مۆسـیقای مـەلهاکانی، چـونکە سـەراتەکەی لـە شـەیتانەویەو کۆتـایی یەکەشی خەشـم قینـی پـەروردگارە، لـە زانـا باوەڕپێکاراوەکانـەوە بیـستومە، کـە چوون بـۆ شـوێنی ڕابواردنـەکان و گـوێ گـرتن لـە مۆسـیقاو گـۆرانی و ئالـەدەبوون پێیانـەوە دەڵـەکان دوو ڕووی هەڵدەمـژن، وەك چـۆن گـژوگیا ئـاو هەڵدەمـژێت، بەتەمەنم خۆ پاراستن لەو جێگایان زۆر باشترە بـۆ مێشك لـە چـەکەرە کردنـی دوو ڕووی لەناو دڵدا، کاتێ واز لەو شوێنە خراپانە دێنێت مێـشکی دەکرێتـەوە بـۆ هـەر

١ـ الطبقات (٥/ ٢٢٠)

شتێکی بەسود، کە بدرێت بەگوێدا...

هەرکوڕێکیان بەشێك لە قورئانی پێ بخوێنەو باجوان فێری ببێت و ئەگەر لێ بوونەوە، پاشان تیرو کەوانایان بدەرە دەست و دەریان بکە بۆ تیر هاوێژی و حەوت جار ڕاهێنانیان پێ بکە، پاش ئەویش نیوە ڕۆهات با قەیلولە بکەن ــ واتە خەوی کاتی گەرمای نیوە ڕۆیان ــ چونکە إبن مسعود رضي الله عنه بەکوڕەکانی دەوت: ئەی کوڕەکانم قەیلولە بکەن، چونکە شەیتانەکان قەیلولە ناکەن[1]

لەم ئاڕاستانەی عمرەوە هەندێ تێبینی لێ وەردەگرین:

١ـ هەڵبژاردنی مامۆستاو پەروەردەکەری صالح: مامۆستاو پەروەردەکار وەك بناغە وان لە پرۆسەی فێرکردندا، عمر مامۆستای بۆ کوڕەکانی هەڵبژارد لە کەسە زۆر نزیك و تابەتیەکانی خۆی، چاك دەیناسی و متمانەیان پێ ی بوو عمر رحمه الله هەر بەسەهلەوە نەوەستا تا پەروەردەو فێرکردنی منداڵەکانی لە ئەستۆ بگرێت، بەڵکو مامۆستازو پەروەدەکارەکەی، کە صالحی کوڕی کەیسان بوو، ڕای سپارد، تا شان بە شانی سهل ئەویش هاو کاری کوڕەکانی بێت لە پەروەردە کردنیاندا.[2]

سوربونی عمر رحمه الله لەسەر فێرکردن و پەروەدەکردنی منداڵەکانی لەم ئاستەدا نەوەستا، بەڵکو گەورە زاناکانی ئەو سەردەمەی ڕادەسپارد تا ئاستی ژیری و ئەدەبیان هەڵسەنگێنێ و تاقیان بکاتەوە، داوای لە (مەیمونی کوڕی مەهران) کرد، کە عەقڵ و ژیری عبدالملکی بۆ هەڵسنگێنێ لە ڕێگەی ڕاوێژ پێکردن یەوە، مەیمون دەڵێت: هاتنی بۆلای ــ واتە: عبدالملکی عمر ــ داوای مۆڵەتم لێ کردو وادەی کاتژمێرێك لەلای مامەوەو، سەر سامی ژیریەکەی بووم.[3]

دیاری پرۆگرامی خوێندن: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پرۆگرامی خوێندن ئەو بابەتانەی بڕیارە بخونرێت بۆی دیاری کردن، کە دەبێت ئەمانەیان پێ بڵێنەوە، بە

١ـ سيرة ومناقب عمربن عبدالعزيز لابن الجوزی لا ٢٠٢.

٢ـ تذكرة الحفاظ ١/ ١٤٨.

٣ـ سيرة ومناقب عمربنعبدالعزيز لابن الجوزی لا ٢٠٣.

جۆرێك لە قورئانی پیرۆزو زانستەکانی یەوە سەرچاوەیان گرتبوو لەگەڵ زانستەکانی تریشدا، دەبێت مەشقی سەربازی پێ بکات بۆ ئەوەی لە لایەنی جیهادو جەنگ و خۆ گریەوە پەروەردەبن، هەروەها مەشق کردن لەسەر تیر هاوێژی و ڕاکردن بەپێ ی پەتی تاڕابێت لەسەری، لەگەڵ ئەو پرۆگرامە وردەدا، کە کاتی حەوانەوەشی بۆ دانابوون، ئەندازەی قورئان خوێندنی ڕۆژانەشیان یەك بەش (جزء) بێت بە ئەو پەری دڵ وریایی و تێگەیشتنەوە، ئەمەو هەرچەندی لە گەڵ ئەو بەرنامەیەدا دەگونجێت کە زانستە ئیسلامی یەکانی تریان پێ بڵێتەوە، هەروەها تیر هاوێژی بە حەوت جار، هەر جارەو بەڕاکردن و پێ ی خاوس بڕوات بۆ لای ئامانجەکەی تا بزانێت پێکاویەتی لە لایەکە و لە لایەکی تریشەوە وەرزشێکی ڕاکردنە و، ڕاهێنان لەسەر ڕۆیشتن.

ئەمەش پرۆگرامێکی زۆر بەرزو بەڕێز بوو، کە تیادا دین و دونیا جەستەو گیان قسەو کرداری پێکەوە گرێ دابوو[1].

کە ئەمڕۆ زۆربەی پرۆگرامەکانی پەروەردەو فێرکردن ـ بەداخەوە ـ فەرامۆشیان کردوە، هۆی ئەوەشە، کە کەسێکی ناتەواو لە دوا ڕۆژدا دێتە کایەوە، کە زۆر زیرەکە لە خوێندن دا، بەڵام ترسنوکە لە سێبەری خۆی دەترسێت! یان زۆر ئازاو بەدەست و مشتە، بەلام نەخوێندەوار و نا ڕۆشنبیر! ئەمەش پوختەی لادانە لە پەروەردەی ئیسلامی ڕاستەقینە.[2]

ئیتر کاتی پشوو، کە بە خەوی قەیلولە ـ نیوەڕوان ـ دەری دەبڕی بۆی ئەوەش زۆر گرنگە بۆ جەستەو ڕۆح و عەقڵ[3]

٣- ڕەچاوکردنی کاریگەریەکان لە پرۆسەی فێرکردندا: عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله ڕەچاوی هەموو ئەو خاڵانەی دەکرد، کە کاریگەریان هەیە لەسەر دڵ و مێشکی

---

١ـ النموذج الإداری لا ١١٢.

٢ـ ووتەی وەرگێر.

٣ـ النموذج الإداری لا١١٨.

خوێندکارو توانای زیاتری وەرگرتم و کردنەوەی عەقڵ و مێشك لەوانە:

یەکەم: مامۆستاکەیان تواناو لێهاتویی یە زانستی یەکەی، چاو لێکردنی قوتابیەکان لە ڕەوشت و هەڵسو کەتەکانی.

دووەم: ڕەچاوکردی ئەوەی، کە نەرم و نیانی و پێکەنین بەدەم قوتابی و سوعبەت کردن و یاری کردن لە گەڵیاندا دەبنە هۆی خاوبوونەوەی قوتابیەکە لە وەرگرتنی زانست و تێگەیشتن بە لێهاتووی یەکی تەواوەوە.

سێ یەم: خل بوونەوە بۆ ناو گۆرانی و سەماو مۆسقیاو خەریك بوون کردنی مێشك پێیانەوە، کاتەکانی قوتابی دەکوژن و مێشك بیریشی گێل دەبێت و تاقەتی وەرگرتنی نامێنێت.[١]

چوارەم: ڕەچاوکردنی ماندوو نەکردنی لایەنی دەروونی خوێندکاران بە جۆرێك، کە لە نێوان وانەکاندا پشوو هەبێت و بوار نەدەیت بێ تاقەت بن و ئەوەش کاربکاتە سەر ئاستی وەرگتنیان و زانست و زانیاریان لە بەر چاو دەکەوێت.

پێنجەم: کاریگەری گرنگی دان بە وەرزش و تیر هاوێژی و ڕاکردن ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لەسەر لەش ساغی و تەندروستی، خاوێن کردنەوەی مێشك و دەروون.[٢]

## ئەنجامی پرۆگرامە پەروەردەیی یەکەی عمر لەسەر منالەکانی:

لە ئاسەوارو بەروبومی ئەو پرۆگرامە پەروەردەیی یە ناوازەی ئەمیری باوەڕداران بۆ کوڕەکانی، ئەوەبوو منداڵەکانی لەسەر خواناسی گۆش بوون، سەیری عبدالملکی کوڕی بکەین بۆمان دەردەکەوێت، کە پەروەردەی ڕاست و دروست وادەکات لە مرۆڤ، کە بەسادەو سروشتی بژی وەك لاوە موسڵمانانەکانی تر ژیان بەسەربەرێت و

---

١ـ هەر لەبەر ئەوشە ڕاگەیاندنە ڕوخێنەرەکان زۆربەی کاتیان بۆ گۆرانی ڕەقس و مۆسیقا تەرخان دەکەن تا میللەت بخەسێتە سەر بارێك تەنها بیر لە تێرکرنی حەزەکانی خۆی بکاتەوە گوێ بە زانست و زانیاری و شێوازی حەکمڕانی وولات نەدەن. (وەرگێر)

٢ـ النموذج الإداري ل١١٩٧.

ئەو ژیانە ناخۆش وز پڕ لە ڕابواردن و هایلایفەی، کە بۆی دەستە بەر کرابوو بەحوکمی ئەوەی کوڕی ئەمیری باوەڕداران بوو واو لێ بهێنێت. لەوانە:

### ١ـ خواناسی و گریانەکانی:

عاصمی کوڕی أبو بکری کوڕی عبدالعزیز، کە برازای عمر بوو، دەڵێ: وەفدێك ڕۆیشتن بۆ خزمەت سلیمانی کوڕی عبدالملك و عمری کوڕی عبدالعزیزیشیمان لەگەڵ دا بوو، من شەو لە لای عبدالملکی کوڕی عمر ماوە، کە لەو کاتەدا ژنی نەهێنابوو، مامەوە، کە لەو کاتەدا ژنی نەهێنابوو، نوێژی عیشمان کرد پێکەوە، پاشان هەریەکەو بەرەو پێخەفی خۆمان ڕۆیشتن، (عبدالملك)یش هەستاو چراکەی کوژاندەوە، دەستی کرد بە نوێژکردن کردن تا خەوم لێ کەوت.

کاتێ بەخەبەر هاتم دەبینم ئەم ئایەتەی قورئان دەخوێنێتەوە: ﴿أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ﴾ الشعراء ٢٠٥ـ ٢٠٧واتە: ئەی محمد دەبینی چەندان ساڵی تریش مۆڵەتی ژیانیان پێ بدەین و پاشان مردنیان بە سەردا بهێنن، چ کەڵکی هەیە بۆیان ئەو هەمووە ساڵەی ژیانیان؟

بەردەوام دەگریاو پاشان ئایەتەکەی دووبارە دەکردەوە، هەرکە لێ دەبووەوە، تاوام لێ هات ووتم: ئاوا بڕوات گریان لە ناوی دەبات، بۆیە بەدەنگی بەرز ووتم: (لا إله إلله و الحمدلله) وەك ئەوەی بەخەبەرێم، تاگریانەکەی پێ ببڕم، هەر هەستی کرد من بە خەبەرم بێ دەنگ بوو ئیتر نوزەی لەخۆی بڕی[١] ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

### ٢ـ زانست و زانیاری و تێ گەیشتنی:

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله خەڵکی کۆکردەوە تا ڕاوێژیان پێ بکات لە بارەی گەڕاندنەوەی ناهەقی و ستەمەکانی حەجاج بۆ خاوەنەکانیان، هەرکە ڕاوێژی بە یەکێکیان دەکرد دەیان ووت: ئەی ئەمیری

---

١ ـ مجموعة رسائل الحافظ إبن رجب الحنبلی(٢/ ٤٧٩)

باوەڕداران ئەوە تاوانێك بووەو لە سەردەمی تۆو بە دەستی تۆ نەکراوە، هەرکەسێکی تر هەمان وەڵامی بداتەوە، دەیوەستان بە پێوە، تا گەیشتە سەرەی (عبدالملك)ی کوڕی (عبدالملك)، بەڵام ئەو پێ ی ووت: ((باوکە گیان، هەر کەسێك بتوانێت نا هەقیەکانی حەجاج بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان و نەیکاتە هاوبەشی ئەوە لە تاوانەکانیدا))، عمریش ووتی: ئەگەر لە بەر ئەوە نەبوایە، کە تۆ کوڕی منیت دەم ووت: تۆ شارەزاترین کە سیت.

ئەوەی عبدالملك ووتی و ئەوەی باوکی بەڕاستی زانی هەروە ڕاست بوو، ئیمام ئەگەر بتوانێت ستەمی کاربەدەستانی پێش خۆی لاببات، پێویستە لە سەری لاییبات بەپێ ی توانای.[1]

(عمر و عبدالملك)ی کوڕی لەو زانایانە بوو، کە زانستی ناسینی خواو ترسان لێ ی و خۆشەویستی و پەرستنی گرێ ی دابوو لە گەڵ ناسینی خوا بە جۆری، کە حەڵال و حەرام و حوکمە شەرعی یەکان پیادە بکات دە پێکەوە.[2]

### ٣ــ غیرەتی لە فتوا دانی قورس و گراندا:

مەیمونی کوڕە مهران دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله ناردمی بەدوای من و مکحول و (أبی قلابە)و پێ ی ووتین: ئێوە چی دەڵێن دەربارەی ئەو شتانەی بە ستەمکاری لە خەڵکی سەنراون؟

مکحول وەڵامێکی لاوازی دایەوە، عمر بە دڵی نەبوو، ووتی: من دەبینم پە لەنەکەیت، عمر سەیرێکی منی کرد، وەك ئەوەی بڵێ فریام کەوە، منیش پێم ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، بنێرە بەدوای (عبدالملك)دا بیهێنە بۆ ئێرە، بەبێ ئەو کارت ناڕوات، کاتێ عبدالملك گەیشتە لایان، عمر پێ ی ووت: ئەی (عبدالملك) دەربارەی ئەو شت و مەکانەی، کە کاتی خۆی بە زوڵم لە خەڵکی سەنراوە ئێستا خاوەنەکانیان دەیانناسنەوەو هاتوونەوتەوە بۆیان، تۆ چی دەڵێیت؟ ووتی: من وا

---

١ ــ مجموعة رسائل الحافظ إبن رجب الحنبلي (٢/ ٤٨١).

٢ ــ هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

دەبینم، کە هەموویان بۆ بگێڕمەوە، ئەگەر وانەکەیت هاوبەشی ئەوکەسانەی لێیان سادندوون لە تاواندا.[١]

### ٤ـ مردنی دەختەوە بیری باوکی:

کوڕێکی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله مرد، عمر هات و لەلای سەری دانیشت و سەری هەڵدایەوەو سەیرێکی کردو فرمێسك بە خوڕ لە چاوی هاتە خوارەوەو، عبدالملكی کوڕی هات بۆ لای و پێ ی ووت: ئەی ئەمیر چیە ئەڵێ ی ئەم مردنە لە کارەکانتی کردویت؟ بەڵکو ئەوە خەریکی کارێکی ترە دوور لەو کارەی تۆ، وابزانە تۆش مرردویت و خۆڵیان کردوە بەسەر چاوتدا.

عمر رحمه الله بە بیستنی ئەو قسەیە دەستی کرد بە گریان، پاشان ووتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت کوڕی خۆم، وەڵاهی تۆبەرەکەتێکی زۆر گەورەیت بەسەر باوکتەوەو ئامۆژگاریەکانت سودێکی زۆر مەزنی هەیە بۆ ئەوانەی ئامۆژگاریان دەکەیت، وەڵاهی زۆر دڵتەنگ بووم بۆ براکەت، بەڵام هەرکەزانیم فریشتەی گیان کێشان هاتە ماڵەوەو ترساندمی هاتنەکەی، وەك بڵێ ی بینیم بەچاوی خۆم، پاشان ووتی: بڕۆن کفن و دفنی بکەن.[٢]

### ٥ـ نەخۆش کەوتن و مردنی (عبد الملك ی کوڕی عمر) رحمه الله.

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله چوو بۆ لای کوڕەکەی عبدالملك، کە لە جێگەدا کەوتبوو توشی نەخۆشی ـ طاعون ـ بوو بوو، پێ ی ووت: کوڕی خۆم ئێستا چۆنی؟ ووتی: ئێستا لە ڕاستیدام، ووتی: کوڕی خۆم بوونی تۆ لە تەرازووی چاکەکانمدا پێم خۆشتر لە بوونی من لە تەرازووی چاکەکانی تۆدا، (عبدالملك)یش ووتی: دەی باوکە گیان من وا لێ بێت ، کە تۆ پێت خۆش بێت پێم خۆشترە لەوەی وام لێ بێ، کە خۆم پێم خۆشە.[٣]

---

١ـ مجموعة رسائل الحافظ إبن رجب الحنبلي(٢/ ٤٨٨)

٢ـ هەمان سەرچاوە(٢/ ٤٨٧)

٣ـ هەمان سەرچاوە(٢/ ٤٩٥)

کاتێ (عبدالملك)ی گەنجی خواناس وای لێ هات نە خۆشیەکەی زۆری بۆ هێناو بە هۆیەوە گیانی سپارد، لە کاتی.

ناشتنیدا باوکی هاتە سەر گۆڕەکەی ووتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت کوڕی خۆم، بەڕاستی چاك بویت بەگەڵ باوکتدا، لەوکاتەوەی خوای گەورە تۆی پێ بەخشیوم دڵ خۆش و مەسرورم، بەڵام نا وەڵاهی ئێستا زیاتر دڵ خۆشم و بە تەمای پاداشتی خوام، کە تۆم داهێلاوەتەوە ناو گۆڕەکەتەوە، دەی ڕەحمەتی خوات لێ بێت و خوا لە گوناهەکانت خۆش بێت؛ پاداشتت بداتەوە بە چاکترین کردەوەت لە کوناهەکانیشت خۆش ببورێت، ڕەحمەتیش ببارێنێت بەسەر هەرکەسێکدا لێرەدا بێت یان نا، کە دووعاو تکایی خێرت بۆ بکەن و، هەموو ڕازین بە بڕیارو قەزای خوا خۆمان دەدەینە دەستی فەرمانەکانی، سوپاس بۆ خوای هەموو جیهانیان - آمین -[1]

پاشان نامەیەکی نوسی بۆ کاربەدەستەکەی لە کوفەو تیایدا قەدەغەی کرد کەس گریان و شیوەن بکات بۆ کوڕەکەی، هەروەك چۆن پێشتر خەڵکی عادەتیان پێوە گرتبوو پرسەو شیوەنیان بۆ پادشاو نەوکانیان دادەنا، لەونامەیە نوسیبوی: (عبدالملك)ی کوڕی ئەمیری باوەڕداران بەندەیەك بوو لە بەندەکانی خوا، خوا چاکی بۆ خۆی و بۆ باوکێشی کردبوو، ئەوندەی کە پێ ی خۆش بوو خوا ژیاندی، پاشان پێ ی خۆش بوو گیانی بکێشێت، ئەوەی بزانم لەگەڵ مرندا پەیوەستی هەبوو، تکایی دەستکەوتنی چاکەو خێری لە خوا داواکارم، پەنا دەگرم بە خوا لەوەی خۆشەویستم بۆ شتێك هەبێت پێچەوانەی خۆشەویستی خوا بێت، چونکە پێچەوانەی ئەوە دروست نی یە، لە تاقیکردنەوەکانی بۆم و چاکەکانی لگەڵمدا بەخششەکانی بەسەرمەوە[2]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: کاتێ (عبدالملك)ی کوڕی عمر گیانی سپارد، باوکی پێ ی ووت: ئەی کوڕی خۆم بەڕاستی تۆ لەوانە بوویت، کە خوای عزوجل دەفەرموێت:

---

١ـ مجموعة رسائل (٢/ ٤٩٥).
٢ـ هەمان سەرچاوە (٢/ ٤٩٦).

﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾ الكهف: ٤٦، من تکام وایە ئەمڕۆ تۆ بۆمن لەو پاش ماوە چاکانە بیت، کە لەلای خوا پاداشتی زۆر و هیوای گەورەم پێتە، وەڵاهی دڵم بەوە خۆشە، کە هەردەم بانگم دەکردی دەهاتی بەدەممەوە.[1]

عبدالملك رَحِمَهُ ٱللَّهُ لە تەمەنی (١٩) ساڵیدا گیانی بە خوای سپارد.[2] عمری رَحِمَهُ ٱللَّهُ زۆر ئەم کوڕەی بە دڵ بو جارێکیان پێ ی ووت: ئەی (عبدالملك) من هەواڵێکت پێ دەڵێم: نەخێر سوێند بە خوا هیچ لاوێکم نەدیوە لە تۆ خواناس تر بێت، یان لە تۆ شارەزاتر بێت، یان لە تۆ خوێنەوار تر بێت، یان نەمدیوە وەك تۆ کەمترین پێ هەڵکەوتنی هەبێت لە شتە بچوکەکان، یان گەورەکاندا.[3]

عمری کوڕی عبدالعزی دەڵێت: وەڵاهی لە بەر ئەوەنەبوایە، کە گومانی ئەوەم پێ دەبرا، کە هەموو کوڕێك لە بەر چاوی باوکی جوانە، من وای بۆ دەچووم، تۆ ئەی عبد الملك، کە شایانی خیلافەتی.[4]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: کاتێ(عبدالملك)ی کوڕی عمر دەمرێت، دەچێتە سەر گۆڕەکەی و زۆر وسف سەنایی دەکات، تا پیاوێك پێ دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر(عبدالملك)بمایە دوای خۆت دیاریت دەکرد بەجێ نشین؟ ووتی: نەء، پیاوەکە ووتی:ئەی کەواتە چۆن ئاوا باسی چاکەی دەکەیت،ووتی: ئەترسم لەبەر چاوم جوان بوبێت وەك چۆن هەموو کوڕێك لەبەرچاوی باوکی جوانە.[5]
مەیمونی کوڕی مەهرانیش دەڵێت: هەرگیز سێ کەسم نەبینیوە لە ماڵێکدا چاکترین کەس بن، لە عمری کوڕی عبدالعزیز و عبدالملكی کوڕی و موزاحیم ی هاوڕێیان.[6]

---

١ـ مجموعة رسائل (٢/ ٤٩٥).
٢ـ هەمان سەرچاوە (٢/ ٤٩٨).
٣ـ هەمان سەرچاوە (٢/ ٤٩٩).
٤ـ هەمان سەرچاوە (٢/ ٤٩٩).
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ هەمان سەرچاوە.

ئەوەبو خوێنەری بەڕێز بەروبومی ئەو پەروەردە زانستی و پڕۆگرامی یەی عمری کوڕی عبدالعزیز، کە منداڵەکانی لەسەر گۆش کرد بوو، ئەوەش نمونەیەکی ئەنجامی پەروەردەی ڕاست و دروست، دەی لە خۆت بپرسیوە تۆش دەبێت چۆن بکەیت لەگەڵ براو خوشکەکانتدا؟ یان لەگەڵ کوڕ کچەکانتدا؟[١]

## ژیانی لەگەڵ خەڵکی دا:

### ١ـ گرنگی دانی بە چاکسازی کۆمەڵگە:

گرنگی دانی بەچاکسازی کۆمەڵگەی زۆر گەورەبوو، هەوڵی دەدا هەرچی بەد ڕەوشتی و گەندەڵی یە هەڵیگرێت و نەیهێڵێت، لەو بارەیەوە نامەیەکی دوور و درێژی نوسی بۆ یەکێ لە کاربەدەستەکانی، وا ئێمەش لە بەر گرنگی سودەکانی هەندێ لە بڕگەکانی دەهێنین، کە تیایدا دەڵێت:

١ـ لە پاشان، هەرگیز خراپە لەناو هیچ گەلێکدا بڵاونابێتەوەو، ئەهلی چاکەش هەوڵی گۆڕینی نەدەن ئەوا خوای گەورە سزایەکیان دەدا، یان بەدەستی خۆیان، یان بەدەستی یەکێ لە بەندەکانی، خەڵکی هێشتا هەر پارێزراون لە سزاو زویر بوونی خوا، تادەستەی خراپەکاران سەرکوت کرابن، کاری حەرام تیاندا شاراوە بێت، هیچ خراپەیەك لە یەکێکیانەوە دەرناکەوێت مەگەر سزاکەی هەموویان دەگرێتەوە، هەرکاتێك تاوان و خراپە لە ناویاندا بە ئاشکرا ئەنجامدراو چاکەخوازان بەرگریان لێ نەکردن، ئەوا سزای خوا لە ئاسمانەکانەوە دادەبەزێت بۆ خراپەکاران و ئەوانەشی بێ دەنگ بوون لە ئاستیان، لە وانەیە بەهۆی بێ دەنگیان لە ئاستی خراپەکاری زووتر لە ناو بچن ئیتر با کارەکانی ئەوانیشی بەدڵ نە بێت، من نەم بیستوە لە قورئاندا خوا هۆزێکی لە ناو بردبێت، کە سێکی لێ دەرباز کردبن، مەگەر ئەو کەسانەی بەرگریان لە خراپە کردوە.

---

١ـ وەرگێر.

خوای(عزوجل) ئەگەر بەدەستی خۆی، یان بە دەستی یەکێ لە بەندەکانی لە ناویشیان نەبات خۆ دووچاری ترس و دڵەڕاوکێ و سەرشۆڕی و زویربوونیان دەکات، چونکە لەوانەیە خوا خراپەکار بە خراپەکار لە ناو بەرێت، یان ستەم کار بەستەم کار، پاشان هەردوولا بەئاگری دۆزەخ شاد بکات، دەی پەنا دەگرین بە خوا لە ستەمکاران بین، یان لەوانە بین دۆست و ئەحبابی ستەمکاران بین.

بیستومە خراپەکاری لە هەرێمە کەتدا زۆر بووە و بەد ڕەوشتان بێ خەم بوون، بە ئاشکرا کۆمەڵێ خراپەو بەدڕەوشتی یەك دەکەن کە خوا پێ ی ڕازی نی یە و، ڕازیش نابێت هەرکەس لەو وەزعە بێ دەنگ بێت، شتی وایش لە ناو هۆزەکێدا بڵاونابێتەوە، کە شەرم لە خوا بکەن و بترسێن لێ ی، لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەوان زۆرترو بەڕێزترن لە ئەهلی فیسق و فجور، کەسانی پێش ئێوە بەو حاڵە ڕازی نەبوون، بەوکارەش بەخششەکانی خوا بەردەوام نابێت لەسەرتان، بەڵکو وەك ئەوانە بن، کە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ﴾ الفتح: ٢٩، ﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖ﴾ المائـــدة: ٢٤، بەتەمەنم جیهادە لە پێناوی خودا، توندو تیژی نواندن لەگەڵ حەڕامکاراندا چ بەدەس، یان زمان و هەوڵدان لە گەڵیادا، ئیتر با باوکیشان بن، چونکە ڕێبازی خوا گوێڕایەڵی کردنیەتی، بیستومە کۆمەڵێکی زۆر لە ناتاواندا سستی دەنوێنن لە بەرگری کردن لە خراپەو فەرمان بە چاکەدا لەترسی ئەوەی لۆمەیان نەکەن و پێیان بگوترێت: فلان کەس ڕەوشتی بەرزەو خوێن تاڵ نی یە، بەکاری خۆیەوە خەریکە، خوای گەورە هەرگیز ئەو کەسانە لە ڕیزی ڕەوشت جوانان دانانێت، بەڵکو ڕەوشت نزم ترین کەسن، ئەوە خۆی لەبیر کردوە، نەك خەریکی خۆیەتی لە خوێن تاڵی وزەڕ ناشیرینی ڕزگاری نەبووە، بەڵکو تێ ی کەوتوە، چونکە ڕازی یە بەو وەزعەی خۆی تێدایە ئیتر کۆمەڵگەکەشی لە وەزعێکی دور لە خوایی یدا بژین و فەرمان بە چاکەو بەرگریی لە خراپە نەکەن.[1]

---

١ــ سیرة عمربن عبدالعزیز ابن عبدالحکم ل١٦٠.

لەم نامە گرنگەدا عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله سوننەت و ڕێڕەوی خوا ڕون دەکاتەوە، کە هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەویش ئەوەیە هەر کۆمەڵگەیەك گوناه و خراپەکاری بە ئاشکرا ئەنجام بدەن، ئەهلی چاکەو خواناسان دەست نەدەنە ڕێگایان و بەرگری، یان لێ نەکەن ئەوە دەبێت خوای گەورە یەکێ لەو سێ سزیانەیان داباریێنێتە سەر:

یەکەم: یان خوای عزوجل سزایان لە لایەن خۆیەوە بۆ دادەبارێنێت.

دووەم: یان سزاو ئەشنکەنجە بۆدەنێرێ، بەڵام لەسەردەستی هەر بەندەیەك خۆی مەبەستی بێت لەوانەیە سەر دەسەر دەستی ستەمکارە خوێن مژەکان، خوا تۆڵە لە بەد ڕەوشتان و سەرپێچی کەران بکاتەوە.

سێ یەم: یان خوای گەورە لەڕێگەی ترس و قات و قڕی و گرانی و سەر شۆڕی و جۆرەکانی تری خەشم قینی خۆیەوە تۆڵەیان لێ دەکاتەوە.

عمر رحمه الله لەم نامەیەدا ئەوە ڕۆشن دەکاتەوە، کە بێ دەنگ بوون لە ئاستی کاری حەرام و تاون کردنی ئاشکرا لە سوننەت و کاری هاوڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵکو خوای گەورە بەوە وەسفیان دەکات، کە توندو تیژین کەس بوون، لەگەڵ خەڵکانێکدا تاوان خراپەکاری بە ئاشکرا ئەنجام دەدەن.

ئەوەی ڕۆشن کردەوە، کە دەم چاو گرژو ترش کردن لە ئاستی گوناهکاران و سەرپێچی کارانداو هەوڵدان بۆ ڕێگری لێیان بەدەست و زمان ئیتر با نزیکترین کەسیشیان بن، ئەوەجیهادە لە پێناوی خوای تەبارەك و تەعالادا، فراوانکردنی بازنەی جیهاد بۆ ئەوەی ئەو لایەنەش بگرێتەوە وەك خوای عزوجل لە ئایەتی سورەتی (التحریم) دا دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾کەواتە جیهادکردنی دوو ڕوان ـ منافق ـلەڕێگەی ناڕەزایی دەربڕین و گفتوگۆو دەنگ وەرگرتن ئەم شتانەوە دەبێت.[1]

١ـ التأريخ الإسلامی (١٥، ١٦/ ١٢٠)

هـەموو نامـەکانی عمـری کـوڕی عبـدالعزیزرحمه الله بـۆ کاربەدەسـتەکانی سـەرجەم چاکـسازی کۆمەڵگـە بـوون، هـەروەك چـۆن (إبـراهیم کـوڕی جعفـر) لەباوکیـەوە دەگێڕنێتەوەو دەڵێت: نامەیەك عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله نەهاتووە بۆ (أبـو بکـری کوڕی محمدی کـوڕی عمـری کـوڕی حـزم)ە مەگـەریان هـەق وەرگرتنەوەیـەك، یـان زیندوکرنەوەی سـوننەتێك، یـان لابردنـی بیدعەیـەك، یـان دابەشـکردن، یـان دیـاری کردنی مووچەبوو، یان خێرێك بوو، ئەمەش بەردەوام بوو، تا لە دنیا دەرچوو.[1]

## ٢ـ ڕۆژی دوای خستنەوە بیری خەڵك:

عمـری کـوڕی عبـدالعزیزرحمه الله ڕۆژێـك وتـاری دەداو دەیـوت: مـن بـۆ شـتێك کـۆم نەکردەونەتەوە، کە خۆم دروستم کردبێت، بەڵکو سـەیری کاروبـاری ڕۆژی دوایتـان کرد، ئەو نەهامەتیانەی لە ڕێتاندایە، بۆم دەرکەوت ئەوانەی باوەڕیـان پـێ ی هەیـە گێل و بێ ئاگان لێ ی، ئەوانەشی بەدرۆی دەخەنەوە خەسارەت مەندو لـەناو چـون، پاشان هاتە خوارەوە لە سەر مینبەرەکە.[2]

ئـەم ووتـارە لەگـەڵ کورتەکەیـدا زۆر ڕەوان بێـژە، چـونکە یادخـستنەوەیەکی زیندووی ڕۆژی دوایی یە، لە پاش مـردن، ئەوکەسـەی بـاوەڕی بەزینـدوو بوونـەوەی پاش مردن و سزای گـۆڕو نـازوو نیعمەتـەکانی و لێپرسینەوەپاشـان، یـان بـۆ مـاڵی خۆشی هەتا هەتایی، یان بۆ نەگبـەتی بـەردەوام، کەچـی لەگـەڵ ئـەم باوەڕەیـشدا تێشوی بۆ ئامادە ناکات، و بەکردەوەی جوان و چاکە کـاری خـۆی بـۆ سـازناکات، دەی بەڕاستی گێل وسەر لێ شێواوە، بە جۆرێ عـەقڵی خـۆی بـەکار نـەهێناوە بـۆ مسۆگەرکرنی ئەوداهاتووە گرنگەلەگەڵ باوەڕیشی بەوەی، کە بەسەری دێت لەوێ.[3]

لە وتارێکی تریدا هەر لەبارەی یادخستنەوەی مردن و ڕۆژی دوایی، باسی ئەوەی کـردەوە بـۆ خـەڵکی، کـە مـرۆڤ بـۆ هەمیـشەی ژیـان دروسـت کـراوە، بـەڵام مـردن

---

١ـ طبقات إبن سعد (٥/ ٣٤٢).

٢ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن عبدالحکم لا ٤٢

٣ـ التأریخ الإسلامی (١٥، ١٦/ ١١٨)

گوێزراوەیە لەماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر، دەڵێت: ئێوەبە نەمری و هەمیشەیی لە دایک بوون، بەڵام مردن گوێزرانەوە لەماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر.[1]

لە وتارێکی یدا دەڵێت: ئەی خەڵکینە، دونیاو مۆڵەت پێدانەکانی لە خشتەتان نەبات، پاش کەمێکی تر بەجێی دەهێڵن و بۆ جێ یەکی تر کۆچ دەکەن، بۆ، خاتری خوا ئەی بەندەکانی خوا ـ خۆتان بپارێزن، فریایی بکەون بەکردەوەی چاك ـ پێش ئەوەی بمرن و بمرن بڕۆنە ژێر خاك نە، درێژی ڕۆژانی تەمەن دڵتان ڕەق نەکات، وەك ئەو هۆزانەتان لێ بێت، کە بانگ کران بۆ بەشی خۆیان، ئەوانیش کەمتەرخەمیان کرد، لە ئاکامدا پەشیمان بوونەوە لە سەر کەمتەۆخەمی یەکان.[2]

## ٣ــ ڕاستکردنەوەی تێ گەیشتنەکان:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لە وتارێکدا دەڵێت: پاشان، ئەی خەڵکینە، تەمەنی درێژ دڵتان ڕەق نەکات، ڕۆژی دوایتان لەلا دوور نەخاتەوە، هەرکەسێ مردنی هاتە پێشەوە، ئەوە قیامەتی یەتی، ڕەخنە قبوڵ ناکرێت، چاکەیش زیاد ناکرێت، مرۆڤ بێوەی نابێت ئەگەر بە پێچەوانەی سوننەت کاری کردبێت، گوێ ڕایەڵی هیچ مەخلوقێك ناکرێت، ئەگەر سەر پێچی پەروەدگاری تێدا بێت، ئێوە بەو کەسەی لە داخی زوڵم زۆری فەرمانڕەوایەکەی هەڵێدێت پێ ی وەڵێن: سەر کەش، کە لە ڕاستیدا فەرمانڕەوا زاڵمەکە هەقی خۆیەتی پێ ی بگوترێت سەرکەش، پاشان من بە نیازم کۆمەڵێ بابەت چارەسەر بکەم، کە زۆر نارەحەتن مەگەر خوا کۆمەك بێت، چونکە خەڵکی لەسەر پیر بووەو منداڵی لەسەر گەورە کراوە، زمانی نەتەوەکانی تری جگە لە عەرەبی لەسەر پاراو کراوە، تا وایان لێ هاتووە خەڵکی وەك شەرع و دین وەریان گرتوون، جگە لەو شتێ تر بەڕاست نازانن، پاشان ووتی: زۆر خۆشە لە لام، کە ماڵ و سامان و ناموستان بپارێزم، مەگەر لە مافدارانی خۆی، ئەمەش لە پشتی خوا ـ ولاقوە إلا بالله ـ[3]

---

١ــ الکتاب الجامع لسیرة عمر(٢/ ٤٤٨)

٢ــ هەمان سەرچاوە(٢/ ٤٤٩)

٣ــ سیرةعمر بن عبد العزیز لابن عبدالحکم لا ٤٢

عمر ﷺ لەم وتارەیدا باش ئەوەی مردن و ڕۆژی دوایی وەبیر موسڵمانان دێنێتەوە، پاشان باس لەوە دەکات، کە بێ وەیی تەواو لە شوێن کەوتنی پێغەمبەری خودایە ﷺ ئەمەش یەکێك لە دوو مەرجەی وەرگرتنی کردەوەی چاکەیە:

یەکەم: دڵسۆزی نواندنی تەواو بۆ خوا.

دووەم: شوێن کەوتنی سوننەت و ڕێڕەوی پێغەمبەر ﷺ ئەو بەم کارەی چارەسەری واقعێك دەکات، کە کردەوە کەم ناکات، ئەگەر(ئیخلاص)و دڵسۆزی لەگەڵ دا بێت، بەڵکو پێویستی بەوەیە لە سەر ڕێڕەوی پێغەمبەر بێت، چونکە لەو کاتەدا (بدعة) و شتی تازە تێکەڵ بە ئیسلام کرابوون و سەردەمی هاوەڵانیش ﷺ لە تەواو بوو بو، هەندێ کاربەدەست و والی خراپ پەیدا بوون، کە هەر سوننەتێکی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئارەزواتیاندا نە گونجایە ڕەدیان دەکردەوە.

## ٤ـ دەمارگیری هۆزایەتی نەهێشت:

عمری کوڕی عبدالعزیز ﷺ نامەیەکی نوسی بۆ (الضحاك)ی کوڕی (عبدالرحمن) وتیایدا پێ ی ووت: هۆی نوسینی ئەم نامەیەم ئەوەیە، کە باسی هەندێ لە پیاوانی دەوار نشینی (بادیە)م بیستوە، پیاوانێکی تر تازە بوون بە فەرمان ڕەوا و هەموو زیری و وشکیان پێوە دیارە و، زانستیان دەربارەی خوا کەمە، بەو بۆنەیەوە لە خشتە براون، لە خشتەبردنێکی گەورە، بەڵاو نەهامەتی خوایان لە بیر چۆتەوە، نیعمەت و بەخششەکانی خویان گۆڕیوە بە جۆرێك، کە هەقیان نەبوو وابکەن.

باسی کۆمەڵێ لەوانەم بۆ کراوە لە پشتی هۆزی (مضر)و (یەمەن) جەنگ دەکەن، وادەزانن دەبێت سەروکاری خەڵکی بکەن، دەی پاك و بێگەردی بۆ خوا، چەند دوورن لە سوپاس گوزاری نیعمەتەکانی خواوە، چەند نزیکن لە لەناوچوون و سەرشۆڕی بێ نرخی یەوە، دەی خوا لەناویان بەرێت! چ کۆیەکیان گرتووە، لەچ زەمان و زروفێکدا دەرچوون، خەریکی چ کارێکن، بەڵام خۆت باش دەزانیت، کە نەگبەت و خراپەکار هەر بەنیتەکەی بۆ تە خراپەکار، خۆ ئاگریش بەبێ هۆ ئامادە

نەکراوە، ئایا ووتەی خوای گەورەیان نە بیستوو، کە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ الحجرات: ١٠.

دەی لەگەڵ ئەوەشدا بیستوومە هەندێ کەس خەڵکی بۆ هاو پەیمانی بانگ دەکەن، خۆ لە ئیسلامدا هاوپەیمانەتی نەماوە، ئەگەر هاوپەیمانەتی یەکیش لە سەردەمی نەفامیدا بووبێت ئیسلام توندتری کردوە، هەردوو لای هاوپەیمان ویستوویانە پەیمانی خۆیان بەرنەسەر، ئەگەر لەسەر خراپەو تاونیش بووبێت، سەرپێچی خواو پێغەمبەری تێدابوبێت، هەرکە موسڵمان بوون لەو پەیمانانە خۆیان دارنی.

من هەرکەسێ ئەم نامەیەم دەبیستێ ئاگاداری دەکەمەوە، دەڵێم: هەرکەسێ قەلایەك بکاتە پاڵپشتی خۆی جگە لە خواو پێغەمبەرو موسڵمانان، ئەوا ئاگادار کردنەوە لە دوای هەموو ئاگادارکردنەوەو یادیان دەخەمەوە، یاد لە دوای یاد، ئەو خوایەیان دەخەنەوە یاد، کە رەشۆی هەموو شتێ بەدەستی ئەوە، ئەو خوایەی، لە خوێن بەرەکانی ناو لەشمان نزیکترە لێمانەوە.

من کەم تەرخەمیم نەکردووە لە ئامۆژگاری کردنتاندا، لەگەڵ ئەوشدا ئەگەر بزانم کەسێك لە خەڵکی ئیتر تاکەکەس بێت، یان هۆز بێت، یان هیچ گەلێك، دەیەوێت ئاوەکە لێڵ بکات و خراپە بەر بکات، بانگتان دەکەم بۆ جێ بەجێ کردنی ئامۆژگاری داواکاریەکانم، سەرکەوتنی ئاشکرای تێدایە، پاشان با چاکەکاران و ئەهلی باوەڕ بەزمانیان هاوکاربن، هەرچەندە زۆرێك لە خەڵکی تێ ناگەن، لە خوا داواکارم، کە نێوانمان و سۆزو خۆشەویستی بێت و، خۆشەویستیمان زیادو بەردەوام دەوام بکات والسلام.[1]

عمر رحمه الله لەم نامەیەدا چارەسەری لادانێکی ترسناك دەکات، کە لەو کاتەدا بەسەر کۆڵەگەی ئیسلامیدا هاتبوو، ئەویش ئەوەبوو تاقمێك لە موسڵمان، کە باوەڕ

---

١ـ سیرةعمر بن عبد العزیز لابن عبدالحکم لا ١٠٢، ١٠٦

لەدڵیاندا جێگیر نەبوو بوو، شارەزاش نەبوون لە زانستە شەرعیەکان دا و، هەندێ پەیوەندی سەردەمی نەفامیان زیندو کرد بوویەوە، وەك پەیوەندی خێڵایەتی و عەشیرە گەرایی.

هەریەکە لەوانە بڕیاری سەر خستنی هۆزەکەی هۆزەکەی دەدا ئیتر بەهەق، یان بەناهەق و ڕەوا، یان بەزوڵم و ناڕەوا.

ئەم مەسەلەیەش بەجورێ تەشەنەی کرد، تاوای لێ هاتبوو هەندێ لە جەنگاوەرانی ئیسلام بە پاڵنەری خێڵایەتی یەوە دەرچوون بۆ جیهاد، ئەوەش وای کرد کاروانی جیهاد بەرەو دواوە بگەڕێتەوە، وایشی دەکرد لەو گەلانەی ڕزگار کراو بوون، جار لەدوای جار ڕاپەڕین و سەر پێچی بەرپا بکەن.

وای لێ هات هەندێ لەو هۆزانە کەسێکی هۆزەکەی خۆیان دەکردە والی، ئەویش هەموو نەفەرەکانی ئەو هۆزەی خۆی دەهێنا پێشەوەو بۆ پۆستی جیا جیای پێ دا، ئەمەش وای کرد هۆزەکانی تر تورە بکەن و شۆڕش هەڵگیرسێنن لە دژیان، ئەمەش بە هۆی ئەوەوە بوو، کە پەیوەندی برایەتی موسڵمانان و ئیسلامەتی بخەنە ئەولاوە، کە هۆکاری سەرەکی بەختیاری پێکە ژیانی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی بوون، لە باتیدا پەیوەندی یەکانی سەردەمی نەفامیان دەهێنایەوە.[1]

### ٥ـ نەیدەهێشت لە حزوریدا بە پێوە بوەستن:

کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بووبە فەرمانڕەوا دەبینێ هەموو خەڵکەکە لە خزمەتی دا بە پێوە وەستاون، ئەویش پێ ی ووتن: ئەی کۆمەڵانی خەڵکی موسڵمانان، ئەگەر بە پێوە دەمێننەوە بائێمەش هەڵسینەوە، ئەگەر دادەنیشین ئێمەش دادەنیشی، بەڵکو خەڵکی تەنها لە خزمەت پەروەردگاریاندا بە پێوە دەوەستن، خوا کۆمەڵێ فەرزو سوننەتی داناوە، هەرکەسێ جێ بە جێ یان بکات،

١ـ التأريخ الإسلامی (١٥، ١٦/ ١٢٤)

دەگاتە سەرفرازان و هەرکەسیش وازیان لێ بهێنێ دەچێتە ڕیزی لە ناوچوان.[١]

عمر رحمه الله بەم کارەی ویستی هەموو ئەو ڕەوشت و نەریتانەی، کە لە قەیسەری ڕۆم و کیسرای فارسەوە مابوونەوە، لایبەرێت و ئوممەتی ئیسلام بگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی جێ نشینە ڕاشیدەکان، ئالێرەدا دووپاڵنەری بەهێز سەرکوت دەکات، کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ خۆشەویستی هۆزەکەی.

یەکەم: حەزی مرۆڤ لە خۆ دەرخستن و داسەپاندنی دەسەڵات هریبەت خستنە ناودڵی خەڵکی یەوە.

دووەم: ویستی هۆزەکەی لە سەرمانەوەی ئەو نەریتانە، بەسوك ڕوانین بۆ عمر لەوەی، کە ئەو نەریتانەی نەدەهێشت و لایدەبردن.

بەڵام بەهۆی لێبڕان و باوەڕی بتەویەوە توانی زاڵ بێت بەسەر ئەم دوو پاڵنەرەدا، ئەو شتانەی پاڵیان پێوەنا بۆ خۆ بەکەم زانین - تواضع — لا بردنی ڕواڵەتە دونیایەیی یەکان، ئەو ترسە گەورەیەی لە خوای گەورەو چاوەڕوانی پاداشتی ڕۆژی دوایی و پشت گوێ خستنی ژیانی دنیا.

ئەم پاڵنەرەش بە هێزترە لە کێشکەرەکانی سەرزەوی و، عمر سەرکەوت لە بواری لە غاوکردنی ئارەزواتەکانی خۆی و بێدەنگ کردنی خاوەنی ڕواڵەتە هەڵخەتێنەرەکان، ڕاستکردنەوەی بۆ چونەکانی کۆمەڵگە لە بواری ئەوەی، کە پێویستە لە سەر کاربەدەستان، پەیوەندی نێوان ئەوان و میللەت.

مەبەست لە ووتەکەی عمر، کە دەیووت: کۆمەڵێ شتی فەرزکردوە لەسەرتان، بۆ ڕوون کردنەوەی هۆکارەکانی بەختیاری و نەهامەتی لە دونیاو ئاخیرەتدا، هەرکەسێ جێ بەجێ یان بکات دەگاتە کاروانی لەخواترسان لە دونیاو هاوڕێ چاکی بۆ دروست دەبێت، لە ڕۆژی ڕەستاخێزیشدا ڕەزامەندی خواو بەهەشتی نەبڕاوە لە پێشوازیاندایە[٢]

---

١ـ تأریخ دمشق لة التأریخ الإسلامی (١٥،١١٤) وەرگیراوە.

٢ـ التأریخ الإسلامی (١٥، ١٦/ ١١٥)

**٦ـ ڕێزلێنانی لەچاکەکاران:**

إبن کثیر دەڵێت: کوڕێکی قەتادەی کوڕی نوعمان - هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ وەفدێکدا دێننە خزمەت عمری کوڕی عبدالعزیز ئەویش لێ ی دەپرسێت: تۆ کێیت؟

کوڕی قەتادەش بەشیعرەوە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت:

منم کوڕی ئەو کەسەی لەغەزادا چاوی دەرهات... مصطفی بەدەستی پیرۆزی خۆی خستی یەوە جێگاکەی خۆی... دەی چەند جوان بووبێت ئەو چاوە، دەی چەند جوان بووبێت ئەو دەستە.

عمریش بەدێڕە شیعرێك وەڵامی دایەوە ووتی:

تلك المكارم لا قعبان من لبن      شيباً بماء فعادا بعد أبوالاً

پاشان ڕێزی لێ گرت و خەڵاتی باشی کرد.[1]

لەم چیرۆکەدا هەڵوێستی ئەمیری باوەڕداران عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله مان بۆ دەردەکەوێت، لە ڕێز لێنان لە کوڕانی هاوەڵە بەڕێزەکان، بەتایبەت کوڕەکەی قەتادە رضي الله عنه کاتێ خۆی ناساند و باسی ئەو ڕوداوە ترسناکەی بۆ عمر کرد، کە چۆن جەنگێکی لەگەڵ بێ باوەڕاندا کردبێت، بەڕادەیەك چاویان دەرهێنابێت و بەکوڵمیدا شۆڕبێتەوە، عمریش چۆن ڕێز لەخزمەتکارانی پێشینی ئەم ئیسلامە دەگرێت و ڕێز نەك لە خۆیان، بەڵکو لە کورو نەوکانیشیان دەگرێت، ئەو هاوەڵە مەزنەش بەهرەمەند بوو بەنواندنی موعجیزەیەکی پێغەمبەری خوداﷺ لە گەڵیدا.[2]

هەروەها یەکێکی تر لە ڕێز لێنانەکانی لە ناودارو پیاو ماقوڵە صاڵحەکان، ڕێزلێنانی بوو لە(زیاد)ی مەولای (إبن عباس)، زیادو دەستەیەك لە هاوڕێکانی هاتن بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز ولە بەر دەرگا خەڵکێکی زۆر وەستابوون عمر بە تەنها ڕوخسەتی زیادی دا بێتە ژوورەوە، زیادیش لە بیری چوو سڵاوی خەلافەتی لێ

١ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزی لا ٩٦.
٢ـ التأريخ الإسلامی (١٥، ١٦/ ٢٣)

بکات، هەر کە بیری کەوتەوە خێرا پێ ی ووت: سڵاوت لێ بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، عمریش پێ ی ووت: سڵانەکردنەکەی یەکەم جارت هیچ عەیببێکی نەبوو بۆم –عمر رحمه الله– لە تەختی خەلافەت دابەزی و لەسەر زەویەکە دانیشت ووتی: من لەوە زۆر گەورەترم، کە لە جێگەیەك دابنیشم لە جێگەی زیاد بەرزتربێت، پاش ئەوەی زیاد کاری سەردانەکەی تەواو بوو نیازی ڕۆیشتنی کرد، عمریش فەرمانی کرد بۆ بەرپسی (بیت المال) و پێ ی ووت: دەرگایی خەزێنەی موسڵمانان بخرە سەر پشت وبەجێ ی بهێڵە با زیادو هاوەڵەکانی چەندیان پێ خۆشە لێ ی ببەن، بەر پرسی(بیت المال) سەیرێکی زیادی کردو سەری سوڕما، کە ئەمە کەی شایستەی ئەوەیە دەرگای (بیت المال) ی بۆ بخرێتە سەر پشت ــ لەو کاتەدا نەیدەناسی ــ ودەرگاکەی بۆ کردەوە، زیاد خۆی ڕۆیشتە ژوورەوە هەشتاو شتێك، یان نەوەدو شتێك درهەمی لە خەێنەکە دەرهێناو بەشی کرد لە خۆی و هاورێکانی.

کاتێ بەرپرسی دارایی ئەوەی بینی ووتی: ئەمیری بڕواداران خۆی دەزانێت (بیت المال) بۆکێ دەخاتە سەر پشت.[1]

ئەم ڕداوە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر تەوازوع و خۆ بەکەم زانینی عمر رحمه الله و ڕێز لێنانی لە زاناو خواناسەکان، ئەوەتا گرنگ نەبوو لەلای نازناوی بەخەلافەتەوە ــ کە سەرەك کۆماری یە بانگ بکرێت ــ کە بەرزترین نازناوە لە لای موسڵمانان، پلەو پایەش فیتنەیە، ئەو کەسانە دەکەونە داوییەوە، کە هەردەم بە دوای شورەت و پلەو پایە ڕادەکەن.

بەڵام باوەڕە بتەوەکان هەرگیز کەسایەتیان ناگۆڕێت لەگەڵ بەرزترین پلەو مەقامدا، بەڵکو جاران چۆن بوون هەر بەو جۆرەدەمێنێتەوەو خۆ بەکەم زانینەکەیان لە دەست نادەن و هەروادەبن، نەخێر، بەڵکو هەندێ جار زیاتریشی دەکەن، چونکە خەڵکی ڕێزیان لە ڕادە بەدەر دەگرن.

لە لایەکی ترەوە ئەو دابەزینەی عمر بۆ سەر زەویەکە ئەو پەڕی ڕێز لێنانی یەتی

---

١ــ سیرةعمر بن عبدالعزیز لابن عبدالحکم ل٥٢. التأریخ الإسلامی (١٥، ٢٤)

لەو زانا مەزنە خواناسە، کە (زیاد)ی کوڕی(أبی زیاد)بوو، کە(خزمەتکاری ئازادکراوی عبداللهی کوڕی عەیاش بووﷺ، ئەوتا هەربەوەی، جاران بەندەبوو، هیچێك لە پلەو مەقامی کەمی نەکرد، چونکە ڕێزو شەرەف بە زانست و تقوایە، نەك بە پلەو مەقام و نژاد.

ئەو هەڵوێستەی زیادیش، کە سەر پشك کرا چەندی دەوێ لە(بیت المال) بیبات، کەچی ئەندازەیەکی زۆر کەم پارە بۆخۆی و هاوڕێکانی دەبات، ئەمەش ئەو پەڕی خۆ بەکەم زانین و خۆ پارستنە لە حەرام - الورع -

چونکە کاتێ دەروونەکان گەورەبوون و عەقڵەکان لەکار دابوون ئەوا مرۆڤ خۆی دەپارێزێت لە پارەوپول و تەماعی دونیا، کە دەروون نزمە بچوکەکان هەڵپەهەڵپی بۆ دەکەن، بەڵام ئەو چاوی بەرزتر دەڕوانێت بۆ خۆشی قیامەت و بەهەشتی نەبڕاوەی خوا دەڕوانێت، کە گەورە پیاوان و دەروون بەرزەکان خۆیانی بۆ دەکوتن.[١]

## ٧ـ منداڵێکی ژیر لە خزمەت خەلیفەدا:

یەکێ لەو وەفدانەی، کە بۆ پیرۆزبای خەلافەت هاتن بۆلای عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله وەفدێك بوو لە حیجازەوە هاتبوون، منداڵێکیان دانابوو لە باتی ئەوان قسەبکات، کاتێ هەستایە سەر پێ و ویستی دەست بکات بەقسەکانی، عمر ئاماژەی بۆ کرد پێ ی ووت: واز بێنە بچکۆل با کەسێکی لە تۆ گەورەتر قسەبکات، منداڵەکەش ووتی:وازبێنە ئەی ئەمیری باوەڕداران، مرۆڤ بەدووشت گەورەیە بەدڵ و زمانی، ئەگەر خوای گەروە زمانێکی پاراو و دڵێکی وریای بە هەرکەسێك بەخشی ئەو وای لێ کردەوە شایەنی قسەکردن بێت، ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەگەر حیساب بۆ تەمەن بکرێت، ئەوا لەناو ئوممەتت زۆر بەتەمەن تر هەیە لە تۆ شایانی ئەو جێگایەی تۆبن.[٢]

١ـ التأريخ الإسلامي (١٥، ٢٤)
٢ـ النموذج الإداري لا ٧٩.

عمر رحمه الله پێ ی ووت: دەی باشە فەرموو قسە بکە بچکۆل، منداڵەکەش ووتی: بەڵێ باشە ئەمیری باوەڕداران، ئێمە وەفدین و بۆ پیرۆزبایی هاتوین، نەك بۆ ڕێز شکاندن و نەهامەتی، لە وڵاتەکەی خۆمانە هاتووین، سوپاسی ئەو خوایە دەکەین، کە تۆی پێ بەخشیووین، نە بەتەماحی شتەوە، نە لە ترسان هاتووین، چونکە سامان و بەخششی تۆگەیشتۆتە لای ئێمە، ئێ لە لایەن تۆشەوە ئەمین و بەختەوەرترین کەسین، چونکە دادپەروەربویت بواری زوڵم ستەمیان بۆ نەهێشتوینەتەوە.[1]

عمر رحمه الله زۆر سەرسام بوو بە زانست و ڕەوان بێژی ئەو منداڵە، بۆیە هانی دا زیاتر قسە بکات، زیاتر متمانەی تێدا دروست ببێت بە خۆی و غیرەت پەیدا بکات، تا ئەم هەڵوێستەش ببێتە هەڵوێستبێکی پەروەردەیی بۆ منداڵەکە لە حزوری ئەمیری موسڵماندا، لە بەر ئەو هۆیە داوای ئامۆژگاری لێ کردو پێ ی ووت: ئامۆژگاریمان بکە بژکۆل بەڵام بەکورتی.

منداڵەکەش ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران خەڵکانێك هەن خەڵەتاون بە نەرم و نیانی خوا و هیوا درێژی و وەسف و سەنای خەڵکی بۆیان، دەی تۆ نەکەی نەرم نیانی خواو تەمەن درێژی خۆت وەسف و سەنای خەڵکی بتخەڵەتێنێت، لە خشتەت بەرن.

پاشان عمر رحمه الله دەربارەی تەمەنی پرسیاری لێ کرد دەبینێ (١٣) ساڵانە بۆیە شیعرەوە ووتی:

تعلم فليس المرء يولد عالماً     وليس أخو علم كمن هو جاهل
وإن كبير القوم لا علم عنده     صغير إذا إلتفت إليه المحافل

---

١ـ مروج الذهب(٢/ ١٩٧)

## ٨ــ مریشکەکانی دەدزن:

عمـری کـوڕی عبـدالعزیزرحمه الله بـەردەوام بـەدوا داچـونی کاروبـاری موسـڵمانانی هـەبووە، هـەردەم دەرگاشـی لەسـەر پـشت بـووە بـۆ پێویـستی دەنـگ و باسـیان، هەرنامەیەکی لە هەر جێگەیـەك لـە هـەر موسـڵمانێکەوە بـۆ بهاتایـە یەکسەر دەدرا دەستی خۆی و کـەس بـۆی نـەبوو پـێش ئـەو بیخوێنێتـەوە، جارێـك نامەیـەکی لـە ئافرەتێکی ڕەش پێستی میسری وە پێ گەیشت، کە کۆنە کـەنیزەکی (ذی أصبح) بووە، لەو نامەیەدا بۆی نووسیبووی: دیواری حەوشەکەم نزمە توانام نی یە بـەرزی بکەمەوە لە بەر ئەوە بە ئاسانی مریشکەکانم لێ دەدزن.

عمری کوڕی عبدالعزیزیش لەوەڵامدا نوسی (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) لە بەنـدەی خـوا ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆ (فەرتونـەی ڕەش) ناکـەتم پـێ گەیـشت، کـە تیـادا باسـی نزمـی دیـواری حەوشـەکتانت کـردووە، گوایـە بـە ئاسـانی دز دوتوانێـت، بقونێتـە ماڵـەوەو مریـشکت لێ بـدزێت، ئـەوا منـیش نامـەم نووسـیوە بـۆ (أیـوب)ی کـوڕی (شرحبیل)، ــ کە بەرپرسـی نوێـژو جـەنگ بـوو لەمیـسرـ پـێم ووتـوە: بـۆت چـاك بکاتەوەو ئیتر (إن شاء الله) ئەو ترسەشت نەمێنێت.

ئەمەش دەقی نامەکەی(عمر)ە بۆ کوڕی شەرحەبیل و پێ ی دەڵێت: لە بەنـدەی خواوە بۆ ئەمیری باوەڕداران بۆ ئەیوبی کوڕی شەرحەبیل، پاشان(فرتونة السوداء) کە کۆنە کەنیزەیەکی (ذی أصبح)نامەیەکی بۆ ناردووم سـکاڵای ئـەوە دەکـات، کـە دیواری حەوشەکەی نزمەو مریـشکی بەئاسـانی لێ دەدەزن، داوا دەکـات بـۆی بـەرز بکەینەوە، هەرکە ئەم نامەیـەت پـێ گەیـشت دەمـەوێت هـەر بەدەسـتی خـۆت ئـەو دیوارەی بۆ هەڵبچنیت، ئەیوبیش خێرا بەهەڵە داوان لەهـەداوان سـواری وڵاخەکـەی بوو خۆی گەیاندە شاری (جیزة) هەواڵی ئەوژنەی پرسی و دەبینێ پیرەژنێکی ڕەش پێستی هەژارەو نامەکەی عمری کوڕی عبدالعزیزی دایە دەستی و دیوارەکەشی بـۆ بەرز کردەوە[1].

---

١ــ سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن عبدالحکم ل١٦٢ــ١٦٤.

**٩ــ خەمی موسڵمانەكانی دەخوارد:**

نامەیەكی نووسی بۆ ئەسیرەكانی موسڵمانان، كە لە بەندیخانەكانی ڕۆحدابوون لە(قوستەنتینیە) تیایدا پێ ی ووتن: ئێوە خۆتان بە دیل نەزانن؟ پەنا بەخوا! نەخێر، بەڵكو ئێوە لەپێناوی خوا بەند كراون، بشزانن من یەك شت لەناو موسڵماناندا دابەش ناكەم، تا چاكترینی لە پێشەوە نەدەم بەكەسو كارەكانتان، ئەوامن یەكی(٥) دینارم بۆ ناردن، ئەگەر لەوەش نەترسامایە، كە تاغوتەكەی ڕۆم گلی دەداتەوە بۆ خۆی زیاترم بۆ دەناردن، فلان كەسی كوڕی فلان كەسم ناردووە بۆ لاتان، تا نێرو مێ گەورەو بچوك بەندەو سەربەستان بەڕەلا بكات، هەر چەندی داوا بكەن دەیدەم، دەی مژدەتان لێ بێ، پاشان مژدەتان لێ بێت والسلام.[١]

لەم نامەیەدا ڕەوشت بەرزی و هەست بڵندی عمرمان بۆ دەردەكەوێت، وەك نمونەی پێشكەوتوو لە حوكمڕانی موسڵمانی لە خواترس، لە پارستنی مافی خەڵكیدا لە خواترساو بەوپەڕی دڵسۆزی و ئەمانەتەوە ڕەچاوی كردوە، بە جۆرێك، كە دڵنەوای دیلە موسڵمانەكانی بەردەستی ڕۆمەكان دەكات، بەو پاسەوانانی سنوری ئیسلامی دوون، كە لە پێناوی خوا خۆیان زیندانی كردووە، بەم كارەیان پاداشتی سنور پارێزان هەیە ـ المرابطین ـ

لەگەڵ ئەم دڵنەوایی كردنە دەرونی یە گردنگەدا، بە پارەوسامانیش دڵنەوای دەكردن و كۆمەكی دەكردن، لە لایەكی تریشەوە خەمی ماڵ و منداڵی لە دڵدا نەهێشتن، ئاگادری كردن، كە ئەم كە ژیانی ماڵ و منداڵەكانی مسۆگەر كردوون؛ هەروەك پەیمانیشی پێدان، كە ئەو پەڕی هەوڵ دەدات بۆ ئازاد كردنیان، ئەم هەڵسوكەوتە بەڕێزانەیە شایانی ئەو دیلانە بوو، كە لە پێناوی خودا دیل كراون بۆ پارێزگاری لە ئیسلام و سەرخستنی لەماڵ دەرچوون.[٢]

---

١ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن عبدالحكم ل١٦٢ـ١٦٤.

٢ـ التأریخ الإسلامی (٧٧،١٥)

## ١٠ـ قەرزی قەزاران دەبژێرێت:

نامەی بۆ کاربەدەستانی نووسی و تیایدا پێ ی ووت: قەرزی قەزاران ببژێرن، پێ ی وون: ئەی ئەگەر قەرزارێکی موسڵمان خانوی هەبێت و خەزمەتکاریشی هەبێت و وڵاخی سواریشی هەبێت و کەل و پەلی مالیشی هەبێت، عمر رحمه الله لەوەڵامدا ووتی: ئەو پیاوە دەبێت خانووی هەبێت تیایدا بژی و خزمەتکاری هەبێت، هەندێ کاری لەکۆڵ بکاتەوە، ئەسپێکیشی هەبێت بۆ جیهاد کردن و کەل و پەلیشی هەبێت لە ناو ماڵدا، لەگەڵ ئەمانەشدا قەرزار بوو، هەرچی قەرزی لە لایە بۆی ببژێرن.[١]

لەم هەواڵەدا ئەمیری باوەڕداران عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله فەرمان دەدات بە بژاردنی قەرزی ئەو کەسانەی، کەخانوو دارو وڵاخ دارو خزمەتکاریان هەیە، لە ماڵیشدا لە هیچیان کەم نی یە، ئەمەش دیمەنێکی مەزنە لە بەزەیی و سۆز و دڵنەوایی حاکمی موسڵمانان و گرنگی دانی بەکاروباری گەلەکەی، پێشەوا داد پەروەرەکانیش هەربەو جۆرە دەکەن و سامان ئاوا خەرج دەکەن، بە جۆرێ هەژاران دەوڵەمەند دەکەن و نارەحەتی ژیانی لەسەر ئاسان دەکەن، دیلی موسڵمانان ئازاد دەکەن و دەستگرۆیی نەدارەکانیشیان دەکەن و ناتەواوی یەکانیان تەواو دەکەن.[٢]

## ١١ـ عمر ودیلە نابینایەکەی لای ڕۆم:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله نوێنەرێکی نارد بۆ لای گەورەی ڕۆم، لەوێ بە ناو سەربازگەکەیاندا دەگەڕا، چاوی بەم لاو بەم دەگێڕا، دای بەلای پیاوێکدا دەبینێ بەدەم گەنم دەهاڕینەوە قورئان دەخوێنێت، کابرا ڕۆیشت بۆ لای و سەلامی لێ کرد، بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە و دوبارە سەلامی لێ کرد، بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە دوبارەو سێ بارە سڵاوی لێ کردەوە، ئەویش لە وەڵامدا ووتی: جا سەلام و ئاشتی لەم وڵاتەدا هەیە؟ پاشان ئەویش پێ ی ووت: کەمن نوێنەری عمری کوڕی

---

١ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (لابن عبدالحكم) لا(١٦٢ـ١٦٤).

٢ـ التأريخ الإسلامي (١٥،٧٧)

عبدالعزیزم بۆ لای سەرکردەی ڕۆم، پێم ناڵێییت مەسەلەی تۆ چۆنە؟ کابراش ووتی: من لە فلان جێگەدا دیل کرام و هێنامیان بۆ لای گەورەی ڕۆمەکان ئەویش داوای لێکردم ببم بەگاور، منیش بەگوێم نەکرد، ئەویش هەڕەشەی لێ کردم و ووتی: ئەگەر نەبیت بە گاور هەردوو چاوت هەڵدەکۆڵم، بەڵام من دینەکەم لەلا خۆشەویست تربوو لە چاوەکانم و ئەویش ئاوای لێ کردم، کە دەمبینی هەموو ڕۆژێ هەندێ گەنمم بۆ دەنێرێت و خۆم دەی هاڕم و دەیکەم بەنان و دەیخۆم.

نوێنەری عمر گەڕایەوە بۆ پایتەختی خەلافەت هەواڵی پیاوە نابینایەکەی بۆ گێرایەوە بینیم فرمێسك لە چاوەکانی ئەمیری باوەڕداران بەخوڕ دەهاتە خوارەوە، پاشان فەرمانی دەرکردو نامەیەکیان بۆ نوسیی و تیایدا بەگەورەی ڕۆمەکانی ووت: هەواڵی فلانم پێ گەیشتووە وەسفی تەواوی بۆ کرد، من سوێند بە خوای گەورە دەخۆم، کە ئەگەر بۆم نەنێریتەوە سوپایەکت بۆ دەنێرم، کە سەرەتاکەی لای تۆ بێت کۆتایەکەی لای من بێت، نوێنەرەکە گەڕایەوە بۆ ناو سوپای ڕۆمەکان و سەرکردەکەیان بە سەر سوڕمانەوە ووتی: چی بوو خێرا گەڕاییتەوە؟! ئەویش نامەکەی عمری کوڕی عبدالعزیز ی دایە دەستی، کاتێ خوێندیەوە ووتی: چۆن دەیەڵێن، ئەو پیاوە صالحە هەستێ بەوکارە، بەڵکو ئەو دیلەی بۆ دەنێرینەوە، دەڵێ: لەوێ چەند ڕۆژێك مامەوە چاوەڕوانی دیلەکەم دەکرد، کەی بمدەنێ و بیبەمەوە، بۆ ئەو مەبەستە چوومە لای سەرکردەکە دەبینم لەسەر کورسی دابەزیوەتە سەر زەویەکە و زۆر بێ تاقەتەو بەناو چەوایدا غەمباری دیاربوو، ڕووی تێکردم و ووتی: دەزانیت بۆچی وام بەخۆم کردوە؟ ووتم: نەخێر شتەکە لەلام زۆر سەیربوو ، ووتی: هەواڵم پێ گەیشتووە، کە پیاوە صالحەکە لە دنیا دەرچووە- مەبەستی عمری کوڕی عبدالعزیز بوو بەو هۆیەوە ئاوام بەسەر خۆم هێناوە، پاشان ووتی: هەرکاتێ پیاوچاك و صالح لەناو هۆزێکدا بێت، کە خراپ بن، ئەوە خوای گەورە نایەڵێ زۆر بمێنێتەوە لە ناویاندا، دەیگەڕێنتەوە بۆ لای خۆی، دەڵێ: منیش ووتم: دەی ڕێگام بدە بڕۆمەوە بێ هیوابوو لەوەی دیلەکەی پێ بداتەوە،

سەرکردەکەش ووتی: ئێمە فەرمانەکەی جێ بەجێ ناکەین لە ژیاندا و لە پاش مردنی بیشکێنین، نابیناکەی لەگەڵ نوێنەرەکەدا ناردەوە.[1]

## ١٢ــ خانمێکی عێراقی:

لە عێراقەوە ئافرەتێك کەوتە ڕێ بەرەو لای عمری کوڕی عبدالعزیز، کاتێ گەیشتە بەر دەرگای ماڵەویان و پرسیاری کرد: ئایا ئەمیری باوەڕداران دەرگاوانی هەیە؟ ووتیان: نەخێر، ووتی: ئەمەم پێخۆشە، پاش ڕێ پێدان ڕۆیشتە ژوورەوەو دەبینێ (فاطمة) دانیشتووەو خەریکی شیکردنەوەی لۆکەیەکەیە، سڵاوی لێ کردو (فاطمە)یش وەڵامی دایەوەو پێ ی ووت: فەرموو وەرە ژورەوە، کاتێ چووە ماڵەوە دانیشت و چاوێکی گێڕا بە ماڵەکەدا و هیچ شتێکی وای نەکەوتە بەر چاو، کە نرخێکی وای هەبێت، هاواری کرد: من هاتووم بۆ ئەوەی ماڵەکەم ئاوەدان بکەمەوە لەم ماڵە وێرانەیە؟! (فاطمة) ش لەوەڵامدا پێ ی ووت: ئەم ماڵە وێران بووە، تا ماڵی کەسانی وەك تۆ ئاوەدان ببێتەوە، لەو کاتەدا عمر رحمه الله هاتەوە بۆ ماڵ و ڕۆیشت بۆ لای بیرەکەیان و دەولچەك ئاوی دەرهێناو ئاوڕشێنی حەوشە خۆڵەکەیانی پێ کردو هەر سەیری(فاطمة)ی دەکرد، ژنە میوانەکەش نەیزانی ئەوە ئەمیری باوەڕدارانە-بۆیە بە فاطمەی ووت: خێرت داپۆشە لەبەر چاوی ئەم کابرا ئاوڕشێن کەرە، چونکە دەبینم زۆر سەرت دەکات! فاطمەش ووتی: ئەوە ئاوڕشێن کەر نییە، ئەوە ئەمیری باوەڕدارانە.

دەڵێ: پاشان عمر سەلامی لێ کردن و ڕۆیشتە ژورەکەی خۆی، بەرەو شوێنی نوێژخوێندنەکەی ڕۆیشت و دەستی کرد بە نوێژکردن، پاشان دەربارەی ئەو ژنە پرسیاری کرد، فاطمەیش ووتی: ئەمەیە خۆیەتی، عمر رحمه الله ڕۆیشت هەندێ ترێ ی هێناو چەند بۆڵێکی جوانی هەڵبژارد و خستی یە بەدر دەستی ژنەکە ڕوی تێ کرد ووتی: چی پێویستی یەکەت هەیە بیڵێ؟

---

١ــ سیرة عمربن عبدالعزیز لابن عبدالحكم. لا ١٦٨.

ژنەکەش ووتی: ئافرەتێکم لە عێراقەوە هاتووم، پێنج کچ هەیە هەموویان (كُسلٌ كُسدٌ) واتە: بێ دەرامەت بێ ئابوری ــ و هاتووم بۆ ولآت تا بە چاوی بەزەیەوە لایەکیان لێ بکەیتەوە، عمریش بەم گریانەوە ووتی: (کسل کسد) پاشان قەڵەم و مەرکەبەکەی هێناو نامەیەکی نووسی بۆ والی عێراق، بەژنەکەی ووت: ناوی کچە گەورەکەیان چی یە؟ پاشان موچەی بۆ دیاری کرد، خانمەکەش سوپاسی خوای لەسەر کرد، پاشان ناوی سێ یەم و چوارەم و پێنجەم پرسیاری کرد و خانمەکەش هەر سوپاسی خوای دەکرد، موچەی بۆ ئەوانیش دیاری کرد و کاتێ موچەی هەموویانی دیاری کرد لە خۆشیاندا تێك چووبوو هەر دوعای خێر پاداشتی لە خوای گەورە بۆ دەکرد.

پاشان عمررحمه الله دەستی بەرزکردەوەو ووتی: هەتا تۆ سوپاس گوزاربوویت ئێمەش هەر مووچەمان بۆ کچەکانت دیاری دەکرد، دەی تۆش بەو چوار کچەت بڵێ: بەشی خوشکی پێنجەمیان بدەن، خانمەکەش نامەکەی هێنایەوە بۆ عێراق و دایە دەستی والی عێراق، کاتێ نامەکەی دایە دەستی والی، والی دەستی کرد بە گریانێکی بە کوڵ ووتی: ڕەحمەتی خوا لە نوسەری ئەم نامەیە، ژنەکەش ووتی: بۆ مردووە؟ ووتی: بەڵێ، ئیتر ئەو ژنە هاوارو سەدای گریانی لێ بەرز بوویەوە ویستی بڕواتەوە، والیش پێ ی ووت: مەڕۆ هەرگیز نامەی عمر ڕەت ناکەمەوە، هەرچی تێیدا نووسیبوویەوە دیاری کرد بۆ ئەو ژنە و کچەکانی.[١]

### ١٣ــ زیندوکردنەوەی سوننەتی (مووچە پێدان) (العطاء)

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله دەڵێت: دروست نی یە مووچەی مردووەکانتان وەربگرن، خێرا ئاگادارمان بکە لە مردنیان، هەر وەکو کۆرپەلەیەکیش ئاگادارمان بکەن، کە لە دایك دەبن تا مووچەیان بۆ دیاری بکەین.[٢]

١ــ سیرة عمر إبن عبدالحکم لا ١٦٩.

٢ــ طبقات إبن سعد(٥/ ٣٤٦).

لە ڕیوایەتێکدا کە (إبن سعد) لە هەواڵی (أبی بکر بن حزم) وەری گرتووە دەڵێت: ئێمە لیستی بەندکراوەکانمان دەهێنا مووچەکانمان بۆ جیا دەکردنەوە لەسەر داواکاری عمری کوڕی عبدالعزیز، لە نامەیەکدا داوای لێ کردم، کە هەر کەسێ لێرە نی یە و شوێنکەی نزیکە ئەوە مووچەی لە لیستەکەیدا دیاری بکە، هەرکەسیش کەس نازانێت چی لێهاتووەو بۆ کوێ ڕۆیشتوە موچەکەی بوەستێنن تا دێتەوە، یان پرسەی بۆ دادەنرێت، یان وەکیلێکت بۆ دیاری بکات و بەڵگەی پێ بێت لەسەر سامانی خاوەنەکەی و مووچەکانی بدە بە وەکیلەکەی.[1]

بەم شێوەیە عمری کوڕی عبدالعزیز سوننەتی مووچەی ساڵانەی زیندوو کردەوە، کە لە سەردەمی خەلیفە ڕشیدینەکان و موعاویەدا کاری پێ کراوە و خەلیفەکانی دوای ئەوان پشت گوێیان خستووە، مووچە تایبەت کردا بە هەندێ ناوداری ناو ئومەتی ئیسلامە یەوە، (بەنی ئومەیەکان) زۆربەی مووچەکان ئەوان دەیانبرد، بەڵام لە سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزدا مووچە گشتی کردایەوەو هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەی گرتەوە.

ئەمەش دیارترین هەڵوێست و چاکسازیە نوێ خوازیەکانی عمربووە رحمه الله.

### ١٤ـ سواڵکەرانی لە سواڵکردن ڕزگارکردووە:

هەندێلە دانیشتوانی مەدینە هاتن بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز و ئەویش هەواڵی خەڵکی شاری مەدینەی لێ دەپرسین و، دەیوت: ئەو هەژارانە چیان بەسەر هات، کە لە فلان جێگادا دادەنیشتن بۆ سواڵ کردن؟ ووتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران وازیان هێنا لەو کارە، عمر پرسی: ئەی ئەو هەژارانە ماون، کە لە فلان و فلان جێگادا دەنیشتن؟ ووتیان: وازیان هێنا ئەی ئەمیری باوەڕداران خوای گەورە دەوڵەمەندی کردن، عمر ووتی: هەندێ لەوانە گیاو گژە ئاڵفی حوشتریان دەفرۆشت بە گەشتیاران، چیان بەسەر هاتووە؟ ناکەونە بەرچاوم لەم دوایانەدا؟ ووتیان: ووتویانە: قوربان خوای گەورە بە هۆی عمری کوڕی عبدالعزیزەوە دەوڵەمەندی

---

١ـ طبقات إبن سعد (٥/ ٢٤٨).

کردین و لەو کارەی خستین.[١]

ئەمەش بە هۆی ئەو بەرنامە پڕ لەداد پەروەریەوە بوو، کە عمری کوڕی عبدالعزیز پیادەی کردوە لە بواری دابەش کردنی سامانی موسڵماناندا، بە جۆرێ، کە ڕێگری کرد لە بەر دەمی کەمینەیەکی کۆمەڵگەدا، کە بە ئارەزووی خۆیان مووچە وەربگرن و بڕژێنە و بپرژێنە خەرجی بکەم، وایان لێ هاتبوو مووچەی یەك کەسیان را بە دەکەس لە موسڵمانە ئاست نزمەکان ـ هەژاران ـ بەوجۆرە سامانی موسڵمانان جارێکی ترگەیشتەوە دەستی سەرجەم موسڵمانان، کە پێشتر شتی وانە بوو، بەو هۆیەوە زۆری موسڵمانە هەژارەکان وازیان هێنا لە ئیش و کارە قورس و گرانەکان بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیانیان بەرامبەر پارەیەکی کەم و بێ نرخ.[٢]

### ١٥ـ ژن هێنان بۆ گەنجە نەدارەکان:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله گرنگی دەدا بەو گەنجانەی، کە وەختی ژنهێنانیان هاتبوو، بەڵام لەبەر نەبوونی و دەستکورتی ژنیان نەدەهێناو ئەو مارەیی بۆ مسۆگەر دەکردن، أبوالعلاء دەلێت: نامەی عمری کوڕی عبدالعزیز خوێنرایەوە لە مزگەوتی گەورەی کوفەداو خۆم گوێم لێ بوو، کە دەیووت: هەرکەسێ ئەمانەتێکی لەسەر شانەو توانای گەڕانەوەی نی یە با(بیت المال) ئەو ئەمانەتەی لەسەرشان لاببات و بۆی بدات، هەرکەسێکیش داوای ژنێکی کردوەو توانای مارەیەکەی نی یە دەبێت لەسامانی خوای گەورە،–بیت المال– بۆی بدەن.[٣]

ئەمەش بڕیارێکی زۆرگرنگە بۆچاکسازی کۆمەڵگە، چونکە پاکسازی چاکسازی و کۆمەڵگە لەسەر ئەوە وەستاوە، کە ڕۆڵەکانی ژن بهێنن و بەختیاری خێزان بەدەست بهێنن، لەوانەیە مارەیی زۆر و ئەرکەکانی تێچونی ژنهێنان وابکات لە گەنجە هەژارەکان نەتوانن ژن بهێنن، خۆ ئەگەر دەوڵەت ئەو ئەرکە لە ئەستۆ

---

١ـ الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(١/ ١٥١).
٢ـ التأريخ الإسلامي(١٥/ ١٢٨).
٣ـ طبقات إبن سعد (٥/ ٢٧٤)

بگرێت ئەوە توانیویەتی كۆمەڵگە بە پاكی بهێڵێتەوە، لە گەندەڵی ڕەوشتی و تێكچوون بپارێزێت.[١]

## ١٦ــ چینەكانی كۆمەڵگە لە یەكتری نزیك بكاتەوە:

(یونس)ی كوڕی(بن أبی شبیب) دەڵێت: لە هەندێ بۆنەی وەك جەژنەكاندا عمری كوڕی عبدالعزیزم بینیوە، كە خەڵكانی ناودارو دەوڵەمەند دەهاتن بۆ پیرۆزبایی لێی تا وایان لێ دەهات لە دەوری مینبەرەكەی كۆ دەبونەوەو لە نێوان ئەو خەڵكە گشتی یەكەدا بۆ شایەك هەبوو، كاتێ عمرﷺ گەیشت و چووە سەر مینبەرەكەی، سڵاوی لە هەمووان كرد، ئەوەی بەدی كرد، كە بۆشایەك هەیە لە نێوان دەوڵەمەندو ناوداران نێوان خەڵكە گشتی یەكەدا، بۆیە بەدەست ئاماژەی كرد بۆخەڵكە گشتی یەكە، كە بفەرموون بێنە پێشەوە، ئەوەندە هاتنە پێشەوە، تالەگەڵ ناودارو خانەدانەكاندا تێكەڵ بوون.[٢]

پێشتر لەدوای سەردەمی ئەمیری باوەڕداران ـ موعاویەﷺ ـ ئەمیرو والی یەكان هەندێ لە خەڵكەكە ناودارو دەوڵەمەندەكانیان جیا كردبویەوە لە دانیشتن دا لە مووچەو بەخششەكانیشدا، ئیتر پاش ئەوە ئەم پەتایە لەناو ئوممەتی ئیسلامیدا بڵاوبوویەوە، تاوای لێ هاتبوو خەڵكە گشتی یەكە نەیاندەوێرا بڕۆنە خزمەت بەرپرس و كاربەدەستەكانەوە، وایان هەست دەكرد، كە ئەوان شایەنی دانیشتن نین لە ئاستی چینە بەرزەكاندا، كە پێیان دەووتن پیاو ماقوڵان(الأشراف).

تاوای لێهاتبوو بۆ نوێژی جموعەكانیش موسڵمانە ئاست نزمەكان نەیان دەوێرا بچنە ریزەكانی پێشەوە، كە لە ڕاستیدا هەق وابوو پێش بڕكێیان بكردایە لە ڕیزەكانی یەكەم، چونكە پاداشتی زۆرو مژدەی گەورەی لەسەرە.

بەڵام عمریكوڕی عبدالعزیزبوبەخەلیفەی موسڵمانان،گەورەترین هەوڵ و تەقەلای بۆئەوەبوو ئەوجیاوازیانە نەهێڵێت وچینەكانی كۆمەڵگە لەیەكتری نزیك بكاتەوە.

---

١ــ التأریخ الإسلامی(١٥/ ١٢٩).

٢ــ طبقات إبن سعد (٥/ ٢٧٨)

ئەمەش بەوەی، کە ناو شورەتی چینە نزمەکان بەرز بکاتەوەو هەست بە بوونی خۆیان بکەن، ورەیان بەرز بکاتەوە هەست بەلاوازی کردنیان تێدا نەبێت، بۆ ئەو مەبەستە لە مووچەدا وەك یەکی لێ کردنەوە، گومانیشی تێدا نی یە، کە پارەو سامان کاریگەری یەکی تایبەتی هەیە لە بەرزکردنەوەو دابەزاندنی شورەتی خەڵکیدا.

بەمەشدا بۆمان دەردەکەوێت، کە چەندێ هەزارانی خۆش ویستووەو ویستوویەتی لەدەوڵەمەندو ناودارەکانیان نزیك بکاتەوە، بەوەی کە ئامازەی کرد بۆیان تا نزیك ببنەوە لێ ی و تێکەڵی چینی پیاو ماقوڵان ببن، تا ئەو بەینە گەورە نەمێنێ لە ناو موسڵمانەکاندا، کە بەپرس وکاربەدەستەکان بەزوڵم و ناڕەوا دروستیان کردبوو.[1]

ئای کە ئەمڕۆکە کۆمەڵگەکەمان پێویستی بەو پڕۆگرامە ئیسلامیە دروستەی عمر رحمه الله هەیە بۆ ئەوەی جارێکی تر چینایەتی لە ناو کۆمەڵگەدا هەڵبگرێتەوە، چونکەئەمرۆ قورئان حاکم نیەوشەرع پەیرەوناکرێت، بۆیەدەبینی حیزبەعەلمانی یەکانی سەر کورسی یەکانی حوکم لەهەموو وڵاتەئیسلامی یەکانداهەستاون بەگەورەکردن وبەرزکردنەوەی ئەندامانی حیزبی حاکم وکەس وکاری کاربەدەست وحوکم رانان، تا وای لێهاتووە مووچەی فەرمانبەرێکی داماو لای وەزیرو گزیرەکان دەرێت بەڕۆژانەی منداڵە بەرپرسێك و هەموو ڕۆژێ مۆدیلێکی نوێ ی ئوتومبیل دەگۆڕن و هەژارنیش نازانن کامەیە کلاج و کامەیە ئیستۆپ!!![2]

## ١٧ـ عمر هەست بە بەرسیاریەتی دەکات بەرامبەر تاکەکانی کۆمەڵگە :

فاطمەی کچی عبدالملك دەڵێت: عمر رحمه الله هەرکاتێ لە دەوام تەواو ببوایەو لە ئیش و کارەکانی نەبوایەوەتەوە، ئەوە شەویشی دەدایە دەمی ڕۆژ تا کارەکانی تەواو دەکرد، بەلام ڕۆژێکیان هاتەوە بۆ ماڵ دیاربوو کارەکانی تەواو کردبوو،

---

١ـ التأريخ الإسلامي(١٥/ ١٤٠).

٢ـ وتەی وەرگێڕ.

چونکە داوای کرد چراکەی بۆ داگیرسێنێنن، کە عایدی ـــ بیت المال ـــ نەبوو، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان کەوت بە دەمدا و سەری خستبووە نێوان هەردوو دەستی و فرمێسکیش بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە، هەناسەی وای هەڵدەکێشا، کە خەریك بوو دڵی دەتەقی لە گەڵی دا گیانی دەردەچوو، تا ڕۆژئاوابویەوەو بەیانی یەکەشی بەڕۆژوو بوو، منیش لێ ی نزیك بوومەوە ووتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا تۆ جاران ئاواو ئاواو نەبویت؟ ووتی: بەڵێ، بەڵام تۆ خەریکی خۆت بەو واز لە من و کارەکانم بهێنە، منیش ووتم: دەمەوێت پەند وەربگرم، عمر ووتی: کەواتە پێت دەڵێم: من بووم بە ـــ خەلیفە ـــ ئەم ئومەتە گەورەیە هەر بەڕەش و سوریانەوە، پاشان بیرم کردەوە لە هەژارێکی بێ پارە خاوەن کولفەتێکی زۆر[1] هاوێنەی ئەوانە لە هەموو کون و قوژبنێکی ئەم وڵاتەدا، بۆم دەرکەوت، کە خوا دەربارەی هەموویان پرسیارم لێ دەکات، پێغەمبەری خوایش ﷺ شکاتم لێ دەکات، ترسام خوای (عزوجل) هیچ بیانویەکم لێ قبوڵ نەکات، بەرامبەری شکاتی پێغەمبەر هیچم پێ نەکرێت، دەی بەخوا فاطمە بە زەیەکی وام بە خۆمدا هاتەوە، کە چاوەکانم پڕبوون لە ئاو دڵم ئازاری پێگەیشت، تا زیاتر بیرم لێ دەکردەوە زیاتر دەترسام، دەی ئا لەمە پەندو ئامۆژگاری وەربگرە، تۆش یان لاچۆ، وازم لێ بهێنە.[2]

ئای خوایە ئەوە عمر رحمه الله ئەوەندە دەترسێت لە لێپرسینەوەی خوایی دەربارەی تاکە تاکە کۆمەڵگەی ئیسلامی هەژارو نەدارو بێوەژن و پەککەوتە و داماوان، ئەترسێت کەسێ لەوانە هەبێت و ئەم پێیان نەزانێت و لە قیامەتدا لێپرسینەوەی لە گەڵدا بکرێت، هەروەك گریانی عمر رحمه الله بەڵگەیە لەسەر ترسانی لە خوای گەورە و سزایی ئاگری جەهەنم، وای لێ دێت، کە خۆی بەرزتر دەگرێت لەهەموو سورو زەردەکانی دونیانو دنیا پەرستی بەسەر دانایەت.[3]

---

١ـ کلفەت: منداڵ

٢ـ سیرة عمربن عبدالعزیز لابن عبدالحکم ل١٧٠.

٣ـ وتەی وەرگێڕ

## ١٨ـ هەڵوێستی بەرامبەر (أهل الذمة): کاتێ پیردەبن:

ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی دادپەروەری و لێبوردەیی و گرنگی دانە بە لاوازەکان، ئیسلام خێرو خۆشیەکانی بۆشوێنکەوتوانی خۆی نی یە وبەس، بەڵکو بۆ هەموو ئەوکەسانەیە لەسەر زەویدا دەژین، ئیتر با لەسەر هەرئاین بیروباوەڕێك بن، عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله ئەم بنەما بەرزو پیرۆزانەی بەکردەوە بەرجەستە کردبوو، ئەمەش بەجێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی شەریعەتی ئیسلامە، کەوای بڕیار داوە هەرکەسێك لەوانەی لە ژێر سایەیدا دەژین، ئەگەر دەسەڵاتیان نەبوو، خۆیان بژێنن و کەسی تریش نەبوو بیانژێنێت، ئەوە لەسەر (بیت المال)ی موسڵمانانە ژیانی مسۆگەر بکات.[1]

(إبن سعد) دەگێڕتەوەو دەڵێت: عمری کوڕی بەهرامی (عێراق) دەڵێت: نامەی عمری کوڕی عبدالعزیزمان بۆ خوێندرایەوە، کە دەیوت: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە عبدالله عمر ـ ئەمیری باوەڕداران ـ بۆ عەدی کوڕی ئەرتەئت و هەموو موسڵمانانی دەڤەرەکەی، سەلامتان لێ بێت، من سوپاسی ئەو خوایەتان لە سەردەمەکەم، کە هیچ خوایەك نی یە جگە لە ئەو، پاشان بە چاوی سۆزەوە بۆ (أهل الذمة) بڕوانەو نەرم و نیان بە لەگەڵیاندا، هەرکەسێك لەوان پیربوو کەسی نەبوو بیژێنێت، ئێوە لە (بیت المال) بیژێنن، ئەگەر خزمی نزیکی هەبوو بەزۆر پێ ی بڵێن: کە بیژێنێت.[2]

## ١٩ـ لەگەڵ گاورو جولەکەدا نان دەخوات:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله هەموو ڕۆژێك یەك درهەمی دەدا بەخواردن و تێکەڵی خواردنی موسڵمانی دەکردو لە گەڵیاندا نانی دەخوارد، سەردانی (أهل الذمة)ی دەکردو خواردنی دەکڕی و لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆیان و ئەوانیش خوردنیان لەنۆك و فاسولیا و شتی تر ئامادەکردو پێکەوە لەگەڵ عمر دەیانخوارد، ئەگەر لێیان وەرنەگرتایە ئەویش نانی نەدەخوارد لەگەڵیاندا.[3]

---

١ـ فقه عمر بن عبدالعزیز(٢/ ٢٥٢)

٢ـ الطبقات الکبری(٥/ ٢٨٠)

٣ـ حلیة الأولیاء(٥/ ٢١٥، ٢١٦) فقه عمر (٢٥٦).

### ٢٠ـ گرنگی دانی بەشیعری دونیا نەویستی یەوە:

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله لەسەردەمی خۆیدا وەك خەلیفەکانی پێش خۆی بەگۆترە پارەی زۆری هەڵنەڕشتوە بۆ ئەو شاعیرانەی بۆ دەستکەوتی پارەوپول، مەدح و سەنای خەلیفەکانیان کردوە، بەڵکو ئەوەندە پارەی کەمی پێداون نرخی نەبووە لە لایان، بەڵام لە پاش ئەوەی زانیویانە، کە لەبەر ڕەزیلی، بەڵکو لە ترسی خواو لێپرسینەوەی ڕۆژی دوای نەیدەپرژاند بەسەریاندا.

بەڵام عمررحمه الله ئەو شاعیرانەی لە خۆی نزیك دەکردەوە، کە باسی زوهدو دونیا نەویستی ومردن و ڕۆژی قیامەتیان بەبیری خەڵکدا دەهێنایەوەو خەڵکیان بەرەو ڕەوشتی بەرزو ڕاستگۆی بانگ دەکرد.

لەناو ئەو شاعیرانە زیاتر (سابق البربری) خۆش دەویست، چونکە هەموو جارێ بە شیعرەکانی ئامۆژگاری عمری دەکردو عمریش زۆر کاری لێ دەکرد و دەستی دەکرد بە گریان، جارێکیان سابق هات بۆ لای عمر و ئەم شیعرەی بۆ دەخوێندەوە، کە بەم چەند دێڕە کۆتایی پێ هێنا:

فكم من صحيح بات للموت آمناً أتته المنيا بغتة بعدما هجـــع
فلم يستطع إذ جاءه الموت بغتة فراراً ولا منه بقوته إمتنــــــع
فأصبح تبكيه النساء مقنعاً ولا يسمع الداعي وان صوته رفـع
وقرب من لحدٍ فصار مقليـــه وفارق ماقد كان بالأمس قد جمع

مەیمونی کوڕی مەهران کەڕاوی ڕوداوەکەیە دەڵێت: عمر ئەوەندە گریا، تالە لەهۆش خۆی چوو، ئێمەش هەستاین و ڕۆیشتینە دەرەوە.[١]

### ٢١ـ نێوان عمر و دوکەینی کوڕی ڕەجائی شاعیر

دوکەین خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله والی شاری مەدینە بوو بە شیعرەوە مەدح و سەنایەکم کردو ئەویش (١٥) ووشتری زۆر چاکی پێدام و منیش پێم ناخۆش بوو بیان فرۆشم و لە دەستم دەربچن، یان

١ـ الكتاب الجامع لسيرة عمر(٢/ ٦١٢)

بەڕەڵایان بکەم، بۆیە کاروانێکی هۆزی ـ موزەڕەـ م دەستکەوت دەگەڕانەوە پێم ووتن: منیش لەگەڵتان دێم ووتیان: ئەم شەو دەردەچین، منیش ووتم: ئاخر خواحافیزم لە عمری کوڕی عبدالعزیز نەکردووە، ئەوانیش ووتیان: شەوانەش خەڵك سەردانی دەکەن برۆ ماڵ ئاوای لێ بکە، منیش ڕۆیشتم ڕوخسەتم خواست، عمر رحمه الله ڕێگای دام چوومە ژوورەوە دوو پیاوی لە لابوو، کە دەمناسین، خوافیزیم لێ کرد، ئەویش پێ ی ووتم: ئەی دوکین من خاوەنی دەرونێکم هەمیشە بۆ بەرزتر دەڕوانێت، ئەگەر ئاستم لەم کارەی ئێستا بەرزتر بوویەوە، ئەوا زیاتر پێ دەبەخشم، منیش پێ ووت: دەی لەسەر ئەوە شایەتت لێ دەگرم، عمر ووتی: خوا شایەت بێت لەسەر ئەو پەیمانە، ووتم: ئەی لەناو دروست کراوەکانیدا؟ ووتی: ئەم دوو پیاوە، منیش ڕاونیم بۆیان بە یەکەیانم ووت: تۆ کێیت وەك بڵێ ی ئەتناسم ؟ ووتی: سالمی کوڕی عبدالله، ووتم: بەڕاستی شایەتەکەم پایە بەرزە، بەوی تریشم ووت: تۆ کێیت؟ ووتی: أبو یحی مولی الأمیر.[1]

بەڵێ ووشترەکانم بردەوەو خوای گەورە بەرکەتێتی وای تێ خستن بیابان نەی دەگرتن، تا جارێك گوێم لە جار چی یەك بوو هاواری کرد سولەیمانی کوڕی عبدالملك کۆچی دوای کردوە، منیش پرسیم ئەی کێ خراوەتە شوێنەکەی؟ وتیان عمری کوڕی عبدالعزیز، خێرا خۆم کۆکردەوە و چووم بۆ لای، لەڕێگا جریر ی شاعیرم بینی لەلای ئەو هاتبویەوە، پێم ووت: ئەی (ئەبو حەزرە) لە کوێ وە دێیت؟ ووتی: لەلای کەسێکەوە دێم، کە پارە دەدات بە هەژاران و دەیگێڕێتەوە لە شاعیران، چونکە ڕێبواریت لە دورەوە هاتویت شتێکی کەمت پێ دەدات، خۆم پێ گەیاند دەبینم لە حەوشەی ماڵەکەیدا خەڵکی چوار دەورەیان لێ گرتووە، هەرچیم کرد نەمتوانی خۆمی پێ بگەینم بۆیە هاوارم کرد لە دورەوە:

یاعمر الخیرات والمکـــارم     وعمر الدسائع[2] العظـــام

---

١ـ الشعر والشعراو لابن أبی قتبیه(٢/ ٦١١).

٢ـ دسائع: بەخشش.

إني امرء من قطنٍ بن دارم     أطلب ديناً من أخٍ مكارم
إذ تنجي والله غير نائمفـــي     ظلمة الليل وليل عاتـــم

لەوێدا ئەبو یحیی ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەم عەرەبە دەشتەکی یە من شایەتم ڕاست دەکات، عمریش ووتی: ئەیناسمەوە، دوکەین لێم نزیك بەرەوە، من هەر ئەو کەسەم، کە بۆم باس کردی و دەروونم هەرچی دەستکەوتبێت حەزی بەرزتر کردوە، وا ئێستا ئەو پەڕی دنیام دەست کەوت، بەڵام دەرونم بۆ بەرزتر دەڕوانێت، کە ڕۆژی دوای یە، بەڵام وەڵاهی دوکەین گیان هیچ پارەیەکم نەهێشتۆتەوەو هەمویم دابەش کردووە بەسەر خەڵکیدا تابت دەمێ، بەڵام دووهەزار درهەمم هەیە هی خۆمە لەگەڵتدا دەیکەم بەدوو کەرتەوە، فەرمانی دا هەزار درهەمیان بۆ هێنام، بەڵام وەڵاهی لەو هەزار درهەمەی عمر بەبەرەکەت دارترم نەدیوە لە ژیانمدا.[1]

کەواتە لە باس کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی عمری کوڕی عبدالعزیز دا بەرنامەو پرۆگرامە نوێ خوازی یەکەیدا گۆڕانی کۆمەڵایەتیەکەمان بۆ دەردەکەوێت، کە گرنترینیان:

### ١ــ سەرمەشق:

بە جۆرێ، کە خۆی سەرکردە سەر مەشق و نمونەیەکی جوان و ناوازە لە زوهدو خۆ لە حەرام ڕاستن و لێ پرسینەوەکردن لە گەڵ خۆیدا و لەگەڵ ماڵ و منداڵ و هۆزەکەشیدا، جێ بەجێ کردنی شەرع بەسەر خۆی و چوار دەورەکەیدا.

### ٢ــ پلەبەندی لە قۆناغەکاندا:

بەجۆرێ لە چاکسازی کۆمەڵگەکەیدا پلەبەندی بەکار دەهێنا، هەر پلەپلە و کەم کەم (بدعە)ی لە ناو بردو سوننەتەکانی زیندوو کردەوە.

---

١ــ الشعر والشعراء لابن أبي قتيبة(٢/ ٦١٢)

### ٣ــ خوێندنەوەی دەروونی مرۆڤەکان:

لەگەڵ خەڵکانی ژێر دەسەڵاتیدا شێوازی حیکمەت و ئامۆژگاری چاکەی گرتبووە، شێوازی هاندان، شێوازی ترساندنی بەکار هێناوە، سەرەتا شتێکی دنیایی دەدا بەکەسێك، بەڵام پاش ماوەیەك دەیبردەوە بەردەمی کێشانەی حەق و داد پەروەری و زوڵم هەڵگری.

### ٤ــ لەو پێویستیانەوە دەستی پێ دەکرد:

سەرەتا گەڕانەوەی نا هەقیەکان ــ ردالمظالم ــ ی لە هەموو کارەکان لە پێشتربوو لەلای، لەبەر ئەو مەبەستە سیاسەتێکی ڕون و ئاشکرای لەو بارەیەوە هەبوو، سەرەتا لە خۆیەوەو پاشان لە خانەوادەکەی و هۆزەکەی دەستی پێکرد، پاشان لابردنی والی یە ستەمکارەکان، دانانی کەسی چاك و بەتواناو ئەمین و زانا لە شوێنەکەیدا، لەپێناوی بەرپاکردنی دادپەروەری و جێبەجێ کردنی شەرعدا... هتد.

### ٥ــ ڕوانگەی ئاشکرا لە هەنگاوە چاکسازی یەکانیدا:

بەجۆرێ زاراوەی شورای هێنایەوە کایەوەو بەیعەتدان بە حاکم و مافی گەل لە هەڵبژاردنی بەرپرساندا، کاری کرد لەسەر دانانی کەسانی ئەمین بە والی لە هەرێمەکان، بڵاوکردنەوەی دادپەرەوەری لە هەموو وڵاتانی یەکگرتووی ئیسلامدا، زیندوکردنەوەی بنەمای فەرمان بەچاکەو دژایەتی کردنی بیروباوەڕە گەندەڵەکان.

پەرەی بەزانایان و خزمەتکردنی ئیسلام دەدا لە ڕوانگەی بانگەوازو زانست و فێربوون و خاوێن کردنەوەی دەرون ـ التزکیة ـ هتد... ئەمەو چەندان کاری تر لە بوارەکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی، بەجۆرێك ڕوانگەیەکی نوێگەری ئاشکرای هەبووە، لە پاشتر لەم کتێبەدا زیاتر ڕونی دەکەینەوە.

### ٦ــ پابەندبوون بەقورئان و سوننەت و ڕێڕەوی چواریارەکەی پێغەمبەر ﷺ:

لە هەنگاوە چاکسازایەکانیدا ئەوەی دەخواست، کە موسڵمانان بەرەو ئەوسێ کانیاوە سازگارە بگێڕتەوە.

## دووەم: هەڵوێستی لەگەڵ زانایاندا

هەرلەڕۆژانی (سلیمانی کوڕی عبدالملك) ەوە سەرەتای بەژداری کردنی زانایان لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت دەستی پێ کرد و، لەسەرچاوەی حوکمەوە نزیك بوونەوەو کاریگەریان لە سەر حاکمی وڵات هەبووە.

بەڵام هەرکە سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیز هاتە پێشەوە ئیتر ڕۆڵی زانایان زیاتر و چالاکتر وگشتی تربوو، چۆن وانەبێت، کە گەورەترین پۆستی دەوڵەت لەلای عمرەو عمریش یەکێکە لە گەورە زانایان، وەك زانایەك دەوڵەتی بەڕێوە دەبرد، نەك وەك پاشایەك.

تا وای لێهات بازنەی بەژداری کردنی زانایان لە مەرکەزی بڕیاردانەوە لە پایتەختدا بەجۆرێ فراوان بوو، کە عمرﷺ کۆمەڵێ لە زانا ناودارەکانی لە دەوری خۆی دانا تا پرس و ڕاو مشوەرەت پێ کردنیان کەڵك وەربگرێت، تاوایان لێ هات خۆیان بوونە تەنها سواری مەیدانەکە، تاوایان لە دەستوری وڵات کرد بەجۆرێ دابڕێژنەوە، کە بەتەواوەتی لەگەڵ شەریعەتی بەرزی ئیسلامدا بگونجێت، تا گەیشتنە ئاستێك هەموو پۆستەکانی وڵات لەوان خاڵی نەبوو.

کەواتە بەهەڵە دانەچوین، گەر بەدەوڵەتی عمری کوڕی عبدالعزیز بڵێین: دەوڵەتی زانایان(دولة العلماء)، کە ئەوەش نمونەیەکە و دەبێت دوەڵەتی ئیسلامی بەو شێوەیە بەردەوام دابمەزرێت، کە هەردوو دەسەڵاتی یاسا دانان و جێ بەجێ کردن بە جوانترین شێوە یەك بگرنەوە.[١]

لهەرچەندە ئەمڕۆ لایەنە ئیسلامیەکان لەزۆربەی وڵاتە ئیسلامی یەکاندا بوون بەدووبەشەوە دەربارەی زانایانی ئاینی.

کۆمەڵێکیان ڕۆڵی زانایان فەرامۆش کردوە لەسەرچاوەی حوکم و سەرکردایەتی دووریان خستۆنەتەوەو بەتەنها بەکاری بەرنوێژیو تەلقین و نیکاحەوە خەریکیان کردوون.

---

١ـ أثر العلماء في الحياة السياسية. لا (١١٤).

لە هەمان کاتدا پۆستە بالا و کاریگەرەکان دراونەتە کۆمەڵێك گەنجی بێ ئەزموون و، کەم خوێندەوار، کە جگە لە مگالعەی هەندێ کتێب و نامیلە نەمێت - سەرچاوە گەورەکانیان نەخوێندۆتەوە لەلای کەس، ئیتر ئەو کۆمەڵە گەنجە، چونکە باتەواوەتی لەگەڵ زانست و زانیاری قوڵی شەرعدا نەشیاراون و تەقواو خواناسیان لەوئاستەد نی یە، کە بیانکات بە سەرقافڵە، ئیتر لەپێش هاتە ترسناکەکاندا نازانن چی بکەن و ئامادەن مێژووی دورو درێژی ئەو لایەنە بدات بەئاودا هەموو کارێکی شەرعی و هەندێ کات ناشەرعی ئەنجام بدات، تا لەپۆستە باڵاکەی بمێنێتەوەو ئەمەش پەتاکەو لەناو حیزبە عەلمانیەکاندا شتێکی ئاسایی یە، بەلام بەهیچ جۆرێك بۆ بانگەخوازو سەرکردە ئیسلامیەیەکان ڕەوا نیەیەو دەبێت زانایان بیبرێنە پێشەوە سود لە عیلم و زانست و زانیاری قوڵیان وەربگرێت.[١]

بەڵێ لە سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزدا زانایان بە جۆرێ هاتنە پێشەوە، کە لە هیچ سەرەدەمێکی دەوڵەتی ئەمەویدا شتی بەدی نەدەکرا، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سور بونەی عمر رحمه الله لەسەر نزیکردنەوەی زنایان و دروستکردنی وەزیرو ڕاوێژکار لێیان، هۆیەکی تریش ئەوەبوو، کە زاناکان بیانویان بەدەستەوە نەما، تا لە عمر و دەسەلاتەکەی دوور بکەونەوە، چونکە زانایان پێیان وابوو، کە بۆ پارێزگاری لە پلەو مەقامی بەرزی زاناو زانیاریەکەی دەبێت نەچێت بۆ لای سولتان و دەبێت بە پێچەوانەوە سولتان بێتە خزمەت زانایان و لەبەردەمیاندا چۆك دابدەن، دەی وا ئەمڕۆ ئاواتیان هاتۆتە دی و عمر، کە لوتکەی دەسەلاتە وا ئەمڕۆ خۆی دەڕواتە خزمەتیان و داوای ئامۆژگاری و ڕاوێژی جوانیان لێ دەکات لەکاری بەڕێوەبردنی ولاتدا، هەروەها ئەو زانایانەش، کە بۆ پارێزگاری لە موسڵمانی یەتی و ئاینەکەیان نەیان دەوێرا لە خەلیفەکان نزیك ببنەوە، دەی ئەمڕۆ ئەو ترسەیان نەما، بەڵکو بە بێچەوانەوە ئەوەی لەکۆڕو دانیشتنەکانی عمر نزیك دەبێتەوە، خواناسی و موسڵمانی یەتی یەکەی زیاتر دەبێت.

---

١ - وتەی وەرگێڕ.

لەبەر ئەم هۆیانە زاناکان بەرەو ڕووی عمر ڕۆیشتن و بۆیان ڕوون بوویەوە، کە لەسەریان واجبە هاوکاری عمر لە هەڵگرتنی هەندێ بەرپرسیارێتیدا، بۆیە کەس بیانووی نەما.[١]

وەك (إبن عساكر) دەڵێت: زاناکان دەیان ووت: نابێت دەست لەم پیاوە بەربدەن تا ئەوکاتەی کردەوەکانی پێچەوانەی ووتەکانی دەبێت.[٢]

هاوبەشی زانایان لە سەردەمی عمردا لەم ڕوانگەیانەوە بووە گرنگترینیان:

١ـ نزیکیان لە خەلیفەوە:

زاناکان لەسەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزوە لە عمر نزیك بوونەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو، کە نەهێڵن لە پڕۆگرامە چاکسازییەکەی خاوبێتەوە، بۆیە پشگیریان دەکرد لەهەموو هەنگاوێکی چاکسازیدا، هەر وەك کاریگەریان لەسەر عمر هەبوو لە دەرکردنی هەندێ بڕیاری چاکسازیدا، یەکێ لەوانە ڕۆڵی زانای خوا ناس(عراك)ی کوڕی(مالك).[٣]

کوڕی مامەکەی دەگێڕێتەوە، کە ئەم (عراك)ە گەورەترین هاندەری عمر بوو، بۆ لێسەندنەوەی هەموو ئەوشتانەی بنی ئومەیە بەناهەق لەخەڵکیان سەندبوو، هەربەو هۆیەوەشەوە بووە(بنی أمیە) ڕقیان لێ هەڵگرتبوو، تەنانەت کاتێ یزیدی کوڕی عبدالملك چووە سەر حوکم دووری خستەوە بۆناوچەی (دەهلەك) کە جزیرەیەکی تەنگ و ترشەو (بنی أمیە) ڕقیان لە هەرکەس بوایە دوریان دەخستەوە بۆ ئەوێ، عراکیش لە گەورەزانایانی(تابیعین) بوو، کە زۆر خواناس و زاهید بووە، ئەو جزیرەیەش، کە دوور خرایەوە بۆی زۆر سودیان لێ وەرگرت، ئەم زانایە زۆر بەڕۆژوو دەبوو تەنانەت دەڵێن: هەمیشە بەڕۆژوو بووە، جگە لەڕۆژە قەدەغەکان.

---

١ـ أثر العلماء في الحياة السياسية. لا ١٩٦.

٢ـ مختصر تأريخ إبن عساكر لە کتێبی أپر العلماو، لا ١٩٧ وەرگیراوە.

٣ـ عراك: زانایەکی گەورەی شاری مەدینە بوو، کە لە غەفاریەکان بوو.

عمری کوڕی عبدالعزیز دەربارەی عەراك دەڵێت: کەسم نەبینیوە وەك عەراك نوێژی زۆر بکات، لە ئاکامدا لەساڵی ١٠٤ی کۆچیدا لە جزیرە گیانی سپارد.[١]

مەیمونی کوڕی مەهران یەکێك بووە، لە زانا هەرە نزیکەکان لە عمرەوە و، عمری کوڕی مەیمونی کوڕی بۆمان دەگێڕێتەوە، لە باوکی یەکەوە، کە دەڵێت: ئەوەندە خەمی گەلمان دەخوارد تاوام لێ هات بەعمری کوڕی عبدالعزیزم ووت: ئەرێ ئەم(طوامیر) لاپەڕەگەورانە بۆچی، کە ئەو هەموو مرەکەبەی تێدا سەرف دەکەین؟! ئەویش فەرمانی دەرکرد واز لە ڕۆتینیات بهێنن، ئیتر لەوەو دوا نامەکانی لە بستێك تێپەڕی نەدەکرد.[٢]

ئەم زانایە ناوی مەیمونی کوڕی مەهرانە، (ذهبی) دەربارەی دەڵێت: (الإمام الحجة) زنای جەزیرەی عەرەب و موفتی یەتی.[٣]

عمری کوڕی عبدالعزیز دەربارەی دەڵێت: ئەگەر ئەم پیاوەو هاو وێنەکانی بمرن ئیتر نەزانان پێشەوایەتی خەڵك دەکەن.

ئەم زانایە بیست ساڵ لە عمری کوڕی عبدالعزیز گەورەترە[٤] ئەو زانا مەزنە لە زانایانی سەلەفی صالحەو پشگیری قورئان و سوننەتی کردوە، دژی بیدعە بووەو لەبارەیەوە دەڵێت: لەگەڵ قەدەریەکان دامەنیشن، هەرگیز جنێو بە پێغەمبەری خوا مەدەن، زانستی ئەستێرە ناسی فێرمەبن.[٥]

حەزی بەوەرگرتنی بەرپرسیاریەتی نەکردوە کاتێ عمر داوای لێ دەکات بێتە قازی، لە وەڵامدا بۆی دەنوسێت: من پیاوێکی بە تەمەن و نەرمم، تۆ داوات لێ کردووم کاری داد پەروەری لە ناو خەڵکدا بگرمە ئەستۆو کاری خەراجیش ئەنجام بدەم لە ناوچەی جەزیرە، عمریش نامەی بۆ نووسی یەوە پێ ی ووت: من شتێکم

---

١ـ سیر أعلام والنبلاء(٥/ ٦٤).
٢ـ سیر أعلام والنبلاء لا(٥/ ١٢٢) .
٣ـ هەمان سەرچاوەلا(٥/١٧).
٤ـ هەمان سەرچاوەلا(٥/ ٧٢).
٥ـ هەمان سەرچاوەلا(٥/ ٧٢).

نەداوە بەسەرتدا، كە نارحەت بێت لەسەرت، ماڵ و سامانی چاك لە خەڵكی وەربگرە، هەرچی یەكیش ئاسانە لە لات حوكمەكەی دەربكە، ئەگەر شتێكت لێ گیرا ئاڕاستەی منی بكە، خۆ خەڵكی ئەگەر شتێكیان لێ گیرا و وازیان لێ هێنا خۆ دین و دنیا نایەتە یەك.[١]

هەر لە وتەكانی مەیمونی كوڕی مەهران: مرۆڤ ناگاتە ئاستی تەقواو تا ئەوەندە لێ پرسینەوەی خۆی نەكات وەك چۆن شەریك لێپرسینەوە لەگەڵ شەریكەكەی خۆی دەكات، تا بەجوانی نەزانێت جل و بەرگ و خواردن و خواردنەوەت لە چ سەرچاوەیەكەوەیە.[٢]

یان دەڵێت: سێ شت لەگەڵ پیاو چاك و پیاو خراپدا وەك یەك ئەنجام دەدرێت:

١- سپاردەپارێزی.

٢- پەیمان بردنە سەر.

٣- سەردانی خزم.[٣]

یان دەڵێت: هەركەسێ بە نهێنی گوناهێكی كرد تەوبەی لێ بكات، ئەگەر بە ئاشكرا گوناهێكی كرد بەئاشكرا تەوبەی لێ بكات، چونكە خەڵكی لێ ی خۆش نابن و لەكەداری دەكەن، بەڵام خوا لە خەڵكیش خۆش دەبێت و كەیسش لەكەدار ناكات.[٤]

جارێكیان پیاوێك بە مەیمونی كوڕی مەهران ووت: ئەی باوكی ئەیوب، خەڵكی بێ وەی لەسەر خێرو چاكەن، تاخوا تۆیان بۆ بهێڵێت، مەیمونیش لە وەڵامدا پێ ی ووت: بڕۆ بەدەم كارتەوە، خەڵكی بێ وەی و لەسەر خێرو چاكە دەبن، تا لە خوای خۆیان دەترسن.[٥]

جەعفەری كوڕی بورقان دەڵێت: مەیمونی كوڕی مەهران پێ ی ووتم: ئەی جەعفەر شتێكم پێ بڵێ با پێشم ناخۆش بێت، چونكە پیاو ئامۆژگاری چاكی

---

١- سير أعلام والنبلاء لا(٥/٧٤).

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- هەمان سەرچاوە.

٤- هەمان سەرچاوەلا(٥/٧٤).

٥- سيرأعلام النبلاء(٥/ ٧٥).

هاوڕێکەی نی یە تا ئەوشتانەی پێ نەڵێت، کە پێ ی ناخۆشە.[١]

(إبن الملیح) دەڵێت: مەیمونی کوڕی مەهران دەیووت: هەر کاتێ چووی بۆ لای بەرپرسێك و نەیانهێشت بچیتە ژوورەوە، دەی خێرا خۆت بگەینە ماڵی پەروەردگار دوو ڕکات نوێژ بکەو داواکاریەکەت لەو بکە.[٢]

یان دەڵێت: مرۆڤ ئاگاتە چڵەپۆپەی خێر ـ بە پێغەمبەران و پیاوچاکانیشەوە ـ تەنها بە سەبرو ئارام گرتن نەبێت.[٣]

هەروەها دەڵێت: خۆت توشی سێ شت مەکە:

یەکەم: مەچۆ بۆلای سوڵتان و دەسەڵات داران، ئیتر بابڵێ ی: ئامۆژگاری دەکەم گوێ ڕایەڵی خوا بکات.

دووەم: گوێ مەگرە بۆ شتی پڕوپوچ و ئارەزوکاری، چونکە ئاگات لێ نیە کاردەکاتە سەر دڵت.

سێ یەم: بەتەنها لەگەڵ ئافرەتان مەنێنەوە، ئیتر بابڵێ ی قورئانی فێردەکەم.[٤]

٢ـ ئامۆژگاری عمریان کردووەو لێ پرسینەوەی قیامەتیان وەبیر هێناوەتەوە:

عمری کوڕی عبدالعزیز یەکێك لەو خەلیفانە بووە، کە لە ناوهەموو خەلیفەکانی (بنی أمیة) دا زۆرترین نامەی ئامۆژگاری ئاراستەکراوە لەلایەن زانا خواناس و ناودارەکانی (تابیعینە)وە، بەردەوام نامەگۆڕینەوە هەبووە لە نێوان خەلیفەو زاناکاندا.

ئیتر لەو نامانەدا هەرچی ئامۆژگاری کاریگەرو ئاراستەی دروست هەبوو پێشکەشی ئەمیری باوەڕدارانیان دەکرد، ئەویش بەو پەڕی سنگ فراوانی یەوە

---

١ـ سیرأعلام النبلاء(٥/ ٧٥).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ هەمان سەرچاوەلا(٥/ ٧٨)

٤ـ هەمان سەرچاوەلا(٥/٧٨)

وەریدەگرتن و کاریشی پێ دەکردن.

لەو زانایانە: سالم کوڕی عبداللەی کوڕی عمری کوڕی خطاب و محمدی کوڕی کعب القرضی أبوحزم و سلمەی کوڕی دینارو قاسمی کوڕی موخیمەرو حەسەنی بەصری و هتد...

ئەگەر بەوردی سەیری پرۆگرام و نەهجی عمر بکەین لە بەڕێوەبردنی وڵات و کارەچاکسازیەکانی داو سەیری ناوەڕۆکی ئەو نامانە بکەین، کە زاناکان پەیتا پەیتا بۆ عمریان ناردوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کەئەوان کاریگەری گەورەیان هەبووە لەسەر بڕیارەکانی.

بابۆ نمونە هەندێ لەو نامانە بخەینە ڕوو:

١ـ نامەی محمدی کوڕی قەرەزی بۆی دەنوسێت دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، دەرگات بخەرە سەر پشت، کاری دەرگاوان ئاسان بکە، ستەم لێکراو سەربخە، ناهەقیەکان بگێڕەوە بۆ خاوەنیان، هەر لەسە ئەو شێوازەی محمد، قاسمی کوڕی موخەیرەیش بۆی دەنوسێت و دەڵێت: بیستومانە هەرکەسێ بوو بەفەرمانڕەواو بەرپرسی خەڵکی دەرگاوانی دانابوو نەیدەهێشت داماو ستەم لێکراوان بگەنە لای، ئەوا خوای گەورە لە قیامەتدا نایەڵێ ئەو کەسە بگاتە لای و باسی داماوی نەونەداری و ستەم لێکاراوی خۆی لەلا باس بکات، عمریش ووتی: دەی ئێستا چی دەڵێیت؟ ماوەیەك سەری داخست و پاشان ڕۆیشتە ناو خەڵککەوە.[1]

لە نامەیەکی حەسەنی بەسریدا هاتووە، کە بە عمری کوڕی عبدالعزیز دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، بۆ ئەو کەسانەی وەك خۆتن ببە بە برا، بۆ ئەوانەی لە خۆت بچوکترن ببە بەباوك، ئەوانەش لە خۆت گەورەترن ببە بەکوڕیان، هەرکەسەو بە ئەندازەی تاوانەکەی سزای بدەو بەپێ ی لاشەو لاری، لەبەر توڕەبوونی خۆت یەك قەمچی لەکەس نەدەیت، چونکە دەڕۆیتە ناو ئاگری دۆزەخ[2] عمریش رحمه الله خاڵ

١ـ سيرة عمر لابن الجوزي لا ١١٢.

٢ـ سيرة عمر لابن الجوزي لا ١٠٢.

بەخاڵ ئەم ئامۆژگاری یە ئاڵتونیانەی جێ بەجێ دەکردو داواشی لە کاربەدەستەکانی دەکرد، کەکاریان پێ بکەن.[1]

سالمی کوڕی عبدالله نامەی بۆدەنوسێت و پێ ی دەڵێت: هەرکار بەدەسێکت نارد بۆ عێراق زۆر بە توندی قەدەغەی ئەوەی لێ بکە، کە بەناڕەوا ماڵی خەڵکی داگیر بکات و خوێنیان حەڵاڵ بکات، ماڵ و سامان، وخوێن ئەی عمر، هەرگیز لە سزای سەختی دۆزەخ ڕزگارت نابێت، ئەگەر هەواڵت بۆ بێت کاربەدەستێکت ستەم دەکات، کەچی تۆش لای نەبەیت.[2]

هەرەوەها سالم بۆی دەنوسێت و پێ ی دەڵێت: خەلیفە گەلێکی پێش تۆ ئەوەی کردیان کردیان، ئەوەی باطل و پڕوپوچ بوو زیندویان کردەوە سوننەتە بەو هۆیەوە دەرگای خۆش گوزەرانی یان لەسەرجەم خەڵکی داخست، ئەوەی هەق و سوننەت بوو لەگۆڕیان نا، تا بەرەیەك هاتە پێشەوە لەسەر ئەوشتانە گەورەبوون، وایا زانی دەرگای بەلاو نەهامەتیان بۆ خستنە سەر پشت، دەی تۆ ـ ئەی عمرـ ئەگەر دەتوانی ـ بە کۆمەکی خوا ـ دەرگای خۆش گوزەرانی لەسەر خەڵکی بخە سەر پشت، بیخە، چونکە دەرگایەکی وا بکەیتەوە، خوای گەورە دەرگای بەلاو نەهامەتیت لەسەردا دەخات، ئەوە وا لێ نەکات لەوەی کاربەدەستێکی خراپ لابەیت، کە بلێ ی ئەترسم کەسێکی وام دەست نەکەوێت شوێنی بیگرێتەوە، چونکە تۆ ئەگەر لەبەرخوا خەڵکی دابنێیت و لەبەر خواشش لایان بەریت ئەوە خوا خۆی کەسانێکی چاکت بۆ دەڕەخسێنێت، کە هاوکارت بن لەکارەکانتدا.

٣ـ بەپرسیارێتی و پۆستەکانیان لێ وەرگرت:

بەپێچەوانەی هەموو خەلیفەکانی ترەوە، کە زاناو خواناسەکان هەوڵیان دەدا نەیەتە بەر چاویان و پۆستیان پێ نەدەن و هیچ بەرپرسیاریتیەکیان لێ وەردەگرتن، چونکە لوتکەی دەسەلاتیان بەدڵ نەبوو، کە پشتگیریان بێت، لەبواری جێ بەجێ کردنی هەق وداد پەروەریدا.

---

١ـ أثر العلماء لا ١٩٩.

٢ـ سيرة عمر لا ١٠٣

بەڵام لەسەردەمی عمری كوڕی عبدالعزیزرحمه الله زاناكان و خوا ناسەكان هەر بە بەرنامەی پڕ لە ئامۆژگاری و ئاڕاستەی ڕاست و دروستەوە نەوەستان، بەڵكو هەستان بە چوونە ژێر باری بەبەرپرسیارێتی دەوڵەتەوە لەگەڵ عمردا، گرنترین ئەو پلەو پۆستانە: ئەمیری هەرێمەكان، بەرپرسی دارای ـ بیت المال ـ [1]

ئەگەر بە وردی چاوێك بخشێنین بەكار بەدەست و والی یەكانی عمردا، دەبینین زۆربەیان لە زاناو داناكان پێك هاتبوون، لەوانە ئەمیری دادپەروەرو پێشەوای متمانە بێكراو عبدالحمیدی كوڕی عبدالرحمنی زەیدی عمری كوڕی خطابی كرد بەوالی كوفە[2]

زانای بەتوانا أبو بكری بن عمر بن حزمی كردە والی شاری مەدینە[3]، زانای گەورە إسماعیلی كوڕی ئەبی موجاهیری كرد بەوالی ئەفریقیا، [4] پێشەوای قازی(عباد)ی كوڕی (نسی) لە ئەردەن[5] و پیاوچاك و متمانە (عروە)ی كوڕی عطیةالسعدی لە یەمەن[6] زاناو فقیە و فەرمودەناس عەدی كوڕی عەدی(الكندی)ی كرد بەوالی جزیرەی فرات و ئەرمینیاو ئازربایجان.[7]

بەرپرسیاریەتی(بیت المال)واتە: وەزیری دارایی دەوڵەتەكەی عمررحمه الله كۆمەڵێك لە زانایانی بەڕێزو پایە بڵند گرتیانە ئەستۆ، لەوانە زانای بەڕێزو پایەبەرز (میمون)ی كوڕی(مهران) كردە بەپرسی خەراج لە جزیرە، پیاو چاكی متمانەدار(صالح)ی كوڕی(جبیرالصدائی) كردە بەپرسی خەراج، زانا(وهب)ی كوڕی (منبە) كردە بەرپرسی (بیت المال)ی یەمەن، (أبو زناد)و(عمری كوڕی میمون)ی كردە بەپرسی پۆستەوە بەرید.

---

١ـ أثر العلماء فی الحیاة السیاسیة لا ٢٠٠
٢ـ سیر أعلام النبلاء(٥/ ١٤٩)
٣ـ المعرفة والتأریخ(١/ ٦٤٥)
٤ـ سیر أعلام النبلاء(٥/ ٢١٣).
٥ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٣٢٣).
٦ـ تهذیب التهذیب(٦/ ١٨٦).
٧ـ مختصر تأریخ دمشق(١٦/٣٢).

گومانی تێدا نی یە ئەم بەژداریە چڕوپڕەی زاناو ناودارو پایەبەرزەکانی ئەو سەردەمە لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات دا، هۆیەکی زۆر سەرەکی بوو لەوەی، کە عمری کوڕی عبدالعزیز لەماوەی دووساڵی خەلافەتیدا کۆمەڵێ کاری مەزن و پڕ لەدادی ئەنجام داو توانی کۆمەڵێکی زۆر لە سوننەتە فەرامۆشکراوەکانی لە ناو کۆمەڵگە جێگیر بکاتەوە، ئەو داهێنراو(بدعە)انەی چەندان ساڵ بوو جێگیر بوو بوون توانی لە ڕیشەیان دەربهێنێ و نەیانهێڵێت، کارگەلێکی چاکی وا بۆ ئیسلام بکات، کە چەندان خەلیفەی پێش خۆی لە (بنی أمية) نەتوانن یەك لەسەر سەدی ئەو ئەنجامە ئەنجام بهێنن و دەی بەڕاستی هەقی خۆیەتی ئەونازناوە جوانەی دراوەتە پاڵ دەوڵەتەکەی عمری کوڕی عبدالعزیز ، کە ناوی دەڵەتی زانایان ــ دولة العلماء ــ

## سێ یەم: قوتابخانە زانستی یەکانی سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیز:

هەرلە سەردەمی عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه گرنگی دانی ئەو پیاوە گەورەی ئیسلام بەبواری زانست و بڵاوبونەوەی خوێندن وخوێندەواری و گەورە زانایانی هاوەڵان لە شاری مەدینە توانیان بەرەیەکی ڕۆشەنبیری خوێندەواری پەروەردە بکەن، کە دواتر بەزانا پایە بەرزەکانی (تابیعین) ناسراون و ئەوانیش کۆمەڵێ قوتابخانەی زانستی یان پێك هێنا لە مەکەو مەدینە و بەسرەو کوفەو میسرو شام و ...هتد

زۆرێ لەو زانایانەی، کە لەو قوتابخانانەدا پێ گەیشتن بوونە بەردی بناغەی دەوڵەتەکەی عمری کوڕی عبدالعزیزو کۆمەك و پشگیری بوون لە پڕۆژە چاکسازی و نوێخوازیە مەزنەکەیدا، کە پڕاوپڕ لەسەر نەهج و پڕۆگرامی پێغەمبەری خواو خەلیفە ڕاشیدەکانی دوای خۆی بوو.

لەوقوتابخانانە:

١ــ قوتابخانەی شام:

ئەم قوتابخانەیە لە سەردەمی خەلیفەی دووەم عمری کوڕی خطاب دا دروست بوو، لە بەناو بانگترین دامەزرێنەرانی(معاذ)ی کوڕی(جبل)و (أبو درداء)و (عبادە)ی

کوڕی(صامت)ﷺ لە تابیعنیش کۆمەڵێك کەس ئاڵایەکەیان لەو پیاوانە وەرگرت و دوای ئەوان درێژە پێدەری بوون لەبواری بانگەوازو زانستدا لەوانە:

١ـ (أبو إدريس الخولاني): قازی و زانای ناوداری دیمەشق، لە(أبی درداء)و (أبو هوريره)و (إبن عباس)وە فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

یەزیدی کوڕی (عبیدە) دەڵێت: لە سەردەمی (عبدالملك)ی کوڕی(مروان)دا (أبو إدرس)م بینی لە گۆشەیەکی مزگەوتی دیمەشق دا پاڵی دابوو بە کۆڵەکەیەکەوە خەڵکی هەموو هەڵقە هەڵقە قورئانیان دەخوێندو هەردەگەیشتنە ئایەتی(سوجدە) بردن دەیان ووت: دەبێت(أبو إدريس) بەدەنگە خۆشەکەی خۆی بۆمان بخوێنێت، هەر کە دەیخوێند هەموو ئەوانەی لە مزگەوتەکەی دابوون سوجدەی تیلاوەیان دەبرد، هەرکە لە قورئان خوێندنەکەیان دەبوونەوە (أبو إدريس) دەستی دەکرد بە فەرمودەو چیرۆك گێرانەوە بۆیان.[1]

یەزیدی کوڕی ئەبی مالك دەڵێت: دەورمان دەدا (أبو إدريس الخولاني) و فەرمودەی بۆ باس دەکردین، ڕۆژێکیان باسی یەکێ لە غەزاکانی پێغەمبەری خوای بۆکردین زۆر جوان باسی کرد، تا پیاوێك لە ناو کۆڕەکەدا بوو پرسی لێی: خۆت ئەو غەزایەت دیوە؟ ووتی: نەخێر، کابرا ووتی: من بەخۆم لەگەڵ پێغەمبەری خودا لەو جەنگەدا بەژداربووم، بەڵام تۆ لەمن باشتری لێ دەزانیت.[2]

(عبدالملك كوڕی مروان)، (أبو إدريس) لە وانە وتنەوەو هەڵقەی مزگەوت لادەبات و دەیکات بەقازی موسڵمانان، بەڵام خۆی دەڵێت: لایان بردم لەوەی حەزم لێ ی بوو، کردمیان بە شتێك، کە پێم ناخۆشە،[3] لە ساڵی(٨٠)ی کۆچیدا وەفاتی کردوە.

---

١ـ سير أعلام النبلاء(٤/ ٢٧٤) .
٢ـ هەمان سەرچاوە(٤/ ٢٧٥).
٣ـ هەمان سەرچاوە.

ب ـ (قبیصه)ی کوڕی (ذؤیب الدمشقی):
له عمری کوڕی خطاب و عبدالرحمن کوڕی عەوف و کەسانی ترەوە فەرمودەی وەرگرتوە، (الشعبی) دەربارەی دەڵێت: له هەموو کەس زاناتربووە بەدادوەریەکانی (زیدی کوڕی ثابت) له ساڵی(٨٨)ی کۆچیدا وەفاتی کردوە.
ج ـ (رجاء)ی کوڕی (حیوة)ی الفلسطینی: لەساڵی(١١٢)ی ك گیانی سپاردووە.
د ـ مکحول الشامی له ساڵی(١١٢) گیانی سپاردوە.
هـ ـ عمری کوڕی عبدالعزیز له ساڵی(١٠٠)ی کۆچی گیانی سپاردوە.
وـ بلالی کوڕی سەعد (السکوتی) خەڵکی دیمەشق بووە وانەکانی زۆر کاریگەر بووە، له یەکێ له قسەکانیدا دەڵێت: ئەی ئەهلی تەقوا، ئەی له خوا ترسەکان، ئێوە بۆ ئەوە دروست نەکراون بڕزێن و نەسێنن، بەڵکو لەماڵێکەوە دەرچن بۆ ماڵێکی تر، هەروەك چۆن له پشتەوە گوێزراوەنەتەوە بۆ سکی دایك، له سکی دایکەوە بۆ دنیا، لەوێشەوە، یان بۆ بەهەشت، یان بۆ دۆەخ.[1]
یان دەڵێت: سەیری بچوکی گوناهەکەت مەکە، بەڵکو سەیری ئەو کەسە بکە سەرپێچی یەکە کردوە، له ساڵی ١١٤ی کۆچیدا وەفاتی کردوە.

٢ـ قوتابخانەی مەدینەی پڕ لەنوور:
کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ لای خوای بالادەست، شاری مەدینە پایتەختی خەلافەتی ئیسلامی بوو، لەو شاردا عەقڵ و ژیری هاوەڵان کرایەوە بۆ تێگەیشتن له قورئان وسوننەت و دەرهێنانی حوکمی شەرعی لێیان.
له سەردەمی عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه نزیکەی (١٢٠) هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ له مەدینەدا بوون، کە فەتوایان دەدا، بەڵام حەوتیان له هەموویان زیاتر دەرکەوتبوون: عمر، عەلی، عبداللەی کوڕی مەسعود، عائیشە، زیدی کوڕی ثابت، عبداللەی کوڕی عباس، عبداللەی کوڕی عمر.[2]
لەو زانیانە کۆمەڵێ لەتابیعین پەروەردەبوون،لەوانە: سەعیدی کوڕی مسیب و

١ـ سیر أعلام النبلاء(٥/ ٩١).
٢ـ هەمان سەرچاوە.

عروەی کوڕی زوبێر و عەمرەی کچی عبدالرحمن ألأنصارية، قاسمی کوڕی محمدی کوڕی أبوبکر الصديق، سليمان کوڕی يسار و نافع و مەولای إبن عمر.[1]

٣ـ قوتابخانەی مەککی:

شاری مەککە بە هۆی ئەو ماڵە پیرۆزی خوای گەورەوە، کە ڕووگەی هەموو موسڵمانانە لە نوێژەکانیاندا ڕێزو حورمەتێکی تایبەتی هەیە لە دڵی موسڵماناناو موسڵمانان، کە دەڕواتە ئەو جێگەیە هەست دەکات یە خۆشی و حەوانەوەی مێشکی و سوکنایی بۆ دڵ و دەروونی دێت.

لە سەردەمی هاوەڵاندا مەککە ڕۆڵی وای نەمابوو لە لایەنی زانست و زانیاری یەوە، بەڵام لە سەردەمی (تابيعين) دا خۆری زانیاری و زانستی لێ هەڵات بە تایبەت بوونی زانایەکی بە تواناو تەرجومانی قورئان عبداللهی کوڕی عباس‌ﷺ لە شاری مەککە خۆی یەکلاکردەوە بۆ تەفسیری قورئان و لەوێشەوە کۆمەڵێ قوتابی چاك پێ گەیشتن و بوونە ئەستێرەی گەشی ئاسمانی وڵاتی ئیسلام لەوانە:

(مجاهد)ی (حبر المكی) کە ناودارترین قوتابی (إبن عباس)ە خۆی دەڵێت: سێ جار قورئانم لە خزمەتی إبن عباسدا ئەمدیو ئەم دیو کردەوە لەسەر هەموو ئایەتێك قسەمان کردوە و لێ ی تێ گەیشتوم لێم دەپرسی لە هۆی هاتنە خوارەوەی و چۆنی یەتی یەکتری.[2]

مجاهد دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز‌ﷺ لەسەرە مەرگدا پێ ی ووتم:ئەی مجاهد خەڵکی دەربارەی ئەم نەخۆشیەم چیدەڵێن؟دەڵێ: ووتم: دەڵێن: سیحری لێ کراوە،عمر ووتی:سیحرم لێ نەکراوە،پاشان بەندەیەکی خۆی بانگ کرد پێ ی ووت: بێ قەزابی یاخوا!بۆچی هەرژەهرت دەرخواردام؟ووتی:لەبەرامبەر ئازاد کردنم (١٠٠٠)و دیناردا، عمر پێ ی ووت: هەزارەکەم بدەرێ،ئەویش بۆی هێناو لێ وەرگرت و خستی یە(بيت المال)و پاشان بەبەندەکەی ووت:برۆ جێکایەك کەس نەتبینێت.[3]

---

١ـ المدينة النبوية فجر الإسلام(٢/ ٤٥).

٢ـ سير أعلام النبلاء(٤/ ٤٥١).

٣ـ سير أعلام النبلاء(٤/ ٤٥١).

ئەم زانایە لەساڵی (١٠٢) کۆچیدا لە کاتی سوجدەدا گیانی سپاردوەو تەمەنی (٨٣)ساڵ بووە.[١]

٢- (عکرمە)ی مەولای (إبن عباس):

یەکێکە لە تابعین و خەڵکی مەککەیەو لە خزمەت (إبن عباس)و (عائشة) و (أبو هوريرة)و(إبن عمر)و (إبن عمرو) و (علی کوڕی أبو طالب)وانەی خوێندەوە[٢] (بخاری) دەڵێت: هەموو هاوەڵانمان وتەی (عکرمە)یان بە بەڵگە هێناوەتەوە، خۆی دەگێڕێتەوە: دەلێت: ماوەی(٤٠) ساڵ هەوڵی فێربوونی زانستم داوە و قوتابی بووم.

دەڵێ: (إبن عباس) لە ژوورەوە بوو من لە بەر دەرگا فەتوام دەدا بۆ موسڵمانان و إبن عباس پێ ی ووتم: فەتوا بدە من کۆمەکیت دەکەم، عکریمەیش ووتی: ئەو خەڵکە لە دەرەوە دوو ئەوەندەی تریش بن، ئەتوانم فەتوایان بۆ بدەم، (إبن عباسیش) پێ ی ووت: ئەوەی زەروریەتی فەتوای بۆ بدەو هەرکەس زەروری نی یە بە فەتوا، فەتوای بۆ مەدە بەو کارە، دوو لەسەر سێ ی ئەرکی فەتوات لە سەر شان دەکەوێت[٣] ساڵی(١٠٥)ی کۆچی وەفاتی کردوە.

ج - (عطاء)ی کوڕی (أبی رباح):

مفتی مەککەی پیرۆزو یەکێ لە زانا بەرزەکان بووە، إبن عباس دەربارەی دەفەرموێت: ئەی خەڵکی مەککە لە من کۆ دەبنەوە؟ کە (عطاء)یشتان لە ناو دایە، لە سەردەمی ئەمەویەکاندا جارچی جاری دەداو دەیوت: جگە لە عطاءی کوڕی رباح کەسی تر فەتوا نەدات، ئەمە لە مەوسیمی حەجدا، لە ساڵی(١١٥)ی کۆچیدا کۆچی دوای کردووە رحمه الله.

١- طبقات إبن سعد(٥/ ٤٧٥).
٢- سير أعلام النبلاء(٥/ ١٢).
٣- هەمان سەرچاوە(٥/ ١٥).

٤ـ قوتابخانەی بەسرە:

ئەم قوتابخانەیە عێراقی یەو لە هەموو زانست و هونەرەكاندا بەرامبەركێ ی كوفیەكانی كردووە، كۆمەڵێ كی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر نیشتە جێ ی بوون لەوانە (أبو موسی الأشعری)و(عمیران) كوڕی (حصین)و(أنس)ی كوڕی (مالك) و كەسانی تر.

بەڵام (أنس)ی كوڕی (مالك) بە مامۆستای گەورەی زانایانی تابعین دادەنرێت لە شاری بەسرەدا وەك: (محمد)ی كوڕی(سرین)و (سلیمان التمیمی) و(ثابت البنانی) و(ربیعە)ی كوڕی(عبدالرحمن)و (إبراهیم)ی كوڕی (أبی میسرە)و(قتادە)و كەسانی تریش.[١]

بەناوبانگ ترینیان:

١ـ محمدی كوڕی سیرین البصری: ئەو زانایایەی، كە ناو بانگی دەركردەوە بەوەی ئەنجامی خەونی لێكداوەتەوە(الذهبی) لە باوەریەوە دەڵێت: كۆمەكی خوای لەگەڵدا بووە لەو بوارەدا.[٢]

خاوەنی خواناسی و بەندایەتی یەكی زۆر بووە، تەنانەت لە هەموو ژیانیدا ڕۆژێ ناڕۆژێك بەڕۆژوو بووە.[٣]

ئەم زانایە زۆر ڕێزی دایكی گرتووە لە حزوریدا ئەوندە لە سەرخۆ قسەی كردووە، ئەگەر كەسێك لە دەرەوە بیدیبایە دەیووت: نەخۆشە[٤]، ئەگەر جل و بەرگی بۆ بكردایە نەرم ترینی بۆ هەڵدەبژاردو بۆی دەكڕی و لە ساڵی (١١٠)ی كۆچیدا گیانی سپارد بە خوای خۆی رحمه الله.

١ـ تفسیر التابعین(١/ ٤٢٣٩).
٢ـ سیر أعلام النبلاء(٤/ ٢٧٧).
٣ـ هەمان سەرچاوەو(٤/ ٦١٥).
٤ـ سیر أعلام النبلاء لا(٤/ ٦٢٠).

٢ــ (قتادە)ی کوڕی (عامە) السدوسی: بەڕاستی خەزێنەی زانست بووە، (أحمدی کوڕی حنبل) دەربارەی دەڵێت: زانابووە بە تەفسیرو و جیاوازی بۆچوونەکانی زانایان و لە ناو هەموو بەسرەدا کەسی نەبو وەك ئەو زوو شت لەبەر بکات، گوێ ی لە هەر شتێك بووبێت وەك لەخۆی بەری کردووە.[١]

(سەلامی کوڕی مطیع) دەڵێت: لە ماوەی حەوت ڕۆژدا قورئانی خەتم دەکرد، لە ڕەمەزاندا لەماوەی سێ ڕۆژدا خەتمی دەکرد.[٢]

ماوەی (١٢) ساڵ لە خزمەتی (حسن البصری) دابووەوو ماوەی (٣) ساڵ نوێژی یانیان پێکەوە کردەوە، لە ساڵی (١١٨)ی کۆچیدا گیانی پاکی سپاردوە رحمه الله

٥ـ قوتابخانەی کوفی یەکان:

نزیکەی (٢٠٠) هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ نیشتەجێ بوون و(٧٠)یان لە بەژدارانی غەزای بەدربوون، عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه گرنگی تایبەتی بە شاری کوفە داوەو بۆ ئەو مەبەستە(عبدالله)ی کوڕی (مسعود)ی بۆ ناردوون، ئەویش دەستی کردەوە بە بانگەواز و بڵاوکردنەوەی زانستی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێ زانای چاك لە سەر دەستی هاتنە کایەوەلەوانە:

١ـ (عامر)ی کوڕی (شراحبیل الشعبی): زانای پایە بڵندی سەردەمی خۆی بوو، دەڵێن: (٥٠٠) کەسی لە هاوەڵان بینیوەو سودی زانستی لێوەرگرتون، محمدی کوڕی سیرین دەڵێت: عامرم بینی لە کوفەدا فەتوای دەدا، لە کاتێکدا ژمارەی هاوەڵان لە کوفەدا زۆر زۆر بوون، لەگەڵ ئەو هەموو زانیاریەیدا زۆر جار پرسیاری شەرعیان لێ بکردایە دەیووت: (نازانم) نازانمیش نیوەی زانستە.[٣]

لەگەڵ ئەو پایە بەرزی و زانایدا کەچی (الشعبی) هەر دەیووت: ئێمە کەی زانایین، بەڵکو ئێمە فەرمودەمان بیستووە، پاشان گێڕاومانەتەوە بۆ خەڵکی، بەڵکو زانای

---

١ـ سیر أعلام النبلاء(٤/ ٢٧٧) .

٢ـ هەمان سەرچاوەلا (٤/ ٢٧٦).

٣ـ الفتوی د. صلاح لا ٨٣.

تێگەیشتوو ئەو زانایەن، کە شتێکیان زانی کاری پێ دەکەن، دەڵێن: لە ساڵی(١٠٥) یان(١٠٦)ی کۆچیان گیانی پاکی بە خوای خۆی سپاردوە.

٢ـ (حماد)ی کوڕی (أبی سلمة): ناسراوە بە (فقیه العراق) و زیرەك ترین قوتابی حماد لە کوفەدا (ئەبو حەنیفە)بوو، لە ساڵی (١٢٠)ی کۆچیدا وەفاتی کردەوە رحمه الله

٦ـ قەتابخانەی یەمەنی یەکان:

پێشەوایانی ئەم قوتابخانەیە سێ هاوەڵی بەرزی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە:

یەکەمیان: (معاذ)ی کوڕی(جبل).

دووەمیان: (علی) کوڕی(أبی طالب).

سێ یەمیان: (أبو موسی الأشعری).

لە بەناوبانگترین قوتابیەکانی ئەوانیش کۆمەڵێ زانای پایە بڵندو مەقامی وەك:

(طاوس)ی کوڕی (کیسان) سەر مەشق و فەقیهی یەمەنی یەکان بوو، لە نەوەی ئەو فارسانە بوو، کە کیسری ناردنی بۆ ئەوەی یەمەن بخەنە ژێر دەستی یەوە، بەڵام وا ڕۆڵەیەکی پڕ لە فەڕ و بەرکەتیان لێ دەکەوێتەوە، کە دەبێتە خێرو بێر، بۆ هەموو موسڵمانان و یەمەن بە تایبەتی.

سوفیانی سەوری لە ناوهەموو قوتابیانی (إبن عباس)دا کەسی بە(طاوس) نەگۆڕی یەوە، خاوەنی نەفسێکی زۆر بەرز بووە، داوای هیچی لەکەس نەکردووە، عمری کوڕی عبدالعزیز پێ ی دەڵێت: داوای پێویستی یەکت لە سلیمان بکە بابتداتێ، ئەویش دەڵێت: پێویستم پێ ی نی یە، عمریش زۆر سەرسام بوو بەوەڵامەکەی.[1] لە ساڵی (١٠٦)ی کۆچیدا لە مەککە وەفاتی کردوە رحمه الله.

ب - (وهب)ی کوڕی(منبه):

نەوەی فارسەکانەو هاتووتە شاری (ذمار)ی نزیك (صنعاء) و کتێبی خوێندەوە،

---

١ـ سیر أعلام النبلاء(٥/ ٤١).

خۆی یەکلای کردۆتەوە بۆ خوا پەرستی و بەخشینی زانست و زانیاری و زوهدو دونیا نەویستی.[١]

هەوڵ و تێکۆشانی تایبەتی هەبووە لە سەرخستنی سوننەتدا و دژایەتی کردن و مێزگردی لەگەڵ خەواریجەکاندا کردوە دووەو توانیویەتی هەندێکیان بهێنێتەوە سەر ڕێگای ڕاست بە تایبەت حەروری یەکان لە ساڵی(١١٠)ی کۆچیدا گیانی سپارد رحمه اللهو دەڵێن: لە زینداندا(یوسفی کوڕی عمر) والی کوفە شەهیدی کردوە لەسەر ئەوەی بەرامبەر زوڵم و زۆری دەوەستاوەو خەڵکی لێ هان دەدا، کە قبوڵی زوڵم و ناهەقی نەکەن.[٢]

٧ـ قوتابخانەی مسیری یەکان:

قوتابخانەی زانستی میسری هەرلەو سەردەمە دامەزرا، کە کۆمەڵێك لە هاوەڵان لەگەڵ سوپای ڕزگاری خوازی ئیسلامدا لە میسر نیشتەجێ بوون و زانست و زانیاری پێغەمبەری خویان گەیاندە ئەو ناوچەیە لەوانە: (عمرو)ی (عاص)و (عبدالله)ی کوڕی(عمرو)ی کوڕ(عاص) و (زبیر)ی کوڕی(عوام)، بەڵام لە هەموویان زیاتر(عقبە)ی کوڕی(عامر) کاریگەری هەبوو لەسەر ئەو دەڤەرە.[٣]

ناودارترین زانای میسریەکان لە سەردەمی تابعین دا:

(یزد)ی کوڕی(أبی حبیب)و مفتی وڵاتی مسیر، لەگەڵ ئەوەشدا، کە عەبدێکی ڕەش پێست بووە، بەڵام خوای گەورە بەهۆی زانست و زانیاریەوە بەرزی کردەوە، بو ئاستی زانا بەرزەکردەوەکارەکان و لە ساڵی(١٢٨)ی کۆچیدا گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار رحمه الله.

٨ـ قوتابخانەی باکوری ئەفریقیا:

سەرکردەکانی سوپای ڕزگاری خوازی ئیسلامی گەیشتە باکوری ئەفریقیاو لە سەرویانەوە سەرکردە(عمرو)ی کوڕی(عاص)، لە پاش ئەویش (عبدالله)ی

---

١ـ علماء الأمصار لا١٢٣.

٢ـ أثر العلماء فی الحیاة السیاسیة لا ٦٦٧.

٣ـ أثر العلماء فی الحیاة السیاسیة لا ٦٦٧.

کوڕی(سعد)ی کوڕی(أبی السرح)، لەپاش ئەویش(معاویە)ی کوڕی (حدیج) ئەفریقایی ڕزگار کرد(معاویە)ی کوڕی(أبو سفیان) بوو بە والی میسرو ئەفریقیا، دوای ئەویش (عقبە)ی کوڕی (نافع الفهری) هات، شاری قەیرەوانی دامەزراند، لە ناو خەلکیدا ناوی بە باش بڵاو بویەوەو بوو بە یەکێك لە باشترین بانگەوازکاران، ئەوانە بەردەوام جیهادیان دەکردو ئەوەندەی تر ئەو کیشوەرە ئەسمەرەیان بە نوری قورئان ڕوناك کردەوە.[١]

لە سەردەمی خەلیفە عمری کوڕی عبدالعزیزدارحمه الله (إسماعیل)ی کوڕی (أبی المهاجر)ی کرد بەوالی ئەفریقیا لە ساڵی (١٠٠)ی کۆچیدا، ئیتر ئەو پیاوە بە ڕەوشتی بەرزو وتەی شیرن و کردەوەی جوان خەڵکی بۆ لای ئیسلام بانگ دەکرد، خەڵکەکە زۆریان خۆش دەویست، بەو بۆنەیەشەوە دینەکەیان خۆش دەویست، زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی، کە بەر بەریەکان موسڵمان ببن، لە ئاکامدا هاتن بەدەم بانگەوازەکەیەوە، زۆر سوور بوو لە سەر ئەوەی قورئانیان فێر بکات و لە ئەحکامی شەریعەت شارەزای دەکردن.

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله دەکەسی چاکی لە تابیعین هەڵبژاردا و لەگەڵ (إسماعیل)دا ناردنی و پێکەوە بوونە چرا بۆ ڕواناکردنەوەی ئەفریقیا بە نوری قورئانی پیرۆز.

## چوارەم: عمر لە خزمەت سوننەتدایە:

لە سەرەتاوە پێغەمبەری خواﷺ نەیدەهێشت جگە لە قورئانی پیرۆز شتێکی تر بسرێتەوە، تەنانەت وتەکانی خۆیشی، چونکە لەوە دەترسان تێکەڵ بێت لەگەڵ قورئاندا، خەڵکی بەشتی ترەوە خەریك ببن و قورئان فەرامۆش بکەن، بەڵام پاشتر پێغەمبەری خواﷺ ڕێگەی دا بە هاوەڵە خوێندەوارەکان، کە فەرموودەکانی بنوسنەوە، ئەوەش مانای ئەوەی دەگەیاند، کە دروستە.[٢]

---

١ـ البیان المغرب للمراکشی(١/ ١٩)

٢ـ عمر بن عبدالعزیز عبد الستارالشیخ ل٧٤.

شتێکی چەسپاوە، کە زۆرێ لە هاوەڵان فەرمودەکانی پێغەمبەریان ﷺ دەنووسیەوە بۆ خۆیان و ئەو کارەیان پێ دروست و ڕێگە پێدراو بوو، پاشتریش قوتابیەکانیان لە بەردەستی ئەواندا دەیان نوسیەوەو ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد بە نوسینەوەو لەبەرکردنی فەرموودە.

بەڵام بەشێوەیەکی فەرمی لەسەردەمی عبدالعزیزی کوڕی مەڕواندا ـ باوکی عمر ـ لە میسر نوسرایەوە، کە لەو کاتەدا ئەمیری ئەو وڵاتە بوو، بەڵام نووسینەوەیەکی چاك و بەر فراوانی وا، کە بەهەرمی بووبێت لە سەردەمی ئەمیری باوەڕداران عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله، ئەمەش لە ڕێگای ئاڕاستە جوانەکانی و ئامۆژگاری یە بە نرخەکانی بۆ ئەو کەسانەی بەو کارە هەڵدەستان هاتە دی، ڕووی کردە هەموو موسڵمانان، دەیووت: (قیدوالعلم بالشکر، قیدو العلم بالکتابة)[1] واتە: زانست و زانیاری ببەستنەوە بە سوپاس گوزاری خواوەو زانست و زانیاری ببەستنەوە بە نوسینەوەی.

بەڵام ئەمیری باوەڕداران هەر بەم ئامۆژگاری و ئاڕاستە گشتیانە نەوەستاوە، بەڵکو بە حوکمی ئەوەی، کە خەلیفەی موسڵمانانە، هەندێ فەرمانی ڕەسمی دەرکرد بۆ هەندێ لە پێشەواو مامۆستایانی ئەو سەردەمە، کە هەستن بەکۆکردنەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموو فەرموودەکانی بنوسنەوە، چونکە عمریش رحمه الله سەیری دەکرد وا زانا بەڕێزەکانی ـــ تابعین ـــ کۆمەڵێك فەرموودەی زۆریان لە لایەو خۆ هەموو سەردەمێك دەماو دەم نارِوات و لەبەر ناکرێت، بۆیە لە فەوتان و لەناوچونی ترسا، لە لایەکی ترەوە تا ببێتە سەرچاوەیەك لەبەر دەستی قوتابیانی دوای ئەواندا و لە کاتی پێویست دا بگەڕێتەوە بۆی.

هۆیەکی تریش، کە وای لە ئەمیری باوەڕداران و زاناکانی ئەو سەردەمە، کە هەستن بەو کارە گەورەو گرانە، ئەوەبوو فەرموودەی هەڵبەستراو درۆ بەدەم

---

[1] ـ عمر بن عبدالعزیز عبد الستارالشیخ لا(٧٥).

پێغەمبەری خواﷺ هاتەکایەوە، کە ئەمەش هەندێ هۆکاری جیاوازی بیروڕاو جیاوازی بۆچون ـ هەندێ لە نیمچە خوێندەوارەکان ئەو کارە حەرام و ترسناکەیان کرد بۆ بۆ مەبەستی پشتگیری لە بۆچون و لایەنەکانیان کۆمەڵێ فەرمودەیان هەڵبەست، کە ئەگەر هەوڵ و تێکۆشانی کۆمەڵێ زانای خوا پەرست نەبوایە، هەرگیز لە فەرمودە صحیحەکان جوانە دەکرانەوە.

ئەمە پێشەوا(الزهری) دەڵێت: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە لەڕۆژ هەڵاتەوە (عیراق و شام) کۆمەڵێ فەرموودەمان پێ دەگات، کە نەمان بیستوون و بەڕاستیشیان نازانین، هەرگیز فەرموودەم نەدەنوسیەوە، ڕێگاشم بەکەس نەداوە بە نوسینەوەی.

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە، کە عمری کوڕی عبدالعزیز نامەیەك دەنوسێت بۆ (أبو بکری)ی کوڕی (حزم) پێ ی دەڵێت: بڕوانە چی فەرموودەی پێغەمبەر هەیە، هەمووی بنوسنەوە، چونکە زۆر دەترسم لە لەناوچونی زانست و نەمانی زاناکان، هەر ووتەیەك ووتەی پێغەمبەرﷺ نە بوو وەری مەگرە، زانست بڵاوبکەنەوە، کۆڕو دانیشتنی زانستیان هەبێت تا ئەوانەی نازانن فێربن، زانستیش لە ناو ناچێت، تا ئەو کاتەی بە نهێنی دەمێنێتەوە.[1]

إبن سعدیش لە عبداللهی کوڕی دینارەوە دەگێڕنەوە، کە دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه‌الله نامەیەکی نووسی بوو، (أبو بکر)ی (محمد)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (إبن حزم) پێ ی ووت: بڕوانەو بزانە چی فەرموودەی پێغەمبەری خوایەﷺ، یان سوننەتێکی موئەکەد، یان ئەو فەرموودانەی لە لای (عمره)ی کچی عبدالرحمن هەمووی بنوسەرەوە، چونکە لەوە ترساوم، کە زانست لە ناو بچێت و زانایان نەمێنن.[2]

٢ـ (إبن شهاب الزهری):

(إبن عبدالبر) دەگێڕتەوە لە (إبن شهاب الزهری)یەوە، کە وویەتی: عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه‌الله فەرمانی دا بەسەرماندا بە کۆکردنەوەی سوننەت، ئێمەش دەفتەر

---

١ـ فتح الباری(١/ ١٩٤/ ١٩٥).

٢ـ الطبقات ـ أصول الدین لا(١٧٧ ـ ١٦٩٨).

دەفتەر هەموویمان نووسی یەوە، هەر دەفتەرێکی دەنارد بۆ یەکێ لە هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی.[١]

(أبو عبید) دەگێرتەوە، کە عمری کوڕی عبدالعزیز فەرمانی پێ کرد، کە شتێك لە سوننەتدا هەیە سەبارەت بە چۆنی یەتی خەرج کردنی زەکات بۆی بنووسێتەوە، (الزهری)یش داوا کاریەکەی جێ بەجێ کرد، بە دورو درێژی لەو بارەیەوەهەرچی هەبوو کۆی کردەوە بۆی لە کتێبێکی گەورەدا.[٢]

ئا لەم بارەیەوە، کە (إبن مجمر) دەڵێت: یەکەمین کەس لە ساڵی(١٠٠)ی کۆچیدا فەرموودەی نووسیەوە لەسەر فەرمانی عمری کوڕی عبدالعزیز، لە پاش ئەویش نووسین لەو بارەیەوە زۆر بوو، بوو بە خێرێکی گەورە بۆ ئوممەت،سوپاس بۆ خوا.[٣]

٣ـ بەڵکو(عمری کوڕی عبدالعزیز) هەموو ئەمیرەکانی، کە دەیناردن بۆ مەدینە داوای لێدەکردن چی فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە کۆی بکەنەوە.

هەرکەسێکیش لەو بارەیەوە شتێکی لە لایە با بەشداری بکات، ئیتر با کەمێ فەرموودەیشی لەلا بێت، نامەیەکی نووسی بۆ هەموو دانیشتوانی شاری مەدینەو دەورو بەری و پێ ی ووتن: سەیر کەن چی فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە هەمووی کۆبکەنەوەو بینوسنەوە،چونکە من لەوە ترساوم،کە زانست لە ناو بچێت و زانایانیش نەمێنن.[٤]

بەو بۆ نەیەشەوە گرنگی تایبەتی دەدا بە زمانی پاراوی و عەرەبی و هانی وڵاتە ڕزگارکراوەکانی دەدا، کە هیچیان عەرەب نەبوون، کە هەوڵ بدەن زمانی عەرەبی بەجوانی فێربن بە جوانی و بۆ ئەو مەسەلەیەش موچەی تایبەتی دانابوو، هەر وەك سزای تایبەتیشی بۆ ئەو کەسانە هەبوو، کە زمانی عەرەبی دەرنابڕن و تێکی

---

١ـ جامع بیان العلم(١/ ٩١ـ ٩٢ ).

٢ـ الأموال لا( ٢٣١، ٢٣٢).

٣ـ فتح الباری(١/ ٢٠٨).

٤ـ عمری بن عبدالعزیز، عبدالستار الشیخ لا٨١.

دەدەن، لەموچەکەی دەبڕین، چونکە دەیزانی، کە فێربوون و تێگەیشتنی زمانی عەرەبی هۆیەکی سەرەکی یە لە تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ.[١]

بەرنامەی عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله لە شێوازی نوسینەوەی فەرمووەدەدا:

بەم نامەو ئاڕاستە جوانانەی پێشووی ئەمیری باوەڕداران بۆ مان دەردەکەوێت، عمر لەم کارە مەزنەدا کۆمەڵێ ڕێ و شوێنی پیشانی ئەو کەسانە دەدا، کە فەرمودەیان کۆدەکردەوە لەوانە:

١ـ هەڵبژاردنی کەسانی شیاوشایستە بۆ ئەو کارە مەزنەدا:

دەبینی (أبو بکر)ی کوڕی (حزم) یەکێکە لە ئەستێرەکانی زانست و زانیاری سەردەمی خۆی و ئیمام (مالك) دەربارەی ئەو پیاوە دەڵێت: تا ئێستا کەسێکی وەك(إبن حزم)م نەبینیوە لە پیاوەتی و تێرو تەسەلیدا، کەسم نەدیوە وەك ئەو خوا هەموو شتێکی پێدابێت، وەك: ئەمیری شاری مەدینە، دادوەری، بەرپرسیاریەتی حەج.

دەڵێت پیاوێکی ڕاستگۆ و، خاوەنی فەرموودەی زۆر بووە، (إبن سعد)یش دەربارەی ئەو پیاوە دەڵێت: زانا بوو، جێگای متمانە بوو، فەرموودەی زۆری لەلا بوو.[٢]

(إبن شهاب الزهری)یش هەر بەو شێوەیە بووە، بەیداخێکی زانیاری بوو، شورەتی هەموو دنیای گرتبوویەوە، بۆیە عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله دەربارەی (زهری) دەڵێت: ئەو پیاوە بە هەند بگرن و بەری مەدەن، چونکە وا نابینم کەسێك مابێت لەو شارەزاتربێت لە بواری فەرموودەدا.[٣]

---

١ـ عمری بن عبدالعزیز – شرقاوی لا١٧٨.
٢ـ سیر أعلام النبلاء(٥/ ٢١٢، ٢١٤).
٣ـ هەمان سەرچاوە لا(٥/ ٣٢٨).

٢ـ دیاری کردنی ئەو کەسانەش، کە زۆر فەرموودەیان لێ وەردەگرن:

عمررحمه الله کەسانێکی تایبەتی دەکردو، بەتایبەتی دیاری دەکرد،کە زۆر گرنگ بن و دەستی بالآیان هەبێت لەو بوارەدا، ئەوەتا بە(إبن حزم) دەڵێت: سود لە (عمرە)ی کچی (عبدالرحمن) وەربگرە، چونکە نزیکتر کەس بووە لە دایکی باوەڕداران(عائشه رضي الله عنها) وەو خاتوو عائشەش شارەزاترین کەس بووە بە ژیان و گوزەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو ماڵەوە لە تایبەت مەندەکانیشی شارەزایە.[1]

ئەم(عمرة) یە کچی عبدالرحمنی کوڕی (سعد)ی(زرارە)ی ئەنصاری یە و لەسەر دەستی عائشەدا پەروەدە بو، باپیریشی (سعدی کوڕی زرارە)یە لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر و برای نەقیب (أسعد کوڕی زرارە)یە و(إبن مدینی) دەڵێت: یەکێك لە زانا خاوەن متمانە نزیکەکان لە عائشەوە.[2]

(الزهری)یش دەربارەی(عمرة) دەڵێت: چووم بۆ لای دەبینم دەریایەکی زانیاری لە بن نەهاتووە.[3]

لە یەکێ لە ڕیوایەتەکاندا دەگێرتەوە، کە فەرمانی داوە بەسەر (إبن حزم)دا کە هەرچی فەرموودەیەك عمری کوڕی خطاب گێڕاویەتی یەوەو کۆی بکاتەوەو بینوسێتەوە، چونکە مەبەستی بوو ڕێ و شوێن سیرەتی فاروقی باپیری بگرێتەوە بەرو، چۆنی یەتی دادوەری و سیاسەتەکانی لە خەرج کردنی زەکات و خێراتەکاندا، هەربۆ ئەو مەبەستەش داوای کرد لە سالمی کوڕی عبداللهی کوڕی عمر، هەموو ئەمانەی لە بەر ئەوە دەکرد، کە بەوردی شوێن بەرنامەو پەیڕەوی باپیری عمری کوڕی خطاب بکەویت و ئەو بکاتە سەر مەشقی ژیانی.[4]

٣ـ داوای لێ کردن فەرموودەی(صحیح) لە فەرمودەی(ضعیف) جیا بکەنەوە:

---

١ـ عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار الشیخ ل٨١.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ سیر أعلام النبلاء(٤/ ٨٠٥).

٤ـ سیرة عمر ، عبدالستار الشیخ ل٨١.

بە جۆرێ بەدوای ئەو فەرموودانەدا بگەڕێن، کە لە پێغەمبەرەوە(ثابت) بووە، وەك چۆن بە (إبن حزم) دەڵێت: هەرچی ئەو فەرمودانە هەیە، کە (صحیحین) و لە پێغەمبەرەوە بە دڵنیایی یەوە هاتوون، بنووسەرەوە، هەروەها فەرموودەکانی عمریش.[١]

(إیمام أحمد)یش لە (العلل)دا هێناویەتی، کە عمرﷺ بە (إبن حزم)ی ووتەوە: هەموو ئەو فەرمودانەی بە دڵنیایی یەوە پێغەمبەری خواوەﷺ پێمان گەیوە بنوسەرەوەو ئەو فەرمودەشانەیشی لە لە(عمرە) وەگێراونەتەوە، بەم کارەیش بەرنامەیەکی جوان ڕاست و دروستی داڕشت بۆ ئەو کەسانەی، کە دوای ئەویش هەڵدەستن بە کۆکردنەوەو نویسنەوەی فەرمودەکان.

٤ـ عمرﷺ خۆیشی پێداچونەوەی فەرمودەکانی کردەوە:

عمری کوڕی عبدالعزیز لە ئاستی زانیاریدا هیچی کەمتر نەبوو لە هەموو ئەو کەسانەی، کە داینابوون بۆ کۆکردنەوەو نوسینەوەی فەرمودەکان، بۆیە خۆیشی بە وتووێژو گفتوگۆ بەژداری زاناکانی دەکرد ، لە ڕاست کردنەوەی ئاستی فەرموودەکاندا، ئەمەش لە بەر ئەوەی زیاتر دڵنیا بێت لە ڕاستی و دروستی فەرموودەکان.

(أبو الزناد عبدالله)ی کوڕی (زکوان القرشی) دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیزم بینی هەموو زاناکانی کۆکردبویەوە، هەموو ئەو فەرمودانەی نوسیبویانەوە تاوتوێی دەکرد لەگەڵیانداو ئەگەر فەرمودەیەکی بدیبایە، کردەوەی موسڵمانانی لە سەر نی یە، دەیفەرموو ئەمە کردەوەی موسڵمانانی لەسەر نی یە.[٢]

ئابەو جۆرە خوای گەورەو پەروەردگار پیاوێکی بەرزی وەك عمری کوڕی عبدالعزیز هەڵخست و کردی بە لوتکەی دەسەڵات، ئەویش بە ڕەسمی و بە فەرمانی دەوڵەت و لەسەر دەستی ئەودا هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەری خواﷺ

---

١ـ مقدمة المسند لا ٢٠، ٢٢.
٢ـ أصول الحدیث لا٨٢.

کۆکرانەوەو ڕزگاریان بوو لە فەوتان، دوەمین سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلام بەڕاستی و دروستی مایەوە، ئەو فەزڵە گەورەیە بە خشرا بە عمری کوڕی عبدالعزیز، هەروەك چۆن ئەو فەزڵە گەورەی درا بە عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه کە پێشنیاری کرد بۆ(أبو بکر الصدیق رضي الله عنه کە قورئان کۆبکاتەوەو بینوسێتەوە، باشتریش فەزڵی کۆکردنەوە موسڵمانان لە سەر یەك قورئان بە خشرا بە(عثمانی کوڕی عفان رضي الله عنه.

## حەسەنی بەسری ئامۆژگاری ئەمیری باوەڕداران دەکات:

کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله چوە سەر کورسی خەلافەت، خێرا حەسەنی بەصری خۆی لێ نزیك کردەوە و بەردەوام ئاڕاستە و ئامۆژگاری چوانی دەکرد و پرۆگرام و بەرنامەی حاکمی دادپەروەری بۆ دەکێشا. ئەم ڕۆڵە چاکەی حەسەنی بەسری لە بەرامبەر خەلیفەی نوێدا بینی، کاری هەموو زانایەکی خواپەرست و خوا ویستە لە هەموو سەردەمێکدا، کە هەوڵ دەدات بڕیار بەدەستان والێ بکات لە بەرژەوەندی و بەرزی ئیسلام حوکم دەربکەن، ئەمەش ئەوپەڕی تێرو تەسەلی کەسایەتی زانایی ڕاستەقینەی (حەسەنی بەسری)مان بۆ دەرکەوێت، کە پەروەردەو فێرکردن و بانگەوازو جیهاد پێکەوە گرێ بدات.

نامەیەك بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز دەنوسێت وپێ ی دەڵێت: بزانە ئەی ئەمیری باوەڕداران، خوای گەورە سەرکردەی بۆ ئەوە داناوە، کە لادەرەکان ڕێك کاتەوە، دەستی ستەمکاران بگرێتەوە لە ستەم لێکراو، پەناگەی هەموو داماوێك بێت.

پێشەوای دادپەروەر، ئەی ئەمیری باوەڕاداران ، وەك شوانێکی بە سۆزوایە بۆ حوشتەرەکانی، بە جۆرێکی وا بەسۆز، کە بۆ سەوزترین و خۆشترین لەوەڕگەیان دەبات و لە شوێنە وشك و ڕەقانەکاندا بە زووی دەیانبات، لە دڕندە دەیان پارێزێت، لە هەموو سەرماو گەرمایەك دەیان پارێزێت.

ئیمامی داپەروەر ئەی ئەمیری باوەڕداران، سەرپەرشتیاری هەتیوانە، خەزێنەی هەژارانە، بچوکەکانیان گۆش دەکات.

ئیمامی دادپەروەر، ئەمیری باوەڕداران، وەك دڵ وایە لە ناو جەستەدا، چاكبوونی ئەو جەستە چاك دەبێت، بەخرابوونی ئەو، هەموو بەشەكانی لەشی خراپ دەبن.

ئیمامی دادپەروەر، ئەمیری باوەڕداران، وەك باوكێكی بەسۆز وایە بۆ جگەر گۆشەكەی لە كاتی منداڵیاندا هەوڵ و تەقەلایان بۆ دەدات، لە گەورەیشدا فێری خوێندەواریان دەكات، تا لە ژیاندایە كاسبیان بۆ دەكات، پارەشیان بۆ هەڵدەگرێت بۆ دوای مردنی.

ئیمامی دادپەروەر، ئەمیری باوەڕداران، وەك دایكی بەزەیی و چاك، كە هەمیشەو هاوڕێ ی كۆرپەیەتی، بە ناڕەحەتی هەڵی گرتووە، بە ناڕەحەتیش بوویەتی، بە منداڵیش گۆشی كردوەو شەوانە شەونخونی لەگەڵدا كێشاوە، بەئارام بوونی ئەو ئارامی بۆهاتووە، جارێ شیری دەداتێ و جارێك لێ ی دەگرێتەوە، بە لەش ساغیەكەی دڵخۆشی دەبێت، بە ئۆف و سكاڵاكانی غەمبارو دڵگران دەبێت.

ئیمامی دادپەروەر، ئەمیری باوەڕداران، وەك نوێنەرو وایە لە نێوان خواو بەندەكانیدا ووتەی خوا دەبیستێت و ئەویش دەیدات بەگوێ ی بەندەكانیدا، ئەو بۆ خوا دەڕوانێت و خواشیان پیشان دەدات، ئەو بەرەو خوا دەڕوات، ئەوانیش بەرەو خوا دەبات، ئەی ئەمیری باوەڕداران هەرگیز وەك ئەو بەندەیە نەبێت لە حوكمڕانی یەكەتدا، كە گەورەكەی ماڵ و منداڵ و سامانەكەی دایە دەستی بۆ ئەوەی بیپارێزێت، كەچی پارەكانی برد بۆخۆی و منداڵەكانی پەرش و بڵاو سەرگەردان كرد، هەژارو ماڵ كاوڵی كردن و پارەكانی لە ناوبردن,

ئەی ئەمیری باوەڕداران بزانە خوای گەورە كۆمەڵێ سزای داناوە لە شەرعدا بۆ ئەوەیە خەڵكی لە بەد ڕەوشتی و پیسی بە دور بگرێت، دەی ئەگەر پێشەوا خۆی خراپەو بەدكاری بكات كێ جێ بەجێ یان بكات! خوای گەورە لە قورئاندا تۆڵەی داناوە بۆ ئەوەی ژیان پارێزراو بێت، دەی ئەگەر پێشەوابكوژێت كێ تۆڵەیان بۆ دەكاتەوە!

ئەی ئەمیری باوەڕداران بیر لە مردن بکەرەوە، کە دۆستەکانت و لایەنگرەکانت فریات ناکەون، دەی توێشوی بۆ بخەو خۆت ئامادە بکە بۆ ڕۆژی ترسناك ـــ ڕۆژی قیامەت ــ.

ئەی ئەمیری باوەڕداران بزانە، کە ئەم ماڵەی ئێستات ماڵی تۆ نی یە، تۆ ماڵێکی تر چاوەڕوانت دەکات، کە زۆر دەمێنیتەوە تیادا، دۆستەکان و خۆشەویستانت دەگەڕێنەوەو وازت لێ دەهێنن، بە تەنیایی لەو چاڵە قوڵە دا بە جێت دەهێڵن، دەی کردەوەی چاك پێش بخە بۆ ئەو ڕۆژەی، کە نەبراو نەدایك و نەباوك و نەخێزان فریات ناکەون.

لە بیرت بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەگەر خەڵکی لە گۆڕەکانیان هاتنە دەرەوە، نهێنی یەکانیانی ناو سنگ ئاشکرا بوو، نهێنی ئاشکرا ببێت و نامەی کردەوکانیش گوناهی گەورەو بچوکیان نەپەڕاندبێت، دەی ئێستا ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ بوارت پێ دراوە، ئەجەلت دواخراوە، ئەمەلت بە ژیانی نەبڕاوە، دەی حوکمی ناو بەندەکانی خوا مەکە بە شێوەی حوکمڕانی نەفامان، ڕێگەی ستەمکارانیان پێ مەگرە، پیاو ماقوڵ و ناوداران سەر نەخەیت بەسەر هەژارو بێ نەواياندا، ئەوانەنە پەیمان نەگرننە ئەستۆ دەزانن لەگەڵ موسڵماندا، ئەو کاتە گوناهی خۆت و خەڵکی و باری قوسی خۆت و خەڵکی دێتە گەردنی تۆ، بەوەنە خەڵتێت، کە خەڵکانێك لە سەر حیسابی قیامەتی خۆشگوزەران بن و خواردنی چەورو بە لەزەت بخۆن لە سەر حیسابی نەمانی خواردنی خۆش و بەلەزەتی تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەمڕۆ سەیری دەسەڵاتی گەورەی خۆت مەکە، بەڵکو سەیری بێ دەسەڵاتی سبەینێ ی خۆت بکە، کاتێ دەکەویتە ناو داوی مردنەوە، لە بەردەمی خوا دەوەستێت و فریشتەکان و پێغەمبەران لە دەورت دان، هەموو ڕووەکان لەو کاتەدا هەر بۆ لای پەروەردگاری زیندو دەڕوانن، من ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەم ئامۆژگاریانەم نەگەیشتوونەتە ئاستی ئامۆژگاری زاناو ژیرمەداندەکان، بەڵام ئەوەندەی پێم کرابێت، کەمتەرخەمیم نەکردەوە تیایدا، ئەم نامەیەم دەنێرم بۆت

وەك دەرمان و چارەسەر بۆ خۆشەویستت، کە چۆن دەرمانی تاڵ و ناخۆش دەکات بەدەمی نەخۆشەکەدا، بەڵام مەبەستی چارەسەرکردنی یەتی، والسلام علیك یا أمیر المؤمنین ورحمة الله وبرکاته[1]

حەسەنی بەسری وەسفی دنیا دەکات بۆ عمر:

حەسەنی بەسری رحمه الله جارێکی تر نامەیەك ئاڕاستەی عمر دەکات و تیایدا وەسفێکی دنیای بۆ دەکات و دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، دنیا ماڵی کاتی یەو گوێزانەوەی لە دوایە، ماڵی مانەوەو حەوانەوە نی یە، باوەکە ئادەم، کە نێردرا بۆ سەر زەوی وەك سزاو دورخستنەوە هێنرا بۆی، ئاگاداربە لێ ی، ئەوەی حەزی پێ دەکات بەجێ ی دەهێڵێت، دەولەمەند تیایدا هەژارە، بەختیار کەسێکە تیایدا، کە خۆی نەدابێت بەدەستی یەوە.

هەرکاتێ ژیرو ئاقڵ مەندان دنیان تاقی کردبێتەوە بۆیان دەرکەوتووە، سەرشۆڕی یە بەشی ئەو کەسەی خۆی دەدات بە دەستی یەوەو دنیا پەرستی دەکات، وەك زەهر وایە کەسێك بە نەزانین بیخوات، ئەوەی نەیناسیبێت حەزی لێ دەکات، دەوەڵاهی مەرگی خۆی پێوەیە، دەی تۆش ئەی ئەمیری باوەڕداران، وەك برینداریك بژی تیایدا، کە لە پێناو چاك بوونەوەدا برینەکەی دەرمان دەکات، قەبوڵی ئازارو سوربوونەوە دەکات، بەڵام لە پێناوی چاك بوونەوەیەکی درێژخایەن.

ئارامگرتن لە بەر نەبونی یەکانی ئاسانترە، لە خۆ گرتن لە سەر توشبونی، ئاقڵ ئەو کەسەیە ئاگادار بێت لێ ی، بە جوانی یەکانی نەخەڵەتێیت، چونکە زۆر بە غەدرو نا پاك و دەست بڕە، خۆی جوانە کات بۆ کڕیارانی وەك بوك وایە، چاوەکان سەیری دەکەن و دڵەکان بۆی لێدەدەن، بەڵام ئەی ئەمیری باوەڕداران سوێند بەو کەسەی محمدی ناردووە بە پێغەمبەر ﷺ لە ناو بەری مێردەکەیەتی، دەی زۆر ئاگات لە فێڵەکانی بێت و خۆت بپارێزە لەخۆ ڕازاندنەوەکانی، خۆش گوزەرانی و شادیەکانی بە دوایدا بەڵاو نارەحەتی دێت، ئەی ئەمیری باوەڕداران ئاوەتەکانی

---

١ـ الحسن البصری (لابن الجوزی) لا ٥٦.

درۆینەیـە، هیواکـانی بـەتاڵ، ڕۆشـنایی یـەکانی لێڵـە، ئـەوەی وازی لێ دەهێنێ سەرکەوتووە، ئەوەی هەوڵی بۆ دەدات لە ناو چووە، ئاقڵ و ژیر ئـەو کەسـەیە کـە لـەو شـتانە بترسـێت، کـە خـوا ترسـاندووەیەتی لێ ی، ئاگـاداری کردونەتـەوە لـە ترسناکی یەکەی، لە ماڵی براوە دەگەڕێتەوە بـۆ مـاڵی هـەتایی مـردنیش هـات ئـەو کاتە دڵنیانی یە دوای بۆ دێت.

دنیا ئەی ئەمیری باوەڕداران ماڵی سزادانە، سامانی تێدا کۆدەکاتەوە کە سـانێك عەقڵیان نی یە، ئەوەی نە شارەزا بێـت پـێ ی دەخـەڵێت، کەسـی ژیروشـێلراو ئـەو کەسـەیە، کـە بـە پـێ ی پێویـست دەرمـانی برینـەکانی دەکـات، لەسـەر تـاڵی دەرمانەکان خۆی دەگرێت، چـونکە چاوەڕوانی چاکبوونەوەیە، لـە ئاکـامی خـراپ دەترسـێت، بـە خـوا ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران دنیـا خەوێکـە، قیامـەت بـە خەبـەر هاتنەوەیە، مردنیش لەو نێوانەدایە، بەندەکانیش لە خەوبینین دان من ئەو ووتەیەی شاعیرت بیر دەخەومەوە، کە دەڵێت:

فإن تنجو من ذی عظمة وإلا فإنی لا أخالك ناجیاً

کاتێ ئەم نامەیەی حەسەنی بەسری رحمه الله دەگاتـە دەسـتی ئـەمیری بـاوەڕداران و دەخوێنێتەوە دەست دەکات بە گریان و هاوار کردن بەجۆرێ کەسانی چوار دەوری دڵیان بۆی دەسووتا، بەدەم گریانەوە دەیووت: ڕەحمەتی خوا لە حەسەن بێت، کە بەردەوام لە خەو بە خەبـەرمان دێنێتـەوە، لـە بـێ ئاگـایی ڕزگارمـان دەکـات، خـوا بیپارێزی، چۆن دڵی بۆمان دەسووتێت و چۆن ئامۆژگاریمان دەکـات، ئامۆژگـارێکی ڕاستگۆو پاراوە.

بەو بۆنەیەوە نامەیەکی نووسی و پێ ی ووت: ئامۆژگاریە بەکەڵکەکانت گەیشتە دەستمان خۆمم پـێ تـەداوی کـرد، بەڕاسـتی دنیـات وەسـف کـرد وەك خـۆی، ژیـر ئەوکەسەیە بە ترسەوەی لێ ی تێدا بژی، وەك بڵـێ ی هەرکەسـێك تیایـدا بڕیاربێـت بمرن حساب بکە مردوون، والسلام علیك ورحمة الله وبرکاته.

کاتێ ئـەم نامـەی عمـر دەگاتەدەسـتی حەسـەن دەڵێـت: دەك خـوا بیپارێزێـت، ئـەمیری بـاوەڕداران چ ڕاسـتگۆیەکە، چ ئامۆژگـاری وەرگرێکـە، خـوای گـەورەو

بالادەست بە دانانی عمر بە ئەمیری باوەڕداران منەتی گەورەی بەخشیوە بە ئوممەت و كردوویەتی بە فەڕو بەرەكەت و ڕەحمەت.[١]

## پێنجەم: هێرشەڕزگاری خوازیی یەكان و هەڵگرتنی گەمارۆی سەر قسطیطنة:

كاتێ عمری كوڕی عبدالعزیز ﷬ بوو بە ئەمیری باوەڕداران، یەكێ لەو كارانەی كردی ئەوە بوو فەرمانی دەركرد بە وەستاندنی فراوان كردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی و نەڕۆیشتن بەرەو جێگا دوورە دەستەكان.

هەوڵی دا سوپای ئیسلام لە ناوچەكانی جەنگ پاشەكشە پێ بكاتەوە، یەكەمین كاری لەم بوارەدا ئەوەبوو، ئەو سوپایە گەورەیەی (سولەیمان) گرنگی پێ دابوو بۆ ڕزگاركردنی شاری(قسطیطنة) لە ڕۆم و (مسلمە)ی برایی كردبووە فەرماندەی و بۆ ماوەی دوو ساڵ گەمارۆیەكی تەواوی ئەو شارەی دابووە بەجورێ دانیشتوانی ئەو شارەی بەتاوەتی هەراسان كردبوو، بەبێ ئەوەی ئامانجی خۆیشی بپێكێت.

عمر﷬ فەرمانی دەركرد بۆ (مسلمە)ی كوڕی (عبدالملك) كەواز لە (قسطیطنة) بێنێت و ئەو سوپایەی كە(سلیمان) خستوویە ڕێ و لە دەریا و وشكانی نی یەوە قورگی ئەو شارەیان پێ گرتبوو، تەنانەت پیاو لە بازاردا بەسەر ولاغەكەیەوە دادەبەزاند و بەبەرچاوی یەوە ولاخەكەیان سەریان دەبڕی و دەیان خوارد، عمریش﷬ زۆر بەوە دلگران بوون و غەباردەبوو، كاتێ بو بە خەلیفە بەینی خۆی خوا هەرچی شتێ كاتی خۆی بە باشی نەزانیبێ بۆ موسڵمانان، زۆر بەخێرایی چارەسەری كردەوە.[٢]

بۆ ئەو مەبەستە نامەیەكی نووسی بۆ (مسلمە) لە ولاتی ڕۆم و داوای لێ كرد دەست لە شاری(قسطیطنة) هەڵبگرێت، لەگەڵ ئەو نامەیەشدا بڕێكی زۆر خواردن و پێداویستی نارد بۆ ئەوەی هانی موسڵمانانیشی دا، تا كۆمەكیان بكەن و دەڵێن:

---

١ـ الزهد للحسن البصری لا ١٦٩.

٢ـ سیرة عمر، لابن عبدالحكم لا ٣٢.

ژمارەی ئەو کۆمەکیانەی بۆی ناردن خۆی دەدا لە(٥٠٠) ولآخ بەبارەوە.[١]

خەلیفە خیاط دەگێڕێتـەوە، کـە سـالّی (٩٩)ی کۆچـیدا عمـری کـوڕی عبـدالعزیز خـواردن و ولآغێکـی زۆری نـاردبوو مـسلمەی کـوڕی سـولەیمان لـە ئـەرزی ڕۆم و فەرمانیـشی دەدا هەرکەسـێك لـە سـوپایی ئیـسلام دۆسـت و ناسـیاوێکی هەیـە لـە ڕۆمەکان، با لەو کۆمەکیانەیان بۆ بنێرێت، فریای خەڵکەکە کـەوت، فـەرمانی پێـدان کە دەست لەگەمارۆ دان و هەوڵی ڕزگاربوو کردنی ئەو شارە هەڵگرن.[٢]

ئەوکاتەی عمررحمه الله چووە سەر حوکم (سمع)ی کوڕی (مالك)ی (الخولانی) کرد بـە والی ولآتی ئەندەلوس و فەرمانیشی پێدا، کە زەویەکان جیا بکاتـەوە، ئـەوەی، کـە بەزۆر داگیرکراون(١/٥) یان لە سەدا بنێن و بە جێ ی بهێڵێن بۆ خاوەنەکانـەکانیان، ڕایشی وابوو ئیتر زەوی فراوان مەکەن، لە بەر ئەوەی ئەو زەیانـە دورەدەسـتن لـە موسڵمانان واز لە(فتوحات) بهێنن.[٣]

بەلآم (سمع) نەی ویست بە تەواوی دەست لە ئەندەلوس هەڵگرێت بۆ یە نامـەی نووسی بۆ عمر و پێ ی ووت: موسڵمانان بڵاو بوونەتەوە، هەموو کـون و قـوژبنێکی ولآتی ئەندەلوسیان گرتۆتەوە، بۆیە ئەوکارەی نەکرد و ئەندەلوسی لەسەر ئیدارەی ئەفریقیا لابرد.[٤]

لەناوچەی ڕۆژهەلآتیش عمررحمه الله نامـەی نـاردبۆ(عبـدالرحمن)،کـەوالی خوراسـان و فەرمانی پـێ کـرد، سـوپایی موسـڵمانان لـەو سـنووورە بوەسـتێت و هـەوڵی فـراوان کردنی خاك نەدات، بەلآم ئـەوان ئـەوەیان پـێ قبـوڵ نـەکرا، ووتیـان: (مـەروە) کـە پایتەختی خوراسان بوو بەشمان ناکات، بەو بۆنەوەیەوە نامەیان نووسی بـۆ عمـری کوڕی عبدالعزیز و ئەویش لە وەلآمیاندا ووتی: خوایە ئەوەی لە سـەرم بـوو کـردم و

---

١ــ تأريخ الطبری لە (عمر بن عبدالعزیز)ی علی لا ١٤٠ وەرگیراوە.

٢ــ تأريخ خليفة لا ٣٢٦.

٣ــ الكامل في التأريخ (١٤/٣)

٤ــ فجر الأندلس حسین مؤنس لا ١٢٦، ١٢٧.

دەی تۆش یارمەتیان مەدە لە غەزادا، ئـەو ناوچـە فراوانـەی ڕزگـارت کـردوە بۆیـان بەسیانە.[١]

وولاتی (السند)یش لە ڕێگەی نامەی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله موسڵمانان بوون، کە لە نامەکەیدا بانگی کردبوون بۆ موسڵمان بوون و پێ ی ووتن: چی بۆ موسـڵمان هەیـە بـۆ ئەوانیـشەو چـی لەسـەر موسـڵمانە لەسـەر ئەوانیـشە، ئـەوانیش ژیـان و بەرنامەی کاری پڕ لە دادپەروەریەکانی ئەویان بیـستووە، بۆیـە پاشـاو سـوپاکەیان موسڵمان بـوون و نـاوی خۆیـان هـەموو گـۆڕی بـۆ نـاوە ئیـسلامی یـەکان، عمـریش عەمری کوڕی موسلیمی باهیلی کرد بە ئەمیریان.[٢]

خەلیفـەی کـوڕی خـەیاتیش دەڵێـت: عمـری کـوڕی عبـدالعزیز نامـەی نـارد بـۆ (جـراح)ی کـوڕی (عبـدالله)ی (الحکمـی) وپـێ ی ووت: ئـیتر هێـرش و پـەلامار بووەستێنن، ئەوەی لە ژێر دەستاندایە بەستانە.[٣]

ئـەم کـارەی عمـری کـوڕی عبـدالعزیز پـێ ی هەسـتا، تایبـەت بـوو بـە جـەنگ و پـەلاماردانی ئـەو ناوچـانەی کـە زۆر دووەرە دەسـت بـوون ولـە پایتەختـەوە زۆر دووربوون، بۆ خۆ یەکلایکردنەوە ئەم کارەی کـرد تـا بتوانێـت نێـو مـاڵی ئیـسلامی بخاتـەوە یـەك و ئـاگری ئـاژاوەو نـەیاری یـە ناخۆیـەکان بکوژێنێتـەوە، هـەرگیز مەبەستی ئەوە نەبووە، کە ئەو دەزگا سەربازیە لە کار بخات، کـە دامەزراندنەکـەی دەگەڕایەوە بـۆ سـەردەمی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، کـە ڕۆڵێکـی سـەرەکی هـەبوو لـە پارێزگاری لە سەروەری دەوڵەتی ئیسلام فراون کردنی سنورە جوگرافیـا یەکـەی و پاراستنی ئەمن و ئاسایش و دامەزراوی وولات.

لە ڕاستی دا بوونی ڕێخراوەی جـەنگی پەیوەسـتە بـەناو کرۆکـی ژیـانی مـەدەنی یەوە، هیچ دەوڵێك بەبێ بوونی ئەو دەزگایە ناکرێت، بۆ ئەو مەبەستە هەموو دەزگا

---

١ــ تأریخ الطبری لە (عمر بن عبدالعزیز)وەی علی(١٤١) وەرگیراوە.

٢ــ فتوح البلدان لا ٤٢.

٣ــ تأریخ خلیفة لا ٢٢٦.

سەربازی یەکانی هەرێمەکانی هێشتەوە، کە سەرچاوەی سوپا ڕزگاری خوازە گەورەکەی ئیسلام بوون، لای نەبردن و هەڵیشی نەوەشاندەوە، لەماوەی کورتی خیلافەتیدا بەردەوام لە زۆری لە بەرەکانەوە جەنگ و پێکدادان لەگەڵ ڕۆمەکان ڕوی داوە.

لەناوچەی (ئازربایجان) تورکەکان هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکان، کۆمەڵێ لە موسڵمانیان شەهید کرد وسامانیشیان بە تالان بردن عمری کوڕی عبدالعزیزیش سوپایەکی بەسەرکردایەتی (حاتم)ی کوڕی (نعمان الباهلی) نارد بۆیان و ئەو تورکانە، یان هەمووکوشت، تەنها چەند کەسێکی کەم لە دەستیان دەرچوو، بە (٥٠) دیلەوە گەڕانەوە بۆ خەناسیرەو هاتنەوە خزمەت خەلیفە.[١]

لەساڵی(١٠٠)ی کۆچیدا ڕۆمەکان لە کەناری دەریاوە هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکان لە (لازقیە)و شارەکەیان خاپور کردو ژن و منداڵەکانیشیان هەموو کوشتن، عمر فەرمانی دەرکرد شارەکەیان دروست کردەوەو قەلای بە هێزیشیان بە چوار دەوریدا دروست کرد.[٢]

لە ساڵی(١٠١)ی کۆچیدا غەزوی وەلیدی کوڕی هیشامی(المعیطی) و عەمری کوڕی قەیسی(الکندی) کرد لە شاری (حمص).[٣]

فەرمانیشی دەرکرد بە ڕاگوێزکردنی لادێ سەرسنورەکانی بەرامبەر ڕۆمەکاندا بوو، ئەمەش لەبەر خاتری ئەوەی توشی نارەحتی و تالان و بڕۆ نەبن بەدەستی ڕۆمەکان.[٤]

هەروەها نیازی کرد شاری(المصیصە) بڕوخێنێ، چونکە بەلەبەرپی ی هێرشی ڕۆمەکان، بەلام پاشتر وازی لێ هێناو مزگەوتێکی گەورەی لە (کفریا) بۆ دروست

---

١ـ تأریخ خلیفة لا٣٢٦

٢ـ فتوح البلدان لا٢٠٧.

٣ـ تأریخ الطبری لە (عمر بن عبدالعزیز)وەی علی(١٤٢) لا وەرگیراوە.

٤ـ فتوح البلدان لا٢٢٠.

کردن و حەوزێکی ئاوی گەورەی بۆ دروست کردن و ناوی خۆی لێ نووسیبوو[١]، کردی بە سەرچاوەیەکی گرنگ و مەڵبەندێکی جەنگی بۆ نەهێشتنی ترسی ڕۆمەکان لە ئەنتاکیە[٢].

عمر لەگەڵ ئەم کارە دڵسۆزانەیدا لەگەڵ شوێنە دوورە دەست و سنوری یەکان ئەم هەنگاوانەی نا، بەڵام خۆ لە لایەکی ترەوە بزاڤی هێرشە ڕزگاری خوازیەکانی نەوستان و دوای ئەویش هەر بەردەوام بوو، لە هەمان کاتیشدا خاوەنی سوپایەکی زۆر بەهێزبووەو خۆیشی زۆر توند بوو لەگەڵ دوژمناندا، کاتێ بینیبێتی ناڕەوای و ستەمێکیان لە موسڵمانێك کردبێت وەك پێشتر باسی ئەو دیلە موسڵمانەمان کرد، کە لە پێناوی ئاینەکەیدا چۆن قبوڵی کرد هەردوو چاوی هەڵبکۆڵن، بەڵام نەبێت بەگاور، کە چۆن عمرﷺ سوێندی خوار سوپایەکی وای بۆ دەربکات، کە سەرتاکەی لەڕۆم بێت کۆتایەکەی لەلای خۆی.[٣]

سیاسەتی عمرﷺ قۆناغ بەندی بوو، دەیویست سەرەتا سنورەکان تۆکمەو قایم بکات و لە هێرشی لاوەکی ڕۆمەکان بێ خەم بێت، گرنگی دەدا بە کردنەوەی عەقلەکان و دڵەکان، پاك کردنەوەی دەرونی ئەو گەلە تازانەی، کە هاتبوونە ناو ئیسلامەوە، بۆ ئەو مەبەستە دەستە دەستە زانایان و بانگ خوازانی بەرەوە دەشت و بیابانەکان دەخستە ڕێ وبۆ ڕۆشنبیرکردنی ئەو گەلانە بە بەرنامەی بێ گەردی ئیسلام، کە لەوکاتەدا زۆر پێویستیان بەوە بوو.

## شەشەم: گرنگی دان بە بانگەوازی گشت گیری ئیسلام:

عمری کوڕی عبدالعزیزﷺ هەموو گرنگی یەکی بەوە دابوو، کە نێو ماڵی ناخۆی موسڵمانان تۆکمە بکاتەوەو یەکریزی و ئاسایشی بپارێزێت، زانست و زانیاری بگەیێنێتە تاکە تاکەی ئومەت بەپێ ی توانا.

---

١- هەمان سەرچاوە لا ١٦٣.

٢- العلاقات العربية البيزنطة لا ١١٩.

٣- هەمان سەرچاوە لا ١٣١.

هەروەك دادپەروەری زیندوکردەوە لە ناو خەڵكدا هەموو ڕق و كینەو دوبەرەكی نێوان موسڵمانی نەهێشت،عمر لەم كارە مەزنەیدا مەبەستی ڕاكێشانی دڵ و عەقڵ و دەرونی خەڵكی بوو بۆلای بەرنامەی ئیسلام، بۆ ئەو مەبەستەش پرۆژەیەكی گەورەی گرت بەدەستەوە، بۆ ئەو مەستەش كۆمەڵێ هۆكاری گرنگی گرتە بەر لە پێناو سەركەوتنی ئەو پرۆژە بانگخوازی یەیدا لەوانە:

## یاسای خۆیەكلایی كردنەوەی بانگخوازان( نظام التفرغ ):

عمر رحمه الله كۆمەڵێ لەزانایان و بانگخوازانی یەك لاكردەوە بۆ ئەوەی هەستن بە تێگەیاندن و ڕۆشەنبیركردنی گەل و بۆ ئەو مەستە موچەی تایبەتەشی بۆ بڕینەوە، تا هیچ جۆرە كاسبیەكی تر نەكەن و هەموو هەوڵ و كۆشێشێكیان سەرخستنی ئەو پرۆژە مەزنەی عمر بێت و بەس.[1]

قورئان خوێنانی تەرخان كرد بۆ فێركردنی لە جوان خوێندنەوەو تێگەیشتنی تەجویدو ئەحكامە شەرعی یەكانی، هەروەها فەرمودەزانەكانی تایبەت كرد بۆ دانانی دەرس و هەڵقە زانستی یەكان لە مزگەوت و شوێنە گشتیەكانداو فەرموودەی پێغەمبەری خوا فێری خەڵكی بكەن.

هەروەك فوقەهاو شارەزایانی شەریعەتی ئیسلامی تەرخان كرد تا حوكمی نوێ لە قورئان و سوننەت دەربهێنن بۆ خەڵكی و فێریان بكەن لە حەڵاڵ و حەرام و شارەزایان بكەن لە ڕێنموونی یەكانی ئیسلام.

قوتابیانیشی یەكلای كردەوە بۆ فێربوون و وەرگرتنی زانست و زانیاری و مووچەی تایبەتی بۆ بڕینەوە تا خەمی ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان نەمێنێت، لە (بیت المال) مووچەیەكی ئەو تۆی بۆ بڕینەوە تا بەسەر بەرزان بژین و ئەمە كاری ئەو خەلیفە مەزنە بوو بە هۆی ئەوەی زۆرێك لە خەڵكی دەست بدەنە فێركردن و بڵاوكردنەوەی زانستەشەرعیەكان و گەنجانێكی زۆریش خۆیان بخەنە بەردەستیان و بەدونیای زانست و زانیاری بەهرەمەند ببن، لەپاشە ڕۆژیشدا ببنە خزمەتكارێكی

---

١ــ ملامح الإنقلاب الإسلامی لا ١٨٤.

گەورەی ئیسلام و ئەوانیش بیگەیەنن بەنەوەکانی دوای خۆیان.[١]

لە (بیت المال) بڕی (١٠٠) دیناری بۆ بڕیەوە، بۆ هەرزانایەك لە مزگەوتێکی وڵاتانی ئیسلامدا هەڵقەیەکی زانستی دابنێت بۆ بڵاکردنەوەی زانیاری و فقهی ئیسلامی و تنەوەی قورئان خوێندن و لە بەرکردنی.[٢]

لە (أبی بکر)ی کوڕی (أبی مریم)ەوە دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ والی حمص و پێ ی ووت: فەرمان بدە بە پیاوچاك و شارەزایان، کە لە (بیت المال) موچەیەکی وایان بۆ بڕێتەوە، کە پێویستیان بە کاسبی نەبێت، هەموو کاتیان خەریکی ووتنەوەی وانە بن و فەرمودە بگەیەنن.[٣]

لە(أبی مریم)ەوە دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ والی حمص و پێ ی ووت: بڕوانن بۆ ئەو کەسانەی خۆیان تەرخان کردوە بۆ وتنەوەی وانەی (فقە) دەستیان بڕاوە لە کارو کاسبی دەرەوە، دەی هەر یەکە لەو کەسانە(١٠٠) دیناری بۆ ببڕێتەوە لەگەڵ گەیشتنی ئەم نامەیەدا تا ژیانی خۆیانی پێ مسۆگەر بکەن باشترین کاری چاکەش ئەو کارەیە بە پەلە بکرێت، (والسلام علیك).[٤]

موچەی تایبەتیشی بڕیەوە بۆ ئەو کەسانەی هەڵقەیان لە مزگەوتەکاندا هەبوو بۆ باسکردنی جەنگ و غەزاکانی پێغەمبەری خواﷺ و ژیانی هاوەڵە بەرێزەکانی، کە ئەو کەسانە بە چیرۆك و خوان موچیاران ناسرابوون.

(إبن شیبە) دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله کاتێ والی مەدینە بوو فەرمانیدا بە پیاوێك، کە چیرۆك بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە مانگی(٢) دیناری بۆ

١ـ عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار الشیخ. لا ٧٢
٢ـ ملامح الإنقلاب الإسلامی لا ١٨٤
٣ـ أصول الحدیث لا ١٧٨.
٤ـ البدایة والنهایة لة عمر بن عبدالعزین، عبدالستار الشیخ. لا ٧٢ وەرگیراوە.

بڕیەوە، کاتێ (هیشام)ی کوڕی (عبدالملك) سەردانی شاری مەدینەی کرد ساڵی (٦) دیناری لە لایەن خۆیەوە بۆ بڕیەوە.[١]

لە نامەکانیدا هاتووە دەربارەی بڕینەوەی مووچە بۆ قوتابی و خوێندکاران تا یەکلا ببنەوە بۆ زانست و زانیاری، (إبن عبدالبر) لە (یحیی)ی کوڕی (إبن کثیر)ەوە دەگێڕێتەوە، کە عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نووسی بۆ کاربەدەستێکی و پێ ی ووت: بۆ قوتابی و وەرگرانی زانست ڕۆژی تایبەتیان بۆ دیاری بکە، یەکلاییان بکەنەوە بۆ زانست و زانیاری.[٢]

٢ـ هانی زانایانی دەدا، تا زانست بڵاو بکەنەوەو ڕاییبگەیەنن:

فەرمانی دەرکرد، کە مزگەوت بکەن بە مەڵبەندی پەروەردە کردن و فێرکردنی خەڵکی دەربارەی ئاینەکەیان، قورئان خوێندن پێیان و گوێ لێ گرتنیان، گەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ و زیندو کردنەوەی سوننەت.[٣]

(عکرمە)ی کوڕی (عمار) کە پیاوێکی خەڵکی یەمەنە دەڵێت: گوێم لێ بوو نامەی عمری کوڕی عبدالعزیزیان دەخوێندەوەو دەیووت: فەرمان بدە بە زانایان با لە مزگەوتەکاندا زانستەکەیان بەگەیەنن، چونکە وادیارە سوننەت مرێنراوە.[٤]

(إبن عبدالبر) سەنەدی بۆ داناوە لە (جعفر)ی کوڕی(قان الرقی)وە دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نوسی بۆمان و پێ ی وتین: فەرمان بەئەهلی فقە و خاوەن زانستەکان بکەن تا لە کۆڕو دانشتنی مزگەوتەکاندا ئەو زانستەیان بگەینن بگەینن بە خەڵکی، کە خوای گەورە پێ ی بەخشیوون.[٥]

٣ـ ڕێنونی گەلی موسڵمان دەربارەی گرنگی زانست و زانیاری:

لەو بارەیەوە دەڵێت: ئەگەر توانیت هەوڵ بدە زانا بیت، ئەگەر نەتتوانی

---

١ـ أخبار المدینة لة عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار الشیخ. لا ٧٢ وەرگیراوە.

٢ـ جامع بیان العلم(١/ ٢٢٨) .

٣ـ أصول الحدیث لا ١٧٨ .

٤ـ أصول الحدیث لا ١٧٨.

٥ـ جامع العلم(١/ ١٤٩).

فێرخواز بە، ئەگەر ئەوەشت نەتوانی خۆشت بوێن، ئەگەر ئەوەشت بۆ نەكرا، هەوڵبدە ڕقت نەبێت لێیان، پاشان ووتی: خوای گەورە بوارەكەی بۆ فراوان كردوە، ئەگەر وەری بگرێت.[1]

٤ـ ناردنی زانایانی خواناس بۆ سەرووی ئەفریقیا:

عمری كوڕی عبدالعزیزرحمه الله زانایانی دەنارد بەناو هەرێمەكاندا، بەڵكو بۆ ناو بیابان و دەوار نشینەكانیش، تاشەرعی خوا بگەیەنن بەوناوچانە،تێیان بگەیەنن لێی، بۆ ئەو مەستە(یزید)ی كوڕی (أبی مالك)ی نارد بۆ لای بیابان نشینەكان تا لە ئیسلام و ئەحكامی شەرع ئاشنایان بكەن و موچەیشی بۆ بڕیەوە لەگەڵ كەسێكی تردا، كەناوی(حارث)ی كوڕی (محمد)بوو، بەڵام (یزید) قبوڵی موچەی كرد، بەڵام (حارث) قبوڵی موچەی نەكرد، ووتی: من لە سەر گەیاندنی ئەو زانستەی خوا فێری كردوم پاداشت و پارەم ناوێت.

كاتێ ئەو هەواڵە گەیشتە عمررحمه الله فەرمووی: ئەوەی (یزید) دروستەو هیچی تێدا نی یە، داوا كاریشم لە خوا وێنەی (حارث)مان تێدا زۆر بكات.[2]

ئەم وەڵامەی عمررحمه الله ئەوە فێری حوكمڕانان دەكات، كە چۆن دەبێت نەرم بن بەرامبەر بۆ چوونە جیاجیاكان، نەنواندنی ووشكی فكری و یەك شێوەیی، ئەوەی ڕون كردەوە، كە وەرگرتنی مووچە لە بەرامبەر خزمەت گوزاری زانستیدا هیچی لە سەر نی یەو دروستە، لە بەرامبەر ئەم فەتوایەشدا، ڕووی كردە خوای گەورەو دوعای خێری بۆ دوەم كرد و داوای زیاد بوونی نموونەی لەو جۆرە كەسانەی لێ دەكرد، كە لە پێناوی گەیاندنی ئاینی پاكی خوادا هیچ پارەوپولێكیان ناوێت و بە تەمای پاداشتن لە خوای باڵادەست.[3]

ئەمیری باوەڕداران‌رحمه الله زانای خاوەن متمانەو پایە بەرزی شاری مەدینە(نافع) مەولای (إبن عمر)ی نارد بۆ ناو میسریەكان، عبداللهی كوڕ عمر دەڵێت: عمری كوڕی

---

١ـ سیرة عمر لابن عبدالحكم لة (عمر)ی زحیلی وەرگیراوە لا ٧٤.

٢ـ سیرة عمر لابن عبدالحكم لا ١٦٠.

٣ـ ملامح الإنقلاب الإسلامی لا ١٨٤.

عبدالعزیزرحمه الله (نافع)ی نارد بۆ ناو خەڵکی میسر تا هەموو سوننەتەکانی پێغەمبەری خوایانﷺ فێر بکات.[١]

لە میسریشەوە (١٠) کەس لەگەورە زانایی تابیعینی نارد بۆ وڵاتی ئەفریقیا، تا خەڵکەکەی لە ئیسلام شارەزا بکەن و فێریان بکەن، فەرموودەی پێغەمبەری خوایانﷺ لە ناودا بڵاو بکەنەوە، تا لەو خێرو بێرە بەهرەمەند بن، کە براکانیان لە شام و حیجاز و عیراق پێ ی بەهرەمەند بوون، کە سەرچاوەی زانست بوون.[٢]

باکوری ئەفریقیا زۆر گرنگ بوو لە لای عمر و هەوڵی دەدا دڵیان ڕابکێشێت و عەقڵ و دەرونیان داگیر بکات و بەنوری بەرنامەی خوا ڕووناکی بکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە ئەو (١٠) زانا مەزنەی نارد و لەو بارەیەوە مەبەستەکانی خۆی بەو هەرێمە گەورەیە ڕون کردەوە لەم خاڵانەدا:

١ـ هەڵبژاردنی زانایانی خواناس و ناسراو بە زانایی و فقه و بانگەواز و خۆ یەکلاکەرەوە بۆ پەروەردەو فێرکردن تێگەیاندن.

٢ـ دانانی نەخشیەکی داڕژاو بۆ یەکلاکردنەوەی زمانی عەرەبی، نەهێشتنی نەخوێندەواری ناو هۆزە بەربەریەکاندا، تا پاشتر بتوانێت بە جوانی لە قورئان و سوننەت تێ بگات و کاریان پێ بکات.

٣ـ گەیاندنی بیروباوەڕی ڕاست و دروستی ئەهلی سوننە لەو ناوچانە.

٤ـ فێرکردنی خەڵکی لە مەسەلەی حەڵاڵ و حەرام.[٣]

فەڕو بەرەکەتی سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیز لە وێدا ڕژا یەسەر ئەفریقیادا، کە ئەمرێکی صالح و باشی بۆ دیاری کردن و کۆمەڵێك لە زانایان و فەقەهایانی خواناسی ناردە ناویان، کە ئەمە ناوەکانیانە بە کورتی:

١ـ (إسماعیل)ی کوڕی (عبیدالله)ی (أبی مهاجر):

---

١ـ سیر أعلام النبلاء(٩٧٩).

٢ـ عمر بن عبدالعزیز لعبدالستار الشیخ لا ٦٩.

٣ـ الشرق والتسامی بحرکة الفتح الإسلامی للصلابی لا ٢٠٦، ٢٠٧.

لە ساڵی ٩٩ـ ١٠٠ی کۆچیدا ئەمیری باوەڕداران ناردی بۆ ئەفریقا بە ناونیشانی ئەمیر، بەڕاستی بوو بە باشترین ئەمیر، لەگەڵ ئەو ئەمیرەدا (١٠) زاناو شارەزای خواناسی نارده ناویان بۆ ئەوەی لە ئاینی پاکی

خودا تێیان بگەیەنێت و حەڵاڵ و حەرامیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە[1]، ئەم ئەمیرە تابلۆ ی دنیا نەویست و بێ فیزبووە، لە ناو وڵاتدا بە دادپەروەری ناوی دەرکردبوو، فەرمودەکانی پێغەمبەری خوای زۆر چاك لە بەردەکرد(إبن عساكر) دەڵێت: (إسماعيلی کوڕی عبيدالله) دەڵێت: دەبێت فەرمودەکانی پێغەمبەری خواﷺ لە بەر بکەن هەروەك چۆن قورئان لەبەردەکەن، بۆ ماوەی (٢١) ساڵ لە قەیرەوان بەردەوام بوو لە سەر هیدایەتدان و ڕێ نموونی خەڵکی تا ساڵی (١٣١) گیانی پاکی بە خوای خۆی سپارد.[2]

ناوی ئەو زانایانەی، کە ناردی بۆ ئەفریقیا بەم جۆرە بوون:

١ـ (بکر)ی کوڕی (سواده الجذامی) ئەم زانا بێ وێنەیە زیاتر (٣٠) ساڵ پێشەوایەتی فقە و فەرمودەو فەتوا بووە لە قەیرەوان، توانی فەرموودەی پێغەمبەری خواﷺ بگەینێتە ئەو کیشوەرە ڕەشە هەر لە ساڵی (١٢٨) گیانی پاکی بە خوای خۆی سپارد.[3]

٢ـ (أبو سعيد) (جعثل)ی کوڕی هاعان الرعينی:

(إبن حجر)ی کوڕی (إبن عرب) بە یەکێ لە زانایانی تابیعینی دادەنێن، فەرموودەزانێکی فەقیە بووە، بۆتە دادگای سەربازگە لە شاری قەیرەوان، بۆ ماوەی (١٥) ساڵ زانستی لەو ناوچەیە بڵاوکردەوە، زۆربەی زانا هەڵسەنگێنەرەکان ـ نقاد ـ بە پیاوێکی خاوەن متمانە ـ ثقة ـ لە قەڵەمیان داوە و أحمدی کوڕی

---

١ـ تأريخ الفتح العربی في ليبيا لا ١٤٨.

٢ـ مدرسة الحديث بالقيروان(٢/ ١٤ـ ٢٢).

٣ـ مدرسة الحديث بالقيروان(٢/ ١٤ـ ٢٢).

حنبل ڕیوایەتی لێوە کردووە لە سەردەمی هیشامی کوڕی عبدالملك داو لە ساڵی ١١٥ی کۆچیدا دوای کردووە.[١]

٣ـ (حبان)ی کوڕی (جبله القرشی):

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله ناردی بۆ ناو خەڵکی میسر تا لە ئیسلام شارەزایان بکات، فەرموودەکانی لای: (إبن عباس) و(إبن عمر) و (عبداللەی کوڕی عەمر ) بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ زانستی لە شاری قەیرەوانی پایتەختی ئەفریقیادا بڵاوکردەوتەوە، بخاری لە (أدب المفرد)دا و (حاکم) لە (المستدرك)را فەرموودەیان لێوە ڕیوایەت کردووە، لە ساڵی (١٢٥) کۆچیدا گیانی پاکی بە خوای خۆی سپارد.[٢]

٤ـ (أبو مسعود) (سعید بن مسعود التجیبی):

فەرموودەی لە هاوەڵانی وەك(أبو درداء)وە ڕیوایەت کردوە، تەنانەت لە پێغەمبەری خواﷺ فەرموودەی بە (مرسل) گێڕاوەتەوە تاوای لە هەندێ کردەوە، کە لێ ی تێك بچێك و بە هاوەڵانی بزانن، بەڵام هاوەڵی پێغەمبەریﷺ نەبووە، کۆڕو هەڵقەکانیانی پڕبووە لە دەرس و پەندو ئامۆژگاری، بەرامبەر کاربەدەستان زۆر توند بووە، کۆمەڵێك لە خوێندکارانی قورئان لە قیرەوان لە بەردەستی ئەو بەرێزە بوون بە گەورە زانایانی ئەفریقیا.[٣]

٥ـ (طلیق)ی کوڕی (جعبان الفارسی):

ئەم پیاوە یەکێکە لە زانایانی تابعین و عمری کوڕی خطابی بینیوەو پرسیاری لێ کردەوە، لە (موسی)ی کوڕی (علی) و(إبن أنعم) لە سەر دەستی ئەو گەیشتنە پلەی زانایانی و زانستێکی زۆری لە ناو قەیرەواندا بڵاو کردەوە، بەڵام زانایان باسی کاتی مانەوەی لە قەیرەوان و ساڵی کۆچی دوایی یەکەی ناکەن.[٤]

---

١ـ مدرسة الحدیث بالقیروان(٢/ ١٤ـ ٢٢).
٢ـ هەمان سەرچاوە (٢/ ١٤/ ٢٢)
٣ـ مدرسة الحدیث بالقیروان(٢/ ١٤ـ ٢٢)
٤ـ عصر الدولتین الأمویة والعباسیة لا ٤٥.

٦ـ (عبدالرحمن)ی کوڕی (راضح التنوخی) (أبو جهم):

لە زۆر زووە ڕۆیشتۆتە ناو قەیرەوان، کە مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی(٨٠)ی کۆچی، بەڕێزترین دادوەرەکانی ئەو ناوچەیە بوو، بەردەوام بۆ ماوەی (٣٠) ساڵ زانست و زانیاری بەو ناوچەیە بە خشیوە، یەکەمین کەس بوو بە دادوەری ـ قاضی ـ شاری قەیرەوان لە ساڵی (١١٢) کۆچیدا گیانی پاکی سپاردوە.[١]

٧ـ (عبدالله)ی کوڕی (المغیرة) الکنانی:

پێش ئەوەی عمری کوڕی عبدالعزیز بە (فەرمی) بینێرێت بۆ قەیرەوان، پێشتر ماوەیەکی زۆر لە ناو خەڵکی ئەو ناوچەیەدا مابوویەوە، لەو ناوەدا زۆر ناسرابوون بە موسڵمانی یەتی و دادپەروەری، لە ساڵی(٩٩) کۆچیدا(عمر) وەك قازی قەیرەوان ناردی بۆ ئەوەێ و لەسەر ئەو کارەی بەردەوام بوو، تا ساڵی (١٢٣)ی کۆچی، کە خۆی دەستی لە کار کێشایەوە، پیاوێکی باوەڕدارو دونیا نەویست بووە، بۆ ماوەی (٢٥) ساڵی زانستی قورئان و سوننەتی گەیاندە ئەو ناوچەیە، (إبن حبان) بە یەکێ لە (الثقات)ناوی دەبات.[٢]

٨ـ (عبدالله)ی کوڕی (یزید)ی المعافری:

هەر لە سەرەتاوە ڕۆیشتە ناو شاری قەیرەوانەوە، کاتێ لە گەڵ (موسی)ی کوڕی (نضیر) دابوو، لە ساڵی (٨٦)ی کۆچیدا، لە ڕزگارکردنی ئەندەلوس[٣]دا بەژداری کردوە، پاشان گەڕایەوە بۆقەیرەوان و لەوێ مزگەوتێکی دروست کرد و لە تەنیشتیدا خانووەیەکی بۆ خۆی دروست کردو کردی بە مەڵبەندێکی بڵاوکردنەوەی زانست و فەرمودەکانی پێغەمبەری خواﷺ، لە ساڵی (١٠٠) کۆچیدا عمری کوڕی عبدالعزیز دووبارە لەگەڵ(١٠) زنادا، کە ناردیەوە بۆ ئەوێ و هەر لە کۆتایی ئەو ساڵەدا کۆچی دوای کرد، پاش ئەوەی سودێکی گەورەی گەیاند بەوناوچەیە،مسلم و أحمد فەرمودەیان گێڕاوەتەوە.[٤]

---

١ـ عصر الدولتین الأمویة والعباسیة لا ٤٥.
٢ـ هەمان سەرچاوەلا ٤٦.
٣ـ أندلس: ئەسپانیای ئێستا.
٤ـ هەمان سەرچاوە.

٩ـ (وهب)ی کوڕی (حی) المعافری:

له ڕزگارکردنی ئەفریقیەدا بەژداری کردوە، یەکێك بوو لەو نۆ زانایانەی، کە عمری کوڕی عبدالعزیز ناردی بۆ ڕوناکبیرکردنی کیشوەری ئەفریقیا، لە قەیرەوان نیشتەجێ بوو، تیا ژیا تا کۆتای ژیانی و هەموو فەرمودەکانی (إبن)ی گەیاندە ئەو ناوچەیە، لە هیچ سەرچاوەیەکدا نە هاتووە، کە لە کەدار کرابێت لە بواری (الجرح والتعدیل) دا.

ئابەو جۆرە عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله چاکترین و باشترین زانایانی تابیعینی سەردەمی خۆی نارد بۆ باکوری ئەفریقیا، تا هەوڵ بدەن دانیشتوانی ئەو دەڤەرە لە ئیسلام و ئەحکامی شەریعەت شارەزا بکەن، بەڕاستی بەو شێوەیە دەرچوون، کە عمر گومانی پێ بردن و لەو لاتەدا بوونە سەر مەشقی چاکەو خواناسی و پێش ئەوانیش زانایانێکی زۆری تابیعین لەو ناوچەیە ڕۆڵیان هەبووەو بەرنامەی ئیسلامیان بۆ خەڵکی ڕۆشن کردۆتەوە.[1]

ئەو دە کەسە پاش خۆیان شوێنەوارێکی گرنگیان بەجێ هێشت لە قورئان و تەفسیرو فەرمودە، بلاوکەرەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەکردەوەکانیان و بەبیروباوەڕی ڕاست دروستەکەیانەوە، هاوکاری دەوڵەتی ئیسلامی بوون لە بەگژداچونەوەی بیرۆکە لادەرەکانی ناوەوە، جیگیرکردنی حوکمی ئیسلامی لە ناو بەربەرەیەکاندا، (مالکی) دەگێڕتەوە: کاتێ خەواریجەکانی هەستان دژی(حنظلة)ی کوڕی(صفوان) لە(طنجة) ساڵی (١٢٢) کۆچی و(حنظلة)یش هەموو زانایانی ئەفریقیای کۆکردەوە، کە کاتی خۆی عمری کوڕی عبدالعزیز ناردبوونی بۆ ئەوێ تا هەوڵ بدەن خەڵکەکە لە ترسناکی بۆچونی خەواریجەکان ئاگادار بکەنەوەو لە ئاینی ڕاستە قینە تێیان بگەینن و ئەوانیش پێکەوە ئەم نامەیان نوسی، تاموسڵمانان بەگشتی کاری لەسەر بکەن و باوەڕیان بەناو کرۆکەکەی هەبێت.

هەموو زانایان و زانست داران بە خواو قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ئەو دەزانن، کە هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەگەڕێتەوەبۆ(١٠) ڕەوشت.

---

١ـ عصر الدولتین لا ٤٧.

(فەرمان، بەرگری، مژدەدان، ترساندن، هەواڵدەر، ئایەتی مانا دیار، ئایەتی مانا نادیار ـ متشابه ـ، حەڵاڵ، حەرام، نموونە )

(فەرمانبەچاکە، بەگری کردن لە خراپە، مژدەی بەهەشت، ترساندن لە ئاگری دۆزەخ، هەواڵی خەڵکانی پێشوو و داهاتوو، مانا دیار بۆ کارپێکردن، مانا نادیار بۆ باوەڕ پێکردن، حەڵاڵ دەبێت بکرێت، حەرام دەبێت نەکرێت، نمونە بۆ پەندو ئامۆژگاری.

ئەوەی بە گوێ ی فەرمان بکات، دور بکەوێتەوە لە قەدەغەکراوەن، دڵخۆش بکات بە مژدەکان، بترسێت لە هەڕەشەکان، حەلاّل بە حەلاّل بزانێت، حەرام دابنێت، ئەوەی ماناکای نادیار بیگەڕێنێتەوە بۆ لای خوا، لەگەڵ گوێ ڕایەڵی چاك و نیەتی پاکدا، ئەوە براوەیە سەرکەوتووە، لە دنیاو ئاخیرەتدا ژیان بۆ ئەوە.[1]

ئەم نامەیە وەك بەڵگە نامەیەکی زۆر گەورەو گرنگە، چونکە مانای ئەوە دەگەیەنێت، کە تا چ ئەندازەیەکی بێ سنور ئەو زانایانەی عمر ناردنی بۆ باکوری ئەفریقا چەند زیرەك بوون، ئامانجیان ڕوون و شەرعی بووە، چۆن توانیان لە نامەیەکی کورتدا هەموو بیروباوەڕی ڕاست و دروستی ئەهلی سوننەو جماعە کۆبکەنەوە، لە بەر گەورەیی و گرنگی نامەکە بڕیاردرا لە هەموو مزگەوتەکانی ئەفریقیا بخوێنرێتەوە بەسەر موسڵماندا.[2]

٥ـ بە نامە بانگی پاشاکانی هیندستان دەکات بۆ لای ئیسلام:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله نامەی نارد بۆ پاشاکانی وڵاتی (السند) و تیاندا بانگی دەکردن بۆ لای ئیسلام و دڵی خۆش دەکردن و دەیووت: هەر خۆتان ببنە گەورە پادشا وڵاتەکەتان و چی بۆ موسڵمان هەیە بۆ ئێوەش هەیە و چی لەسەر بۆ موسڵمانان دەبێت لەسەر ئێوەش دەبێت.

---

١ـ ریاض النفوس للمالکی(١/ ١٠٢، ١٠٣)
٢ـ عصر الدولتین الأمویة و العباسیة لا ٤٨.

لەگەڵ نامەکانـدا هـەواڵی دادپـەرەوەری و خواناسـی یەکـەی گەیشتبووە لایـان بۆیە (جیشبە)ی کوڕی (داهر) موسڵمان بوو.[١]

پاشـاکان پـاش موسـڵمان بـوون ناوەکـانی خۆیـان گـۆڕی بـۆ نـاوی ئیـسلامی و لەسـەردەمی عمـر و یەزیـدی کـوڕی عبـدالملك دا بـەو شـێوەیە مانـەوە، عمـر زاناوشارەزایانی دەنارده ناویان تا لە ئیسلام حاڵیان بکات.[٢]

هەروەها نامەی بۆ پادشاکانی پشتی دەریبای ڕەش ـ ما وراء النهـر ـ و بـانگی دەکـردن بـۆ لای ئـسلام و موسـڵمان بـوون و هەنـدێکیان هـاتن بـەدەم داواکـاری یەکەوەو موسڵمان بوون.[٣]

هەروەك وەفدێکی باڵای بە سەرۆکایەتی(أبو الأعلى)ی کوڕی(أبی عمـره)ی نـارد بۆ لای (ئالیون) قەیسەری ڕۆم بەمەبەستی بانگ کردنیان بۆ لای ئیسلام.[٤]

٦ـ هاندانی خەڵکی بێ باوەڕ بۆ هاتنە ناو ئیسلام:

عمری کوڕی عبدالعزیز هەر بـەوەوە نەوەسـتا، کـە خـەڵکی بـانگ بکـات بـۆ لای ئیسلام و بەرنامەکەی خوا، بـەڵکو لـە ڕێگـەی مـاڵ و سـامان بەخـشینەوە بەوانـەی دەهاتنــە نــاو ئیـسلام هـەوڵی دەدا دڵیـان کەمەنـد کـێش بکـات و ئـەم کارەشـی چاوکردنی بوو پێغەمبەری خوا ﷺ و قورئانی پیرۆزن کە هانی موسـڵمانی دەدات لـە زەکات و ماڵی موسڵمانان بدرێت بەو کەسانەی دێنە ناو ئیسلام بۆ ئەوەی دڵیان بـە ئیسلامەوە بنوسێت پێیان دەوترێت: ﴿مؤلفة قلوبهم﴾.

دەگێرنەوە (١٠٠٠) دیناری دا بە گەورە زانایەکی جولەکە لە بەر ئەوەی موسڵمان بووبوو تا لە ئیسلام ڕاوەستاو بێت.

(إبن سعد) لە (عیسی)ی کوڕی (أبی العطاء)وە دەگێڕنەوەو دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله هەندێ کات پارەوە سامانی بەو کەسانە دەدا، کە تازە هاتبوونە نـاو

---

١ـ فتوح البلدان لا ٤٢٨.

٢ـ عمر بن عبدالعزیز وسیاسته في ردالمظالم لا ١٧٣.

٣ـ فتوح البلدان لا ٤١٥.

٤ـ عمر بن عبدالعزیز وسیاسته في ردالمظالم لا ١٧٣.

ئیسلامەوە بۆ دڵ ڕاگرتنیان.[١]

٧ـ هانی ئەهلی(االذمة)ی دەدا لە سەر موسڵمان بوون:

زۆرچاك و بەویژدان بوو لەگەڵ ئەهلی(ذمة)دا و بە هەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا ئیسلام خۆشەویست بکات لە لاییان، بڕیاری وابوو هەریەکەیان موسڵمان ببێت، سەرانەی لە سەر لاببات، ئیتر با خەزێنەی موسڵمانانیش ـ بەرەو کزی بڕۆیشتایە.

بۆ ئەو مەبەستە نامەی نارد بۆ والی خوڕاسان (جراح)ی کوڕی (عبدالحکمی) و پێ ی ووت: بڕوانە کێ ڕوی کردە قیبلەکەت و نوێژی کرد، سەرانەی لە سەر لاببە.[٢]

هەروەها بۆ ئەو مەبەستەش نامەی نووسی بۆ(أهل الذمة) و هانی دەدات، کە بێتە ناو ئیسلامەوەو موسڵمان بن، نامەی دەنوسی بۆ (جراح) لە خوراسان و پێ ی ووت: بانگەوازی (أهل الذمة) بکەە بابێتە ناو ئیسلامەوەو هەر یەکەیان هات بەدەستەوە خێرا سەرانەی لە سەر هەڵبگرە وچی بۆ موسڵمانان هەیە بیدەبە ئەویش و چی لە سەر موسڵمانانیشە بیدە بەسەر ئەویشدا.[٣]

ئەم کارە بوو بە هۆی ئەوەی بە لێشاو هەزاران کەس ببن بە موسڵمان، هەر لە خوراسان(٤) هەزار کەس لە سەر دەستی(جراح)ی کوڕی (عبدالله) موسڵمان بوون.[٤]

لە ڕۆژئاوای وڵاتانی ئیسلام هەموو بەربەرکان موسڵمان بوون لەسەر دەستی والی عمر، کە ناوی(إسماعیلی کوڕی عبداللهی کوڕی (أبی مجاهر).

ئەمەش بەڵگەیە سەر ئەوەی عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله گرنگی گەورەی بە نانگەوازی ئیسلامی داوە.

---

١ـ الطبقات(٥/ ٢٥٠).
٢ـ تأریخ الطبری(لا ١٧٤).
٣ـ الطبقات(٥/ ٢٨٦).
٤ـ الطبقات(٥/ ٢٨٦).

لە ڕێگەی ئامۆژگاری جوان و داوا کردنی ئاشتیانە، کە ئاکامەکەی کەمتر نەبوو لە ئاکامی بڵاوبونەوەی ئیسلام بەڕێگای جیهاد و جەنگە ڕزگاریەکان، بەڵکو ئەمە گرنگ تر بوو، چونکە ئەو هەموو کەسە هاتنە ناو ئیسلامەوە بەبێ ئەوەی خوێنی موسڵمانێك برژێت، یان خەرجی لە ڕادە بەدەری سوپاو پێداویستی یەکانی جەنگەکان.

ئابەو شێوەیە لە سەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزدا ئیسلام بڵاوبوویەوە لە ڕێگای قسەی خێرو ئامۆژگاری جوان و دڵسۆزانەوە، بەردەوام بوونی جیهاد لە سەردەمی ئومەویەکاندا پێگەیشتبوون.

ئەو زانا مەزنە بانگەوازکارانەبوون نە هۆی کەوتنی پرۆژە مەزنە بانگەوازی و زانستی یەکەی عمری کوڕی عبدالعزیز.

# بەشی شەشەم

## بەشی دارای و چاکسازی یەکانی عمر لەو بوارەدا

سیاسەتی عمر لە بواری دارایی دا هەرەمەکی نەبوو، بەڵکو ئەو بەرپرسی دەوڵەت بوو، حسابی بۆ هەموو هەنگاوێکی خۆی دەکرد لەو بوارەدا، کە هەڵی دەنا، گنتی دادە بە هەموو کارێکی، کە دەستی دەدایە کردنی.[1]

لەم سیاسەتەیدا ئەم خاڵانەی ڕەچاو کرد:

### * پشت بەستن بە قورئان و سوننەت و قوربانی لەو پێناوەدا:

ئەمەش بە ئاشکرا بەدی دەکرێت لە ڕێگەی نامەو وتارەکانی یەوە، وەك لە جێگایەکدا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ و یارانی دوای ئەو ڕێڕەوو پرۆگرامیان دارشتووە، هەر کەسێك دەستیان پێوە بگرێت ئەوە دەستی بە قورئانەوە گرتووەو هێزێکی باشیشە بۆ ئاینەکەی خوا، بۆ کەس نی یە دەستکاری بکات، یان بیگۆڕێت، یان بڕوانێت بۆ ئەو کەسانەی، کە پێچەوانەی دەکەن.[2]

### * جێگیرکرنی بە هاکانی هەق و داد پەروەری و ستەم لابردن:

ئەمەبنچینەی سیاسەتەکانی عمر بووە، هەموو ئەو ئامانجانەی هەوڵی بۆ دەدا، کە بیانهێنێتە دی لەسەر ئەم بنچینەیە دامەزرابوون، گەڕاندنەوەی هەق بۆ خاوەنەکانیان و هەلگرتنی زوڵم و ستەم لە بنچینە سەرەکی یەکانی شەریعەتی ئیسلامن، لە مەبەستە گەورەکانی ئیسلامن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ الحديد: ٢٥.

---

١ـ السياسة الإقتصادية والمالية لعمر بن عبدالعزيز. لا ٢٧

٢ـ سيرة عمر (لابن عبدالحكم) لا ٢٨.

(إبن قیم) دەڵێت: بنچینەو بناغـەی ئیـسلام بنیـات نـراوە لەسـەر حـوکم ڕانـی و پاراستی بەرژەوەندی خەڵکی لە ژیانداو لە دوا ڕۆژیشدا، هەمووی دادپـەروەری یـە، هەمووی بەزی یە، هەمووی بەرژەوەندی یە، هـەمووی ژیریـە، هـەر مەسـەلەیەك لـە قالبی عەدل بەرەو ستەم چـووە دەرەوە، لـە حیکمـەت و ژیـری بـەرەو هەڕەمـەکی چووە دەرەوە، هیچ پەیوەندی یەکی بە شەریعەتەوە نامێنێت.[1]

عمر رحمه الله هەر کاتێ ڕاستی بۆ دەربکەوتایە خێـرا دەگەڕایـەوە سـەری و لـە سـەر هەڵە بەر دەوام نەدەبوو، لەو بارەیەوە دەیووت: هیچ قورێك لەلام ئەوەندەی ئـەوە نەرم نی یە و هیچ نامەیەك وەك ئەوە لام ئاسان نی یە بەئەندازەی ئـەوەی، کـە لـە مەسەلەیەکدا حوکمێك دەربکەم و، پاشان بیـنم هـەق لـە پێـچەوانەکەیدایە، زۆر بە ئاسانی بگەڕێمەوە لە قسەکەی پێش خۆم.[2]

## یەکەم: ئامانجە ڕامیاری و سیاسی یەکانی عمر

١ــ سەر لەنوێ دابەش کردنەوەی سامان لە سەر بنەمای دادپەروەری:

عمـری کـوڕی عبـدالعزیز رحمه الله ئـەو پـەڕی هـەوڵی دا لـە سـەردەمی خەلافەتیـدا، دابەشکردنی خێروخێراتی وڵات لە ناو میللەتـدا یەکسان بکاتـەوە، بە جـۆرێ، کە خوای گەورە ڕازی بکات و هـەق و مافـەکان بگێڕێتـەوە بـۆ جـێ ی خـۆی و زوڵـم و ستەم نەهێڵێت، عمر ئەمەی بەباشـی لـە بـەر چـاو گرتبـوو، بـە وردی ئـەو لادانـەی چـاودێری دەکـرد لەسـەر دەمـی خەلیفـەکانی پێـشوودا ڕووی دابـوو، تێبینـی ئـەو ئەنجامە خراپانەی دەکرد، کە لە دەروونی جەماوەردا دروستی کردبوو، ڕەخنەی لە سیاسـەتی دابەشـکردنی سـامانی سـلیمانی کـوڕی عبـدالملك دەگـرت، پـێ ی ووت: دەتبینم بەم کارانەت دەوڵەمەندەکان زیاتر دەوڵەمەند دەکەیت، هەژارەکانیش زیاتر داماوتر دەکەیت.[3]

---

١ــ إعلام المعوقین(٢/ ٢)

٢ــ سیر و مناقب عمر لابن الجوزی لا ١١٢.

٣ــ سیرة عمر (إبن عبدالحکم) لا ١٢٥.

عمر رحمه الله له ڕێگەی ئەو جیاوازی یە گەورەیەی کەوتبووە نێوان ئابوری خەڵکی یەوە شێوازی چەوتی دابەش کردنی سامانی بۆ دەرکەوتبوو، بۆیە سیاسەتێکی نوێ ی نەخشە کێشا بۆ ئەوەی لەڕێگایەوە قەرەبوویەك بۆ ستەم لێکراو هەژارانیش بکاتەوە.

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەم ڕێگایەدا کۆمەڵێ هۆکاری بەکار هێنا بۆ گەیشتن بەو ئاکامەی لەوانە: بەرگری کردنی لە مۆڵ بوونی و سامان و پارەی ولات لەلای گەورەپیاوان و فەرمان ڕەوایان و دەست گرتن بەسەر ئەو موڵکانە، کە بە نا ڕەوا داگیرکرابوون، کار بەدەست و گەورە پیاوان دەستیان بەسەردا گرتبوون، گەڕانەوەی ئەم سامانانە بۆ خاوەنەکانیان هەر کاتێ ناسرانەوە، خۆ ئەگەر خاوەنیان نەناسرابایەوە دەیخستە خەزێنەی موسڵمانان و دەی کرد بە سامانی گشتی ی.

زیادکردنی موچەی ئەو کەسانەی ئاستی ئابوریان نزم و نەدار بوون و، سەرپەرشتی دەکردن، مسۆگەر کردنی ئاستی بژێویان لە ماڵی زەکات و سەرچاوە دارایەکانی تر.[1]

بەکردەوە هەستا بە جێ بەجێ ئەم سیاسەتەی، وەك چۆن پێشتر باسمان،کە چۆن مافەکانی گەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانیان، سیاسەتی عمر لە دابەش کردن ساماندا بەو نیازەوە بوو، کە ئاستی تێرو تەسەلی ـ کفیایةـ ئەمەش لە وتارەکان تێبینی دەکرێت، ئەوە بوو ڕۆژێك وتاری بۆ خەڵکی دەداوەو دەیووت: ئاواتە خوازام دەوڵەمەندەکانی کۆببونایەتەوەو چی لە خۆیان زیادەبیاندایە بە هەژاران تا هەمووی دەچووە یەك ئاستی ژیان و منیش یەکێك دەبووم لەوان.[2]

لەوتارێکی تردا دەیووت: هەر یەکە لە ئێوە پێویستی یەکانی خۆیم پێ بگەنێت ئامادەم بەوپەڕی توانا بۆی جێ بەجێ بکەم، هەر کەسێ دەستی ناگاتە لام تا هاوکاری بکەم ئاواتە خوازبووم لەمن و کەسە نزیکەکانمەوە دەستی پێ بکردایە

---

١ـ السياسة الإقتصاديةو المالية لا ٢٥.

٢ـ الإدارة الإسلامية في عصر العرب. لا ١٠٢.

تاژیانی ئێمەو ئەوان وەك یەکی لێ بهاتایە.[١]

عمرڕەحمەتی خوای لێبێت بەکردەوە ئەم نیازە بەرزانەی خۆی جێ بەجێ کرد، کاتێ فەرمانی‌دا قەرزی هەموو قەرزاران ببژێرن، تا کاربە دەستێکی نامەی بۆ ناردو پێ ی ووت: قەرزاری وا هەیە لە لای ئێمە وەزعی باشە خانووی هەیە، خزمەتکاری هەیە، ولآخێکی هەیە، هەمووشتی ناومالّی هەیە! عمرڕەحمەتی خوای لێبێت پێ ی ووت: دەی ئەوە چی یە؟ هەموو کەسێك دەبێت خانویەك تیا بژی، خزمەتکارێك کارەکانی بۆ ئاسان بکات، ولآخێکی هەبێت بۆ جیهادی دوژمنانی و، شت و مەکی ناومالّی ولآت، لەگەلّ ئەوەشدا قەرزار بوو قەرزەکانی بۆ ببژێرن.[٢]

سیاسەتی سەر لە نوێ دابەش کردنەوەی سامانی لە لای عمر بە مەبەستی ئەوەوەبوو، کە خەلّکی لە هەندێ شتی سەرەکیدا وەك یەك وابن، وەك: خانوو، ولآخی سواری = ئوتومبێلی ئێستا ـ شت و مەکی ناو مالّ، کە ئەمانە لە پێداویستی یەکانی ژیانی مرۆڤن و ژیان بەبێ ئەوانە زۆر ئاستەم و نارەحەتە.[٣]

٢ـ هێنانەدی گەشەی ئابوری و خۆش گوزەرانی کۆمەلآیەتی:

عمری کوڕی عبدالعزیز لە ڕێگەی زۆر هۆکار دەیویست ئەم ئامانجە بێنێتەدی، کەش و هەوایەکی گونجاوی لە ڕێگەی پاراستنی ئاسایش و نەهێشتنی ئاژاوە ناوخۆیەکانەوە هێنا کایەوە، بۆ ئەم گەشە ئابوری یە، گەڕانەوەی مولّك و سامانەکان بۆ خاوەنە شەرعی یەکانی خۆیان، تاوای لێ هات میللەت دلّنیابوو لەوەی مافەکانی مسۆگەر و پارێزراوە لە ولآتی خۆیدا زۆر بە دلّنیایەوە دەژی، هەروەها فەرمان بە دروست کردنی شوێنە گشتی یەکان، کە ئەمڕۆ پێ ی دەوترێت ژێرخانی ئابوری، گەش و نومای ئابووریش بەم کارانە نەبێت مەحالّە بێتەدی، وەك ڕووبارو ڕێگاو بان و شتی تر، عمرڕەحمەتی خوای لێبێت بنەمای ئابوری سەرەکی دنا، بەلآم بە کۆمەلّە مەرجێکی شەرعی، تاوای لێهات خەلّکی دەستیان دا بە بازرگانی و پەرە

---

١ـ سيرة عمر (إبن عبدالحكم) لا ٤٢.

٢ـ هەمان سەرچاوە لا ١٧١.

٣ـ السياسة الإقتصاديةو المالية لا ٢٨.

پێدانی سامانەکانیان، هەروەها گرنگی یەکی تایبەتی دا بەکشتوکاڵ، بە جۆرێ، کە کەرتی کشتوکاڵی بەگەورەترین کەرتەکان دادەنرا لەسەر ئاستی تاکەکان، ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لەسەر میزانی یەی وڵات.

عمر و هەموو ئومەت بەرووبومی ئەو سیاسەتەیان دەست کەوت و، خۆش گوزەرانی باڵی کێشا بەسەر هەموو وڵاتی ئیسلام و بەندەکانی خوادا.[1]

پیاوێك لە نەوەکانی (یزید)ی کوڕی خطاب ﷺ دەیووت: عمری کوڕی عبدالعزیز دوو ساڵ و نیو واتە: (٣٠) مانگ حوکمی موسڵمانانی کرد، لە دونیا دەرنەچوو تا موسڵمانان وایان لێ هات، کە پیاوێك دەهات بۆ لامان بەسامانێکی زۆرەوە دەیووت: ها بیبەن دابەشی بکەن بە سەر هەژاراندا، کەچی بە پارەوماڵەکەوە دەگەڕایەوە، چونکە کەس نەمابوو خێری پێ پشێ، عمری کوڕی عبدالعزیز هەموو لایەکی دەوڵەمەند کردبوو.[2]

## دووەم: چەند هۆکارێکی عمر بۆ جێ بەجێ کردنی ئامانجە ئابوریەکانی دەوڵەتەکەی

عمر ﷬ لە ڕێگەی کۆمەڵێك هۆکارەوە ئەم ئانجانەی هێنایەدی:

١ــ دەستەبەرکردنی کەش و هەوای گونجاو: لەم ڕێگایانەی خوارەوە:

أــ گەڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان: کەش و هەوای پڕ لە ئاسایش و دڵنیایی هاتە دی، بەهاکانی هەق و دادپەروەری و گەڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان و ناوی لێنا (نەهێشتنی ناهەقی یەکان) هەموو هاتەدی[3]، کە پێشتر بە درێژی و بە نموونەوە لەم خاڵانە دواین.

ب ــ عمری کوڕی عبدالعزیز ﷬ ئەم سەربەستی ئابوریەی جەندجار دووپات کردۆتەوە، کە ئەمڕۆ پێ ی دەڵێن: ــ بازاڕی ئازاد ــ بەڵام لە دەوڵەتی عمر دا

١ــ السياسة الإقتصاديةو المالية لا ٤١.

٢ ــ سيرة عمر (إبن عبدالحكم) لا ١٢٨.

٣ــ السياسة الإقتصاديةو المالية لا ٤٢

هەرەمەکی نەبوو، بەڵکو مەرج داربوو،لەم بارەیەوە دەنوسێت بۆ کاربەدەستێکی و پێ ی دەڵێت: لە بەندایەتی کردنی خوایەو لە قورئانەکەی دا بڕیاری داوە بانگ کردنی خەڵکی بەگشتی بۆ لای ئیسلام، خەڵکیش سەربەست بکرێن بەئارەزووی خۆیان لەوشکای و دەریادا کاسبی و بازرگانی خۆیان بکەن و ڕێیان لێ نەگیرێت و بەرگری نەکرێن، لە شوێنێکی تردا دەڵێت: پردی زۆر لێ بدەن بۆ هاتوچۆکردنی خەڵکی بەبێ بەرامبەر، چونکە کاربەدەستە خراپەکانی پێشوو بە ناڕەوا دەست درێژیان کردۆتە سەر خەڵکی.[1]

عمرﷺ خۆی هەڵنەقورتاندۆتەوە مەسەلەی نرخ دانان: (عبدالرحمن)ی کوڕی (شوبان) دەڵێ: عمری کوڕی عبدالعزیزم ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی لە سەردەمی تۆدا نرخی شتەکان گران بووە، کەچی لەسەردەمی پێش تۆدا هەرزان بوون؟ لەوەلامدا ووتی: فەرمانڕەواکانی پێش من من(أهل الذمة)یان دەچەو ساندەوە بە جۆرێ ناڕەحەتیان دەکردن، کە ناچار بن چیان هەیە بە هەرزان بیفرۆشن و لە دەستیان بێتەوە، بەلام من بۆ هیچ شتێك لە توانای خۆی بەدە داوای هیچ لەشتێك کەس ناکەم، خەڵکی بە ئارەزوی خۆی شت بفرۆشت، منیش پێم ووت: ئەگەر نرخت لەسەر شتەکان دابنایە، ووتی: ئێمە بۆمان نی یە ئەو کارە بکەین و نرخ لە تایبەت بەندی خوایە.[2]

عمرﷺ توندوتیژبوو لەو کالایانەی، کە حەرام بوون و نەیدەهێشت کڕین و فرۆشتنیان بەسەرەوە بکرێت، عەرەق ــ مەی ــ شتێکی زۆر پیسەو نابێت لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا مامەڵەیان پێوە بکرێت لە بەرحەرامیەتەکەی و زیانەکانی، بە جۆرێ، کە خواردنەوەی دەبێتە هۆی حەلاڵ کردنی خوێنی بێ تاوانان و خواردنی سەروەت و سامانیان، بۆیە عمرﷺ دەیووت: هەرکەسێ ببینن بیخواتەوە، پاش ئەوەی ئاگادارمان کردن سزایەکی بە چێژی دەدەین، چ لەخۆی چ لە دارایەکەی و، دەکەین بە پەند بۆ خەڵکانی تر.[3]

---

١ــ الإدارة الإسلامية محمد كرد على لا ١٠٥.

٢ــ السياسة الإقتصاديتو المالية لا ٤٨.

٣ــ سيرة عمر (إبن عبدالحكم) لا١٠٢.

سیاسەتی عمر لە گەڕانەوەی نا هەقی یەکان بۆ خاوەنەکانیان و فەراهەم هێنانی سەربەستی ئابوری ڕێك و پێك، کەش و هەوایەکی وای ڕەخساند بۆ خەڵکی، هانی دەدان بۆ کارکردن و بەرهەم هێنان، هەموو بەربەستەکانی بەردەمیای لابرد، ئەمەش بوو بە هۆی گەشەی بازرگانی، دواتریش بوو بە هۆی زیادبوونی زەکات دانەکان، کە ئەمەش دووبارە بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی چینی هەژارو دواتریش بەو هۆیەوە سەرفیات زیاد دەکات،دواکاری شت و مەك و کاڵاکان لە زیاد بووندا دەبێت، بەو هۆیەشەوە بوژاندنەوەی ئابوری و بەرزبوونەوەی ئاستی ژیان و خۆش گوزەرانی دێتەکایەوە.[١]

٢ـ ڕێگرتن لە فرۆشتنی زەویە ـ خەراجی یەکان ـ [٢]:

خەڵکی پرسیان لە(عبدالملك)ی کوڕی (مروان)و (ولید)و (سلیمان) دەربارەی کڕینی زەوی خەراجی لە(أهل الذمـة) ئەویش ڕێگەی پێدان بە مەرجێ پارەکەی بخەنە (بیت المال)، کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز چووە سەر حوکم دەستی لەو کڕین و فرۆشتنانەی پێشوو نەدا، چونکە تێکەڵی میرات و مارەی ئافرەتان بووبوون، نەیدەتوانی جیایان بکاتەوە، بەڵام لە ساڵی(١٠٠)ی کۆچیدا پەیامێکی نووسی بۆ خەڵکی و خوێندرایەوە بەسەریاندا، کە ووتی: لە دوای سەری ساڵی کۆچی یەوە هەموو کڕین و فرۆشتنێك بەو موڵکانەوە دانامەزرێن، ئەوساڵە ناوی نرا ساڵی (ماوە). لەو ساڵەوە کەس ئەو زەویانەی نەدەکڕی.[٣]

خاوەنی زەویەکان داوایان لە عمر کرد، کە زەکات لە سەر زەویەکانیان دابنێت لە باتی (خەراج) عمریش لە وەڵامیاندا ووتی: من شتێکی تر نابینم لە ئیسلامدا ڕۆشنتربێت لە مەسەلەی ئەم زەویانە خوای گەورە ناوی ناون (فەیئ).

(أبو عبیدە) دەڵێت: بۆچوونی عمر وابووە، کە ئەو زەویانە حیسابی (فەیئیان)

---

١ـ سیاسة الإنفاق العام في الإسلام لا ٣٧٢.

٢ـ خەراج: ئەو زەویەیە، سوپای ئیسلام شوێنێك ڕزگار دەکات، زەویەکان دەداتەوە خاوەنەکانیان بەرامبەر پارەیەکی ساڵانەی کەم.

٣ـ الخراج، للريس لا٢٩٠.

بۆ دەكرێت، لە بەر ئەو هۆیە قەدەغەی كردبوو لەسەر خاوەنەكانیان، كە بیفرۆشن،[١] نامەیەكی نووسی بۆ (میمون)ی كوڕی (مهران)و پێ ی ووت: نەیەڵێت خاوەن زەویەكان ئەو زەویانەیانەیان بفرۆشن، چونكە ئەوانە ماڵی فەیئی موسڵمانانن.[٢] هەروەها نەیهێشتووە زەوی یە ـ خەراجی یەكان ـ بگۆڕن بۆ زەوی دەیەك،[٣] بەڵكو خەراجیش و یەدەكیشی لە سەر دانابوو و دەیووت: خەراجەكە لەسەر زەویەكەبوو، دەیەكەكەش لەسەر دانەوێڵەكان[٤]

ئابەو جۆرە عمرﷺ پارێزگاری كرد لەو سەرچاوە سەرەكی یەی بەرووبوم، كە سەرجەم موسڵمانان سودی لێ وەربگرن، نەك بیفرۆشێت و سودەكەی بەش بەش و بچوك بكرێتەوە.[٥]

ب ـ هاوكاری كردنی جوتیاران و سوككردنی سەرانە لە سەریان:

لە پێش حوكمڕانی عمردا هەندێ لە خەلیفە ئەمەویەكان سەرانەی قورسیان خستبووە سەر جوتیاران، جۆرەها سەرانەیان داهێنابوو، وای لێ هاتبوو دارەكان تەواو هەراسان بوو بوون و زەویەكانیان بەجێ هێشتبوو، تەنها خەراجیان دەدا، ئەوەش زیانێكی گەورەی دابوو لە دارایی دەوڵەت، ناچاری جۆرەها سزادانیان بووبوون لەپێناوی پارەو سەرانە لێ سەندیان،تاوایان لێ كردبوون ئاژەڵ و كەل و پەلیان دەفرۆشت تا سەرانەكانی پێ بدەن.[٦]

هەركە ئەمیری باوەڕداران عمر چووە سەر حوكم هەموو ئەو سەرانانەی، كە پێچەوانە بوون لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا لایبردن و نەیهێشتن، بۆ ئەو مەبەستەش نامەی نووسی بۆ هەموو كاربەدەستەكانی و تیادا بەكاربەدەستی كوفەی ووت:

---

١ـ الأموال أبی عبیدة لا ١٢١ژ ٢٥٦.

٢ـ هەمان سەرچاوە لا ٢٥٧.

٣ـ السیاسة الإقتصادیةو المالیة لا ٥٠.

٤ـ الأموال لا ٢٣٥.

٥ـ الخراج لا ٢٣٩.

٦ـ هەمان سەرچاوە لا٢٥٧.

خەڵكی شاری كوفه نیگەران و ناڕەحەتی دەستی زوڵم و ستەمی بە ناوی شەرعی خواوە، كاربەدەستە خراپەكان ڕێچكەی ناڕەویان داهێناوە، خەراج وەرنەگرن لەكەس، دیاری بۆنە ئاینەیەكانیان وەرنەگرن، هەروەها نرخی وەصل و كرێ ی گەنجینەكان لەكەس وەرنەگیرن.

سەرانەی قوبالەی لابرد، كە بریتی بوو لەوەی، كە كەسێك دەبووە ناوەندو سەرانەكانی لە جوتیاران كۆدەكردەوەو جوتیاری هەژار لەبەرامبەر ئەو كارەدا پارەیان پێ دەدا، هەروەها شێوازی حەرزانەشی سڕیەوەبەجۆرێ، كە كاربەدەستەكان نرخی بەرهەمە كشت و كاڵی یەكانیان زۆر بەزیادەوە دادەنا و پارەكەشیان بەدەستی دەویست لە جوتیار، جوتیاریش بەو هۆیەوە زۆر نا رحەت بوون، عمریش رحمه الله پێ ی دەوت: هەواڵم پێ گەیشتووە كە هەندێ لە كاربەدەستەكانت لەناوچەی فارس نشین نرخی گران دەخەنەسەر بەروبومە كشت و كاڵی یەكان لە نرخی بازاری ئاسایی زیاترو داوتر پارەكەیان بەو زیاترەوە بەدەستی دەوێت لە جوتیارەكان، بۆیە (بشر)ی كوڕی (صفوان) و (عبدالله)ی كوڕی(عجلان)م ناردبۆ لاتان تا لەو مەسەلەیە بكۆڵنەوە، هەرپارەیەكی زیاتریان لە جوتیاران وەرگرتووە بۆیان بگێڕنەو.[1]

هەروەك عمری كوڕی عبدالعزیز رحمه الله فەرمانی دا بە سڕینەوەی ئەو سەرانە هەیشەیی یەی لە سەر خەڵكی یەمەن دانرابوو، كە وەك خەراج بوو لەسەر زەویە دەكەكان(العشریه) بۆ ئەو مەبەستە نووسی بۆ كاربەدەستەكەی لە یەمەن پێ ی ووت: تۆ نامەت بۆ نوسیم، كە گوایە لە یەمەن دەست بەكار بویت، دەبینی سەرانەیەكی زەوی و زار – خەراج – سەپاوە بەسەر خەڵكیدا وەك جزیە و لە هەموو باروو زوروفێكدا دەبێت بیدەن، ساڵی هات، ساڵی قات و قڕ، بمرن یان بژین! دەی پاك و بێ گەردی بۆ خوای جیهانیان و دوبارە پاك و بێ گەردی بۆ خوای جیهانیان!! هەر، كە نامەی منت پێ گەیشت چی پڕ لە دادو ڕەوایە بیكە و چیش

١– الضرائب في السواد لا ٦٥.

ستەم و ناڕەوایی تێدایە وازی لێ بهێنە، هەق بڕۆ ئیتر من و تۆ چیمان بەسەر دێت، با بێت، ئەگەر هەناسەیشمان لێ بڕڕێت، ئەگەر لەهەموو یەمەنەوە هیچم بۆ ڕەوانە نەکەیت جگە لە مشتێ کەتم[١]، خوا دەیزانێت من بەوە مەسرورو دڵخۆش دەبم، ئەگەر لەگەڵ هەق و ڕەوا دا بێت، (والسلام).[٢]

تێبنی ئەوەی لێ دەکرێت لە نامەکانی عمردا بۆ کار بەدەستی هەرێمەکانی تێبینی ئەو لادانانەیە دەکرێت، کە لەسەر دەستی کاربەدەستانی پێش خۆیدا ڕوویان داوەو عمر بە ڕەوای نەزانیبوون، ئاسەواری ئابوری خراپیان لێ کەوتبویەوە، بە جۆرێ، کە خاوەن زەویەکان چاری زەویەکانیان نەدەکرد و ناچار دەیان هێشتنەوە، بەو جۆرە بەرووبوم لاواز دەبوو بەو هۆیەشەوە وڵاتی ئیسلام و (بیت المال)ەکەی زیانیان لێ کەوتبوو، بەڵام عمرﷺ زۆر سوربوو لەسەر ئەوەی هەق جێ بەجێ بکات و نەترسێت لە چەندێتی، بەڵکو خەمی چۆنی یەتی بخوات، ئەو دەستکەوتی زۆری نەدەویست لە ڕێگەی زوڵم و ستەمەوە[٣]، لابردنی ئەو کۆمەڵە سەرانە لەسەر جوتیاران وای کرد لە ئابوری وڵات گەشە بکات و ببوژێتەوە.

ج ـ چاکسازی و ئاوەدانی و زیندوکردنەوەی زەوی یە مردووەکان:

عمرﷺ زۆر هانی خەڵکی دەدا تا زەویە مردوەکان زیندو بکەنەوە، چاکسازی کردنی زەویەکان بۆ کشتوکاڵ، بۆ ئەو مەبەستە نامەی نووسی بۆ کارمەندەکەی کووفەو پێ ی ووت: زەوی کشت وکاڵی بەرهەم دار و زەوی بێخێر وەك یەك دا مەنێ، بەڵکو لەزەوی یە بێسودو بێ خێرەکان بە پێ ی بەرو بومی سەرانەیان لێ وەربگرە، هەوڵ بدە ئەو زەویانە چاك و بەرهەم داریکەیت، لەخاوەنی زەویە بەرهەمدارەکانیش مەسێنە، مەگەر بەپێ ی بەروبومەکان و بە شێوەیەکی نەرم نیان و جوان[٤]

---

١ـ کەتم: ڕوەکێکە لەگەڵ خەنەدا تێکەڵ دەکرێت و قژی پێ ڕەنگ دەکرێت.

٢ـ سیرة عمر (إبن عبدالحکم) لا١٢٦و الخراج للریس لا ٢٢٩

٣ـ السیاسة الإقتصادیةو المالیة لا

٤ ـ الأموال لأبی عبیدة ژ ١٢٠ لا ٧٥.

هەروەها نووسینی هەرکەسێ خۆی ئاو بۆ زەویەك ساز بكات ئەوە خێروبێروی بۆ خۆیی یەتی، (حكیم)ی كوڕی(زریق) ووتی: نامەیەكی عمری كوڕی عبدالعزیزم خوێندەوە، كە بۆ باوكمی ناردبوو، تیایدا نووسیبوی بۆی هەرکەسێ زەویەك زیندو بكاتەوە بەكێلان، یان دیواركردنی ئەوەبیكە بەهی خۆیان، مەگەر لە خەڵكانێكی تریان كڕیبێت، یان هەندێكیان زیندوكردبێتەوە، هەندێكیان بەجێ هێشتبێت.[1]

عمررحمه الله زۆر سوربوو لەسەر كێڵانی زەویە تایبەت مەندیەكان، كە بەرپرسان بەدیاری دابویان بەهەندێ كەس و دواتر كەسەكە مردووەو وارسیشی نی یە، ئەوكات زەویەكە دەگەڕێتەوە بۆ(بیت المال)و نەی هێشتووە بدرێت بەكەسی ترو فەرمانی داوە بەدوو كوتی بدرێت بە جوتیاران ئەگەر بەرهەمی بێنن و بەسێ كوتی ئەگەر بیكێڵن و نەیكەن بەهیچ، ئەگەر نەیكەن بە هیچ و نەشی كێڵن ئەوە دەیەكی لێ بسەنن، ئەگەر كەس خۆی نەكات بە خاوەنیان، ئەوە (بیت المال) بەخاوەنی ئەو زەویانەیە دەكات.[2]

عمررحمه الله زۆر گرنگی داوە بە جوتیاران، زیانەكانی بۆ دەبژاردن، لەو بارەیەوە دەگێڕنەوە سوپایەكی وڵاتی شام دایان بەناو كێڵگەی جوتیارێكداو پان پشلیان كردەوە، كابرای جوتیاریش خەلیفە عمری ئاگاداركردەوە، ئەویش دەهەزار درهەمی پێدا لە قەرەبووی كشتوكاڵەكەیدا.[3]

قەرزی دەدا بەكشاوەرزان و لەنامەكەیدا بۆ والی عێراقی ناردبوو پێ ی ووتوە: سەیری حاڵی هەموو ئەو كەسانە بكە، كە (جزیة) دەدەن، ئەگەر توانای نەبوو زەویەكەی بەرهەم بێنێت سولفەی پێبدەن تا زەویەكانی بكێڵێت، چونكە ئێمە بۆ ساڵ و دوو ساڵمان ناوێن.

ح ـ عمر و قاغەكان (الحمی):

عمررحمه الله هەموو قاغە كردنێكی تاكە كەسی لابرد و ئەو زەویانەی كردەوە بە

---

١ـ الأموال لأبی عبیدة ژ ١١٧ ٢٦٩.

٢ـ سیرة ومناقب عمر لابن الجوزی لا ١١٧.

٣ـ التطور الإقتصادی فی العصر الأموی لا ٢٠٢.

زەوی گشتی موسڵمانان، نەیدەهێشت بۆ کۆمەڵێکی تایبەتی بێت و خەڵکانی تری لێ بێ بەش بکرێت، لەو بارەیەوە دەیووت: ئێمە وادەبین، کە قاغەکانمان بگەڕێنەوە بۆ موسڵمانان، قاغەی تایبەت کرد، بەڵام بۆ حوشترەکانی (بیت المال)، هەر چەندە هەندێ کەس لێرەو لەوێ لەوبارەیەوە تانەیان لەو بڕیارە دەدا بۆیە ووتی: ئێمە وابەچاك و خاوێن دەزانین، کە وازیان لێ بهێنن و هەموو موسڵمانان وڵاخی خۆیانی تێ بکەن، گەورەی وڵاتیش وەك یەکێك لە موسڵمانان مافی هەیە لەو قاغانەدا، چونکە باران بەخششی خوایەو بۆ هەموو بەندەکانی خۆی دەبارێنێت.

کاتێ هەموو قاغەکراوەکانی بۆ موسڵمانان ئاچوغ کر، تەنها قاغەی (نقیع) نەبێت، پێغەمبەری خواﷺ کاتی خۆی بۆ حوشترەکانی (بیت) تایبەت کردبوو.[1]

بە قاغەکردنەوەی لەوەرگاکان واتە: سودە گشتی یەکەی، تا بەردەوام وەقف بێت بۆ سەرجەم موسڵمانان.[2]

هـ ـ بتەوکردنی ژێرخانی ئابووری:

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله هەوڵی دەدا کۆمەڵە پرۆژەیەك بە ئەنجام بگەیەنێت، کە بنە هۆی بە هێزکردنی لایەنی ئابوری، ئەم کارەیشی لەو سەردەمەوە دەستی پێ کردن کە بوو بە والی شاری مەدینە، ئەم پرۆژە گرنگانەیشی لە بەرژەوەندی بازرگان و جوتیارو گەشتیاراندا بوو، بە جۆرێ بەردەوام فەرمانی دەردەکرد بە لێدانی جۆگەو ڕوبار و بیر لە شاری مەدینە و جێگاکانی ترو، لە شاری مەدینەدا بیری (حەفید)ی لێدا، کە ئاوەکەی زۆر سازگار بوو، هەروەك مزگەوتی پێغەمبەری خوایﷺ فراوان کردو منارەکەی بەرزکردەوە، چەندان ئوتێل و خانی و وڵاخ و شوێنی مێوانداری ڕێبواران و گەشتیارانی دروست کرد[3]، هەستا بەلێدانی کەنداوی ـ أمیرالمؤمنین ـ لە نێوان نیل و ڕێبواران و گەشتیارانی دەریای سوردا، تا بە

---

١ـ فتح الباری (٥/ ٢٤)

٢ـ الإتجاه الجماعي في التشريع الإقتصادی لا ٢٤٢.

٣ـ خامس الخلفاء الراشدین للبدری لا ١٧٠.

ئاسانی له میسرەوه کالاّ بگوزرێتەوە بۆ شاری مەککە لە سەردەمی خۆیدا.[١]

ڕێگـای دا بـەوالی بەسـرە بەهەڵکەنـدنی ڕوبارێـك لـە سـەر داوای دانیـشتوانی شارەکەو ناوی لیّ نا ڕووباری (عەدی)[٢]

## سێیەم سیاسەتی عمر و داهاتەکان:

سیاسـەتی پەیـداکردنی پارەوسـامان و ڕێگاکـانی خـەرج کردنـی دوو فاکتـەری گـرنگن لـە بـواری ئابوریـدا، بۆیـە سیاسـەتی عمـررحمه الله بـەوە دەسـتی پێکـرد، کـە بەڕێژەیـەکی زۆر سـامانی بـۆ میلـەت سـەرف دەکـرد، قـەرەبووی هـەموو سـتەم لێکراوەکانی لە(بیت المـال) دەکـردەوە، تـاوای لێهـات خەزێنـەی عێـراق تـاپی بـوو ناچار لە شامەوە سامانیان هێنا بۆ (بیت المال)ی عێراق.[٣]

پارەیەکی زۆریشی لـە پـڕۆژە کـشت وکـاڵی یەکانـدا خـەرج کـرد و خـەرجی زۆر دەکرد لەو پێناو پتەوکردنی ژێرخانی ئابوری وڵاتی ئیسلام دا، هـەروەك سـامانێکی بێ ژماری لە بواری چاودێری کۆمەڵایەتیدا بۆ میلەت خەرج کرد.

لـە لایـەن داهاتەکانـەوە، هـەوڵی داو هـەموو بـاج و سـەرانە ناهەقـەکانی لابـرد، (جزیة)ی هەڵگرت لە سـەر هـەموو کەسێکی (أهـل الذمـة)، کـە موسـڵمان دەبـوون، سەرانە لاوەکیەکانی هەڵگرت لەسەر کشا وەرزان، هەموو سەربار خۆری و کۆتەکانی لەسەر لابردن.

هـەروەها (بیـت المـال)ی کـردووە بـەخاوەنی موڵـك و هـەموو قاغـەو بەخشـشە تایبەتی یەکانی لەخەڵکی سەندەوە وخستی یـەوە و، هـەموو تایبـەت مەندیـەکانی ئەمیرو بەرپرسەکانی گەڕاندەوە بۆ دەوڵـەت، لـە زۆربـەی پـارەی دەوڵـەتی خسـتە پێناو لایەنی ئیدارياتی مەدەنی و سەربازی.[٤]

---

١ـ السياسة الإقتصاديةو المالية لا ٥٥

٢ـ هەمان سەرچاوە لا ٥٧.

٣ـ سيرة عمر إبن عبدالحكم لا ١٢٩.

٤ـ السياسة الإقتصاديةو المالية لعمر لا ٨٥ .

هەموو ئەم كارە مەزنانەی ئەميری باوەڕداران‌رحمه‌الله بوون بە هۆی تەقاندنەوەی ووزەكان، كشت وكاڵ و بازرگانی پەرەی سەند، بەو هۆيەشەوە داهاتەكان چەند جار بوونەوە، وەك زەكات و خەراج و دەيەك، وای لێ هات خەزێنەی دەوڵەت پڕبوو، لێ ی ڕژا، عمريش‌رحمه‌الله زيادەكانی دانابوو بۆ پڕۆژە گشتيەكان تا زياتر ئامانجە ئابوريەكان بێنە دی.

لە مێژووشيدا ئەوە تێ بينی دەكەينن كە هەركاتێك دەوڵەتی ئيسلامی دەستی گرتبێت بە شەرعی خواوەو پڕۆگرامی شەريعەتی ئيسلامی جێ بەجێ كردبێت وڵات هەموو بوژاوەتەوەو دەوڵەمەندبوون، خەزێنەی (بيت المال) يش پڕبووەو لێ ی ڕژاوە، بە هيچ شێوەيەك ميلەت هەستی نەكردوە بە نەبوونی و ناڕەحەتی و هيچ بەرژەونديەكی گشتی و تاكە كەسی پشت گوێ نەخراوە.

هەركاتێكيش دەوڵەت لە پڕۆگرامی ئيسلامی لايدابێت و شەريعەتی ئيسلامی پڕ لەدادپەروەری پشت گوێ خستبێت ئەوا ميزانی يەتی وڵات تێك چووە و ميزانی يەتی دەوڵەتيش ئاوێنەی باڵای دادپەروەری و ستەم كاری يە، بەرنامە ڕێژی و، يان شپرزی و بێ بەرناميی يە.[1]

داهاتەكانی دەوڵەت لەسەردەمی خەليفە عمری كوڕی عبدالعزيز‌رحمه‌الله ئەم سەرچاوانە بوون:

(زەكات)و (جزية)و(خەراج)و (دەيەك)و (غنيمە)و(فيئ):

١ـ زەكات:

عمر‌رحمه‌الله گرنگی دەدا بە زەكات و سووربوو لەسەر بەدوا داچوونی، چونكە مافێكی هەژاران بوو پارەوسامانی دەوڵەمەندەكاندا، نابێت ساردوسڕی تێدا بنوێنرێت،زۆرگرنگی بەوەش دەدا،كەبەسەركەسانی شياودا(مستحق)دابەش بكرێت.[2]

١ـ السياسة الإقتصاديةو المالية لعمر لا ٨٥ .

٢ـ هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٦٠.

هەموو کاتێ بەکار بەدەستەکانی دەووت: بگەڕێن ئەو هەژارو نەدارانە بدۆزنەوەو مافی خۆیانیان پێ ببەخشن، هەرکاتێ هەژارو نەدار نەبوایە تا موچەو پارەیان پێ بدات، لە میزانی یەی وڵات بەندەی دەکڕی لە پارەی زەکات ئازادی دەکردن.[١]

عمر رحمه الله لەم بوارەدا دەیویست شوێن ڕێنمونی و هەنگاوە پیرۆزوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت لە بواری ئابوری و دابەش کردنی زەکات، کە بە جۆرێ لە جۆرەکان زۆربەی خەلیفەکانی پێش خۆی ساردو سڕیان تێدا نواندبوو، بەجۆری بە ناهەق وەریان دەگرت لە جێ ی خۆشیدا دابەشیان نەدەکردەوە.[٢]

لە ڕواڵەتی شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن عمرەوە رحمه الله ئەوەبوو داوای کردبوو، کە ئەو کتێبەی بۆ بهێنن، کە باسی زەکات و صدقات دەکات، نەك هەر ئەوە، بەڵکو دوای کتێبەکەی عمری کوری خطاب رضي الله عنه کرد لەوبارەیەوە، فەرمانی دا بە نوسینەوەی دانەیەك لە هەر یەك لەو دوو کتێبە، کە باسی زەکاتی حوشترو مانگاو مەڕ و بزن و ئاڵتون و زێر، خورماو گەنم و مێوژ، دیاری کردنی بەشە زەکاتی هەریەکە لەو جۆرانە.[٣]

عمر رحمه الله لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ ﴾ فەرمانی دا زەکات بدرێت بەو(٨) جۆرە کەسە، بۆ ئەو مەبەستە کۆمەڵێ فەرمانبەری دەست پاکی خاون متمانەی دامەزراند بۆ کۆکردنەوەی زەکات و ئامۆژگاری دەکردن، کە زوڵم و ستەم لە خاوەن موڵك و دەوڵەمەندەکان نەکەن و کتابی زەکات دانی ئەو ساڵەیان بۆ پڕ بکەنەوە.[٤]

---

١ـ سيرة عمر لابن الجوزى لا ١٢٩.
٢ـ سيرة عمر لابن الجوزى لا٩٤.
٣ـ هەمان سەرچاوە لا ٩٩.
٤ـ هەمان سەرچاوەلا ٩٩.

فەرمانیشی دەرکرد زەکات وەربگرن لەهەموو ئەو جۆرانەی زەکاتیان تێدا فەرزکراوە، تەنانەت لە مووچەبەرزەکان زەکاتی دەسەند و لەو مووڵك و سامانەکەیشی دەیگەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانیان زەکاتی لێ دەردەکرد.[١]

هەر وەك فەرمانیشی دەکرد ، کە زەکاتی هەموو هۆز و ناوچەیەك لەشوێنی خۆیاندا سەرف بکرێتەوە ئەگەر خۆیان هەژارو دەست کورتیان هەبوو.[٢] جارێکیان زەکاتیان لەناوچە یەکەوە هێنا بۆ لای عمر و ئەویش پێ ی ناردنەوە بۆناوچەکەی خۆیان و فەرمانی دا بەسەر هەرژارانی خۆیاندا دا بەشی بکەنەوە.[٣]

ئەم جۆرە چاکسازیە ئابووریانەی عمرﷺ لەشێوازی کۆکردنەوەی زەکاتدا کاریگەر زۆری هەبوو لەسەر زیاد بوونی و گەشەکردنی، ئەم سیاسەتە ئابووریەیو بەرقەرار بوونی ئاشتی و دڵئارامی و گرنگی دانی بە پرۆژە سەرەکی یەکانی کشتوکاڵ و بارزگارنی و ئاوەلاکردنی بازرگانی ئازادی سنووردار، هەلگرتنی هەموو باج و سەرانە ناڕەواکان، ئەمانە هەموو بوونە هۆی ئەوەی زیاد بوونی ڕێژەی زەکات دانەکان و زەکات دەرەکان.[٤]

عمرﷺ لەوجۆرە کەسانە بوو، کە توانی ڕێژەی زەکات دەران فراوان بکات، ئەمەش بەهۆی زانایی یەکەیەوە بوو لە فقیهی زەکات لەبەروبومی کشتوکاڵیدا، لەزەکاتی حوشتر و زەکاتی ماسی و هەنگوین دا.

بەهۆی زیادبوونی بانگەوازەوە لەسەردەمی عمردا موسڵمان بوونی و زۆرێك لە (أهل الذمة) بەلێشاو، لەڕاستیدا ئەمەش بوو هۆی زیاد بوونی ڕێژەی زەکات، چونکە لەناو ئەوموسڵمان بووانە دەوڵەمەند هەیە، کە ئاسایی یە ئەوانیش زەکات دەدەن و ژیانی پڕ لە خواناسی و تەقوای عمر وای کردبوو لەوەی متمانەیەکی تەواو لەنێوان

---

١ ـ الاموال لابی عبید ژ ١٢٢٦ لا ٢٩.
٢ ـ فتح الباری(٣/ ٣٢٣).
٣ ـ الاموال ١٩١٧ لا ٧١٢.
٤ ـ ملامح الانقلاب لا ١٣٥.

میللەت و خەلیفەکاندا دروست ببێت، وببێتە هۆی ئەوەی، کە خەڵکی زیاتر زەکاتی‌ی خۆیان بدەن بەدەوڵەتی ئیسلام، ئەوەش بوو بوهۆی ئەوەی ئابوری وڵات بەرەو بوژانەوەیەکی بەرچاو بڕوات.[١]

بەهۆیەوە وای لێ هات زەکات لەپێداویستی خەڵکی زیاتر بوو، خەڵکی وەری نەدەگرت و کەس نەمابوو وەری بگرێت.[٢]

٢ـ سەرانەی ساڵانە(الجزیه):

(جزیه) بەو بڕە پارەیە دەوترێت، کەلە هەموو کافرێك دەسەنرێت، کە وڵاتی ئیسلامدا دەژێت، ئەمەش لەقورئان و سوننەت و کۆدەنگی زانایاندا هاتووە، عمریش رحمه الله لەسەرشێوازی سوننەت (جزیه)ی لێ وەردەگرتن و هەرکامیان موسڵمان ببوایە(جزیە)کەی لەسەرهەڵدەگرتن، چونکە (جزیە) لەسەر کافر فەرزە و بەموسڵمانا بوونی لەسەری دەکەوت،[٣]

کەچی هەندێ لەخەلیفە ئەمەویەکانی پێش عمر، بیدعەی وەرگرتنی(جزیە)یەیان لەو کەسانەی موسڵمان دەبوون داهێنابوو، حەجاجیش جزیەی لێ وەردەگرتن و دەیووت لە ترسی(جزیە)دان موسڵمان بوون ئەمەش بوو بەهۆی هەستانی خەڵکی دژی حەجاج و خەلیفە ئەمەویەکان.[٤]

هەرکە عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله چووە سەر کورسی حوکم خێرا(جزیە)ی لەسەر موسڵمانان هەڵگرت، بەتوندیش فەرمانی دەرکرد بۆ کاربەدەستەکانی و پێی ووتن: هەرکەسێ ئەم شایەتومانەی ئێمە بهێنێ، ڕووبکاتە قیبلەکەمان و خۆیشی خەتەنە کردبوو ئیتر(جزیە)ی لێ وەرمەگرن.[٥]

١ ـ ملامح الانقلاب لا ١٣٥.

٢ ـ سير أعلام النبلاو (١٣١/٥).

٣ ـ السياسه الماليه والاقتصاديه لا ٧٠.

٤ ـ الجرائب فى السواد لا٥٨.

٥ ـ الاموال لا ٦١.

کاتێ(أهل الذمة) ئەوەیان بیست خێرا هاتن بەدەم بانگەوازی خواوە و موسڵمان بوون، کاربەدەستەی عمر سکالاَی ئەوەی هێنا بۆ لای عمر، کە گوایە(جزیە)دان کەمی کردوەو(بیت المال) خاڵی بوەتەوە!

عمریش لەوەلاَمدا ووتی: پاشان: خوای گەورە محمدی ناردوە بۆ بانگەواز کردن نەك بۆ پارە چنینەوە).[1]

عمرﷺ (أهل الذمة)ی کردبوو بەسێ بەشەوە و بەپێ ی وەزع باشی(جزیە)ی لەسەر دانابوون و بەشی دەوڵەمەند و بەشی مام ناوەندو بەشی هەژاران و، جوتیار لەزەویەکەی و بازرگان لەبازرگانەیەکەی و کاسب لەکاسبی یەکەی(جزیە)بدات.[2]

لەسەر ئاستی ولاَتەکانیش جیاوازی دەکرد، بۆ نموونە خەڵکی شام وەزعیان باش بوو زیاتری لەسەر دانا بوون و لەسەر هەژارەکانیانی هەڵگرتبوو، بەڵکو لە(بیت المال)یش مووچەی بۆ بڕیبوونەوە، وەك چۆن عمری کوڕی خطابیشﷺ بەوشێوەیەی کردووە.

ئیتر پاش ئەوە(أهل الذمة) لەدوای موسڵمانان بوون زیاتر سەربەست بوون لە ولاَتی ئیسلامدا و زیاتر برەویان بەکارو کاسبیان دەدا و بەوهۆیەوە زەکاتیان چەند جارەی (جزیە)دەدا بەئیسلام.

٣ـ دەستکەوتی زەوی(الخراج):

(خراج)ئەو بڕە پارەیە، کە دەوڵەتی ئیسلامی دەیخاتە سەر ئەوزەویانەی بەشەرگیراون، یان ئەو زەویانەی بەڕێگەی ئاشتیانە دراوەتەوە دەستی خاوەنەکانیان،

لەسەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزﷺ داهاتی خەراج بەڕادەیەکی زۆر زیادی کردو گەیشتە (١٢٤)ملیون درهەم.[3]

---

١ ـ الطبقات(٥/٣٨٤).

٢ ـ سیرة عمر (ابن عبدالحکم) لا ٩٩.

٣ ـ الخراج للریس٢٣٨.

بۆ بەردەوامی ئەو داهاتە هەستا بەقەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتنی ئەو زەویانەی، کە (خەراجین) تا ئەو سەرچاوە گرنگە بەردەوام (بیت المال)دەوڵەمەند بکات، هەروەك هەموو ئەو باج و سەرانە ناڕەوایانەی لابرد لەسەر جوتیاران، کە بوو بوونە هۆی دواکەوتنی بەرهەمی کشت و کاڵی، دەستی کرد بە لێدانی بیرو زیند و کردنەوەی زەویە پشت گوێ خراوەکان.

بەهۆی سیاسەتی ئابوری ژیرانەی عمرەوە بەجۆرێ بەروبومی کشت و کاڵی زیادی کرد، کە تەنها لەعیراقدا گەیشتە (١٢٤)ملیون درهەم، کە لەسەردەمی حەجاجدا تەنها (٤٠)ملیون درهەم دەستکەوتی خەراج بوو، کەلە سەردەمی عمری کوڕی خطاب(١٠٠)ملیون درهەم بوو.

خەراجیش زۆر گرنگ بوو بۆ وڵات ، چونکە سنوری خەرج کردنی زۆر فراوان بوو بەپێچەوانەی زەکاتەوە،کە(٨)جۆر لەخەڵکی سوودیان لێ وەردەگرت و بەس.[1]

٤ـ دەیەك(العشور):

ئەمەشە ئەوپارەیە، کە وەك(گومرگی ئەمڕۆ) وایە، بەڵام ئەوەی تێدایە لە موسڵمانان ناسەنرێت، بەڵکو لەو بازرگانە کافرانە دەسەنرێت، کە دەێنە ناو خاکی ئیسلام و، پاشان دەگەڕێنەوە واتە: لەنێوان وڵاتی ئیسلام و وڵاتی خۆیاندا بازرگانی دەکەن.

حوکمە شەرعی یەکەی ئەوەیە بۆ بێ باوەڕان کاتی لەدورەوە دێن(٢٠)دینار بوو، بەڵام(١٠)دینار لەبازرگانەکانی(أهل الذمة) دەسەنرێت و لەساڵێکیشدا یەکجار وەردەگیرێت.

عمررحمه الله زۆر گرنگی دەدا بە ڕوون کردنەوەی شێوازی وەرگرتنی ئەم داهاتە و لەنامەکانیدا بۆ کاربەدەستەکانی بەدرێژی ڕوونی کردۆتەوە وەك ئەوەی یاسای (وەسڵ)ی داهێنابوو، کە هەر بازرگانێك پارەی ئەو ساڵەی دەفع کرد وەسڵێکی بۆ بکرێت، تا لەو ساڵەدا کەس جارێکی تر داوای لێ نەکاتەوە، هەروەها بەدەستی

---

١ ـ السياسة المالية والاقتصادية لعمر لا ٧٦.

لێیـان نەسـەنرێت، بـەڵکو کـاتی قـازانج کردنـدا بیـدەن، بـەوجۆرە جوڵەیـەکی گەورەکەوتـە نـاو بازرگانـە بیـانی یـەکان و هـەموویان پارەکانیـان خـستبووە نـاو بازرگانی یەوە لەناو وڵاتی پان و پۆڕی ئیسلامدا بەبێ تـرس دەهـاتن و دەچـوون و خەزێنەی موسڵمانان لەم سەرچاوەدارایی یە بەهرەمەند دەبوو.

٥- دەستکەتی جەنگی(غنیمە)و(فەیئ):

غەنیمە بەو ماڵە دەڵێن، کە بەزۆرو لەجەنگدا لـەبێ بـاوەڕان دەسـەنرێت، بـەڵام (فەیئ)، بەوماڵە دەڵێن لەبێ باوەڕان دەسەنرێت بەبێ شەڕ و ئەرك و ماندووبون.

کاتێ عمر چوە سەر کورسی خەلافەت هەموو هەوڵێکی تەرخان کرد، بـۆ تۆکمـە کردن و چاك کردنەوەی کاروباری ناوخۆی وڵات، بۆیە زۆر گرنگی بەجەنگـە ڕزگـاری خوازیەکان (الفتوحات)نە دەدا، لەسەردەمی خۆیدا، بەڵکو هەموو هەولێیکی خـستە گەر بۆ بانگەوازو سەرمەشقی جـوان، بـەجۆرێ دەسـتی کـرد بـە نوسـینی نامـە بـۆ پاشـاکان و گەلـە جیاجیاکـانی سـەرزەوی و بەوهۆیـەوە بەربـەرەکان بـەبێ جـەنگ موسڵمان بوون و هاتنە ناوئیسلام.[1]

لەبەر ئەم هۆیانە ئەم سەرچاوە دارایی یە لەسەردەمی عمردا کز بوو، ئەو مـاڵ و سامانەی (بیت المال) هەمووی لەغەزاکانی پێشووەوە دەست کەوتبوو.[2]

بەڵام هەوڵێکی خـستنە کـار لـەپێناو گەیاندنـەوەی (پێـنج یـەکی) دەسـتکەوتی غەنیمـە جیهـاد بـە خـەڵکانی هـەژارو وشـیاری خـۆی بەوشـێوەیەی لەسـورەتی (الانفـال)دا بـەجوانی ڕوون کاروەتـەوە، لەهـەموو سـامانێکی تـر جیـای کـردەوە (١٠)هەزار دیناری لێ جیا کردەوە و دابەشـی کـرد بەسـەر (بنـی هاشـم)داو گـەورەو بـچووك و نێـرو مـێ ی وەك یـەك دانـا، لەسـەر ئـەوەش فاطمـەی کـچی حـسین ﵂ نامەیەکی سوپاسگوزاری بۆنارد و پێ ی ووت:

((ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران، بەڕاسـتی بوویـت بەخزمـەتکاری کەسـانێك، کـە

١ - السیاسة المالیة والاقتصادیة لعمر لا ٨١.

٢ - السیاسة المالیة والاقتصادیة لعمر لا ٨١.

خزمەتکاریان نەمابوون، پۆشتەت کردنەوە لەکاتێکدا پۆشتە کەرەوەیان نەمابوو، سامانت ڕاژند بەسەرکەسانێکدا کە هیچیان نەبوو خەرجی بکەن).[١]

ئەو ٥/١ ی غەنیمەیە زۆر گرنگ بوو لەلای عمر، کە پێشتر پشت گوێ خرا بوو، کاتێ وڵاتی ئەندەلوس ڕزگار کرا٥/١ی لێ جیا نەکرایەوە، بۆیە عمررحمه الله نامەی نووسی بۆ فەرمان ڕەوای ئەوێ و پێی ووت: هەموو زەوی و زاری و موڵکەکان بەمەرجێك بەجەنگ گیراوە بێت ٥/١ ی لێ جیا بکەرەوە.[٢]

بۆ ئەو زەویانەیش بەبێ جەنگ گیرابوون، کەپییان دەوترێت(فیئ) عمررحمه الله تەرخانی کردبوو بۆ هەموو موسڵمانان و لەسەر بۆ چوونە فقهی یەکەی عمری کوڕی خطابرضي الله عنه، کە کاتێ خۆی ئەو جۆرە زەویانەی (وقف)کرد بۆ هەموو موسڵمانان ، تا لە سوودەکەی بەردەوام بێت بۆ جیل و نەوەکانی دواتریش.[٣]

عمررحمه الله لە ( پێنج یەك) وورد بویەوە دەبینێ لەگەڵ (فیئ)دا حوکمەکانیان وەك یەکن لەبەرئەوە تێکەڵی کردن وەك چۆن عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه کاتی خۆی، کردبووی.[٤] و لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا حەرجی دەکردەوە.

بۆ ئەو مەبەستە نامەیەکی نووسی تیایدا ووتی: ((... بۆ ٥/١ی دەستکەوتی جیهاد زانایان جیاوازیان هەیە تیایدا... من وا دەبینم وای لێ بکرێت وەك خەلیفەی دووەم عمری کوڕی خطابرضي الله عنه کردنی بەیەك و هەموو موسڵمانیش پێی رازی بوون، ئێوەش چاو بکەن لەو پێشەوا دادپەروەرە، چونکە هەردوو ئایەتەکە - ئایەتی ٥/١ ، ئایەتی (فیئ)یەکشتن، منیش وا دەزانم، کە بکرێت بەیەك و تەرخان بکرێن بۆ هەموو موسڵمانان و کەسی لێ جیا نەکرێتەوە.[٥]

بەهۆی ئەم سیاسەتە ژیرانەیەی عمرەوە خەڵکی هەناسەی خۆشیان هەڵمژی و هەستیان کردبەدادپەروەری و نەمانی ستەم ناڕەوایی لەدابەش کردنی خێراتی وڵاتدا.

---

١ - الطبقات(٥/ ٣٩٠).

٢ - تأريخ الاسلام. حسن ابراهيم (٠١/ ٣٢٠).

٣ - الخراج، ابی یوسف لا ٣٥.

٤ - سیاية المالية والاقتصادية لعمر لا (٨٣).

٥ - سيرة عمر( بن الحكم )لا ٩٧.

**چوارەم: سیاسەتی عمر لە خەرج کردنی پارەی گشتی دا:**

١- خەرج کردنی ماڵ لەپێناو بواری چاودێری کۆمەڵایەتیدا:

لەپێناو سەر لەنوێ دابەشکردنەوەی داهات و بەر و بومەکاندا، عمرﷺ هەوڵی زیاتری دا، تا هەژارو نەدارەکان پشکی زیاتریان بەر بکەوێت لە (بیت المال)، بۆ هاتنە دی چاودێری تەندورستی و کۆمەڵایەتی لەناویاندا، ئەمەش داوکاری شەریعەتی ئیسلامە ولە سەوننەتی پێغەمبەرداﷺ هاتووە.

عمریشﷺ هەر لەیەکەمین ڕۆژەکانی دەست بەکار بوونی خەلافەتی یەوە، هەوڵی دا خاڵ بەخاڵ شەریعەتی ئیسلام جێ بەجێ بکات و هەق دادپەروەی بەرپابکات، بۆ ئەو مەبەستە نامەی دەنارد بۆ زاناکان و پرسیاری شەرعی جیاجیای ئاڵۆزی لێ دەکردن، و (إبن شهاب الزهری) بۆ ئەوە مەبەستە کتێبێکی نووسی بۆ عمرﷺ و تیایدا باسی زەکاتی بۆ کرد لەژێر ڕۆشنایی سوننەتی پێغەمبەردا، تا لە کاتی خەلافەتدا کاری پێ بکات، تیایدا نووسیبووی: تیایدا بەشی نەخۆشە درێژ خایەنەکان و کەم ئەندامانم دیاری کردوە، بەشێکیش بۆ هەموو موسڵمانێك نەخۆشییەکی لەگەڵدا بێت، کە نەتوانێت کاروکاسبی بکات و، بەشێکیش بۆ هەژارانەی، کە سواڵ دەکەن، یان خزمەتی دەوڵەمەندەکان دەکەن، تا نانەسکی یەکیان پێ بدەن، ئەوانە بەشیان پێ بدرێت، تا ئیتر دەست لەکەس پان نەکەنەوە...

بەشێکیش بۆئەو کەسانەی، کە لەبەندیخانەدان و کەسیشیان نی یەخواردن و پێداویستیان بۆ بنێرن... بەشێکیش بۆ ئەو نوێژگەرانەی، کە کاروکاسبی یان موچەیەیکان نی یە لەلایەن دەوڵەتەوە و ڕووشیان نایەت لەکەس دواو بکەن.. بەشێکیش بۆ ئەوکەسانەیە، کە هەژارا کەوتوون وقەرزاری هێناونی بەچۆکدا، قەرزەکانیشی بۆ شتی ناشەرعی نەکردوە، کەسیش قسەی نی یە لە موسڵمانەتی و پیاو چاکیان دا،... بەشێکیش بۆ ئەو گەشتیارانەی - مسافر - کە شوێنیان نی یە بۆی بڕۆن و خرمێشیان نی یە لەو جێگایەدا... ئەوانە خواردن و خەوتن بۆ خۆیان و

وڵاخەکەکانیان مسۆگەر دەکرێت، تا دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، یان خزم و کەس دەدۆزنەوە.[١]

ل- بەشی هەژار وکەم دەرامەتەکان:

عمر رحمه الله زۆر بیری لەلای هەژارو کەم دەرامەتەکان بوو، هەوڵی دەدا دەوڵەمەندیان بکات، کە پیشتر باسی ئەو بەسەر هاتەمان کرد، کە لەگەڵ(فاطمة)ی خێزانیدا ڕووی داو پرسیاری لەعمر کرد لەهۆی گریان و فرمێسک ڕشتنی، ئەویش ووتی: ئیشووکاری ئوممەتی محمد ﷺ سپێراوە بەمن، منیش بیرم کردەوە لە هەژارێکی برسی، لەنەخۆشێکی لەبیرکراو، روت و بێ بەرگەکان، ستەم لێکراوە تا سێنراوەکان، غەریبێکی بێ کەس و کار، پیرێکی بەساڵاچوو، پیاوێکی مناڵ دار، بۆم دەرکەوت خوای گەورە لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکات دەربارەیان، محمدیش پشتگیری ئەوان دەکات لەدژی من، منیش لەوە ترسام قسەم پێ نەبێت و بشکێم، بەزەییم بەخۆمدا هاتەوە و دەستم کرد بەگریان.[٢]

لەم ڕووداوە وە سیاسەتی عمری کوڕی عبدالعزیزمان بۆ دەردەکەوێت دەربارەی چینی هەژاران چۆن بووە، پڕیەتی لەمانای بەرز، کە پیویست بەورد بوونەوەی تێ ڕامان دەکات، هەستی دەکرد بەو ئەرکە قورس و گرانەی سەرشانی و هەستی بەرپرسیاریەتی دەکرد دەربارەی گەل، پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ((کلکم راع وکلکم مسؤل عن رعیته، والامام راع و هو مسئول عن رعیته)).[٣]

عمری کوڕی عبد العزیز رحمه الله ئەو پەڕی هەوڵی دەدا و پێداویستی هەژاران و داماوان دەربکات، پیاوێك هاتە خزمەت عمر رحمه الله لەبەردەمیدا وەستاو ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، هەژاری زۆری بۆ هێناوم و نەداری هێزی لێ بڕیوم، خوایش سبەینێ لەسەر ئەم حاڵەی من لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکات، لەو کاتەدا عمر خۆی

---

١ ـ السیاسة المالیة الإقتصادیة لعمر لا ٨٣.

٢ ـ سیر اعلام النبلاء(١٣٢/٥).

٣ ـ البخاري ژ٨٩٣.

دابو بەسەر دار عەسایەكەیدا، دەستی كرد بەگریان، تا فرمێسك بەدار عەسایەكە هاتە خوارەوە، پاشان موچەیەكی بۆ خۆی و منداڵەكانی بڕیەوە، فەرمانیشی دەركرد(٥٠٠)دیناری بدەنێ، تا كاتی مەعاش وەرگرتن.[١] كەلەو كاتەدا ساڵانە بووە.

بۆ ئەو مەبەستە زۆر گرنگی دەدا بە بێوەژن و منداڵەكانیان وەك باسی ئافرەتە عیراقیەكەمان كرد، چونكە باش ئاگاداربوو، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( الساعي على الارملة والمسكين كالمجاهد في سبيل الله، أو كالذي يصوم النهار ويقوم الليل)).[٢] واتە: ئەوەی پێداویستی بێوەژن و هەژاران دەربكات وەك ئەو سەوایە لەپێنا خوا جیهاد بكات، یان ئەوكەسەی بەڕۆژ بەڕۆژووەوە بەشەو شەو نوێژ دەكات.

ئەمیری باوەڕداران؏ خانوویەكی تایبەتی دروست كرد بۆ نان خواردن تایبەت بوو بە هەژاران و كەمدەرامەت و ڕێبواران.[٣] ئەو گرنگی دانەی عمر تەنها هەژارو كەم دەرامەتەكانی نەگرتبویەوەو بەس، بەڵكو هەموو نەخۆش و عیللەت و دارو هەتیوەكانیشی گرتبووە، بۆ ئەو مەبەستە نامەیەكی نارد بوو كاربەدەستەكانی شام و پێ ی ووتبوون:

(٠ هەموو نابیناكانم بۆ بنێرن لەگەڵ ئیفلیجەكان و قاچ پەڕیوەكانیش و ئەوانەشی نەخۆشی درێژ خایەنیان لەگەڵدایەو ناتوانن نوێژ بكەن، ئەوانیش ناوەكانیان بۆ نارد، ئەویش بۆ هەموو نابینایەك یەكە كەسی بۆ تەرخان كرد دەستی بگرێت و هەر دوونەخۆش و خزمەتكارێكی بۆ گرتن، پاشان نامەی نارد بۆیان ووتی: ناوی هەتیوانتانم بۆ بنێرن لەگەڵ ئەوكەسانەی كە بێكەسەن، فەرمانی دەركرد، كە هەر پێنج هەتیو و خزمەتكارێكی بۆ گرتن، كە بگەرێت بەسەریاندا و خزمەتیان بكات.[٤]

---

١ ـ حلية الأولياء(٥/٢٨٩).

٢ ـ البخاري ژ٦٠٠٦.

٣ ـ الطبقات (٣/ ٣٧٨).

٤ ـ سيرة و مناقب عمر لابن الجوزي لا ٢٠٢.

ب ـ هاوکاری کردنی قەرزارەکان:

لەو کەسانەی، کە هاوکاری عمر رحمه الله گرتنی یەوە قەرزاران بوو، (إبن شهاب الزهری) لەکتێبەکەیدا بۆ عمری نووسی و پێ ووت: بەشێك لەزەکات بۆ قەرزارانە، ئەوانەی لەکاتی جیهاد تووشی قەرزاری بوون، یان کەسێك هەژارو کەوتووە و نا توانێت قەرزەکانی بداتەوە، کە بۆ کاری ناشەرعی قەرزی نەکردبێت، لەلایەن خواناسی و بەندایە ئیشەوە ڕێك و پێك بێت.[١]

بۆ ئەو مەبەستە عمر رحمه الله نامەی نووسی بۆ هەموو هەرێمەکانی، کە هەرکەس قەرزارە قەرزەکانی بۆ ببژێرن، ئەوانیش نامەیان نووسی ، کە کەسی وا هەیە خانووی هەیەو خزمەتکار وولآخ و شت و مەکی هەموو هەیە، عمریش لەوەلآمدا پێ ی ووتن: دەی پیاو دەبێت خانووی هەبیت بڕواتەوە بۆی، خزمەتکارێکی هەبێت کارێکی بۆ بکات و ولآخێکیش، کە جیهادی بەسەرەوە بکات و شت و مەکی ناو ماڵیشی هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا قەرزار بێت قەرزەکانی بۆ ببژێرن.[٢]

نامەیەکیشی نووسی بۆ والی کوفە، کە پارەو پولێکی باشی لە (بیت المال)دا هەبوو ـ پێ ووت: نامەت بۆ نووسیووم، کە لە دوای ئەوەی پارەی سەربازەکانت داوە، کە چی پارەکە هەر زۆرەو ماوەتەوە، دەی بیبەخشەرەوە بەسەر ئەوانەی قەرزیان کردوە بۆ شتی چاك، یان ژنیان هێناوە و ناتوانن بیگوێزنەوە، والسلام.[٣]

نامەیەکی تری بۆ نووسین و لە مزگەوتی کوفە دا خوێنرایەوەکە پێ ی ووتبوون: هەرکەسێ ڕاسپاردەیەکیان پێ داوە و ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی دەی ئێوە لەپارەو سامانی خوا بۆی بدەنەوە، هەرکەسێکیش ژنی خواستووە و ناتوانێت مارەیی یەکەی هەڵسوڕێنێت، لەماڵی خوا بۆی هەڵسوڕێنن.[٤]

---

١ ـ الاموال لابن عبیدة ١٨٥٠.

٢ ـ سیر عمر لابن عبد الحکم لا ١٧٧.

٣ ـ سیرة عمر (ابن عبدالحکم) لا ١٧١.

٤ ـ سیرة عمر (ابن عبدالحکم) لا ١٧١.

ج ـ کۆمەکی کردنی دیل کراوان:

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله گرنگی تەواوی دەدا بە ئەسیرو دیل کراوەکان لە(بیت المال) خەرجی پێ دەدان، بۆ ئەو مەبەستە نامەیەکی نووسی بۆ دیلە موسڵمانەکان لە (قسطنطینیة).[١] کەپێشتر دەقی ئەم نامەیەان نووسیوە لەبەشی ژیانی کۆمەڵایەتی عمردا باسمان کردوە.

هەروەها گرنگی دەدا بە بەندنەکراوە موسڵمانەکانی ناو بەندیخانەی موسڵمانان کە بەهۆی هەرتاوان و خەتایەکەوە گیراونو فەرمانی دەرکرد، کە بە جوانی خزمەت بکرێن و خەرجیان دابین بکرێت، عمر بۆ ئەو مەبەستە نامەی نووسی بۆ کاربەدەستەکانی و پێ ی ووتن: لەناو زایندانەکانتاندا کەس نەهێڵنەوە بە کۆت و زنجیرەوە کە نەتوانێت نوێژەکانی بکات، کەس بە کۆت و زنجیرەوە نەخەوێت مەگەر ئەوانەی، کە قاتیلن و پیاویان کوشتووە، ماڵ و سامانیان بۆ خەرج بکەن لەپێناو خواردن و جل و بەرگیاند.[٢] فەرمانیشی دەرکرد، کە خواردن و بەرگی زستانەو هاوینە یان بۆ مسۆگەر بکەن.[٣]

د ـ هاوکاری گەشتیار و ڕێبواران

عمررحمه الله گرنگی بەگەشتیاران و ڕێبوران دەدا، فەرمانی دەردەکرد بۆ کاربەدەستەکانی، کە خانوو ـ ئوتێل ـ دروست بکەن لە سەر ڕێگاکاندا بۆ پێشوازی کردنی گەشتیاران و گرنگی دان پێیان، بۆ ئەو مەبەستە نامەیەکی نووسی بۆ کار بەدەستێکی و پێ ی ووت: ( لەوڵاتەکەتدا(ئوتێل)و (خان) دروست بکە، هەر موسلچمانێك هاتە سنوری وڵاتەکەت با شەو ڕۆژێك و خۆیان و ووڵاخەکانیان لەویدا بحەوێنەوە، هەرکەسێکیش نەخۆشە با دوو ڕۆژ و دووشەو بمێنێتەوە تیایاندا، هەر کەسێکیش پارەی لێ بڕابوو ئەوەندەی پێ بدەن، کە بیگەیەنێت بەشوێنی خۆی.[٤]

---

١ ـ الطبقات (٥/ ٣٧٤).

٢ ـ خراج أبو یوسف لا ٣١٥.

٣ ـ الطبقات (٥/٣٥٦).

٤ ـ السیاسة المالیة والاقتصادیة لعمر لا ٩٤.

هەروەها نامەی دەنووسی بۆ سەرجەم هەریمەکان، کە هاوکاری تەواوی حاجیانی ماڵی خوا بکەن و خەرجیان دابین بکەن،چاودێری لاوازەکانیان بکەن و هەژارەکانیان کۆمەکی بکەن.[١]

ه ـ هاوکاری بەندەکان بۆ ئازاد کردنیان:

پاش ئەوەی عمر رحمه الله پارەو سامانی دەوڵەتی خستە خزمەت هەژارو کەمدەرامەت و ناتواناکان و قەرزارەکان و ڕێبوارانەوە، ئیتر پارەو سامانی تری تەرخان کرد بۆ ئازادر کردنی بەندە و ژێردەستەکان، کار بەدەستی عمر لە ناوچەی ئیفریقیا دەڵێت: (( عمر ناردمی بۆ کۆکردنەوەی زەکات و خێراتی ئەفریقیا، داوام کرد هەژارەکان بێت زەکات وەربگرن کەچی یەك هەژاری تێدا نەبوو... منیش دەچووم کۆمەڵێ بەندەم دەکڕی و ئارازارم دەکردن)).[٢]

پێشتریش باسی ئەوەمان کرد، کە عمر مووچەی تەواوی بڕیبویەوە بۆ زاناو مامۆستاکان، تا خۆیان یەکلایی بکەنەوە بۆ خزمەتی زانست و بانگەواز، ئیتر گرنگی و هاوکاری یەکانی هەموو چینەکانی کۆمەڵگای گرتبوویەوە تەنانەت منداڵانیش، کە مووچەی دەدا بەم سەرپەرشتیارانیان، تا بۆیان خەرج بکەن، گرنگیشی دەدا بە (أهل الذمة) و لە (بیت المال) هاوکاری هەژارو دەست کورتەکانی دەکردن.[٣]

ئەوەی لیرەدا پیویستە ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیکە ئەم سیاسەتەی عمر رحمه الله بوو بەهۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی دەوڵەمەند بوون، بوونە خاوەنی سەرمایەی کشت و کاڵی و بازرگانی و شتی تر، بوو بەهۆی بەهێز بوونەوەی دینداری و خۆشەویستی ڕۆژی قیامەت لەناو دڵەکاندا و حەزکردن بەخێرو چاکە لەپێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا. بەوهۆیەوە خێر کردن لەپێناو خوادا زیادی کرد

١ ـ سيرة عمر (ابن عبد الحكم) لا ٦٥.

٢ ـ السياسة المالية والاقتصادية لا ٩٤.

٣ ـ هەمان سەرچاوە لا ٩٧.

بۆ هاوکاری کردنی هەژارو نەدارو بێوەژن و دروست کردنی شوێنەگشتی یەکان و لێدانی بیرەکان و دروست کردنی مزگەوت و شتی تریش و ئەمەش کاری سەرشانی (بیت المال)و دەوڵەتی ئاسان کرد بوو چ لە پایتەختدا، یان لە هەرێمەکاندا.

٢- ڕێنمونی کردنی خەرج کردنەکانی دەوڵەت:

سیاسەتی عمری کوڕی عبد العزیزرحمه الله لەبواری خەرج کردندا لەسەر بنەمای ئابووری ژیرانە وەك ئەمڕۆ پێ ی دەڵێن: بنەمای سەروەری لەخەرج کردندا، کە بەوجۆرێکە دوورە لە زیادەڕەوی لەخەرجداو پارەو سامان بەزایەدان لەشتی پڕو پوچ و لاوەکیدا، لەهەمان کاتدا دورە لەدەست قوچاوی و چروکی.[1]

لەو هەنگاوانەی گرتیە بەر لەبواری خەرجکردندا لەپێناوی بەرژەوەندی یەکانی دەوڵەتدا:

أ - موڵك و دەستکەوتە تایبەتیەکانی خەلیفە و ئەمیرەکانی بڕی:

یەکێ لەکارە گەورەگران و ترسناکە کان کە عمر- بویرانە - پێ ی هەستا ئەوە بوو، کە هەموو موڵك و سامان و زەوی زارەکانی خەلیفە و فەرمانڕەواو والی یەکان هەبوو، کەبە ناڕەوا پێیان درابوو، لێ ی سەندنەوەو خستی یەوە (بیت المال)و ئەوەی هی خەڵکی بۆی گەڕاندوە، سەرەتا لەخۆی و بنەماڵەکەی خۆیانەوە دەستی پێ کرد و عمر لە(بیت المال) موچەی وەرنەدەگرت، ، پێیان ووت: عمری کوڕی خطابرضي الله عنه مووچەی لە (بیت المال) وەرگرتووە ئەویش لەوەڵامدا ووتویەتی: عمر پێویستی پێ ی بووە و من خۆم پارەم هەیە.[2]

کاتێ کەژاوەی خەلافەتیان بۆ هینا لەپاش مردنی سولەیمان، خیرا ووتی: هەرچی وڵاخ و فەرش و جوانکاری هەیەیتایدا هەمووی بخەنە (بیت المال) عادەتی وابوە لەپاش مردنی یەکێکیان، هەموو جل و بەرگ و عەتر و شتەکانی تری

١ - السياسة المالية والاقتصادية لعمر لا ٩٦.
٢ - العقد الفريد (٥/ ٢٢).

دەردرایە دەستی خەلیفەی نوێ دەوڵەت، بۆیان هێناوە، ئەویش فەرمووی: ئەمانە هی سولەیمان بووە، نەهی منەو نەهی ئێوە، بەڵکو هەمووی موڵکی موسڵمانانەو بۆیە خستی یە(بیت المال).[١]

جارێک داوای کرد لەخزمەتکارەکەی هەندێ هەنگوینی بۆ بکڕێت و ئەویش بەئەسپەکەی نامەبەرەکان هێنایەوەو بۆماڵەوەو عمریش فەرمانی دا هەنگوینەکەیان فرۆشت و نرخەکەی خستە (بیت المال) و بەخزمەتکارەکەیشی ووت: هەنگوینەکەت پیس کردین ماڵت ئاوا بێت![٢] عمر رحمه الله هەرگیز سامانی گشتی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارنەهێناوە، جارێک ئەمیری ئەردەن دووسەبەتە خورما بەدیاری بۆ عمر دەنێرێت، بەهۆی وڵاخەکانی نامەبەرەوە و هەر، کە عمر بەوەی زانی خێرا فەرمانی دا خورماکانیان فرۆشت و دایان بەئالف بۆ ئەسپەکانی نامەبەر.

ب: کەم کردنەوەی خەرجە ئیداریەکان

عمر رحمه الله هەوڵی دەدا هاوکاران و والی و فەرمانڕەواکانی والێبکات کەمترسامان و شت و مەکی دەوڵەت بەکاربهێنن، کاتێ والی مەدینە داوای مۆمێکی کرد لە عمر، عمریش لەوەڵامدا پێ ی ووت: بەهەموو تەمەنم من تۆم واناسیوە ئەی (ابن أم حزم)، کە لە شەوە تاریکەکانی زستاندا بەبێ چرا دەچوویت بۆ مزگەوت، بەڵام وا ئەزانم تۆ ئەوکاتە چاکتر بویت لەئێستا، دەی فتیلەکانی ماڵەوە بەسە بۆت، والسلام.[٣] جارێکی تر هەر ئەو والی یە لەنامەیەکدا داوای کرد لەعمر، کە هەندێ پەرەی نووسینی بۆ بنێرێت... عمریش لەوەڵامدا پێ ی ووت: ئەگەر ئەم نامەیەیی منت پێ گەیشت نووکی قەڵەمت تیژ بکەو ورد بنوسە و دێر مەپەڕێنەو، شتی زۆر بنووسە لەیەك لاپەڕەدا، چونکە موسڵمانان پێویستیان بەنووسینی زیادە نی یە، کە زیان لە (بیت المال)ەکەیان بدات.[٤]

١ ـ سيرة عمر( ابن عبد الحكم) لا ٣٥.
٢ ـ سيرة ومناقب عمر لابن جوزى لا ٢١٠.
٣ ـ سيرة عمر (ابن عبدالحكم) لا ٦٤.
٤ ـ سير و مناقب عمر(لابن الجوزي) لا ١٢١.

لێرەدا ئەوە تێبینی دەکرێت، کە چۆن عمری کوڕی عبدالعزیز تا ئەو ڕادەیە ڕێنموونی بەرپرس و کار بەدەستانی ولآتەکەی دەکرد، تا ماڵ و سامانی دەوڵەت بەفیڕۆ نەدەن بە ڕادەیەك لەنووسینی نامەکانیشاندا هەوڵ بدەن بەکورتی بنوسن و بەبێ هودە پەرە سەرف نەکەن.

ج - شێوازی خەرجی سەربازی: ئەمەویەکان کۆمەڵی جەنگی دەرەکی و ناوەکیان ئەنجام دەدا، کە بوجەیەکی زۆری ولاتە یەکگرتوەکانی ئیسلامی بەفیڕۆدا، لەوانە هێرش بردنە سەر شاری(قسطنطينيه) لەسەردەمی (سلیمان)ی کوڕی عبدالملك دا، بەجۆرێ زۆری لەشەهید بوون و لەدەست دانی سامانێکی زۆری بەبێ هودەی لێ کەوتەوە.

بەلآم کاتێ عمر بووبە خەلیفە یەکسەر فەرمانی دەرکردبۆ (مسلمه)ی کوڕی (عبدالملك)کە سەرکردەی سوپا بوو پاشەکشە بە سوپای ئیسلام بکات و بگەڕێنەوە، تا سوپا لەتەنگەشەیە ڕزگاریان ببێت.

سیاسەی ژیرانەی عمر و ڕەوشت و ژیاننامە بەرزەکەی بوونە هۆی بەرقەرابوونی ئاشتی و ئارامی لەناو خۆدا و هەمو جەنگ و ئاژاوە ناوە خۆیەکان وەستان، کاتێ ژیانی عمر هەواڵەکانی گەیشتە لای خەواریج، هەموو کۆبونەوەو ووتیان: دروست نی یە لەگەڵ ئەم پیاوە چاکەدا بجەنگێین.[١]

ئەو جەنگ نەمانەیش بەدەوری خۆی ڕۆڵێکی گێڕا لەنەمانی ئاژاوەو و بەرقەرار بوونی ئاشتی و دڵئارامی، کە ئەوەش بوو بەهۆی گەشەی وابووری ولات و خۆش بوونی ژیان و گوزەرانی خەڵکی ئاست نز م و هەژاران، کە ئەوەش دوای کۆمەکی خوای پەروەردگار دەگەڕایەوە بۆ سیاسەتە ژیرانەکانی عمرﷺ.

---

١ ـ سیر و مناقب عمر(لابن الجوزي )لا ١٢١.

# بەشی حەوتەم

## دەزگای داد وەری لەسەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزدا هەندێك لەو بۆ چوونە فیقهی یەکانی لەو بارەیەوە

### یەکەم: دادگاکان و شایەتی دانەکان

**١ـ ڕەوشتی داد وەر:**

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله زۆر بەوردی قازی و داد وەری دیاری دەکرد. بۆ ناوچەکان نەوەك موسڵمانەکان تووشی داد وەریەك بکات، بەبێ شارەزایی حوکم بکات و لەهەق لابدات. بۆ ئەو مەبەستە(٥)مەرجی سەرەکی دانا بوو بۆ هەڵبـژاردنی دادوەر ـ قاضی ـ و لەوانە: (بوونی زانست، نەرم و نیانی، پاکی، ڕاوێـژکاری، بەهێز لەوەرگرتنی هەقدا).

(مزاحم) ی کوڕی زفر دەڵێت: لەگەڵ شاندێکی خەڵکی کوفەدا چوین بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز و ئەویش دەربارەی ناوچەکەمان و ئەمیرەکەمان و قازی یەکەمان پرسیاری لێ کردین، پاشان ووتی: پێنج ڕەوشت هەیە پێویستە لەهەموو قازی یەکدا بێتە دی و ئەگەر یەکێکیانی تێدا نەما دەبێتە خەوشی لەسەری: ((دەبێت تێ گەیشتوو بێت، لەسەر خۆ بێت، پاك بێت، لەهەقدا توندبێت، دەبێت زانابێت و پرسیار بکات لەوشتانەی نایانزانێت)).[1]

لەڕوایەتێکی تردا لە یحیی ی کوڕی عمری کوڕی عبدالعزیز دەگێڕنەوە، کە وتوویەتی: قازی و داد وەر خۆی بەقازی نەزانێت، تا پێنج شت هەیە لە خۆیدا نەهێنێتە دی: پاکبێت ـ عفیف ـ نەرم و نیان ـ حلیم ـ زانا بێت بە دادوەریەکانی پێشخۆی، ڕاوێژ بە ژیرمەندان بکات،گوێ نەدات بەلۆمەی خەڵکی).[2]

١ ـ الطبقات (٥/ ٣٦٩).
٢ ـ الطبقات (٥/ ٣٦٩).

عمری کوڕی خطابیشﷺ ووتەیەکی نزیکی هەیە لەمانایەوە،[١] عەلی کوڕی ئەبو طالبیشﷺ ووتەیەکی لەم مانایەوە هەیە، چوار مەزهەبەکەی ئیسلامیش لەم سیفەتانەدا لەگەڵ عمری کوڕی عبدالعزیز یەکدەگرنەوە.[٢]

## ٢ـ داد وەری مەسەل ئالۆزەکان:

لەوانە هەندێ کێشەی دادگایی ئالۆزە ڕووبەڕووی قازی ببێتەوە، کە دادوەر سەرسامە و نازانێ چ حوکمێك بدات، دەی ئایا حوکم دەربکات؟ یان واز لەو کێشەیە بێنێ بۆ کەسانی بالاتر و زاناتر؟!

عمر لەم بوارەدا بڕیارێکی دەرکرد کەشیاوی ئەوەیە، تا ڕۆژی قیامەت دادگاکان کاری لەسەر بکەن، ئەویش ئەوە بو، کە دەڵێت: هەرکاتێ دادوەر حوکمەکەی لەلا ئاشکرا بوو با حوکم دەرکات و ئەگەر لەلای ئالۆز بوو باواز لکێشەکە نەهێنێ، بەڵکو بەرزی بکاتەوزە بۆسەرووی خۆی، تا لێ ی بڕوانن و چارەسەری بکەن.[٣]

(میمون)ی کوڕی (مهران) نامەیەکی بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز نوسی وتیایدا پێ ی ووت: سکالای قورسی کاری داد وەری و بەرپرسیاریەتی کۆکردنەوەی زەکات دەرکرد لەوکاتەدا قازی جەزیرە بوو ـ عمریش لە وەلامدا پێ ی ووت: من شتێکم نەداو بەسەرتدا ، تا نارەحەتت بکات، بەڵکو زەکاتی خاوێن کۆبکرەوە لە هەر مەسەلەیەکیش دا، کە حوکمەکەی ڕوون بوو، حوکم دەربکە و ئەگەر لەلات ئالۆز بوو بەرزی بکەرەوە بۆمن، جا خۆ هەر کاتێ خەڵکی مەسەلەیەکیان لەلا قورس ببێت و وازی لیٚبێنن ئەوە نەدین بەرپا دەبێت و نەدونیا.[٤]

بەمەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە خوای گەورە ئاستی زیرەکی و تێگەیشتووی وەك یەك نەبەخشیوە بەخەڵکی، بەڵکو هەرکەسەو ئاستێکی پێدراوە، جا هەرکەسێ

---

١ ـ شذرات الذهب (١/ ١٢٠).

٢ ـ المغني ٩/ ٣٩ ـ ٤٣ ـ ٥٠.

٣ ـ فقه عمر بن عبد العزيز (٢/ ٤٨٧).

٤ ـ الخراج لأبي يوسف لا ٢٤٠ـ ٢٤١.

بوو به قازی و كێشه ڕوون و ئاشكراكانی هاتـه بەردەست بـا حوكميـان دەربكـات، بەڵام ئەگەر چارەسەری كێشەيەكی لەلا قورس بوو نەيدەزانی چی بكـات، بـا ڕاوێـژ بكات به زاناو خوێندەوارانی سنورەكەی، ئەگەر ئەوانيش نەياندەزانی بـا بـەرزتری بكاتەوزە بۆ كاربەدەستانی باڵا و كێشەكە لەدەستی ئەودا نەمرێتو بدرێته دەستی كەسانی تر.[1]

عمری كوڕی عبدالعزيز رحمه الله هەندێ لەشەوی تەرخان كردبوو بـه وتووێـژو لەگـەڵ زانايان و تێ گەيشتووان لەمەسـەله جيـا جياكـانی لـەكارو بـاری ئـاينی و دونيـايی، چونكه زۆر تێگەيشتو و بـوو دەيـزان بەيەككەيـشتنی پيـاوانی شـارەزا فيكـر نـوێ دەكاتەوەو هزرەكان بەرزدەكاتەوە.

بۆيه كاتێ (رجاء) ی كوڕی (حيوة) پرسياری لێ كرد، كه ئايا تۆ هـەموو ڕۆژەكـه بەكاروباری خەڵكی يەوە خەريكی دەی شـەوەكه دانـێ بـۆ حەوانـەوە خـۆت بۆچـی لەگەڵمان دادەنيشی بۆ شەو نشينی؟

لەوەڵامـدا وتـی: ئـەی رجـاء، بەيـەك گەيـشتنی پيـاوان مێـشك و عـەقڵ پاڵفتـه دەكات، ڕاوێژكردن و وتووێژ قاپی ڕەحمەت و كليلی فەڕو بەرەكەتـە، كـەس تيايـدا بەهەڵه دا ناچێت و ڕای لاواز جێگير نابێت.[2]

### ٣ـ نەرم ونيانی لەگەڵ گەوجان و حوكم نەدان لەكاتێ توڕه بووندا:

عمری كوڕی عبـدالعزيز رحمه الله نامـەی نووسـی بـۆ سـەركردەی سـوپاكان و پـێ ی ووتن: (( له (عبدالله) عمری كوڕی عبدالعزيز ـ ئەميری باوەڕداران ـ بۆ فەرماندەكانی سوپا... هەركاتێ سـكاڵاكەرێكی بـێ مێـشك و گێـل و بـێ ڕێـز هاتـه لات و ويـستت حـوكم دەربكـەيت بەسـەريدا، پەلەمەكـه و سـەرەتا، تـا دەتـوانی تـێ ی بگەيەنـه و بەنەرمی مەسەلەكەی بۆ ڕۆشن بكەرەوە، ئەگەر تێ نەگەشت و مەسـەلەكەی لـەلای ڕۆشن بكەرەوه ئەوه ـ نيعمەتی خوايه، ئەگەر سوديـشی نـەبوو لەگەڵێـدا ئـەوه تـۆ

---

١ ـ فقه عمر بن عبد العزيز (٢/ ٤٨٨).

٢ ـ ملامح الانقلاب لاسلامی لا ١٨٦.

قسەت نەهێشتەوە، بۆی ـ إقامه الحجه ـ و ئەگەر بۆت دەرکەوت تاوانێکی کردوە و شایانی سزادانە، تۆ لەو کاتی تورەیی یەدا حوکم دەرمەکە بە سەریدا، بەڵکو بەهێمنی و لە حوکمی ڕاستەقینە بکۆڵەرەوە دەربارەی ئیتر تاوانەکەی هەر تاوانێك بێت ـ و ئیتر باسزاکەیشی تەنها یەك دار بێت لێ بدەیت.

ئەگەر سزاکەیشی کوشتنی بوو پەلەمەکەو سێ ڕۆژ دوای بخەو گوێ مەدە بەکەسانەی لەو کاتەدا لەچواردەورتن و لەبەر ئەوان پەلە نەکەیت و پاش ئەو سێ ڕۆژە حوکم دەربکە تا نەوەك لەبەر تۆڵەی تورە بوونی خۆی بێت).[١]

## ٤ـ دادوەر بە هەڵە لەخەڵك ببورێت باشترە لەوەی بەهەڵە سزا بدات:

(ابو عقبه)دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز دەیووت: سزا دیار یکراوەکان لەسەر خەڵکی لابەرن بە بچوکترین بەهانە، چونکە (والی) ئەگەر بە هەڵە لەتاوانێك ببورێت زۆر باشترە لەوەی، کە بەهەڵە سزای بێ تاوانێك بدات.[٢]

## ٥ـ کار بەدەستان و دیاری وەرگرتن:

عمری کوڕی عبدالعزیز ﷺ هەموو جۆرە دیاری و بەخششێك، کە بدرایە بەوالی و داد وەران و فەرماندە سەربازی و مەدەنیەکانی بە بەرتیل دادەنا، لەئەوەپەری هەژارای و دەست کورتیدا دیاری وەر نەگرتووە، فەرمانیشی بەخەڵکی دەدا، کە دیاری نەبەن بۆ کاربەدەستاان، هەروەك فەرمانیشی دەدا بە کاربەدەستەکانی، کە بەهیچ جۆرێك دیاری لە خەڵکی وەرنەگرن.[٣]

(فرات)کوڕی(مسلم)دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیزﷺ حەزی لە سێو دەکرد، ناردی بۆ ماڵەوە، بەڵام ماڵەوە ووتیان: هیچمان نی یە سێوی پێ بکڕین، عمریش سواری وڵاخەکەی بوو، ئێمەش لەگەڵیدا سواری وڵاخەکانمان بووین، دای بەلای

---

١ ـ سيرة عمر (لابن عبدالحكم) لا ٦٨ـ ٦٩.

٢ ـ سيرة و مناقب عمر (لابن الجوزي) لا ١٢٣.

٣ ـ فقه عمر بن عبد العزيز(٢/٤٩٥).

(دێر)ێکدا کۆمەڵێك لە منداڵانی ناو دێرەکە بەسەبەتەیەك سێوەوە پێش وازیان لێ کرد، ئەویش لەلایاندا وەستا و سێوێکی هەڵگرت و تێر بۆنی کرد، پاشان خستی یەوە ناو سەبەتەکە، پاشان ووتی: بڕۆنەوە ناو دێرەکەتان و سێوەکەشتان بەرنەوە، چونکە وا نازانم سێوتان بۆ هەموو هاوڕێکانم هێنابێت.

(فرات) دەڵێت: وڵاخەکەم خێرا کرد و خۆم گەیاندە لای عمر پێم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران حەزت لەسێودەکرد و بۆت نەکرپا کەچی وا بەدیاری بۆت هات و تۆش وەرت نەگرت،! عمریش ووتی: پێویستم پێ ی نی یە، (فرات) دەڵێ: پێم ووت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عمر دیاریان وەرنەگرتوە؟ عمریش ووتی: بەڵێ: بەلام بۆ ئەوان دیاری بووە، بەلام بۆ کاربەدەستانی دوای ئەوان بەرتیلە.[1]

## ٦ـ هەڵوەشاندنەوەی هەر حوکمێك پێچەوانە بێت لەگەڵ قورئان و سوننەتدا:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله نامەی نووسی بۆ والی عیراق، کە هەموو ئەو حوکمانەی حەجاج کاتی خۆی دەری کردوون هەڵیان بووەشێنێتەوە،[2] فەرمانیشی دەرکرد لەهەموو جێیەك ئەم حوکمانە هەڵوەشێنەوە، کە پێچەوانەی یە لەگەڵ قورئان و سونەت و کۆدەنگ و شورا داو هەرسێ پێشەوا - مالك و شافعی و احمد- پێیان وایە، کە حوکمێك پێچەوانە بێت لەگەل قورئان و سوننەت و کۆدەنگدا - اجماع - کاری پێ ناکرێت و هەڵدەوەشێتەوە.[3]

## ٧ـ هەر کەسێك سپاردە بفەوتێنێ دەبێت سوێند بخوات:

(وهب)ی کوڕی (منبه)نامەی نووسی بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز و پێ ی ووت: بڕی پارەی (بیت المال)م لەلا بوو کەچی دیار نەماوە وونم کردووە، عمریش

---

١ ـ الطبقات الکبری (لابن سعد)(٥/ ٣٧٧).

٢ ـ حلیة الاولیاء(٥/٢٧٠).

٣ ـ فقه عمر بن عبد العزیز( ٢/٤٩٩).

لەوەلامدا بۆی نوسی: پاشان...من لە موسڵمانەتی و دەست پاکیت دلنیام، بەلام گلەیم لەوە هەیەکە وریانیت و شت وون دەکەیت، من بەرپرسیارم لەهەموو شتێکی موسڵمانان، بۆیە دەبێت سوێند بخوێت بۆیان، والسلام .[1]

### ٨ـ بەڵگەی نادیار و دواکەوتوو:

کۆمەڵێك لەقورەیشی یەکان هاتن بۆلای عمری کوڕی عبدالعزیز ﵀ و شکاتیان لەیەکتری هەبوو، عمریش﵀ حوکمی کردن، بەیەکێ لەوانەی حوکمەکەی بەسەردا درابوو ووت: من ناتوانم حوکمی هیچ مەسەلەیەك دوابخەم دوای ئەوەی بۆم ڕۆشن بویەوە، بەلام تۆ بڕۆ و هەرکاتێ بەڵگەیەکت بۆ هێناوم و لەو بەڵگەی ئەوان بەهێزتر بوو. من یەکەمین کەسم ، کە حوکمی خۆم هەڵبووەشێنمەوە.[2]

### ٩ـ مەسروفی حوشتری وون بوو:

(شعبی) دەڵێت: پیاوێك حوشترێکی لێ وون بوو، پاش ماوەیەك لەلای پیاوێك بینی یەوە، کە ئالیکی چاکی دابوویەو قەڵەوی کرد بوو، سکالای بەرزکردەوە بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز﵀ کە لەوکاتەدا والی شاری مەدینە دەبێت، حوکمی دەرکرد حوشترەکەی بگەڕێتەوەو بۆ خاوەنەکەی و خاوەنەکەیشی بڕی مەسروفەکەی بگێڕێتەوە بۆ کەسی یەکەم.[3]

### ١٠ـ منداڵی دوزراوەکەسێکی سەربەستە:

عمری کوڕی عبدالعزیز﵀ نامەی نووسی بۆ خەڵکی شاری مەککە و پێ ی ڕاگەیاندن، کە (منداڵی دۆزراوەـ اللقیط ـ سەربەستە...)واتە: دروست نی یە مامەڵەی بەندەی لەگەڵدا بکرێت کاتێ گەورە بوو.[4]

---

١ ـ سیرة عمر (لابن الجوزي)لا ١٠٤ـ ١٠٥.

٢ ـ الطبقات الكبرى(٥/٣٨٦).

٣ ـ مصنف ابن ابي شيبه (٦/ ٣١٢).

٤ ـ مصنف ابن ابي شيبه(٦/ ٥٣١).

### ١١ـ شایەتی برا بۆ برا:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله نامەی نووسی بۆ هەرێمێك و پێ ی ووتن: شایەی برا بۆ براکەی وەربگرن ئەگەر موسڵمان و دەستپاك بوو ـ عدل ـ.[١]

## دووەم: دەرابرەی کوشتن و تۆڵەسەندنەوە

١ـ لەسەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله ژنێك هەستا بەکوشتنی پیاوێك و عمریش کەس و کاری پیاوەکەی هێنا و پێ ی ووتن: ئەگەر حەزدەکەن عەفوی بکەن؟ بیەنو ئەگەر حەزدەکەن بیکوژنەوە ئەگەر حەزیش دەکەن خوێن وەربگرن، خوێن وەربگرن.[٢]

٢ـ پەلە نەکرێ، تا خاوەن خوێن گەورە دەبێت: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله دەربارەی ئەو پیاوەی، کە کوژرا و منداڵێکی هەبوو، ووتی: باکوژراوەکە ڕابگیرێت، تا ئەو منداڵە گەورە دەبێت و خۆی حوکم دەدات بەسەر بکوژی باوکیدا.[٣]

٣ـ هەندێ خۆش ببن و هەندێ خۆش نەبن لێ ی: (الزهری)دەڵێت عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله نووسی: ئەگەر یەك کەس لەکەس و کاری کوژراو ـ أولیاءـ لە بکوژ خۆش بوون ئیتر کوژراو ناکوژرێتەوە و دەگوێزێتەوە بۆ خوێن دان ـ الدیه ـ.[٤]

٤ـ کەسێ لەبازاڕدا دەکوژرێت و کەس نازانێت کێ کوشتویەتی: دادوەری شاری بەسرە(عدی)کوڕی (أرطأة) نامەی نووسی بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز و پێ ی ووت: لەبازاڕی قەسابەکاندا پیاوێکمان بەکوژراوی دیوەتەوە، عمریش ووتی: لە (بیت المال) خوێنەکەی بدەن.[٥]

---

١ ـ مصنف ابن ابي شيبه (٩/ ٣١٨).

٢ ـ المحلی ١٠/٠/ ٣٦١).

٣ ـ مصنف عبد الرزاق(١٠/ ١١).

٤ ـ هەمان سەرچاوە(٩/ ٣١٨).

٥ ـ هەمان سەرچاوە(١٠/ ١٦، ١٧).

٥ـ ئـەوەی لەقەرەباڵغیـدا دەپلیـشێتەوە: ئەگـەر کەسـێك لەقەرەباڵغیەکەکـدا بپلیشێتەوەو بمرێت و نەزانرا کێ کوشتویەتی! ئایا خوێنەکەی بـێ هـودە دەڕوات؟ عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله بۆ چوونی وابوو، کـە ئەگـەر بکوژرێـت و بکوژەکـەی دیـا نەبوو ئەو خوێنەکەی لەسەر (بیت المال)ی موسڵمانانە.[١]

جارێکیـان دەربـارەی دووکـەس، کـە لـە نـاو قەڕەباڵغیـدا خنکـابون، ووتـی: خوێنەکـەیان لـە (بیـت المـال) بـدەن، چـونکە یـان دەسـتێك، یـان قاچـێك پلیشانوێتیەوە.[٢]

## سێ یەم: دەرابرەی خوێن ـ الدیه ـ

١ـ خوێنی مرۆڤ: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نووسی بۆ سەرکردەی سوپاکانی پێ ی ووتن: لەسەردەمی پێغەمبەری خودا خوێنی مرۆڤێك (١٠٠)حوشتر بووە.[٣]

٢ـ خوێنی قرتـانی زمـان: (سـلیمان)ی کـوڕی (موسـی)دەڵێـت: لەونامەیـەی کـە عمـری کـوڕی عبـدالعزیز نـاردی بـۆ سـەرکردەکانی سـوپا ووتبـووی: ئەگـەر زمـان ئەوەندەی لێ قرتابوو، کە تواناى قسەکردنی نەمابوو خـوێنێکی تـەواوی دەکـەوێت، ئەگەر لەوەکەمتر بوو بەو حسابە حسابی لەگەل دەکرێت.[٤]

٣ـ خوێنی نەهێشتنی قوڕگ و دەنگ: سەرچاوەی دەنگ ئەگەر گەرو نەماو زیانی لێ کەوت، قسەکردنیش زیانی لێ دەکەوێت، عمـری کـوڕی عبـدالعزیز نووسـی: کـە ئەگەر تواناى قسەکردنی نەهێشتبوە ئەوە خوێنی مرۆڤێی تەواوی دەکەوێت.[٥]

٤ـ خوێنی نەهێشتنی کۆئەندامی زاوزێ ی پیاو: کۆئەندامی زاوزێ بەشـێکی زۆر گرنگی پیاوانـە، ئەگـەر نـەمێنی ئـیتر ئـارەزوی نـامێنێ و توانـای منـدال بوونیـشی نامێنێ لەبەر ئەوە عمری کوڕی عبـدالعزیز پـێ ی وایـە خـوێنی تـەواوی دەکـەوێت،

---

١ ـ فقه عمر بن عبد العزيز (٢/٣٦).
٢ ـ المحلى(١٠/ ٤١٨).
٣ ـ مصنف ابن ابي شيبه(٩/١٢٨).
٤ ـ مصنف عبدالرزاق (٩/ ٣٥٧).
٥ ـ فقه عمر بن عبد العزيز(٢/ ٦٩).

ئەگەر بەکەمتر بوو زیانەکەی، بەپێ ی ئەوزیانە خوێنی دەکەوێت.[١]

٥ـ خوێنی زیان گەیاندن بە کۆئەندامی زاوزێ ی ئافرەت: ئەگەر کەسێك دای لەئافرەتێك و ئازاری بەو کۆئەندامەی گەیاند بەجۆرێ سەرجێگەیی و سەرئاو و عادەی مانگانەی نەهێشت خوێنی مرۆڤێکی دەکەوێ لەلای عمری کوڕی عبدالعزیز،[٢] لەڕیوایەتێکیش داهاتوە، کە ١/٣ی دیەی پێ داوە، بەلام بۆ کۆکردنەوەی ئەم دووڕایەی عمر ئەتوانین بڵێین ئەگەر بەیکجاری ئەوسێ شتەی لەئافرەتەکە بڕیبوو ئەوە بێ گومان خوێنی تەواوی دەکەوێت، ئەگر یەکێ لەو زیانانەی لێ کەو ئەوە ١/٣ی دەکەوێت.[٣]

٦ـ خوێنی لووت: لەبەرئەوەی لوت کۆئەندامێکی زۆر گرنگی مرۆڤە و لەڕێگایەو هەناسەدەدات، بۆنی شتەکان دەکات و لەیەکیان جیا دەکاتەوە ئەمەو سەرەڕای ئەوەی، کە هۆی جوانی دەم و چاوی مرۆڤە و قرتاندنی ناشیرین بوونی دەم و چاوی مرۆڤە، لەلای عەرەبیش هەرکەسێ لووتی ببڕدرێت ئەوە گەورەترین سوکایەی پێ کراوە، بۆیە عمری کوڕی عبدالعزیز خوێنی تەواوی لەسەر داناوە ئەگەر لەبنا ببڕرێت و ئەگەر کەمتر بڕا بەو پێ ی یە خوێنەکەی دیاری دەکرێت..[٤]

٧ـ خوێنی گوێچەکەیەك: لەبەرئەوەی گوێ نیوەی سودی بیستن و دەبەخشێت، لەمرۆڤیشدا دوو دانەن، بۆیە عمری کوڕی عبدالعزیز بۆچوونی وایە ئەگەر قرتاندیان توانای بیستنی نەما نیوەی مرۆڤێکی دەکەوێت، کە(٥٠)حوشتر دەکات.[٥]

٨ـ خوێنی قاچەکان: لەبەرئەوەی ئادەمیزاد ناتوانێت بڕوات بەڕێوە بەهۆی قاچەکانی یەوە نەبێت، مانەوەی یەك قاچیش سودی نی یە بۆ ڕۆیشتن و لەبەر ئەوەی یەکێکە لە ئەندامە جوتەکانی مرۆڤ بۆیە لەناو بردنی بەقرتاندن، یا لەکار

---

١ ـ مصنف عبدالرزاق (٩/ ١٢٨).

٢ ـ فقه عمر بن عبد العزیز (٢/ ٧١).

٣ ـ مصنف عبدالرزاق(٩/ ٣٧٧).

٤ ـ فقه عمر بن عبد العزیز (٢/ ٧٦).

٥ ـ ـ فقه عمر بن عبد العزیز لا (٢/ ٨٠).

خستنی وەك شەلەل یەك قاچ خوێ،ەکەی(٥٠) حوشترە و خوێنی هەردوکیان (١٠٠)حوشترە ئەمە لەلای عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه الله.[١]

٩- لەناو چوونی برۆکان: هەندێ وردەکاری هەیە لەمەسەلەی خوێندا، کە زاناکان لەپێش عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه الله باسیان لێوە نەکردبوو، وا عمری کوڕی عبدالعزیز رای خۆی دەربارەیان دەردەبڕێت، لەوانە شکاندن و بریندار کردنی نیوان برۆکان و ئەویش وەك دەم و چاوایە ئەگەر ئێسکەکانی نەشکاند بوو دەڵێت: ئەگەر برۆکانی لەناو بردبوو ئێسقانی نەشکاندبوو(١/٤)ی خوێنی دەکەوێت ـ[٢] واتە(٢٥) حوشتری،

١٠- تێك شکاندنی دەم و چاو: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله دەربارەی روومەت کاتێ دەشکێت ـ هشمت ـ خوێنەکەی (١٥٠)دینارە.[٣]

١١- خوێنی چەناگە: هەرکەسێ چەناگەی کەسێك بشکێنێت لەلای عمری کوڕی عبدالعزیز ١/٣ی خوێنێکی دەکەوێت، ئا بەو جۆرە عمری کوڕی عبدالعزیز بەراو بۆ چوونە ژیرانە و وردەکاریەکانی یەوە لەمەسەلە وردو فەرامۆش کراوەکان دەدوێ، کەپێش تر کەس لەسەریان نەدواوە، بۆیە لێرەدا عمر دەڵێت: ١/٣ی خوێنی دەکەوێ، چونکە ئیتر ناتوانێت دەم بکاتەوەو خواردن بجوێ و شێوەشی ناشیرین دەبێت، ئەم ووتەیەش لەلایەن عمرەوە تەنها یەو کەسی تر قسەی تێدانە کردوە.[٤]

١٢- خوێنی پەنجەکان: لەبەر گرنگی پەنجەکان بەتایبەتی پەنجەکانی دەست، عمری کوڕی عبدالعزیز‌رحمه الله پێ وایە یەك پەنجەی دەست، یان قاچ ١/١٠ی خوێنی پەنجەیەکی دەکەوێت،لەپەڕینی هەر جومگەیەکی دەست جگە لە پەنجەگەورەکە دو جومگەیە، جومگەیەك نیوەی خوێنی پەنجەیەکی دەکەوێت.[٥]

---

١ ـ مصنف ابن ابي شيبه(٩/ ٢٠٠٩).
٢ ـ هەمان سەرچاوە (٩/ ٢٩١).
٣ ـ مصنف عبدالرزاق(٩/ ٣٦١).
٤ ـ فقه عمر بن عبد العزيز (٢/ ٦٩).
٥ ـ هەمان سەرچاوە لا(٢/١٠٠).

١٣ـ عمری كوڕی عبدالعزیز رحمه الله لە بۆ چوونە فیقهی یە ژێرانەكانیدا تەنانەت نینۆكیشی پشت گوێ نەخستوە، ئەگەر بەلێدان ڕەش هەلگەڕابا، یان هەڵوەرێ ١/١٠ی خوێنی پەنجەیەكی دەكەوێت، كە (١٠)دینار دەكات.[١]

## چوارەم: سنورەكانی پەروەردگار ـ الحدود ـ:

١ـ بەرپاكردنی سنورە شەرعیەكان ـ الحدود ـ:

بەرپاكردنی سنورەكانی شەرع هۆكارێكی سەرەكی یە لەپاراسنی گیان و خوێن و سامان و ناموسی موسڵمانان و بەر قەرار بوونی ئاشتی لەهەموو وڵاتدا، عمری كوڕی عبدالعزیز یش زۆر بەگرنگی یەوە سەیری كردوون وەك گرنگی نوێژو زەكات، لەوبارەیەوە عمر دەڵێت: بەرپاكردنی سزا شەرعی یەكان لەلای من وەك بەرپاكردنی نوێژ و زەكات وایە.[٢]

٢ـ سزا شەرعی یەكان دوای گەشتنی ئیمام:

عمری كوڕی عبدالعزیز رحمه الله پێ ی وابووە، كە تا نەگاتە ئیمام بۆ خاوەنی ماف هەیە لە بەرامبەرەكەی ببورێت، بەڵام هەركە بەرزكرایەوە بۆ لای ئیمام ئیتر لەدەستی ئەودا نامێنێت و لەسەر ئیمام پێویستە جێ بەجێ بكات.[٣]

٣ـ پیاوێك چەند سزایەكی لەسەر بێت:

جاری وا دەبێت كەسێك لەیەك كاتدا كۆمەڵێك سزای لەسەر دەبێت وەك دزیو كوشتن و داوێن پیسی، دەی ئایا كوشتنی ئەو پیاوە بەسە لەباتی تاوانەكانی تر؟ یان سزاكانی بەسەردا جێ بەجێ دەكرێت و، پاشان دەكوژرێت؟

لێرەداو لەو ڕیوایەتێكدا عمری كوڕی عبدالعزیز رحمه الله پێ ی وایە ، كە سزا شەرعی یەكانی تری بەسەردا جێ بەجێ دەكرێت و، لەپاشاندا دەكوژرێتەوە.[٤]

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (٢/ ١٠٢).

٢ ـ الطبقات الكبری(٥/ ٣٧٨).

٣ ـ فقه عمر بن عبد العزیز(٢/ ١١٣).

٤ ـ هەمان سەرچاوە (٢/ ١١٣).

٤ـ والی یەکان بەپێ پرسی خەلیفە کەس نەکوژن:

ئەمە ڕای عمری کوڕی عبدالعزیز، کە پێ وابووە کوشتن و خوێن زۆر ترسناکە هەرکەسێ پێ ی هەڵبستێ خەلیفە تاوانبارە تیایدا، ئەگەر بەناڕەوا ئەنجام بدرێت، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد حەجاج بەکەیفی خۆی نەیارەکانی خۆی دەکوشت ـ سلیمان ـ یش نەیدەزانی پێ ی ـ بۆیە عمر پێ ی وایە دوو سزاگەورەکەی ئیسلام ـ کوشتن و هەڵواسین ـ بەبێ ئاگاداری پێش وەخت و پرس کردن بە خەلیفە نابێ ئەنجام بدرێت.[1]

٥ـ ئەوە بەدڕەوشتی دەدەیتە پاڵ ـ القذف:

عمری کوڕی عبدالعزیز پێ وایە، کە جنێودان بە بێ باوەڕ بە ووشەی بەد ڕەوشتی ـ زنا ـ کەسی لەسەر سزا نادرێت، چونکە خۆی لەتاوانبارە بەکوفر و بێ باوەڕی، کە لەزینا زۆر ناشیرین ترە، (طارق )ی کوڕی (عبدالرحمن)و (مطرف)ی کوڕی (طریف)دەڵێن: لەلای (الشعبی)بووین، دووپیاو هاتن بۆ لای و یەکەمیان موسڵمان بوو، دووەمیان گاور، هەردووکیان ووتیان: جنێومان بە یەکتر داوە ـ قذف ـ (٨٠)داری بڕیاردا بدرێ لەگاورەکە، چونکە ناموسی موسڵمانێکی لەکەدار کردووە، بەڵام بەگاورەکەی ووت: تۆ لەکەدار نەکراویت، چونکە لەکەو خەوشی گەورەترت تێدایە ـ کە بێ باوەڕیە ـ.

ئەو مەسەلە بەرزکرایەوە بۆلای عبد الحمیدی کوڕی زەید و ئەویش عمری کوڕی عبدالعزیز ی لێ ئاگادار کردەوە و عمریش نامەی بۆ نووسی و دەستخۆشی لەشەعبی کرد لەسەر ئەو فەتوایە.[2]

٦ـ باوکێك جنێو بەناموسی کوڕەکەی دەدات ـ القذف ـ:

هەر کاتێ باوکێك کوڕەکەی بەوە ناشیرین بکات، کە زینای کردوە، ئایا داری حەدی لێ دەدرێت، یان نا؟ یان ئایا باوك مافی ئەوەی هەیە، کە کوڕێ خۆی بەوە لەکەدار بکات؟

---

١ ـ فقه عمر بن عبد العزیز (٢/ ١٢٠).

٢ ـ مصنف عبدالرزاق(٦/ ٦٤، ٦٥).

ئەی ئایا سزاکەی لەسەر لا دەچێ ئەگەر کوڕەکەی لێ ی ببورێت؟

بۆ وەلامی ئەم پرسیارانە عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بۆ چوونی زانایانەی خۆی هەیە و دەڵێت: باوك داری حەدی لێ دەدرێ، اتێك کوڕەکەی بەبەد ڕەوشتی توانبار بکات، هەر کاتێ کوڕەکەی لێ ی خۆش بوو ئیتر سزاکەی لەسەر هەڵدەگیرێت،[1]

(ابن جریج) دەڵێت: (ڕُزەیق) سەرگەورەی (ئیلە) نامەیەکی نووسی بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز ـ هەواڵی پیاوێکی پێدا، کە قسەی بەکوڕەکەی ووتبوو، عمریش بۆی نووسی، کە داری حەدی لێ بدرێت مەگەر کوڕەکەی عەفوی بکات.[2]

٧ـ لەکەدار کردنی ئافرەتی گاور:

ئەگەر ئافرەتێکی گاور خیزانی پیاوێکی موسڵمان بێت، یەکێ بەقەسەی ناشیرین ڕەوشتی لەکەدار بکات، لەبەر ئەوەی، کە لەکەدار کردنی ئەو ئافرەتە لەکەدار کردنی ئابڕوی کوڕە موسڵمانەکەی و مێردە موسڵمانەکەیەتی بۆیە عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پێ ی وایە داری لێ دەدرێت، بەڵام کەمتر لەئاستی حەددەکان.[3]

(ابی اسحاق الشیبانی) دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله سزای ئەو کەسەی داوە، کە ئافرەتێکی گاوری هاوسەری موسڵمان لەکەدار بکات سی و شتێك داری لێ داوە.[4] زوهری و قەتادەیش لەسەر ئەم ڕایەن، مالیکیەکانیش دەڵێن: داری حەدی لێ نادرێ، بەڵام تەمێ دەکرێ لەبەر دڵی مندال و هاوسەرە موسڵمانەکەی.

٨ـ ئافرەت بڵێ ئەم پیاوە زینای لەگەڵ کردووەم:

لە عمری کوڕی عبدالعزیزەوە دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێك هاتووە بۆلای و ووتویەتی: فلان پیاو بەزۆر زینای لەگەڵ کردم،عمریش لێ ی دەپرسێت: کەس گوێ ی لەهاوارت بوو، یان کەس بینیویەتی لەو کاتەدا؟ ووتی: نەخێر، ئەویش ووتی

---

١ ـ فقه عمر بن عبد العزیز (٢، ١٣٣).
٢ ـ مصنف ابن ابي شیبه (٩/ ٥٠٤).
٣ ـ فقه عمر بن عبد العزیز(٢/ ١٣٦).
٤ ـ مصنف عبدالرزاق(٧/ ١٣٠).

بۆتۆڵەی ئەو پیاوە، داری حەدی(لەکەدار کردنی) ـ قزف ـ لەئافرەتەکەدا.[١]

ئەم مەسەلەیە هیچ پەیوەندی یەکی نی یە بەسزای داوێن پیسی یەوە، بەڵکو ئەمە تایبەتە بە لەکەدار کردنی ئابڕو ـ القذف ـ ، چونکەهەر ئافرەتێك هەستێت بەتاوانبار کردنی پیاوێك، کە گوایە داوێن پیسی لەگەڵ کردوە، بەم قسەیەی ئابڕوی پیاوێکی لەکەدار کردوە، ئەگەر شایەتی نەبێت داری حەدی ـ القذف ـ ی لێ دەدرێت، بیستنی هاوار کردنی ئافرەتەکەیان بینینی ئەو سزایەی لەسەر لا دەبات، ئەم ڕایەی عمری کوڕی عبدالعزیز ﷺ یەك دەگرێتەوە لەگەڵ (الزهری)و (قتادە)و (یحیی)ی کوڕی (سعید الانصاری)دا.[٢]

٩ـ دزێك بگیرێ پیش ئەوەی شتەکانی بەرێتەوەماڵەوە؟

عمری کوڕی عبدالعزیز ﷺ بۆ چوونی وایە، کە دەستی زێك نابڕدرێت، کە هێشتا ماڵەکەی دەرنەکرد وەلەو جێگایەو نەیبردۆتە وە ماڵەوە، تا ئەو ماڵە دەرنەکات و نەیباتە شوێنی دڵنیای خۆی سزای حەدی لەسەر نی یە.[٣]

١٠ـ ئایا کفن دز دەستی دەبڕێت؟

خەڵکانێك هەن دەرونیان بەڕادەیەك نزمە کاری واقیزەوەن دەکەن، کە هەرکەس بێزی لێ دەکاتەوە، هەندێ خەڵکی بیردەکەنەوە لەوەی کفنی مردووی تازە بدزن، بۆ ئەوە مەبەستە شەو دەڕۆیشتن و گۆڕەکەیان هەڵدایەوە و کفنەکەیان لەمردووە کە دەکردەوە دەیان برد و دەیانفرۆشێت،

عمری کوڕی عبدالعزیز پێ ی وابوو، کە هیچ جیاواز یان نی یە لەگەل دزی ترداو داری حەدیان لێ دەدرێت، چونکە دزی لەمردوو هەروەك دزی وایە لە زیندو هیچ جیاواز یەکیان نی یە.[٤]

---

١ ـ فقه عمر بن عبد العزیز (٢/ ١٤٠).

٢ ـ المحلی (١١/ ٢٩١).

٣ ـ فقه عمر بن عبد العزیز (٢/ ١٤٦).

٤ ـ هەمان سەرچاوە(٢/ ١٤٧).

(معمر)دەڵێت: هەواڵم پێ گەیشتووە، کە عمری کوڕی عبدالعزیز دەستی کفن دزی بڕیوە(النباش).[١]

١١- سزای ئارەق خواردنەوە بۆجاری دووەم:

لە (عبادە)ی کوڕی (نسی)دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیزم بینی داری حەدی دەدا لەپیاوێك ئارەقی خواردبوویەوە، جلەکانی لەبەری داکەندو (٨٠)داری لێدا، بینیم هەندێ جێگەی لاشەی شوێنەواری لێدانی پێوە دیار بوو، هەندێکیشی پێوەی دیار نەبوو، پاشان عمر پێ ی ووت: ئەگەر جارێکی تر دووبارەی بکەیتەوە لەپاش لێدانیش، زیندانیت دەکەم، تا چاك دەبیت).

پیاوەکەش پێ ووت: ئەی ئەمیری بڕواداران توبە دەکەم و دەگەڕێمەوە لای خواو هەرگیز ئەو هەڵەیە دووبارە ناکەمەوە، ئەویش وازی لێ هێنا.[٢]

١٢- سزای ئەوکەسەی عەرەق دەگێڕێت:

هەرکەسێ(ئارەق) پەیدا دەکات، یان دەیگێڕێت بەسەریاندا، نابێت سزاکەی لەوانەی، کە دەیخۆنەوە کەمتر بێت، چونکە هۆکاری گەیاندنی عەرەقەکەیە بەئارەق خۆرەکان، لەبەر ئەوە عمری کوڕێ عبد العزیزرحمه الله کەسزای عەرەق خۆرانی دابێ سزای ئارەق گێڕەکانیشی داوە لەگەڵیاندا،[٣]

(إبن التمیمی)دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله کۆمەڵێ ئارەق خۆری گرت و لەگەڵیشاندا مەی گێڕەکەی گرت و داری حەدی لەویش دا.[٤]

١٣- گۆزەو شوشەی ئارەق خوڕەکان دەشکێنرێت:

(هارون)ی کوڕی (محمد)دەڵێت: لەباوکی یەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عمری

---

١ ـ مصنف ابن ابي شیبه (١٠/ ٣٤).
٢ ـ الطبقات الكبرى( ٥/٣٠٦٥).
٣ ـ فقه عمر بن عبد العزیز
٤ ـ مصنف عبدالرزاق(٩/ ٢٣٠).

کوڕی عبدالعزیزم بینی لە (خناصرة) بوو گۆزەی ئارەق خۆرەکانی ووردکرد و شوشە کانیشی شکاندن.[١]

١٤ـ حوکمی بێ باوەڕان کاتێ ئارەق بێننە ولاتەوە:

بێ باوەڕان هەرکاتێ بیەوێت ولاتی ئیسلامەوە، ئەگەر ئارەق و مادە بێ هۆش کەرەکانیان بوو، ئەتوانن بیهێنە ولاتی ئیسلام؟ یان ڕێگەیان پێ نادرێت؟ یان لەولاتی ئیسلامدا بۆیان دەستەبەر دەکرێت؟

لەوەلامدا نەخێر نابێت بیهێنن و نابێ بۆیان دەستە بەر بکرێ و دەبێت ئەو ماوەیەی لەولاتی ئیسلامدان خۆیان بگرن و ڕێزی شەریعەت و یاسای خوا بگرن و یاسای خوایش شایانی هەموو ڕێزو حورمەتێکە،

ئا لەم ڕوانگەیەوە عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله بواری نەدەدا بە (أهل الذمة) کە کڕین و فرۆشتنی بەسەر ئارەقەوە بکەن و ئەوانیش ڕەچاوی ئەو یاسایەیان دەکردو نەیان دەهێنایە ولاتی ئیسلامەوە، چونکە ووتبووی: (أهل الذمة) بۆیانی نی یە ئارەق بهێنە ولاتی ئیسمەوە.[٢]

١٥ـ سزای جادو گەر:

(همام)لە (یحیی)وە دەگێڕێتەوە، کە کاربەدەسی عمان بوو، نامەی نووسی بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز و پێ ووت: ژنە جادو گەرێکمان گرتووە، چی لێ بکەین؟ عمریش بۆی نووسی: کە ئەگەر خۆی دانی نا بەسیحربازی یەکەیدا، یان شایەت هەبوو، کە سیحری کردوە، بیکوژە.[٣]

ئەمەش مەزهەبی سێ زانامەزنەکەی ئیسلامە(ابو حنیفە)و(مالك)و (احمد).[٤]

(عمر)ی کوڕی (خطاب)یشرضي الله عنه نامەی دەنارد بۆ هەموو کاربەدەستەکانی و پێی

---

١ ـ الطبقات الكبرى (٥/ ٣٦٥).

٢ ـ فقه عمر بن عبد العزيز( ٢/ ١٦٤).

٣ ـمصنف ابن ابي شيبه(١٠/ ١٣٥).

٤ ـ حاشي ابن عابدين(١ـ ٣١).

دەوتن هەموو پیاوێکی جادو گەر بکوژن.[١]

١٦- لە ئیسلام هەڵگەڕاوەکان:

موسڵمان زۆر لە کەس ناکات بۆ موسڵمان بوون، بەڵام بەهیچ شێوەیەك قبوڵی ئەوە ناکات کەسێك بە ئارەزوو حەزی خۆی موسڵمان ببێت و، پاشان لەئیسلام پاشگەزبێتەوە، بۆئەو مەبەستە عمری کوڕی عبدالعزیز- بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دوای دەخستن وداوای تەوبەی لێ دەکردن وپاش سێ ڕۆژەکە ئەگەر هەر لەسەر کوفر سوربوو ئەوە دەدرێت لە ملیان.[٢]

١٧- چۆن تەوبەی پێ دەکرێت؟

لە(عبدالرحمن)ی کوڕی(ثابث)ی کوڕی(ثوبان)و ئەویش لەباوکی یەوە دەڵێت: من کار بەدەستی عمری کوڕی عبدالعزیز بووم ونامەم بۆ نووسی دەربارەی جولەکەیەك کەموسڵمان بوو، پاشان بوویەوە بەجولەکە، عمریش لەوەڵامدا پێ ی ووتم: بانگی بکەرەوە بۆ موسڵمان بوونەوە، ئەگەر موسڵمان بوویەوە بەرەڵای بکە، ئەگەر هەرسوربوو لەسەر پاشگەزبوونەوەکەی، لەسەر تەختەیەك پاڵی بخە، پاشان بانگی بکەرەوە بۆ موسڵمان بوون، ئەگەر هەر ملەجەڕێ ی دەکرد ئەوە بیبەسەرەوەو چەقۆیەکی گەورە بخەسەر گەردنی و ئەگەر هەرسوربوو، بدە لەملی، منیش وام کرد وجولەکەکە موسڵمان بوویەوەو وازم لێ هێنا.[٣]

دکتۆر محمد شقیر دەڵێت: تا ئێستا دەربارەی سزای پاشگەزبووم ئابەم وردەکاریەوە نەبینیوە لەهیچ کتیبێکدا.[٤]

١٨- سزای ئافرەتی پاشگەزبوو:

عمری کوڕی عبدالعزیز – ڕای وایە ئافرەتی موسڵمان کاتێ لەئیسلام پاشگەز

---

١ ـ مصنف ابن ابي شيبه (١٠/ ١٣٥).

٢- الطبقات الكبرى(٥/٣٥١).

٣ – مصنف ابن ابى شيبه (١٢/٢٧٤).

٤ – روضه الطالبين (١٠/٧٥) .

دەبێتەوە، داوای گەڕانەوەی لێ دەكرێت، ئەگەر تەوبەی نەكرد دەكرێتە كۆیلەو دەفرۆشرێت بەهاو ئاینەكانی تر،[1]

(ابوبكر صدیق) یش هەمان كاری كرد بە ئەو ئافرەتانەی (اهل الردە) كە لەئیسلام پەشیمان بوونەوە.

## پێنجەم: سزا تەمێ كاریەكان - التعزیرات-:

١-ئەو پەری ڕادەی داركاری كردن لەتەمێ كاریەكاندا:

پاش ئەوەی باسی(حدود)مان كرد كەكۆمەڵێ سزان خوا خۆی دیاری كردووە بۆ هەندێ لەتاوانباران، ئێستا باسی(تعزیرات) دەكەین كەدیاری كردنی سنورەكەی لەدەستی فەرمانڕەواكاندایەو ئەتوانن كەم و زیادی بكەن.

بۆیە عمری كوڕی عبدالعزیز: نامەی دەنووسی بۆ كاربەدەستەكانی وتیایدا فێری ئەوەی دەكردن، كەسزای تەمێكاری خەڵكی كەمتەرخەم وساردو سڕبدەن، بەڵام بانەگاتە سنوری خوارترین ی (حدود)ەكان واتە(٣٩) جەڵدە زیاتر نەبێت. وپێ دەووتن: هەركەسەو بەپێ ی تاوانەكانیان سزایان بدەن ئیتر ئەگەر یەك قەمچیش بێت، بەڵام دەخیلتان بم بازۆر ترینی نەگاتە ئاستی(حدودە) دیاری كراوەكانی خوا_ عزوجل. ..[2]

٢ – نابێت لەسەر گومان خەڵكی سزا بدرێت:

عمری كوڕی عبدالعزیز پێ ی وایە كە دروست نی یە لەسەر بناغەی گومان یان بەتاوانباركردن خەڵكی ئازاربدرێت و سزابدرێت، لەمەدا بنەمای دادپەروەری دەچەسپێنێ كە دەڵێت سزا لەسەربناغەی تاوانی ڕوون وبەرچاو ومەلموس دەدرێت، ئەمەش لەترسی ئەوەی نەوەك بێ گوناهێك بەناڕەوا لیدان و ئەشكەنجە بدرێت، پێ ی باش بووەكە ئەوانە بەو گوناهەوە بچنەوە بەردەمی پەروەردگارو لەوەباشترەكەئەم بگەڕێتەوە بەردەمی خوا ودەستی بەخوێنی ئەوان سور بووبێت.[3]

---

١ ـ فقه عمربن عبدالعزیز(٢/١٨١) .

٢ـ سیره عمربن عبدالعزیز، لابن الجوزی لا ١١٧.

٣ – فقه عمر بن عبدالعزیز(٢/٢١٢).

(ابـراهيم)ى كـورِى هـشام النـسانى) لـەباوكى يـەوە وئـەويش لەباپيريـەوە كەووتوويـەتى: عمـرى كـورِى عبـدالزيز كردمـى بەفـەرمانڕەواى شـارى موسـلّ، كەڕۆشتمە ئەوێ دەبينم لەهەموو شارەكانى دنيا زياتر دزى وتالآنى تيا ڕوودەدات.

منيش نامەيەكم ئاراستەى عمر كردو لەووەزعە ئاگادارم كرد وپێم ووت: ئايا دەهێڵيت خەڵكى بەگومان بگرم ولەسەر تۆمەت لێيان بدەم يان بەبەڵگە يان لەسەر بنەماى عادەتى ناوچەكە مامەڵەيان لەگەڵ بكەم؟

عمـريش لەوەڵامـدا بـۆى نووسـيم: لەسـەر بنـەماى بەڵگـەى ڕوون و شـێوازى سوننەت كاريان لەگەڵ دا بكە، چونكە ئەگـەر هـەق و ڕاسـتى چاكيان نـەكات دەى خوا چاكيان بۆ نەكات، (يحيى) دەڵێ بەو جۆرەم كرد كەعمر پـێ ى ووتم ولەشـارى موسلّ دەرنەچوو بووم هێشتا، ئەو شارە بوو بەچاكترين شارى وڵات و دزى وتالآنى تێدا نەما مەگەربەدەگمەن.[1]

(عدى)كورِى(أرطاة) نامەيەكى نووسى بۆ عمـرى كـورِى عبـدالعزيز وپـێ ى ووت: پاشان...خـواى ئـەميرى بـاوەڕداران سـەلامتت كـات، كاربەدەستەكانى پـێش مـن سامانێكى زۆرى (بيت المال)يان داگيركردووە بۆ خۆيان من ناتوانم لێيان بسەنمەوە مەگـەر بـەوەى هەنـدێ ئەشـكەنجەو سـزايان بـدەم لەزيندانـدا، ئەگـەر ئـەميرى باوەڕداران پێ خۆش بێت من بەوكارە هەڵدەستم.

عمر وەڵامى دايەوە ووتى: پاشان...سەيرەوە زۆريـش سـەيرە تـۆ داواى مۆڵـەت لەمن دەكەيت تا مرۆڤێك سزابدەيت وادەزانيت من لەسـزاى خـوا دەتپـارێزم؟، وەك بلّێ ى ڕازى بوونى من لەخەشم و قينى خوا دەتپارێزێت؟

جوان وردبەرەوە كێ بەڵگەى لەسەر سەلمێنرا بەئەندازەى ئەو بەڵگانەى حسابى لەگەڵدا بكە، هەركەس دانى بەهەرچيدانا حسابى ئەوەى بۆ بكە، هەركەسيش دانى پێدانەنا تۆ سوێندى بەخواى گەورە پێ بخۆ، پاشان وازى لێ بهێنە، سوێند بـەخوا بەوناپاكى يە يانەوە بگەڕێنەوە بۆ لاى خوا پێم خۆشترە لەوەى لەلاى خوا دەسـتم بەخوێنيان سووربێت.[2]

---

١ – حلية الاولياء (٥/٢٧١) .

٢ – سيره عمر بن عبدالعزيز( ابن عبدالحكم )لا ٥٥ .

٣- بەرگری کردن لەشێواندنی جەستە:

سەرسفر کردن یەکێکە لەو کارانەی کەبەنیەتی پەرستشەوە بکرێت خوا پێی خۆشە لەکاتی حەج وعەمرەدا، فەرموودەکانیش بەرگری دەکەن لەپیش تاشین، بەڵام هەندێ کەس پێچەوانەی ئەم رێنموونیانەیان کردووە،

ئەگەر بیانویستایە سزای یەکێك بدەن دەهاتن سەروریشیان سفر دەکرد و عمری کوڕی عبدالعزیزیش...ئەو شتەی لابردوو نەی هێشت وپێ ی دەووت شێواندنی جەستە.[1]

عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نووسی بۆ کاربەدەستێکی وپێ ی ووت: نەکەیت جەستە بشێوێنیت، واتە سەروریشی خەڵکی بتاشیت،[2] لەچوار مەزهەبەکەی ئیسلامدا هاتووە کە بەهیچ بیانوویەك دروست نی یە ریشی کەس بتاشرێت، بەڵام لای مالك وابوحنیفە: نابێت سەریش سفربکرێت.[3]

## شەشەم: دەربارەی بەندکراوان

١ـ پەلەبکرێت لەلێپرسینەوەی زیندانی:

عمری کوڕی عبدالعزیز...فەرمانی دەرکرد بەوەی بەپەلەوبێ کەمتەرخەمی لەزیندانی یەکان بپرسنەوە وبێ مەحکەمە لەزینداندا نەهێڵرێنەوە، هەرکەسێ تاوانی بەسەردا سەپا سزاکەی بدەن وهەرکەسیش هیچی بەرسەردا نەسەپا بەزوترین کات ئازادبکرێت، عمر هەردەم پێ ی وابوو جێبەجێ کردنی سزاکانی _ الحدود_ بەسەرتاوانباراندا هۆکارێکی چاکە بۆ کەم بوونەوەی زیندانیان، چونکە بەربەستێکی چاکە لەرێگە ناپاك و بەدرەوشتەکاندا.[4]

(جعفر)ی کوڕی(برقان) دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز...نامەی بۆنووسین و پێی

---

١ - فقه عمر بن عبدالعزیز (٢/٢١٥) .

٢ - الطبقات الكبرى (٥/٣٨٠) .

٣ - مفتي المحتاج (٤/١٩٢) .

٤ - فقه عمر بن عبدالعزیز (٢/٢٢٥) .

ووتین:...ئەگەر سزا شەرعی یەکان بەتەواوی جێ بەجێ بکەن بەندکراوانتان زۆر کەم دەبێتەوە، خەڵکانی بەدڕەوشت وخراپەکاریش دەترسن، وازدەهێنن لەکاری خراپ، زیندانەکان بۆیە پڕدەبن چونکە لێیان ناپرسنەوەو دادگاییان ناکەن، ئەو جێگایە بەندیخانەیە نەك جێگای لێپرسینەوەو دادگای کردن، دەی فەرمان دەربکە بۆ فەرمانبەرەکانت کەبەزووترین کات لەزیندانیان بپرسنەوەو لەکێشەکانیان بکۆلنەوە لەهەموو ڕۆژێکدا، ئەگەر سەپابەسەریاندا باسزای خۆیان وەربگرن و ئەوانەیشی بێتاوانن بائازاد بکرێن.[1]

٢-گرنگی دان بەگوزەرانی زیندانیەکان:

عمری کوڕی عبدالعزیز... لەسەر هەموو ئاستەکان ولەهەموو ڕوویەکەوە چاکسازی ئەنجام دەدا، داد پەروەری لەهەموو ڕوویەکەوە بەرپادەکرد، گرنگی یەکی زۆر گەورە وتایبەتی بەزیندانیان دەدا و لەو بارەیەوە چەندان ڕێنمایی دەردەکرد تا جل و بەرگ و خواردن وخواردنەوە یان بەردەوام پێ بدەن،[2]

(جعفر)ی کوڕی(برقان) دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی بۆ نووسین ووتی:... لە(بیت المال) ئەوەندەیان بۆ خەرج بکەن کەبەشی جل و بەرگ و خواردنیان بکات، فەرمان بدەن مانگانەیان بۆ ببڕنەوە بۆخزمەت کردنی خۆیان و خواردن وجل و بەرگیان، ئەوەش بەوەی هەموو مانگێك مووچەیەکی دیاری کراویان پێ بدەن تاخۆیان شت بکڕن، چونکە ئەگەر خواردنیان پێ بدەن ئەوە بەرپرسانی زیندان و پاسەوانەکان دەیبەن بۆخۆیان، بەڵکو کەسێکی دەستپاك و چاکەخواز بکە بەبەرپرسی ئەو کارە و هەموومانگێك خۆی یەك یەك ناویان بخوێنێتەوە وپارەکە بداتە دەستیان، جگە لەوەیش زستان جل و بەرگی زستانەو هاوین جل و بەرگی هاوینەیان بۆبکات، بۆ ئافرەتانیش لەوەزیاتر سەر بۆشیشیان بۆ بکات.. بۆ کەسێکیش کەدەمرێت لێیان، بێ کەسە وسەرپەرشتی کاریشی نی یە لەپارەی (بیت

١ - الخراج لابی یوسف لا ٣٠١ .

٢ - فقه عمر بن عبدالعزیز (٢/٢٢٦) .

المال) كفن ودفن بكرێن ونوێژیان لەسەر بكرێت.[١]

نامەیشی نارد بۆ سەركردەی سوپاكان وپێ ی ووتن: لەكاروباری زیندانی یەكان بڕوانن و بزانن كێ چیێ بەسەردا دەسەبێت بیسەپێنن، زیادەڕەوی مەكەن لەسزاداندا، نەخۆشەكانیان خزمەت بكەن ئەوانەیان كەبێ كەس وبێ پارەن، بزانە كێ دەكەیت بەبەرپرسیان لەوكەسانەی دڵنیایت لێیان وبەرتیل وەرناگرن، هەركەسێ بەرتیلی وەرگرت ئەوەی پێتان وتراوە وای لێ بكەن.[٢]

٣ـ زیندانی تایبەت بەئافرەت:

عمری كوڕی عبدالعزیز... بەردەوام لەڕێك و پێك كردنی زیندانەكان وگرنگی دان بەئیش وكاری زیندانی یەكان بوو، فەرمانی دەركردبوو بەدروست كردنی زیندانی تایبەت بەئافرەتان تالەگەڵ پیاواندا تێكەڵی ڕوونەدات وهەردەم ئەوەی دووپات دەكردەوە كەدیندارو خوا ناس ودەستپاك بكرێتە بەرپرس وپاسەوانی ئەو زیندانانە.[٣]

عمری كوڕی عبدالعزیز‌رحمه الله نامەی نووسی بۆ سەركردەكانی سوپاو پێ ی ووتن: ...سەیركەن بزانن زیندانی یەكانتان هەركەسێ شكاتی لێ كراوە مەیگرە تاتاوانەكەی بەسەردا دەسەبێت، هەركەسێك مەسەلەكەی ئاڵۆزبوو منی لێ ئاگاداربكە بەنامە، ئەوانەی لەسەر بەدڕەوشتی دەگیرێن كۆت و زنجیریان بكە چونكە زیندان بۆ ئەوان پەندو وانەیە تاچاك ببن، لەسزاداندا زیادەڕەوی نەكەیت، چاودێری زیندانی یە نەخۆشەكان بكە ئەوانەی نەكەس وكارو نەپارەشیان هەیە،

ئەگەر كەسێكی ئایندارو بەڕێزت گرت مەیبەرە ناو زیندانی یە بەدڕەوشت و تاوانبارانەوە، باجیابێت لەوان، زیندانێكی تایبەتی بە ئافرەتان دروست بكە، بزانە كەسێكی خاوەن متمانە بكە بەسەر پەرشتیان كەبیر لەبەرتیل وەرگرتن نەكاتەوە، هەركەسێكیش بەرتیلی وەرگرت چیتان پێ وتراوە وای لێ بكەن.[٤]

---

١ – الخراج لابی یوسف(٣٠٠، ٣٠١).

٢ – الطبقات الكبری (٥/٣٥٦) .

٣ – فقه عمر بن عبدالعزیز (٢/٢٢٨) .

٤ – الطبقات الكبری (٥/٣٥٦) .

## حەوتەم: دەربارەی جیهاد

١- دیاری کردنی تەمەنی جەنگاوەر:

لاوانی جیلی یەکەمی ئیسلام کەمندالانی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا بوونﷺ وهەردەم هەوڵیان دەدا کەپێغەمبەری خوا ڕازی بکەن کەبهێڵی ئەوانیش بەشداری جەنگەکان بکەن ولە پێناوی خوادا بجەنگن وهەرکەسێکیان وەرنەگیرایە لەبەر منداڵی وکەم تەمەنی، خێرا دەستی دەکرد بەگریان بەسەردایك وباوکیدا و ئابەو جۆرە گەورەو بچوك لەپێشبڕکێ ی بەشداری کردنی جیهاد دابوون..

بەڵام عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله یاسایەکیشی بۆ ئەو کارە داناو تەمەنی جەنگاوەری دیاری کرد، کە(١٥)ساڵ کەمتر نەبێت، هەرمنداڵێك تەمەنی گەیشتە (١٥)ساڵ هەموو مافێکی جەنگاوەری هەیە وهەرکەسێکیش لەوتەمەنە کەمتربێت لەریزی ماڵ و منداڵی جەنگاوەراندا دادەنرێت و بەشە تایبەتی پێ نادرێت وبواری بەشداری کردنی جەنگیشی پێ نادرێت .[1]

٢- چۆن جەنگ دەست پێ دەکات:

(صفوان)ی کوڕی (عمرو)دەڵێت نامەیەکمان لە عمری کوڕی عبدالعزیزەوە پێ گەیشت بۆ کاربە دەستەکەی ناردبوو_ لەوکاتەدا خەلیفەبووە _ کەنووسیبووی: پەلاماری هیچ قەڵایەکی ڕۆمەکان نەدەن یان هیچ سەربازگەیەکیان تا بانگیان نەکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر قبوڵیان کرد وازیان لێ بێنن، ئەگەر ئەوەشیان نەکرد سەرانەی ساڵانە(جزیە)یان لێ داوا بکەن بدەن، ئەگەر ئەوەشیان پێ قبوڵ نەکرا ئیتر جەنگیان لەگەڵدا رابگەیەنن.[2]

٣- زۆرترین ماوەی سنور پارێزی _الرباط_:

موسڵمانان لەدوای سەردەمی یەکەمی ئیسلام وسنوری وڵاتی ئیسلام پان و فراوان بوو، ڕۆم وفارسەکان سنور شکێنی وهێرشی لەناکاویان دەکردە سەر دێ

---

١ – فقه عمر د.شقیر(٢/٤١٥) .

٢ – الطبقات الكبرى (٥/٣٥٥) .

نشینە موسڵمانەكان و تالآن و بڕۆیان دەكردن و ئیتر موسڵمانانیش وەك بەندایەتی بۆ خودا ماوەیەك بەماڵەوە دەچوونە سەر سنورەكان ولەوێ دەژیان تاسنوریش بپارێزن.

بەڵام عمری كوڕی عبدالعزیز سنوری مانەوەیانی بە(٤٠) ڕۆژ دیاری كرد _ كەپێشتر هەبوو لەساڵ زیاترو هەبوو تامردن لەوێ دەمانەوە - و بۆ ئەو مەبەستە ووتی:- تەواوترین ماوەی (٤٠) ڕۆژی تەواوە(رباط).[١]

٤- جەنگاوەر مافی تەواوی ئیش و كاری هەیە:

عمری كوڕی عبدالعزیز دەڵێت: ئەگەر جەنگاوەر لەناوجەنگدا وبەسواری ولآخەكەیەوە بێت بجەنگێت، تەواوی سەربەستی ئەوەی هەیە كەماڵ وپارەو سامانی چی لێ دەكات بیكات.[٢]

٥- چەك و ولآخ فرۆشی بەدوژمنان:

فرۆشتنی چەك وتەقەمەنی و ولآخ و گوێزانەوەی بۆ ناو سوپای دوژمنان دەبێتە هۆی بەهێزبوونی سوپای بێ باوەڕان وزیاتر توانای جەنگیان تێدا دروست دەكات، بۆیە بەتاوانێكی گەورە دادەنرێت، دەبێت دەست بگیرێت بەسەر ئەو شتانەدا تا نەگاتە دەستی دوژمنان.

ئالەم ڕوانگەیەوە عمری كوڕی عبدالعزیز قەدەغەی ئەوەی كردووە چەك وتفاق وولآخ بگوێزرێتەوە بۆ ولآتی هیندستان چونكە تا ئەو كاتە هیندستان یەكێك بووە لەولآتە بێ باوەڕو دوژمنەكانی ئیسلام ودواتر ڕزگاركرا.[٣]

٦- ئازاد كردنی دیلە موسڵمانەكان:

عمری كوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەنامەكانیدا بۆ كاربەدەستەكانی ئەوەی دووپات دەكردەوە كەهەوڵی زۆربدەن وپارەی باش بدەن لەپێناو ڕزگاركردنی دیلی

---

١ – الطبقات الكبرى (٣٥٥/٥) .
٢ – الطبقات الكبرى (٣٥٢/٥) .
٣ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (٤٢٧/٢) .

موسڵمان لەزیندانی بێ باوەڕەکاندا، بۆ یەکێ لەکاربەدەستەکانی نووسی وپێ ی ووت: پارەبدە لەپێناو ئازادکردنی دیلە موسڵمانەکاندا ئیتر با لەو پێناوەشدا هەموو سامانەکەتان لەدەست بدەن.[١]

(ربیعە)ی کوڕی (عطاء) لەعمری کوڕی عبدالعزیزەوە دەگێڕێتەوەکە (١٠) دیلی ڕۆمەکانی بەرەڵا کرد لەپێناو ئازاد کردنی یەك دیلی موسڵماندا.[٢]

٧- (ربیعە)ی کوڕی(عطاء) دەڵێت : عمری کوڕی عبدالعزیز نامەیەك وهەندێ پارەی لەگەڵدا ناردم بۆ کاربەدەستی _ ساحل ی عەدەن وپێ ی ووت: - پارە بدە لەپێناو ڕزگارکردنی ژن وپیاوکۆیلەو و(أهل الذمة) لەدیلی.

بەمەشدا ئەوپەری دادپەروەری عمرمان بۆ دەردەکەوێت، کەفەرمان دەردەکات پارەو سامان خەرج بکەن لەپێناو بەرەڵا کردنی هەردیلێکی وڵاتی ئیسلام ئیتر باموسڵمانیش نەبێت، چونکە دەبێت خەمی(أهل الذمة) بخورێت وبەرگریان لێ بکرێت کە ئەمەش ئەو پەری پەیمان بردنە سەری وڵاتی ئیسلام دەگەیەنێت بەرامبەر ئەو _ئایندارانەی تر _ کەلەژێر سێبەری ئاڵای ئیسلامدا دەژین و وەك هەرموسڵمانێك خەمیان دەخورێت وڕزگاردەکرێن.[٣]

٨- کەراهەتی کوشتنی دیل:

(معمر) دەڵێت: پیاوێکی خەڵکی شام کەپاسەوانی عمری کوڕی عبدالعزیزی بوو بۆی گێرامەوە و دەیووت: هەرگیز عمری کوڕی عبدالعزیزم نەدیوە ئەسیر بکوژێت مەگەر یەك جار ئەویش دیلێکی تورکی کوشت، دەڵێ ئەوەش ئەوەبوو جارێکیان کۆمەڵێك دیلی تورکیان هێنایە بەردەستی عمر، ئەویش فەرمانی دەرکرد کەبیانکەن بەکۆیلە، لەو کاتەدا یەکێ دیلەکان بەدەنگی بەرز ووتی : ئەی گەورەی باوەڕداران، ئەگەر ئائەمەت دەبینی _ ئاماژەی کرد بۆ دیلێك لەخۆیان _ چۆن

---

١ ـ حلیة الاولیاء (٥/٣١١) .

٢ ـ الطبقات الکبری (٥/٣٥٤) .

٣ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (٢/٤٣٦) .

شەڕی دەكرد وچۆن موسڵمانی دەكوشت، دەستت دەكرد بەگریان بۆیان، عمریش ووتی:كامەیە بیهێننە پێشەوە تابیكوژم، هەستایە سەر پێ وچووە پێشەوە لێ ی و كوشتی.[1]

عمری كوڕی عبدالعزیز ﵀ زۆر پێ ی ناخۆش بووە دیل بكوژرێت بەڵام و ئەم دانەیەش كەبەدەستی خۆی كوشتی لەبەر ئەوە بوو كەژمارەیەكی زۆر لەموسڵمانانی كوشتبوو، بەڵام ڕێگای دابوو بەموسڵمانان كە بیانكەن بەكۆیلە و خزمەتكار، كە ئەوەش بۆچوونێكی فیقهی عمرە و لەدەستەڵاتیشدا كاری پێ كردووە.

## هەشتەم: لەژن مارەبڕین وتەڵاق داندا

### ١ـ ژن مارەبڕین بەبێ بوونی (ولی):

وەلی لەئیسلامدا واتە سەرپەرشتیاری ژن لەخزمە نزیكەكانی وەك باوك، برا، مام، خال،باپیر، كوڕ و بەبێ بوونی وەلی نیكاح دانامەزرێت مەگەر دەوڵەتی ئیسلام خۆی بكات بەوەلی ئەو ئافرەتانەی كەكەسیان نی یە بیاندەن بەشوو.[2]

(سفیان) لەپیاوێكی خەڵكی جەزیرەوە گێراویەتی یەوە كە ووتویەتی: پیاوێك لەسەردەمی عمری كوڕی عبدالعزیزدا ئافرەتێكی خواست، كەوەلی یەكەی لەوێ نەبوو لەڕۆم نیشتەجێ بوو، عمریش نیكاحەكەی هەڵوەشاندەوە و ووتی: یان دەبێ وەلی هەبێت یان دەبێت حكومەت _السلطان_ بیدات بەشوو.[3]

### ٢ـ دوو وەلی كچێك بەشوو دەدەن:

(ثابت) ی كوڕی(قیس الغفاری) دەڵێت: نامەیەكم نووسی بۆ عمری كوڕی عبدالعزیز دەربارەی ئافرەتێك كەدوو پیاوی هۆزی (جهینە) هەریەكە بۆخۆی بوو

---

١ ـ مصنف عبدالرزاق (٥/٢٠٠٥، ٢٠٠٦).

٢ ـ ووتەی وەرگێڕ .

٣ـ مصنف ابن ابی شیبە (٤/١٣٢) .

بوون بە(ولی) ئەو ژنە و هەریەکەو لەپیاوێك مارەیان بڕیبوو، عمریش لەنامەیەکدا وەڵامی دایەوە وپێ ی ووت: باشایەتی عەدل وخواناس لەنێواندا هەبن وکچەکە سەرپشك بکە، هەرکامیانی هەڵبژارد ئەوەیان هاوسەریەتی.

### ٣ـ زینای لەگەڵ کردووە و، پاشان خواستوویەتی:

ئایا ئەگەر پیاوێك زینا بکات لەگەڵ ژنێکدا ئایا بۆی هەیە بیهێنێ یان نا؟ بۆ چوونی عمری کوڕی عبدالعزیز وایە کە بۆی هەیە بیهێنێی ئەگەر زانی ژنەکە تەوبەی کردووە، ئەمەش ڕایەکی ژیرانەیە و پێکاویەتی، چونکە زۆریێ لەدەرگاکانی خراپەکاری دادەخات، هەروەها هیچ جیاوازیەکیش نی یە لەنێوان ئەوەی ئەو زینای کردبێت لەگەڵ ی یان پیاوێکی تر،

ئەگەر بڵێین: دروست نی یە ئەم پیاوە بهێنێ، دەی خەڵکانی تریش نایانەوێت، ئەمەش خراپەو زیانی گەورەی لێ دەکەوێتەوە[١].

(یحیی) ی کوڕی(سعید) ووتوویەتی: پرسیار لەعمری کوڕی عبدالعزیز کرد دەربارەی ئافرەتێك تووشی غەڵەت بووە، پاشان دەبینن ڕەوشتی گۆڕاوەو چاك بووە، ئایا پیاوەکە دەتوانێت بیخوازێت، عمر ووتی: وەك پێم گەیشتووە گومان وایە، واتە بۆی هەیە بیخوازێت.[٢]

### ٤ـ مارە کردنی خێزانی ئەسیر:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله دەڵێت: هەرگیز خێزانی ئەسیری موسڵمان لەکەس مارە ناکرێت، مادەم هێشتا هاوسەرەکەی لەکۆتی دیلی دایە،[٣] چونکە ئەم ئەسیرە موسڵمانە بەهۆی لێ بڕان وگیان بازی خۆیەوە و بەشداری کردنی لە شەرەفی جیهاد و کوشتاری دوژمنانی ئیسلامدا، لەپێناو بەرزی ئالای ئیسلام و بەرگری

---

١ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (١/٤١٢) .

٢ ـ مصنف ابن ابی شیبه (٤/٢٥٠) .

٣ ـ الطبقات ابن سعد (٥/٣٥١) .

لەخاك ونیشتمانی موسڵمانان، دیل کراوە لەبەر ئەم هەڵوێستە مەزنەی کەلەپێناو ئاینەکەیدا خۆی کردۆتە قوربانی _ دەبێت خێزانەکەی ئەمەی لەیاد نەچێت و ئەم رێزەی لێ بنێ و ئارام بگرێ و هەولْ نەدات شوو بکاتەوە تاخوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە وهاوسەرە ئەسیرەکەی بۆ دەگەڕێنێتەوە، بەتایبەت مانەوەی لەدیلیدا بەدەست خۆی نی یە، هەروەك لەهەموو ساتێکدا گومانی بەربوونی هەیە، لەبەر ئەم هۆیانە لەدادپەروەری و ویژدان داریەکەی خۆی بگرێت وشوونەکات تا مێردەکەی دەگەڕێتەوە.[١]

## ٥ـ مارەکردنی خێزانی وون بوو ـ المفقود ـ :

ئەگەر پیاوێك وون بوو، هەواڵی نەما، کەس نازانێت ئایا مردووە یان زیندووە ؟ ئایا دەبێت خێزانەکەی بەردەوام چاوەڕوانی بکات؟ و عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پیێ ی وایە کە خێزانی پیاوی وون بوو، ماوەی (٤)ساڵ چاوەڕوانی دەکات وپاش ئەوە دەتوانێت شوو بکات.

بۆ ئەو مەبەستە عمر نامەی نارد بۆ عدی کوڕی أرطأة وپیێ ی ووت: خێزانی ئەو کەسەی کەوون بووە و دیارنەماوە، بۆ ماوەی (٤)ساڵ چاوەڕوان دەبێت.[٢]

وادیارە عمری کوڕی عبدالعزیز پیێ ی وابووە کە ئەو ژنە دوای چوار ساڵەکە، چوارمانگ و دەرۆژ لەـ عدەـ دا چاوەڕوان دەکات پاش ئەوە شوو دەکاتەوە .[٣]

## ٦- ژنێك تەلاق بدرێت پێش ئەوەی پیاوەکەی بیگوێزیتەوە:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پیێ ی وایە کە ئەو ئافرەتەی مارەبڕابێت لەکەسێك و کەسەکەش پێش ئەوەی بچێتەلای تلاقی بدات، ئافرەتەکە نیوەی مارەیی دەکەوێت، لەوبارەیە عمر دەڵێت : نیوەی مارەیی دەکەوێت ونەمیرات دەبات ونەـ عدەـیشی پێویستە.[٤]

---

١ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (١/٤١٨) .

٢ ـ المحلی (١٠/١٣٨) .

٣ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (١/٤١٨) .

٤ ـ مصنف ابن ابی شیبە (٤/٣٣١) .

## ٧-ئایا باوك دەتوانی شیر بایی وەربگرێت؟

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پێ ی وایە مارەیی تایبەتە بەئافرەتەوە وبەس، ئەگەر باوك شتێکی بۆ خۆی لەگرێ بەستی مارەبڕینەکەدا بڕیاردا، ئەوا ئەوەش دەچێتە ڕێزی مارەیی یەکە وهەردووکیان دەدرێت بەئافرەتەکەو باوکی هیچی ناکەوێت.

(ابو عر و الاوزاعی) دەڵێت: پیاوێك کچەکەی بەشوودا لەسەر (١٠٠٠)دینار وەك مارەیی بۆ کچەکەی و(١٠٠٠)یش بۆخۆی، عمری کوڕی عبدالعزیزیش بڕیاریدا (٢٠٠٠)دینارەکە بدرێت بەکچەکە و باوکەکەیش هیچی نەکەوێت.[١]

## ٨- گاڵتە کردن بەتەڵاق خواردن:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پێ ی وایە کەدەبێت لەسەر تەڵاق خواردن موسڵمان لێبرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت، ئیتر جیاوازی نی یە لەنێوان ئەوەی بەڕاستی بووبێت یان بەگاڵتە،(سلیمان)ی کوڕی (حبیب المحاربی) دەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی بۆ نووسیم و ووتی پێم: باگێل وگەوچەکان هەموو گاڵتەیەکیان لێ قبوڵ بکرێت بەڵام لەمەسەلەی تەڵاق خواردن و بەندەئازاد کردندا لێیان قبوڵ نەکەن.[٢]

## ٩- بەزۆر ژنەکەی تەڵاق بدەن:

هەندێ کات واڕوو دەدات پیاوێك لەژێر گوشار و زۆردا ژنەکەی پێ تەڵاق بدەن، وەك ئەوەی بەتەڵاق سوێندی پێ بخۆن بۆ کردنی کارێك، یان هەرەشەی کوشتنی لێ بکرێت ئەگەر ژنەکەی تلاق نەدات.

ئایا ئەم جۆرە تەڵاقانە دەکەون یان نا؟ وعمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پێ ی وایە تەڵاقی زۆر لێ کراو بەهیچ جۆرێك ناکەوێت.[٣]

---

١ ـ مصنف ابن ابی شیبه (٤/٢٠١) .

٢ ـ هەمان سەرچاوە (٥/١٠٦) .

٣ – فقه عمر بن عبدالعزیز (١/٤٣٤).

### ١٠- پیاوێك نیو تەڵاقی ژنەكەی بدات:

بەعمری كوڕی عبدالعزیزیان ووت: پیاوێك نیو تەڵاقی ژنەكەی بدات، حوكمەكەی چی یە؟ عمر لەوەڵامدا ووتی: بەتەڵاقێكی تەواو حسێب دەكرێت لەسەری.[١]

### ١١- ئافرەت دەتوانێت خۆی تەڵاق بدات؟

ئەگەر ئافرەتێك لەكاتی مارەبڕیندا داوای كردبوو كەتەڵاق لەدەستی ئەودابێت نەك بەدەستی مێردەكەی ومێردەكەشی قبوڵی كرد، ئایا ئەگەر پیاوەكەی تەڵاق بدات تەڵاقی دەكەوێت یان نا؟

عمری كوڕی عبدالعزیزرحمه الله پێ ی وایە تەڵاقەكە دەكەوێت بەڵام یەك تەڵاقی دەكەوێت ئیتر با سێ بەسێ یشی خواردبێت، بۆی هەیە هەركاتێك بیگەڕێنیتەوە بۆلای خۆی .

دەربارەی پیاوێكی هۆزی تەمیم كەتەڵاقی دابوویە دەستی ژنەكەی وئەویش پاش ماوەیەك كابرای تەڵاق دا، عمر ووتی : ئەگەر كاری تەڵاق بداتەوە دەستی پیاوەكەی ئەوە دەبێتەوە بەهی ئەو، ئەگەر خۆی تەڵاق دا ئەوە بەیەك تەڵاق دادەنرێت و ئەگەر ویستی پیاوەكەی بهێنێتەوە ئەوە هەقی خۆیەتی.[٢]

### ١٢- ژنی كافرێك موسڵمان ببێت:

ئەگەر ئافرەتێك موسڵمان ببێت ولەوكاتەدا خێزانی كافرێك بێت، ئەوە نیكاحی نێوانیان هەڵدەوەشێتەوە ولەیەك جیادەكرێنەوە .

(معمر)ی كوڕی (سلیمان) لەباوكی یەوە دەگێڕتەوە و دەڵێت : (حسن)و عمری كوڕی عبدالعزیزرحمه الله دەربارەی ژنی گاور موسڵمان ببێت دەڵێن: ئیسلام لەمێردەگاورەكەی جیادەكاتەوە.[٣]

---

١ – فقه عمر بن عبدالعزیز (٤٤١/١) .

٢ – مصنف ابن ابی شیبه (٥٧/٥) . * مەبەست حەسەنی بەسری یە (وەرگێڕ) .

٣ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (٤٥٠/١) .

ئەم جیابوونەوەیەش ڕوونادات تا داوا لەپیاوەکەی نەکرێت کە موسڵمان بێت و ئەگەر ڕازی نەبوو ئەوا تەلاقی بائنی دەکەوێت، هەرکاتێك موسڵمان بوو لەماوەی (عدە)ی خێزانەکەیدا ئەوە مافی خۆیەتی بهێنێتەوە.[1]

## ١٣ـ ژنێك پیاوەکەی لەدورەو نایەتەوە:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پێ ی وایە کە ئەو ژنەی کەمێردەکەی لێ ی دوورکەوتۆتەوە وەك ئەوەی لەدەرەوەی وڵاتە.. بۆی هەیە تاماوەی دوو ساڵ چاوەڕوانی مێردەکەی بکات، پاش ئەو ماوەیە یان دێتەوە بۆلای ژنەکەی یان دەبێت تەلاقی بدات.

بۆ ئەو مەبەستە نامەی نووسی بۆ کاربەدەستەکانی و ووتی: هەرکەسێ خۆی شاردەوە ـ دورکەوتەوەـ بۆ ماوەی دوو ساڵ، یان پێ ی تەلاق بدەن یان بینێرن بۆ لای پیاوەکەی.[2]

ئەمە شتێك بوو لەخەرواری ئجتهاد و لێکۆڵینەوە فقهی یە وردەکانی عمری کوڕی عبدالعزیز کە هەموو یان پێیان دەوترێت فقهی کردەوەیی وهیچ حوکمێکی خەیاڵی و دور لە واقیع ی تێدا بەدی ناکرێت، هەموو ئەم کارانەیشی لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت و ووتەو بۆ چوونە فیقهی یەکانی خولەفاکانی ڕاشدین دا دەردەبڕی.

دکتور(محمد شقیر) نامەی دوکتۆراکەی لەسەر فیقهی عمری کوڕی عبدالعزیز نووسی وەو لە دوو بەرگی گەورەدا کۆی کردۆتەوە لە وڵاتی سعودیە وهەرکەس پێی خۆشە زیاتر شارەزابێت لە دەریای فیقهی عمر با سەر لەو کتێبە نایابە بدات.

---

١ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (١/٤٥١، ٤٥٢).

٢ ـ هەمان سەرچاوە (١/٤٥٥).

# بەشی هەشتەم

# فیقهی بەڕێوەبردن( الادارة ) لە لای عمرو دوارۆژەکانی تەمەنی وگیانی سپاردنی رحمه الله

## یەکەم: والی یە ناوادارەکانی دەوڵەتەکەی عمر

١- (حجاج) کوڕی (عبدالله الحکمی).

ئەم پیاوە والی خوراسان وسجستان بووە، (الذهبی) دەربارەی دەڵێت: پێشەوای سوپا و سوارچاکی کەتیبەکان بووە، (ابو عقبە الجراح ی کوڕی عبداللە الحکمی، لەکاتی حوکمی حەجاجدا کردوویەتی بەوالی بەسرە وپاشان خراسان وسجستان لەسەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزدا، پاڵەوانێکی ئازاو چاونەترس بووە، خواناس و قورئان خوێنێکی پایە بەرزبووە.[1]

(الجراح) دەربارەی خۆی دەڵێت: بۆ ماوەی (٤٠)ساڵ وازم لەگوناه کردن هێنا لەشەرماندا، پاش ئەو ماوەیە (ورع)م بۆ دروست بوو.[2] (وەرع واتە: گوناه کردن و حەرام خواردنی لەبەرچاوکەوت (وەرگێڕ).

بەرپرسی خوراسان بووە لەهەر سێ بواری جەنگی وئاینی و دارایی .[3] ولەساڵی (١١٢)ی کۆچیدا و لەسەردەمی خەلیفە هیشامدا شەهیدکرا.

(سلیم)ی کوڕی (عامر) دەڵێت: چوم بۆلای (جراح) ودەستەکانی بەرزکردەوە و هەموو فەرماندەکانی چواردەوریشی دەستیان بەرزکردەوە، ماوەیەك بەبێ دەنگی

١ ـ سیر اعلام النبلاء (١٨٩/٥) .

٢ ـ هەمان سەرچاوە(١٩٠/٥) .

٣ ـ هەمان سەرچاوە.

مایەوە وپاشان پێ ی ووتم: ئەی (ابا یحیی) ئەزانیت خەریکی چی بووین؟ ووتم: نـەء هەرئەوەندەیە ئێـوەم بینـی دەسـتان بـەرزکردەوە ومنـیش لەگەڵتانـدا دەسـتم بـەرزکردەوە. ئـەویش ووتـی: دەپاڕاینـەوە وداوای شـەهیدبوونمان لـەخوای _ عزوجل_ دەکرد.

دەی سـوێند بـەخوا هەرهـەموویان لەغەزاکانـدا شـەهید بـوون.[1] ئـەوە بـوو لەساڵی(١١٢)دا لەشکری خستەڕێ بەرەو (أزربایجان) بۆ جەنگ لەگەڵ (ابن خاقان) ولە وێ جەنگێکی دژوار و ترسناکیان کرد، لەمانگی ڕەمەزاندا جراح الحكمی شەهید بوو بەئاواتی خۆی گەیشت وسوپا کەیشی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا وموسڵمانان زۆر نیگەرانی کوشتنی جراح ی سەرکردەیان بوون و بەکوڵ دەگریان بۆی.[2]

٢- (عدی)کوڕی (أرطاة):

ئەم پیاوە والی شاری بەسرە بوو لەسەردەمی کوڕی عبدالعزیزدا، خواناس بووە، وتاربێژێکی کاریگەر بووە، (عمرو)ی کوڕی (عبسە)و(ابی امامە) دەڵێن :(عباد)ی کوڕی (منصور) دەڵێت: (عدی) لەمزگەوتی مەدائن ووتاری بۆ دەداین خۆی دەگریا و هەمووشمانی کردبووە گریان.[3]

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله هەردەم بەسەری دەکردەوەو بەردەوام ئامۆژگاری و ئاراستەی جوانی پێش کەش دەکرد.

(معمر) دەڵێت: عمر نامەیەکی نووسی بۆ (عدی) کوڕی(أرطأة) وپێ ی ووت: تۆ بەم عەمامە ڕەشەتەوەو بە بەشداری کردنت لەوانەی زاناکانـدا منـت خەڵەتانـدوە، خـوای گـەورە زۆر شـتی نهێنـی ئێـوەی بـۆ ئاشـکرا کـردووم، دەی ئایـا سـەردانی گۆڕستانەکان دەکەیت؟.[4]

---

١ـ سیر اعلام النبلاء (١٩٠/٥).

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ سیر اعلام النبلاء (٥٣/٥).

٤ ـ سیر اعلام النبلاء (٥٣/٥).

(عدی) بەرەو بەسرە کەوتـە ڕێ(یزیـد)ی کـوڕی(ملـهب)ی گـرت و کـۆتی کـرد و ناردی بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز، کاتێ عمر کۆچی دوایی کـرد(یەزیـد) لەبەنـدی ڕزگاری بوو، دەستەیەکی جەنگی بۆ خۆی دروسـت کـرد وبانگەشـەی گەڕانـەوە بـۆ سەر ژیانی عمری کـوڕی خطـاب دەکـرد و، ئـالای ڕەشـی هـەڵکرد بـوو، (مـسلمە)ی کـوڕی(عبـدالملك) لەگـەڵی جـەنگاو کوشـتی، بـەڵام(موعاویـە)ی کوڕیـشی بەلاماری(عدی)دا وگرتی وبەسزا کوشتی.

بەم جۆرە لەسـاڵی(١٠٢)ی کۆچیدا یـەکی لـەواڵی چاك و بەمتمانـەکانی عمـری کـوڕی عبـدالعزیز شـەهید کـرا[١]، (دارالقطنـی) دەڵێـت: پیـاوێکی(ثقـة) بـووە و فەرموودەی لێ وەردەگیرێت.

٣- (عبدالحمید)ی کوڕی(عبدالرحمن)ی کوڕی(زید)ی کوڕی خطاب:

ئەم پیاوە والی شاری کوفە بووە و نـاوی(أبـو عمـرو العـدوي الخطـابی المـدنی) بووە و بە(الامام العـادل) ناوبـانگی دەرکـردووە، زۆر بـەڕێز بـووە، لەسـاڵی(١١٥)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.[٢]

٤- (عمر)ی کوڕی (هبیرە):

والی جەزیرە بووە، لەژێرمەندە ئازاو بەجەرگەکان بووە، یەکێ لەپیاو ماقوڵانی وڵاتـی شـام بـووە، عمـر لەسـاڵی(١٠٠)ی کۆچـیدا کـردی بـە والی، لەناوچەی(ئەرمینیا)وە لەگەڵ ڕۆمەکاندا جەنگاوە و شکاندوونی و ئەسیرێکی زۆری لێ گرتوون، بەردەوام والی جەزیرە بوو تـا سـەردەمی (یزیـد)ی کـوڕی (عبـدالملك)و ئەویش کردی بەوالی عیراق و خوراسان، پاشان لەبەر هەندێ ناکۆکی هشام ی کوڕی عبدالملك لای برد، پاشتر کـردی بـە زینـدان و لەڕێگـەی خزمەتکارەکانـەوە ڕێگـەی هەڵاتنی بۆ ئاسـان کـرا و ئـەویش ڕای کـرد بـۆ لای (مـسلمە)ی کـوڕی (عبـدالملك)و داوای پەنابەرێتی لـێ کـرد و ئـەویش بـەڕێزەوە پـەنای دا لەسـاڵی(١٠٧)ی کۆچـیدا کۆچی دوایی فەرموو.[٣]

١ ـ سیر اعلام النبلاء(٥/٥٣).
٢ ـ هەمان سەرچاوە (٥/١٤٩) .
٣ـ سیر اعلام النبلاء (٥/٥٦٢) .

٥- (أبو بكر محمد)ی کوڕی(عمرو)ی کوڕی حزم:

والی شاری مەدینە بووە، یەکێکە لەپێشەواو زانا متمانە پێکراوەکان بووەو، لەسەرەتاوە ئەمیری شاری مەدینە بووە وپاشان بووە بەقازی ئەوشارە، دەڵێن: زاناترین کەسی سەردەمی خۆی بووە لەبواری دادوەریدا، لەڕیزی تابیعینە بچوکەکاندا هەژمار کراوە.[١]

عطاف ی کوڕی خالد لەدایکی یەوە و ئەویش خێزانی (ابن حزم)ەوە دەگێڕیتەوەکە(ابن حزم)ی هاوسەری ماوەی(٤٠)ساڵە لەسەر جێگەنە خەوتووە.[٢]

٦- (عبدالعزیز)ی کوڕی (عبدالله)الأموی:

ئەم پیاوە لەپێش حوکمی عمری کوڕی عبدالعزیزدا وسەردەمی(سلیمان)ی کوڕی(عبدالملك)دا والی شاری مەککە بووە، عمر بەپیاوێکی پاك ولێهاتووی زانیوە بۆیە لەجێگەی خۆی هێشتوویەتیەوە، (نسائی) و(إبن حبان) لەناو _ثقە_ کاندا ناویان بردووە.[٣]

٥- (رفاعە)ی کوڕی (خالد)ی کوڕی (ثابت الفهمی) :

عمری کوڕی عبدالعزیز کردی بەوالی ولاتی میسر کە خۆی پیاوێکی خەڵکی میسر بوو، ناوبانگی خواناسی وپیاو چاکی و دادپەروەری وبەدوور لەپارەو دنیا ویستی دەرکرد بوو. ولەمانگی (ربیع الاول)ی ساڵی (٩٩)دا عمر لەسەر کار لای برد و(ایوب)ی کوڕی(شرجیل)ی خستە جێگای.[٤]

٦- (اسماعیل)ی کوڕی(عبدالله)ی کوڕی (ابی مهاجر المخزومی) :

عمرﷺ هەڵیبژارد وکردی بەوالی ولاتی (مغرب) وپیاوێکی صالح ودنیانەویست، لەساڵی (٩٩)دا گەیشتۆتە ولاتی(مغرب)، ناوبانگی چاکەی دەرکردبوو، هەق و

---

١ - سیراعلام النبلاء (٥/٣١٤) .

٢ - هەمان سەرچاوە.

٣ - تاریخ خلیفە لا ٣٢٣ .

٤ - عمرو سیاستە فی رد المظالم لا ٢٨٩ .

دادپەروەری بەرپاکردبوو لەو ناوچەیەدا سەرتاسەری بەربەریەکان لەسەر دەستی ئەوەدا موسڵمان بوون، زۆر سور بوو لەسەر موسڵمان بوونیان وعمری کوڕی عبدالعزیز نامەی دەنووسی بۆی وهانی دەدا لەسەر موسڵمان کردنی(أهل الذمه) وئەویش نامەکانی بۆ دەخوێندنەوە وئەم پیاوە لەساڵی(١٢٣) کۆچیدا گیانی پاکی سپارد بەپەروەردگاری جیهان.[1]

٧- (السمح)ی کوڕی مالك:

ئەمیری بەناوبانگ ی وڵاتی ئەندەلوس، عمری کوڕی عبدالعزیز کردی بەوالی وڵاتی ئەسپانیای ئێستا، فەرمانیشی پێدا کەجۆری زەوی یە ڕزگاربووەکان جیابکاتەوە وکامەی بەزۆر ولەجەنگدا گیراوە وکامەی بەسوڵح وبەبێ جەنگ گیراوە تا پێنج یەك وخەراجی جیابکاتەوە هەروەها داوای لێ دەکرد دەربارەی ئەندەلوس وکاروکاسبی خەڵکەکەی وحەزو ئارەزوەکانیان شتی بۆ بنووسێت و ئەویش بۆی دەنووسی، لەئاکامدا لەجەنگی فرنجە(دژبەفەرنسی یەکان)دا گەیشتە پلەی بەرزی شەهیدی.

## دووەم: هەڵبژاردنی کاربەدەستەکانی

فەرمانڕەواو کاربەدەستانی خەلیفە_ جێگری خەلیفەن بەسەر ئەو شوێنانەی خۆیانەوە و هێڵی پەیوەندین لەنێوان خەلیفە و میللەتدا، ئەگەر خەلیفەزۆر زیرەك و لێهاتوو بێت لەبەڕێوە بردنی وڵاتدا _ هیچ سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت_ ئەگەر زیرەکانەو بەوردی کۆمەلێ والی وفەرمانڕەوای چاك و لێزان هەڵنەبژێرێت تا کاری ناوچەکانی بۆ ئاسان بکات.

لەبەر ئەم هۆیە بوو، عمر زۆر زۆر گرنکی دەدا بەهەڵبژاردنی والی و ئەمیرو فەرمانڕەواکانی و ئەگەر بەوردی لەکارەکانی عمر بکۆڵینەوە لەم بوارەدا بۆمان دەردەکەوێت کەکۆمەلێ مەرجی هەبووە لەهەڵبژاردنی ئەو کەسانەدا کە کاریان بۆ دەکرد لەهەرێمەکاندا.

---

١ ـ عمرو سیاسته فی رد المظالم لا ٢٩٣ .

گرنگ ترینی ئەو مەرجانە:
تەقواو لەخوا ترسان و دەست پاکی وموسڵمانەتی_ئاینداری_ ، کاتیٚ(خالد)ی کوڕی (الریان)ی لابرد کەپێشتر سەرۆکی پاسەوانانی سەردەمی (ولید)ی کوڕی(سلیمان)دا، عمر سەیری دەم وچاوی پاسەوانەکانی کردو وپاشان(عمرو)ی کوڕی(مهاجر)نصاری بانگ کردو پیٚ ی ووت:
سوێند بەخوا ئەی(عمرو)تۆ چاك دەزانیت جگە لەبرای موسڵمانی هیچ خزمایەتی یەك لەنێوان من وتۆدا نی یە، بەڵام بەگویٚ ی خۆم گوێم لیٚ بوو قورئانت خوێندووە، لە کاتانێکی وادا تۆم دیوە نوێژت کردووە کەباوەڕت نەکردووە کەس چاوی لێت بێت، دەبینی زۆر جوان نوێژت دەکرد، دەی فەرمووئەم شمشێرە بگرەو هەموو پاسەوانەکانت دەدەمە دەست ودەتکەمە بەرپرسی هەموویان.[1]
نامەی دەنووسە بۆ کاربەدەستەکانی وپیٚ ی دەووتن: دەخیلتان بم هیچ کارو بەرپرسیایتی یەکمان نەدەنە دەستی کەس بێجگە لەهەڵگرانی قورئان، چونکە ئەگەر هەڵگرانی قورئان خێرنەدەنەوە ئەوا خەڵکانی تر هەر خێریان لیٚ چاوەڕوان ناکرێت.[2]
ئەگەر گومانی لەچاکی و لێهاتوویی کەسێکدا هەبوایە، پێش ئەوەی بڕیاربدات لەسەر ئەوەی بەرپرسیارێتی یەکی پیٚ بدات، لەحاڵی ورد دەبوویەوەو تاقی دەکردەوە، ئەوە بوو کاتیٚ عمر _ڕ_بوو بەخەلیفە، بۆ پیرۆزبایی لێکردن وەفدێك هاتە خزمەت خەلیفە بەسەرۆکایەتی(بلال)ی کوڕی (ابی بردە)و (بلال) هاتە پێشەوە وپیرۆزبایی لێکرد ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران هەر کەسێك خەلافەت جوانی کرد بێت، تۆ خۆت خەلافەتت جوان کردووە، هەرکەسیٚ خەلافەت سەنگینی بکات ئەوا تۆ خۆت خەلافەتت سەنگین کردووە، بەچەند دێرە شیعرێك مەدح و پیا هەڵدانی عمری کرد، عمریش پاداشتی چاکەی دایەوە، پاش ئەوە(بلال)مایەوەو

---

١ ـ سیره عمر بن عبدالعزیز ( ابن الجوزی )لا ٣١ .
٢ ـ هەمان سەرچاوە لا ٨ . سراج الملوك ، طرطوسی لا ٢٥٥ .

بەردەوام لەمزگەوتدا نوێژی دەکرد، شەو ڕۆژ قورئانی دەخوێند، بەڕادەیەك خۆی بردە دڵی عمرەوە کەنیازی کرد بیکات بەوالی عێراق، ووتی: ئەم پیاوە زۆر چاك و لێهاتووە.

بەڵام عمر رحمه الله زۆر وریاو زیرەك بووە وبەڕواڵەتی هیچ کەس نەخەڵەتاوە بەڵکو هەوڵی داوە بزانێت لەژێرەوە چۆن پیاوێکن بۆیە کەسێکی متمانە پێکراو دەنێرێت بۆ لای وکەپێ ی بڵێت: ئەگەر من لە لای خەلیفە ئیشت بۆ بکەم تابتکاتە والی عێراق، چیم بۆ دەکەیت؟ ئەویش لەوەڵامدا پێ ی ووتبوو پارەیەکی زۆرت پێ دەدەم، کابرایش هاتەوە ومەسەلەکەی بۆ عمر گێڕایەوە و عمریش لەبەر چاوی کەوت و ناردیەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی.[١]

زۆر پێ ی ناخۆش بووە کەسێك بکاتە فەرمانڕەوا کەپێشتر ستەمکار بووبێت یان هاوکارو پاڵپشتی ستەمکارانی کردبێت بەتایبەتی (حەجاج)ی کوڕی (یوسف الثقفی).[٢]

ئەگەر لەپێش عمردا ولەسەردەمی خەلیفە ئەمەویەکانی تردا خزمایەتی و سەربە ئەمەویەکان ڕۆڵی هەبووبێت لە هەڵبژاردنی بەرپرسیار بۆ هەرێمەکان، ئەوە لە کێشانەی عمردا کەمترین قورسایی نەبوو، بوونی نەبوو.

ئیمام (أوزاعی) دەگێڕێتەوە و دەڵێت عمری کوری عبدالعزیز رحمه الله لەماڵی خۆیان دانیشتبوو، هەموو گەورەپیاوانی هۆزی (ئومەمەیە) بەچواردەوریدا دانیشتبوون، عمر پێ ی ووتن: پێتان خۆشە هەریەکەتان بەرپرسیاریتی یەکی سەربازی پێبدەم؟ ووتیان: شتێك دەخەیتە بەردەستمان کەپێشمان نادەیت؟!

عمر ووتی: ئەم قاڵی یەی ژێرم دەبینن؟ خۆ من دڵنیام ڕۆژێ دێت برزێت، دەی من پێم خۆش نی یە بێنە سەری بەقاچەکانتان بیسی بکەن، دەی ئیتر چۆن کاروباری ئاینەکەمتان تەسلیم دەکەن! یان ماڵ وناموسی موسڵمانان بدەمە

١ ـ اثر العلماء فی الحیاة السیاسیة لا ١٨٢ .

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

دەستتان!؟ دەی ئەوە هەر نابێت، هەرنابێت!![1]

لەئاکامی ئەم سیاسەت وشێوازی هەڵبژاردنی کاربەدەستتان لەسەر بنەمای لەخواترسان و لێوە شاوەیی یەی عمردا، وای کردبوو لەوەی ئاشتی وئارامی سەرتاپای ولاتە یەککگرتوەکانی ئیسلامی گرتبوویە.

بەجۆری کەهەموو خەڵکی لەگەورە کاربەدەستەکانیان ڕازی بوون و کردەوەکانیان بەبەرز دەنرخاندن، کەلەناو هەمواندا کەسێکی تێدا نەبوو لەسەر شێوەی حجاج بێت، کەبەزۆر وزەبرو زەنگ مامە ڵە لەگەڵ مللەتدا بکات، بەبچوکترین تۆمەت کێشی زیندانەکانیان بکات، هەروەك کەسێکی هۆز پەرست و ڕەگەز پەرستی دانە نابوو تاخێروبێری بۆ کۆمەڵێ کەسی تایبەتی بێت وباقی خەڵکانی تر ڕقی لێ هەڵ بگرن وئالای دژایەتی بەرامبەر هەڵبکەن.[2]

## سێ یەم : سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی کاروبارەکانی دەوڵەت

عمری کوڕی عبدالعزیزرَحِمَهُ‌اللهُ خۆی سەرپەرشتی کاروبارەکانی دەوڵەتی دەکرد ئیتر ئەو کارە گەورە بوایە یان بچوك، چاودێری کارەکانی کاربەدەست و ئەمیرو والی یەکانی خۆی دەکرد لەسەرجەم هەرێمەکاندا، ئەمەش لەڕێگای ئەو دەزگایانەوە بۆ دەچووە سەر وەك دەزگای پۆستەو گەیاندن ـ البريد ـ ودەزگای هەوالگری گەورە کەهەموو کون وقوژبنێکی ولاتە یەککگرتوەکانی ئیسلامی گرتبوویەوە و هەموو خەلیفەکان بەکاریان دەهێنا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و بۆ ئاگاداربوونی ڕاستەوخۆ لەکاروباری بەڕێوەبردنی هەرێمەکان، ئەم دەزگایانەیش بەشێوەیەکی هەڕەمەکی هەربوون بەلام لەسەردەمی (عبدالملك)ی کوڕی (مروان)دا پەرەی پێدرا وبوون بە دوو دەزگای گرنگی دەوڵەت.

---

١ ـ سير اعلام النبلاء (٥/١٣٢) .

٢ ـ أثر العلماء فى الحياة السياسية لا ١٨٣ .

لەگەڵ ئەوەدا کەعمررحمه الله زۆر بـە وردی و ژیرانـە والی وئـەمیرە متمانـە دارەکـانی دەستنیشان دەکرد بۆناوچەکان، بەلاّم ئەمـە وای نـەدەکرد کەچـاودێریان نـەکات و لێپرسینەوەی نـەبێت لەگـەڵیان و گەلـەکانی ژێردەسـتیان فـەرامۆش بکـات لەسـەر بنەمای متمانە، بەڵکو ڕاستەوخۆ چاودێری هـەق و دادپـەروەری والی یـەکانی خـۆی دەکـرد لەگـەڵ میللەتـدا وشـەو نوێـژو خواپەرستی و پارەنـە خـواردن و هتـد..... چاودێری هەموو والی وئەمیرێکی سەربازی دەکرد.

ئیتر بەڕادەیەك کارەکانی بەهەند ـ جدی ـ دەگرت، تـاوای لـێ هـات شـیعاری: (کـاری ئـەمڕۆ مەخـەرە سبەینێ) ی هـەلگرتبوو، تـا جارێکیـان پێیـان ووت: ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران، چـۆنە ئەگـەر سواری ولاغەکـەت ببوتیایـە وئـەمڕۆت بکردایـە بەمۆلەت وحەوانەوە.

عمـریش لەوەلاّمـدا دەیـووت: دەی کـێ کارەکـانی ئـەمڕۆم بـۆ بکـات؟ ووتیـان: سبەینێ بیانکە، عمریش سەرێکی باداو ووتی : کاری یەك ڕۆژ پیاو ماندوو دەکـات، جاوەرە کاری دوو ڕۆژم لەسەر کۆببێتەوە.[1]

(میمون)ی کوڕی (مهران) دەڵێـت: شـەوێکیان بـۆ شـەو نـشینی لـەلای عمـری کوڕی عبدالعزیز مامەوە، پێم ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئـەوە چـۆن مـاوی تـۆ بەم جـۆرەی مـن دەتبینـم کاردەکـەیت؟ کـەتۆ بـەڕۆژدا کاروبـاری خـەڵکی بـەڕێوە دەبـەیت وپێویـستی یـەکانیان بـۆ جـێ بـەجێ دەکـەیت، بەشەویـشدا لەگـەڵ ئێمـە کۆدەبیتەوە، خوایش ئەیزانی دوای ئێمەیش بەتەنهایی چی تر دەکـات ـ واتـە شـەو نوێژ ـ .[2]

عمــررحمه الله زۆر لەکاتــەکانی خــۆی تــەرخان دەکــرد بــۆ کێــشانی سیاســەتە چاکسازیەکەی کـە هــەموو گۆشـەکانی ژیـانی گرتبوویـەوە چ لایـەنی ئـابوری یـان سیاسـی یـان ئیـداری بوایـە، تـا وای لـێ هـات لـەدوای خـۆی بڕێکـی گـەورەی لـەو سیاسەتانە بەجێ هێشت کەبوونە بنەمای مەوادی خامی یاسای چاکسازی گشتی، و

١ ـ سیرةعمر بن عبدالعزیز، (ابن عبدالحکم) لا ٥٥ .
٢ ـ الطبقات(٣٧١/٥) .

ئەو سیاسەت و بۆ چوون ونەخشانەی کەدای دەڕشتن _ لەڕێگەی نامەبەرەکانی یەوە دەیگەیاندە هەموو هەرێمەکان وداوای جێ بەجێ کردنی لێ دەکردن، زۆر جاریش لەگەڵ ئەو ئاراستە جوانانەشدا کۆمەڵێ ئاراستەی پەروەردەیی بۆ دەناردن وەك ڕوون کردنەوەی گەورەیی ئەو کارەی پێیان سپێرراوە، بەچاودێری خوایی دیترساندن و فەرمانی پێ دەکردن کەلە خوا بترسن و لەهەموو کاروکردەوە و فەرمانێکیاندا بیکەن بەچاودێر بەسەر خۆیانەوە.[1]

ئەم ئاراستەو ئامۆژگاریانەی عمر بۆ کاربەدەستەکانی گاریگەریەکی ئەو تۆیان هەبوو کە زەبروزەنگ و قەمچیش ئەو ڕۆڵەیان نی یە، زۆر لەو گاریگەرتر بوو کەفەرمانی لابردن ودوور خستەوەیان دەربکات.

جارێك نامەیەك دەنووسێت بۆ یەکێکیان وپێ ی دەڵێت: برای خۆم، ئەوەت یاد دەخەمەوەکە درێژی شەوەکانی ناو ئاگری جەهەننەم، کۆتایی نەهاتن و هەتا هەتایی یەکەی لەیاد نەکەیت، دەخیلت بم کارێك نەکەیت خوات لێ بڕەنجێت و دواتر هیچ هات و هاوارێك کەڵکیان نەبێت بۆت.

کاتێ کاربەدەستەکە نامەکە دەخوێنێتەوە خۆی پێ ناگیرێت و وڵات بەجێ دێڵێت وخۆی دەگەیەنێتەوە عمر وپێ ی ووت: ئەوە بۆچی هاتوویتەوە؟ کابرایش ووتی: بەونامەیەت دڵ وهەناومت دەرهێنا، ساوەڵڵاهی تادەگەمەوە لای خوای عزوجل _ هەرگیز بەرپرسیارێتی و فەرمانڕەوایی وەرناگرم.[2]

عمر رحمه الله هەربەوەشەوە نەدەوەستا کە ئامۆژگاری و ئاراستە و بڕیارەکانی بنێرێت بۆ کاربەدەستەکانی هەرێمە جیاجیاکان، بەڵکو بەدواداچوونی ئەوەشی دەکرد کەبزانێت تا چ ئاستێك والی یەکان جێ بەجێیان کردووە، تا چ ڕادەیەك بەرهەم وشوێنەواری ئەو ئاراستانە بەمیللەتە کەیانەوە دیارە ولێ ی سودمەندبوون.

ئیتر بەردەوام پرسیاری دەکرد لەو کەسانەی لەو هەرێمانەوە دەهاتن بۆ

---

١ ـ اثر العلماء فی الحیاة الساسیة لا ١٨٦ .

٢ ـ أثر العلماء فی الحیاة الساسیة لا ١٨٦.

پایتەخت ئەوەتا(زیاد)ی کوڕی (ابی زیاد المدنی) دەڵێت: کاتێ لەمەدینەوە هاتم بۆ لای عمر خێرا لێ ی پرسیم دەربارەی ناوی پیاو چاك و چاکەخوازانی ناوچکە چ پیاوان یان ژنانیان، پرسیاری دەربارەی هەندێ شت لێ کردم کەخۆی فەرمانی دابوو بەجێ بەجێ کردنی لەو وڵاتەدا ومنیش بەوردی بۆم باس کرد. [1]

جارێکیان لەگەڵ (موزاحیم) ی یاوەریدا سواری وڵاخ دەبن ولەشاردەردەچن - کەزۆر جار ئەوە پیشەی بووە تا هەواڵی لادێ و کاروباریان بەسەر بکاتەوە- و لەڕێگای گەیشت بەپیاوێك لەشارێکەوە هاتبوو، ئەوانیش دەربارەی خەڵکی و کاروبارەکانیان پرسیاریان لێ کرد، ئەویش پێ ی ووتن:

ئەگەر پێتان خۆش بێت بەگشتی بۆتان باس دەکەم، ئەگەر حەزیش دەکەن بەوردی ویەك یەك بۆتان باس دەکەم، ئەوانیش پێیان ووت: بەگشتی باسی بکە، کابرایش ووتی: من کاتێ ئەو شارەم بەجێ هێشت: ستەمکار تیایدا چەوساوەیە، ستەم لێکراویش سەر خراوە، دەوڵەمەندی فرە بووە، هەژارانیشی دانسقە.

عمر بەو هەواڵە زۆر دڵی خۆش بوو، پێ ی ووت: وەڵڵاهی ئەگەر هەموو هەرێمەکانی ئیسلام بەم شێوەیە بوونایە لەهەموو دنیا پێم خۆش تر بوو - لەوەی خۆری لێ هەڵدێ -. [2]

پیاوێك لەخوراسانەوە هات بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز وماوەیەك مایەوە پاشان نیازی کرد بڕواتەوە و لەوکاتەدا بەعمری ووت: ئیشێ کارێ نامەیەکت نی یە؟ تابۆت بەرم بۆ خوراسان؟ وعمر کاتێ لەچاکی وهەڵسوکەوتی دڵنیابوو پێی ووت: ئایا دەتوانیت کارێك هەیە بۆمان بکەیت؟

پیاوەکە ووتی: بەڵێ، عمر پێ ی ووت: هەرکاربەدەستێك دادەنێم بەسەر خۆراسانەوە تۆ سەیری ژیان و هەڵسوکەوتی بکە، ئەگەر چاك و دادپەروەر و خواناس بوو ئاگادارم مەکە، بەڵام ئەگەر خراپ بوو ئاگادارم بکەرەوە.

---

١ ـ أثر العلماء فی الحیاة الساسیة (١٨٧/٥).

٢ ـ سیره عمر، ابن عبدالحکم لا ١١٥.

(مـــزاحم) دەڵێــت: بـــەردەوام ئـــەو پیـــاوە نامـــەی بـــۆ دەنووســـین وئێمـــەش كاربەدەستمان لادەبرد بەسەر خوراسانەوە .[١]

لەمەوە تێبی نی ئـەوە دەكـەین كـە عمـری كـوڕی عبـدالعزیزﷺ سـودی لەسـەر چـاوە جیاجیاكـانی هـەواڵ گـرتن وەر دەگـرت، چـونكە دەیزانـی بـۆزانینی هـەواڵی كاربەدەســـتەكان و گەلـــەكانیان پێویـــست بـــەوە دەكـــات لەسەرچـــاوە جـــۆراو جۆرەكانەوە هەواڵیان لەسەر كۆبكاتەوە،لەسەر ئەو زانیاریانـە فـەرمان وبریـارە بـە سودەكانی دەردەكرد ، كە لەبەرژەوەندی میللەتی موسڵمان و دەوڵەتەكەی بوو.

ئەم چاودێری یە وردەی خەلیفە بۆ ئیش و كاری والی وئـەمیرەكانی بـوو بـەهۆی ســـەقامگیربوونی ئاشـــتی وئـــارامی لەســـەرجەم هەرێمەكانـــدا، هـــەروەك وایـــشی لەكاربەدەستەكان كردبوو كەهەمیشە ئاگایان لەخۆیان بێت و لەهـەق ودادپـەروەری لانەدەن وكاریێ نەكەن میللەت بەدڵیان نەبێت و ئەوانیش عمر ئاگادار بكەن وعمریش لایانبات ، بەوجۆرە وەك عمریان لیێ هاتبوو.

(ابـراهیم)ی كـوڕی (جعفـر) لـەباوكی یـەوە دەگێڕیتـەوە ودەڵێـت: (ابـوبكر)ی كوڕی(محمد)ی كوڕی (عمرو)ی كوڕی(حزم)م بینی بەشەو بـەڕۆژ ئـیش و كارەكـانی ڕادەپەراند، ئەمەش لەبەر هاندانەكانی عمر بوو بۆی.[٢]

عمر پشكنەری دەنارد بۆ هەرێمەكان تا هەواڵی وردی بۆ بهێننەوە،(٣)پشكنەری نارد بـۆ خوراسـان، تـا دابنیـشن وسـەیری سـتەم وناهـەقی یـەكان بكـەن لـە ئـیش پێكردنی یاسای (خراج)دا كە(عدی) كوڕی(ارطاة) بڕیاری لەسەر دابوو.

هەروەها پشكنەرێكشی ڕەوانـەی عـیراق كـرد تـا هـەواڵی والی و میللەتەكـەی بـۆ بهێنێتەوە.[٣]

---

١ ـ الاثر العلماء فی الحیاة الساسیة لا ١٨٨ .
٢ ـ الطبقات (٣٤٧/٥) .
٣ـ عمر بن عبدالعزیز الزحیلی. لا ١٨٢ .

ئەو کارەی عمر دەیکرد لەبەدواداچوونی کاروبارەکانی دەوڵەت و هەڵس و کەوتی کاربەدەستان بەزاراوەی ئەبڕۆ ئەتوانین ناوی بنێین((چاودێری گشتی)) .

ئەوە بوو لەوەرزی حەجکردندا نامەی بۆ حاجیانی ماڵی خوا نووسی و ووتی:... من بەریم لەوستەم و ناڕەواییانەی کاربەدەستەکانتان لێتان دەکەن... دەی هیچ ستەم لێکراوێك ڕوخسەت وەرگرتنی ناوێت بێتە لام، من کۆمەك و پشتگیری هەموو چەوساوەیەکم، هەرکارمەندێ لەکارمەندەکانی من لەحەق لابدات وکاربە قورئان وفەرموودە نەکات بۆتان نی یە گوێرایەڵی کردنی .....

هەرکەسێك هەواڵێکم بۆ بهێنێ کە خوا بەهۆی ئەو کارەی ئەوەوە ئیش و کارەکان چاك بکاتەوە۔ لەنێوان(١٠٠) دینار تا(٣٠٠) دیناری پێ خەڵات دەکەین، بەپێ ی نیەت پاکی گەورەیی کارەکەی.[١]

ئەوەتا لەگەورەترین کۆنگرەی ئیسلامیدا ئەمە ڕادەگەیەنێت، بەڵکو بەجۆرەهاندانی دەروونی و مادی چاودێری جێ بەجێ کردنی دەکات، چاودێری کاربەدەستەکانیشی دەکات، بەئاشکرا هانی خەڵکی دەدات بۆ مانگرتن و _عصیان المدنی _ ئەگەر کارەکانیان لەسەر بنەمای قورئان و سوننەت بەڕێوە نەبەن، شتێکی ئاسایشە ئەگەر دەوڵەتانی ئیسلامی دەست بەقورئان و سوننەتەوە بگرن پێویستیان بەبەرنامەو پرۆگرامی تر نی یە، لەکاتێدا کە دەست گرتن بەودوانەوە ئامانجی دەسنیشان کراوە بۆ موسڵمان.[٢]

## چوارەم: نەخشە دانان لەسیاسەتی ئیداری عمردا

نەخشە دانان یان پلان دانان بەمانایەکی گشتی واتە: کردارێکە بۆ دابین کردنی پێویستی یەکانی دوارۆژ، دیاری کردنی هۆکاری هێنانەکایەی.[٣]

---

١ ـ عمر بن عبدالعزیز (ابن الجوزی) لا ٩٠ .

٢ـ النموذج الاداری المستخلص من سیرة عمر بن عبدالعزیز لا ٤١٣ .

٣ ـ الأدارة، المنیف لا ١٤٧ .

کەواتە دەتوانین بڵێین: پلاندانان لەئیسلامدا واتە: ئامادەسازی مرۆڤ بۆ پێش هاتەکانی داهاتوو، واتە ئێستا باسی چەند ساڵێکی تر بکرێت و کارەکانی دیاری بکرێت.[١]

عمری کوڕی عبدالعزیز ﷬ هیچ بڕیارێکی دەرنەکردووە بەبێ ڕەچاوکردنی دوارۆژو دانانی پلانی گونجاو بۆی و، پێشچاوخستنی پێشهاتەکان، باشترین بەڵگەیش لەسەر عەقل و ژیری و وردی عمر لەووتەیەیدا دەر دەکەوێت کەبە- رجاء ی ووت:( أن لي عقلاً أخاف أن يعذبني الله عليه ) واتە: ئەی ڕەجا، من عەقڵێکی گەورەم پێ دراوە زۆر دەترسم خوای گەورە سزام بدات لەسەری.

عمر دوای ئەوەی کەپشتی بەخوا دەبەست، لەدوای ئەوە پشتی بەکۆکرنەوەی زانیاری وزیرەکی ولێهاتووی خۆی لەخوێندنەوە وهەڵسەنگاندنی ئەو زانیارانەی کەدەگەیشتنە بەر دەستی، نەخشەی دوارۆژی لەسەر دەکێشان ولەوبارەیەوە دەڵێت: هەرکەسێ بەبێ زانیاری و شارەزایی کارێك ئەنجام بدات ، ئەوە لەباتی ئەوەی چاکی بکات کارەکان خراپ دەکات.[٢]

عمری کوڕی عبدالعزیز لەکارو پلان دانانەکانیدا ئامانجەکانی دیاری دەکرد و سیاسەتی کاری هەڵدەبژارد، ئەو کارو کردەوانەی دیاری دەکرد کەدەیگەیەنێت بەوئامانجە، لەناوئەو ئاکامەیدا ئاکامێکی زاڵ و مەزن هەبوو، ئەویش، هێنانەکایەی چاکسازی ونوێخوازی راشدین لەسەر پرۆگرامی پێغەمبەری خواو چوار خەلیفە راشدەکەی دوای خۆی.

بەرپاکردنی هەموو ئەو کارانەی دەیگەیەنێتە ئەو ئامانجە بەرزە وەك: بەرپاکردنی هەق وداد پەروەری ولابردنی ستەم و هێنانەوەی پێکەوە ژیانی نێوان مرۆڤ ونێوان بوونەوەرو ژیان وپەروەردگارەکەی، ئەمەش لەچوار چێوەی تێگەیشتنی گشتی لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

---

١ ـ عمر بن عبدالعزيز ابن الجوزي لا ٢٦٦ .

٢ ـ عمر بن عبدالعزيز ابن الجوزي لا ٣٥٠ .

هەروەها دیاری کردنی سیاسەتی کار یەکێك بووە لەبنەماکانی پلاندانانی، ئەمەش لەڕێگای جێبەجێ کردنەکانی عمرەوە دەردەکەوێت بۆ پلاندانانی ئیداری.

بەڵگەی گەورەیش لەسەر نەخشە دانانی عمر لەژیانی کاری داهاتوویدا، دووپات کرنەوەی ئەوەی کەتەنها دەست بەقورئان وسوننەتەوە بگیرێت، هەرگیز ئامادە نەبووە بۆ کاری دەمەقالە لەسەر مەسەلەکانی شەریعەت و ئاین دا، بەبێ ئەوەی کەئەو جێ بەجێ کاری شەرعی خوا بووە وشەرعیش لەسەرووی خۆی و میللەتیشەوە دەبێت لەجێ بەجێ کردندا، بۆیە بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم پلانەی لەسەر میللەتی پێویست کردبوو کە دەست بگرن بە شەریعەتی بەرزی ئیسلامەوە.

لایەنی کارکردنیش بەبنەماکانی ئەو پلانانەیەوە هەر لەیەکەمین ڕۆژی دەست بەکاربوونی خەلافەتی وە وبەئاشکرا ڕای گەیاند کەکێ بۆی هەیە هاوری تیمان بکات وکێ بۆی نی یە، کە پێشتر باسمان کردووە.

شێوازی کارکردن بۆ هاتنەکایەی ئەو ئامانجانەی کەنەخشەی بۆ کێشابوون، لەسەرەتای کاریەوە ڕای گەیاند کەئەو جێ بەجێ کاری ڕینموونی یەکانی ئیسلامەو شوێن کەوتەیە نەك داهێنەرو دەست کاری کەری ئاین _المبتدع _ وگوێڕایەڵیش بۆ کەسێکە گوێ ڕایەڵی خوابێت، بنەمای کاریش دەبێت لەسەر بناغەی کارکردن بەدادپەروەری وچاکسازی وچاکەکاریوبەدەر لەستەم و دەستدرێژی وڕەوشت نزمی.[1]

نەخشەکێشان وپلان دانانەی عمر گشتگیری بوو، هەموو بوارەکانی ژیانی گرتبوویەوە ولایەنێك نەمابوو نەیگرێتەوە، چ لەبواری سیاسەت ودادگاو حوکمڕانی وئابووری وپەروەردەو زانست و لایەنە کۆمەڵایەتی یەکان.

هەروەك گرنگی تایبەتی دەدا بەهەندێ لەهەرێمەکانی وەك خوراسان وعیراق بەشێوەیەکی جیا لەهەرێمەکانی تر، گرنگی دەدا بەدەزگا ڕێکخراویەکانی وەك: دادگا، (بیت المال)و بەرپرسانی خەراج، ولایەنی تریش.[2]

---

١ ـ عمر بن عبدالعزیز لا ٣٥، ٣٦، ١٠٢ .

٢ ـ النموذج الاداری المستخلص من سیرة عمر بن عبدالعزیز لا ٤٠٠ .

## پێنجەم: ڕێکخستن لە ئیدارەی عمردا

ڕێکخستن هەمیشە بەدوای پلان داناندا دێت وتەواوکەری یەتی بۆ بەرپاکردنی ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی جێ بەجێ کردنی ئەو پلانانە، عمری کوڕی عبدالعزیز ڕێکخستنی دانابوو بەگرنگترین کارە لەپێشەکانی ئیدارەکەی بەجێگیرکردنی زاراوەی ڕێکخستن لەشێوازی ئیدارەکەیدا.

هەیکەلی ڕێکخستنی کاری بەم جۆرە بوو، کەدەبینین ئیش وکاری دەوڵەتی کردبوو بەچوار بەشی سەرەکی یەوە، ئەو چواربەشەیش لەژێرچوار ئەرکاندان کەئەمانەن، القاضی، خاوەنی (بیت المال) خەلیفە.[١]

ئەمەو کۆمەڵێك دەزگای تریش وەك:خەراج، سەربازی، نووسەر، پۆلیس، پاسەوان، وخاوەنی مۆر، دەرگاوان.

ئەمەش هەیکەلی ئیداری حکومەتەکەی عمری کوڕی عبدالعزیزە لەخوارەوە:[٢]

سەرۆکی دەوڵەت (خەلیفە عمری کوڕی عبدالعزین)




ڕێکخستنی لەلایەنی ئەوەی کەنێوان خەلیفە و والی یەکان لەلایەك و نێوان خەلیفە وگەلی موسڵمان لەلایەکی ترەوە ونێوان والی و ئەمیرەکان وگەل و ژێردەستەکانیانەوە، لەحکومەتی عمری کوڕی عبدالعزیز کۆمەڵێ ڕێ وشوێنی گونجاو گیرایە بەر ودەتوانین بڵێین: زۆربەی نامەکانی عمر بۆ کاربەدەستەکانی بۆ

١ ـ النمذج الاداری لا ٤٠١ .
٢ ـ هەمان سەرچاوە.

هێنانەدی ئەم ئامانجە بووەو ولایەنی ڕێکخستن لەکرداری ئیداریدا پێوە دیار بووە.

بۆ نموونە: شێوازی هەڵس وکەوت کردنی ڕوون دەکردەوە لەنێوان والی و نێوان ستەم لێکراواندا وشێوازی پەیوەندی ئەو دوو نێوانە، کەبەجۆرێك بریاری دەرکردبوو کەستەم لێکراوان دەتوانن بێ پرس بێنە ژوورەوە بۆ لای خەلیفەو والی یەکان.

هەر لەشێوازەکانی ڕێکخستن: گەڕانەوەی زۆرێك لەکارو مەسەلەکان بۆ شێوازی سروشتی خۆی لەسەردەمی پێغەمبەری خواﷺوخەلیفە ڕاشیدەکاندا، بۆ نموونە: زەویە کشت وکالی یەکانی خۆی لەخەیبەر گێڕایەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا ، بەهەمان شێوەیشی کرد لەگەڵ زەوی (فەدەك) دا.

نامەی نووسی بۆ (ابوبکر)ی کوڕی (حزم) کەوالی مەدینە بوو لەوکاتەدا وپێی ووت: من لەکاروباری (فەدەك) ورد بوومەتەوە، سەیری دەکەم بەم جۆرە باش نی یە، بەڵکو وادەبینم بیگێڕمەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خواﷺ ابوبکر وعمر و عثمان،بەرپرسێکی بەسەرەوە دابنی بەروبوومەکەی کۆبکاتەوە بەشێوەی ڕاست و دروست وبیخاتە(بیت المال)ەوە والسلام علیك.[1]

هەروەك چۆن نامەی دەنووسی بۆ هەموو کاربەدەست و والی وئەمیرەکانی و شێوازی کاروباری دارایی بۆ ڕوون دەکردنەوە سەرلە کۆکردنەوەی زەکات و خێرات و٥/ ١ی غەنیمەو ڕێکخستنی کاروباری بازرگانی و دیاری کردنی ئەو کەسانە بۆیان نی یە کاروباری بازرگانی ئەنجام بدەن.[2] وشتانی تریش .

هەروەك کاروباری دادگاو دادوەریەکانی ڕێك دەخستن وگرنگی گەورەی پێدەدان، چونکە هۆیەکی گەورەبوون بۆ کوژاندنەوەی زۆرێك لەناکۆکی یەکان و گەڕاندنەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان، بۆ هەموو هەرێمێك قازی یەکی تایبەتی دانابوو لەسەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەتدا ناکۆکی یەکان نەهێڵێت، هەموو قازی یەکانی لەهەموو وڵاتەکاندا لەپیاو چاکترین وزانا ترین کەس لەو وڵاتەدا هەڵدەبژارد،

١ ـ سیره عمر بن عبدالعزیز( لا بن الجوزی) ل ١٣١.

٢ ـ سیره عمر (ابن عبدالحکم) ل (٧٨ـ ٨٣) .

وەك(عامر)ی کوڕی (شرحبیل) الشعبی لەکوفە، (حارث)ی کوڕی (یجمد الاشعری) لە موصل و(عمری) کوڕی (سلیمان المحاربی) لەدیمشق و کەسانی تریش .[١]

تەنانەت عمر خۆیشی رحمه الله دادەبەزیە ناو کاروباری دادوەری، ئەوەی زۆر بنەڕەتی بوو لەکاروباری رێکخستنی دادگا ودادوەریدا لەلای عمری کوڕی عبدالعزیز ئەوە بوو کەزۆر پیاچوو نەوەی هەق بکرێت، چونکە گەڕانەوە بۆ هەق زۆر باشترە لەبەردەوام بوون لەناو ناڕەوایی دا .

کاتێ خەڵکی سەمەرقەند سکاڵای (قتیبە)ی کوڕی (مسلم)، یان برد بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز وئەویش _ وەك پێشتر باسمان کردووە_ قازیەکی تایبەت کرد بۆ ڕەوانەوەی ئەو ناکۆکی یەی نێوان قتیبە وخەڵکی سەمەرقەند .

لەم بەسەر هاتەیشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەعمررحمه الله بۆی دەرکەوتبوو کەخەڵکی سەمەرقەند لەسەر هەقن وسەرکردەی سوپای ئیسلام فێڵی لێ کردوون، کارەکەیشی نەدایە دەستی کاربەدەستەکەی خۆی لەسەمەرقەندکە (سلیمان)ی کوڕی (ابی السری)بوو لەترسی ئەوەی نەوەك هەواو ئارەزوو وای لێ بکات لەهەق لابدات وپشتی سوپای ئیسلام بگرێت،

بەڵکو فەرمانی دا قازی یەکی تایبەتی ئەو کێشەیە یەکلایی بکاتەوە، چونکە قازی هیچ گوێ بەمەسەلەی سیاسی وسەربازی نادات لە بەرنامەی خوا لانادات و شەرع چی بڵێت جێ بەجێ ی دەکات، دەی هەروایش بوو مەسەلەکەی لەبەرژەوەندی خەڵکی سەمەرقەند کۆتایی پێ هێنا وحوکمی دەرکرد کەسوپای ئیسلام بگەڕێتەوە شوێنەکانی خۆی لەپێش گرتنی شارەکەدا، بە بەڵگەی ئەوەی بردنەوەی جەنگەکە بەڕێگایەکی ناڕەوا بووە.[٢]

هەروەك ڕێکخستنی کاروباری خەلیفەو دیوانی خەلافەتیشی گرتەوەو خۆی پیشانی میللەت دایەوە وەك کەسێکی ئاسایی موسڵمانان وئەوهەموو پاسەوان و

---

١ ـ عمر بن عبدالعزیز وسیاسته فی رد المظالم لا( ٢٨٤ ـ٢٨٥) .

٢ ـ نظام الحکم فی الشریعه الاسلامیه والتاریخ الاسلامی(٤٠٧/١) .

کەژاوەو ئەسپسوارانەی بڕیاربوو بەدوای خەلیفەوە بن، لایبردن وهەمووی خستەوە (بیت المال). وهەندێ کاروباری سەرۆکی پۆلیسی لابرد کەجاران لەپێشی خەلیفەوە بەشمشێرێکەوە دەڕۆیشت وەك عادەتی خەلیفەکانی پێشوو، عمر پێ ی ووت: دەبڕۆ ئەو لاوە ئیشم بەتۆنی یە؟! من تەنها کەسێکی ئاسایی ناوموسڵمانانم، پاشان خۆی دەڕۆیشت وخەڵکیش بەدوایدا.[١]

## شەشەم: خۆپاراستن لەگەندەڵی ئیداری

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی وولاتی ئیسلام سەلامەت بێت لەگەندەڵی ئیداری، گرتنەبەری ئەو هۆکارانەی کەناهێڵن ڕووبدات، داخستنی بەنچەرەکان بەڕووی ژەهرە ئیداری یەکاندا، وەك: ناپاکی، درۆ، بەرتیل، دیاری و خەڵات ناردن بۆ بەرپرسان وفەرماندەکان، خەریك بوونی فەمانڕەواو ئەمیرەکان بەکاری بازرگانی یەوە، زیادە مەسروف، موڵەت نەدانی ئەمیرو کاربەدەستان بەجەماوەر کەبچنەلایان وحاڵی خۆیانیان تێ بگەیەنن، زوڵم وستەم کردن لەمیللەت، ئەمەو چەندان شتی تریش .

فەرموو لەگەڵ چەند هەنگاوێکی گرنگی عمر بۆ ڕێ گرتن لەگەندەڵی ئیداری:

١- زیادکردنی مووچەی کاربەدەست وفەرمانبەران :

یەکەم کاری عمر کردی بۆ ڕێ گرتن لەدزی وناپاکی کارمەندانی دەوڵەت، زیادەکردنی مووچەکانیان بوو، لەگەڵ ئەو ژیانە زبرو هەژاری یەداکەخۆی وماڵ و منداڵی خۆی تێدابوو، بەم کارەی ویستی وەزعی ئابوورییان باش بکات وناچاری ناپاکی کردن نەبن.

مووچەی فەرمانبەرەکانی بەجۆرێ بەرزکردەوە کەهەیان بوو لەمانگێکدا(١٠٠) دینار وهەشیان بوو (٢٠٠)دیناری وەردەگرت.[٢]

---

١ ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز (ابن الجوزي) لا ٦٥ .

٢ ـ مەبەست (١٠٠) دیناری ئاڵتوونە .

عمر پاساوی ئەم کارەی بەوەدەدا کەبەم کارە ئیتر خۆیان یەکلایی دەکەنەوە بۆ کاروباری موسڵمانان، پێیان ووت: دەی ئەوەی دەیدەین بەفەرمانبەرەکانت، بیشیدە بەماڵ و منداڵەکەی خۆت؟ لەوەلامیان دا دەیووت: مافی خۆیان زەوت ناکەم ومافی خەڵکانی تریشیان پێ نادەم، بەوشێوەیە ماڵ و منداڵەکەی خۆی لەوەزعێکی ئابوری نارەحەتتدا دەژیان، دەیووت ماڵ و منداڵی خۆم قەیناکا، بەلام کەس و کارەکەم کاتی خۆی پارەی باشیان بۆ خۆیان داناوە.[1]

بەم کارەیشی دوو ئامانجی پێکا:

یەکەم: داخستنی دەرگاکانی خیانەت وناپاکی، چونکە نەبوونی دەبێتە هۆی بیرکردنەوە لەدزی وناپاکی لەپارەو پوولی موسڵمانان.

دووەم:فەرماندەوفەرمانبەرەکان پێویستیان بەکارو کاسبی وبازرگانی نامینێ و خۆیان بۆ کاری موسڵمانان یەکلایی دەکەنەوە .

٢- کاربەدەستانی لەدرۆ کردن پاراستووە:

(میمون)ی کوڕی (مهران)دەڵێت: چوم بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز ولەوکاتەدا کاربەدەستەکەی کوفە لەوێ بوو، دەبینم زۆر لێ ی توڕەیە، منیش ووتم: چی کردووە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ عمر ووتی: هەواڵم پێ گەیشتووە کە ووتویەتی هەرکەسێ شایەتی درۆ بدات زمانی دەبڕم!

منیش ووتم دەی شتی واناکات ئەی ئەمیری باوەڕداران، دەڵێ عمر ووتی: سەیری ئەم پیاوە ناکەن_مەبەستی(میمون)بوو، قسەی ئەو پیاوە دوو مانای خراب هەڵدەگرێت، کە باشترینیان ئەوەیە درۆ دەکات دەی ئەوەدوورپووی زۆر خرابن.[2]

مەبەست ئەوەیە کە درۆکردن ڕوویەکی پڕ لەگوناهو خراپەیە، بەم کارەیش عمر ویستوویەتی کلکی گەندەڵی ئیداری لەبنا ببڕێت وئاگاداری کاربەدەستەکانی

---

١ ـ البدایە والنهایە لە (النموذج الاداری) لا (٣١٥) وەرگیراوە .
٢ ـ سیرە عمر (لابن الجوزی) لا ١٣٤ .

کردۆتەوە، کەبە هیچ جۆرێك فێڵ و درۆ ودەلەسە لەمیللەت نەکەن لەدەرکردنی بڕیارەکاندا.[١]

٣- ڕێگرتن لەوەرگرتنی دیاری وبەخشیش:

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله نەیهێشتووە نەخۆی و نەبچوکترین، تا گەورەترین کارمەندی دەوڵەتەکەی دیاری لەخەڵکی وەربگرن، لەوەڵامی ئەو پرسیارەشدا کەپێیان ووتبوو: دەی ئایا پێغەمبەری خواوچوارخەلیفەکەی دیاریان وەرنەگرتووە ؟ لەوەڵامدا ووتبووی: بەڵێ، بەڵام بۆ ئێمە مانان وکەسانی دوای ئێمەیش بەرتیل وەرگرتنە.[٢]

هەروەها هەموو ئەو شێوازە نادروستانەی لابرد کە ئەمیرو والی یە ئەمەویەکان دیاریان لەخەڵکی وەردەگرت، بۆ نموونە دیاری (جەژنی نەورۆز)و(میهرەجان) کەجەژن وبۆنەی فارسەکان بوون، عمر بەنامەی ڕەسمی ئەو ڕێ و ڕەسمەی قەدەغەکرد و بەگوناە وتاوان و حەرام ناوی برد .[٣]

هەرشەو ئاگاداریشی دا بەهەر کاربەدەستێکی خۆی کەبەدەم داواکاری خەلیفەیان هەر خزمێکی تری یەوە بێن و لەماڵی موسڵمانانیان بۆ بنێرن .

بۆنموونە: کاتێك (فاطمە)ی کچی (عبدالملك) جوابی ناردبوو بۆ والی _(ابن معدی کرب) وداوای لێ کردبوو کەهەندێ لەهەنگوینی شاخی لوبنانمان بۆ بنێرەو ئەویش خێرا داواکاریەکەی جێ بەجێ بوو، هەنگوینی بۆ ناردبوو، کاتێ عمر هەواڵەکەی بیست نامەی بۆ والی یەکەی نووسی وپێ ی ووت: سوێند بەخوا، جارێکی تر شتی وا دووبارە بکەیتەوە، هەرگیز هیچ کارێکت نادەمە دەست وناشمەوێت بتبینم .[٤]

٤- ڕێگرتن لەزیادە مەسروف ـ الاسراف ـ :

عمر رحمه الله کۆمەڵێ بڕیارو ئاراستەی دەرکرد بەمەبەستی ڕێگرتن لەبەفیڕۆدانی

---

١ ـ النموذج الاداری لا ٣١٦ .
٢ ـ سیره عمر (ابن الجوزی) لا ١٨٩ .
٣ ـ سیره عمر(ابن عبدالحکم )لا ١٣٦ .
٤ - المعرفه والتأریخ للنسوی (٥٨٠/١) .

سامانی موسڵمانان، یەكەم كارێ پێ ی هەستا لەپاش دەست بەكاربوونی خەلافەتی، هەموو ئەو ئیسراف وزیادەڕەویانەی لابرد كە بۆ خەلیفە ئامادەكرابوون، كەكۆمەڵێ ولاخ هێنران بۆلای ووتی ئەمەچی یە؟ ووتیان ئەم ولاخانە كەس سواریان نەبوون وتەنها خەلیفە سواریان دەبێت وبەس، عمریش وازی لێ هێنان چووە دەرەوەو بەدوای ئێسترەكەیدا دەگەڕا، بە_مزاحم_ ی ووت: هەموویان بخەرەوە (بيت المال)ی موسڵمانان.

هەندێ چادرو ژوری جوانیان ئامادەكردبوو كەهەموویان چۆڵ بوون وئامادەكرابوون بۆ خەلیفەی نوێ. و ووتی: _مزاحم_ هەرهەموویان بخەرە ناو (بيت المال)ەوە .

پاشان سواری ئێسترەكەی خۆی بوو، ڕۆیشت بۆلای قاڵی وفەرشە جوان و ڕازاوەكان كە كەس لەسەری دانە نیشتبوو بۆخەلیفەی دا هاتوو ئامادەكرابوون و بەقاچ كۆی كردنەوە تا حەسیرەكانی ژێری دەركەوتن و ووتی: _مزاحم_ ئەم حەسیرانەمان بەسە هەموو ئەو فەرش و قاڵی یانە بخەرە (بيت المال).[1]

هەر بۆ دژایەتی كردنی زیادەڕەوی وماڵی (بيت المال) بەفیڕۆدان، (میمون)ی كوڕی (مهران)ی بینی سەیری لیستی ناوی خەڵكیان دەكرد، پێ ی ووت: ئەم تۆمارانە چین؟ كەبە خەتی گەورە ودورو درێژ نووسراون كەهەمووی زیانە و لە(بيت المال)ی موسڵمانان دەكەوێت؟ بۆ ئەو مەبەستانەی نووسی بۆ هەموو كاربەدەستەكانی وپێ ی ڕاگەیاندن كە: تۆماری پان و گەورە بەكار نەهێنن و زۆر بەگەورەیی نەنووسن، نامەكانی عمرﷺ لەبستێك تێنەپەڕیووە.[2]

پێشتر باسی ئەوەمان كرد كەچۆن دەربارەی مۆم وچراكانی مەدینە نامەی بۆ والی شاری مەدینە نووسی وتێ ی گەیاند كەتۆ جاران بەتاریكایی شەو دەچوویت بۆ مزگەوت، بۆ مەسەلەی نووسینەكانیش پێ ی ووت: ئەگەر نامەكەمت پێ گەیشت بانووكی قەڵەمەكەت تیژبكەو ورد بنووسە ودێر مەپەڕێنەوە لە یەك لاپەڕەدا شتی

---

١ ـ سيره عمر (ابن عبدالحكم )لا ٣٣ .

٢ـ سيره عمر، ابن الجوزي لا ٨٨ .

زۆر بنووسە، چونکە نووسینی دوورو درێژ سودی بۆ موسڵمانان نی یە بەڵکو زیانیش لە (بیت المال)ەکە شیان دەدات، والسلام علیك.[١]

٥- نەیهێشتووەوە کاربەدەستانی بازرگانی بکەن:

لەیەکێ لەنامەکانیدا بۆ کاربەدەستێکی ناردبوو نووسی: وادەبینین کەپێشەوایان نابێ بازرگانی بکەن، هەروەك بۆ کاربەدەستان نی یە خۆیان بەکاسبی وبازرگانی یەوە خەریك بکەن لەکاتی دەوام و دەستەڵاتیاندا، چونکە ئەگەر ئەمیر کاسبی بکات کۆمەڵێ گاریگەری دێنەرێگای و هەندێ شتی توش دەبێت کەناڕەحەتن وباش وایە نەیکات.[٢]

ئەم بڕیارەی عمر لەبەر ئەوە بوو کەباش تێگەیشتبوو کەئەگەر کاربەدەست وبەرپرسەکان کاسبی وبازرگانی بکەن لەدوو شت دەرباز نابن:

+ یان ئەوەیە بەکاروکاسبیەکانەوە خەریك دەبن و پشت لەئیش و کاری موسڵمانان دەکەن وبۆیان ناکرێت.

+ یان ئەوەیە لەبەر پلەو پایەو مەقامە سیاسی یەکەی خەڵکی زیاتر نەرمی لەگەڵدا دەنوێنن وهەندێ شتی پێ دەدەن وبۆ دەکەن کەمافی خۆی نی یە ئیتر یان لەترساندا یان بە تەماحێکەوە .

لەبەر ئەم هۆیانە عمر ویستوویەتی دەرگایەك ی ترسناك دابخات کەسەر دەکێشێ بۆ گەندەڵی ئیداری و ئاکامەکەی باش نابێت .[٣]

لەدوای هەشت سەدەبەسەر کۆچی دوایی عمری کوڕی عبدالعزیزدا، نووسەر و زانایەکی وەك (ابن خلدون) دێت ولە(مقدمە) مەزنەکەیدا ئەم ڕاستی یە دووپات دەکاتەوەو زانایی و زیرەکی وڕاست بێژی عمر دەسەلمێنێت و دەڵێت: فەرمانڕەوایان بازرگانی بکەن زیان بەمیللەت دەگەیەنن وئیش وکارەکانیان بەئاستەم بۆ دەچێت بەڕێوە .[٤]

---

١ ـ سیره عمر، ابن عبدالحکم لا ٥٥.

٢ ـ سیره عمر، ابن عبدالحکم لا ٨٣.

٣ – النموذج الاداری لا ٣٢٠.

٤ ـ مقدمه ابن خلدون (له) رجال الفکر والدعوه ی الندوی وقرطیراوة لا(٤٦/١) .

٦-کردنەوەی پردی پەیوەندی نێوان حوکمڕایان و میللەت :

ئەو پاسەوانانەی کەبە چوار دەوری خەلیفەکانی پێش عمردا بوون، نەیان دەهێشت، بەئاسانی خەڵکانی سادە، یان ستەم لێکراوان بگەنە لای و رازی دڵی خۆیانی بۆ بدرکێنن، وەك دیوارێکی پۆڵاین وابوون لەنێوان میللەت و خەلیفەدا و کەس بۆی نەبوو بێتە لای خەلیفە مەگەر کەسێك خۆیان پێیان خۆش بووبێت و، لەگەڵ بەرژەوەنیاندا بگونجایە.

بەڵام عمر بەپێچەوانەی ئەوانەی پێش خۆیەوەو دەرگای خستە سەرپشت بۆ هەر یەکێك بیەوێت خەلیفە ببینێت، نەك هەر ئەوە بەڵکو دیاری و بەخششی گەورە گەورەیشی دانا بوو بۆ هەر کەسێك هەواڵی ستەم لێکراوێکی بۆ بهێنێت، یان لەمەسەلەیەك دا._ ڕاوێژی پێ بکەن کە بەرژەوەندی موسڵمانان ودەوڵەتە کەیانی تێدابێت.

بۆ ئەو مەبەستە نامەی نووسی بۆ وەرزی حەج ولەوێ بۆ هەموو حاجیانی دنیایان خوێندەوە کەدەیووت پێیان: (هەرکەسێ سکاڵای ستەم لێکراوێکمان بۆ بهێنێ یان قسەیەکی خێرامان بۆ بکات کە بەرژەوەندی تایبەتی، یان گشتی ئیش و کاری موسڵمانانی تێدابێت، ئەوە لە(١٠٠)دینارەوە تا(٣٠٠)دیناری پێ دەبەخشین کەبەپێ ی نیەتی خۆی ودووری ڕێگاکەی بێت، ئەمەش بەهیوای ئەوەی مافێك زیندوبکاتەوە یان نارەوایی یەك نەهێڵێت، یان هەرچاکەیەکی تێدابێت).[١]

هەروەها فەرمانی بەکاربەدەست و والی یەکانی دەدا کەپردی پەیوەندی دروست بکەن لەنێوان خۆیان ومیللەتەکەیاندا، گوێیان بۆ بگرن ولەحاڵ و وەزعیان ئاگادار بن، ئەوەش دەبێتەهۆی نەمانی زوڵم وستەم ودەست درێژی کردنە سەمافەکانی خەڵکی، ڕێگە خۆش دەبێت بۆ هەموو تاکێك کەچی دەوێت بیڵێت، بەبێ ئەوەی پەنا ببرێت بۆ هۆ کارگەلێك کەهیچ پەیوەندیەکیان بەئیسلامەوە نی یە.[٢]

---

١ ـ رجال الفكر والدعوه (١/٤٧) .

٢ ـ النموذج الاداری لا ٣٠٢ .

٧-لێپرسینەوەی کاربەدەستەکان لەبواری داراییدا :

(سەرکردەو فەرمانڕەوایان کەخۆیان دەست پاك بوون ودوربوون لەدزی و پارەخواردن، ئیتر ئەوە بەس نی یە و دەبێت چاودێری وردی خواری خۆیان بکەن ولەڕاستی ئەو وەسڵ و مەسروفانەی دەیکەن بکۆڵنەوە بەوردی، پاشان شەرم لەکەس نەکەن ولێپرسینەوەی توندیان هەبێت لەگەڵ ئەو کاربەدەستانەدا کەشتیان لەسەرەو دزی وناپاکیان لێ دەرکەوتووە).[١]

ئەوەتا هەرکە عمری کوڕی عبدالعزیز دەبێت بەخەلیفە، یەکەمین کاری ئەوە بوو، والی ولاتی خۆراسانی بانگ کردو بەندی زیندانی کرد کەناوی (یزید)ی کوڕی (ملهب)بوو، هێنایە بەردەستی ولێ ی پرسینەوەی لەگەڵ کرد دەربارەی ئەوموڵك و سامانەی کەدەسی کەوتبوون ولەنامەدا بۆ (سلیمان)ی کوڕی عبدالملك نارد و ئاگاداری کرد وەبەلام پارەکانی نەهێنابوو.

(یزید)یش ووتی: تۆ خۆت دەزانیت من زۆر نزیك وخۆشەویست بووم لەلای (سلیمان)، ئەو نامەیەشم بۆیە بۆ نووسی تا بۆ خەڵکی بخوێنیتەوە، خۆت دەزانیت(سلیمان) داوای هیچ پارەیەکی نەکردووە کەلەنامەکاندا ئاماژەیان پێ کرابێت، یان فەرمانی بەشتێ نەداوە کەمن پێم ناخۆش بێت.

عمریش پێ ی ووت: من هیچ چارەیەکی ترم نی یە جگە لەوە نەبێت بتکەمە زیندانەوە، لەخوابترسە چیت لەلایە بیگێڕەرەوە، چونکە ئەوە سامانی موسڵمانانە وناتوانم چاویان لێ دابخەم، گەڕاندیەوە بۆ زیندان، لەزیندان مایەوە تا ئەو ساتەی عمر نەخۆش کەوت.[٢]

عمرزۆربەی کاتەکانی لەدورەوە چاودێری وردی کاربەدەستەکانی خۆی دەکرد و هەواڵی دەسپاکی دەپرسین وئەگەر شتێکی لێ ببیستنایە کە بەدڵی نەبوایە بانگی دەکردن ولێپرسینەوەی لەگەڵ دەکردن ولەپاشاندا یان چاك دەبوون یان یەکجاری لەسەر کار لایدەبرن.

---

١- ووتەی وەرگێڕ .
٢ - التاريخ الطبری (٧/٤٦٠_ ٤٦١_ ٤٦٢) .

جارێك نامەیەك دەنووسێت بۆ یەكی لەكاربەدەستەكانی وەبڕگەیەكی زۆر جوانی پێ دەڵێت كەحەزم كرد بەعەرەبی یەكەی بیهێنمەوە، پێ ی دەڵێت:

((لقد كَثُرَ شاكوك، وقَلَّ شاكِروك، فاما عدلتَ، واما اعتزلت، والسلام)).[1] واتە: سكاڵا كارانت زۆربوون، سوپاس كارانت كەم بوون، یان دادپەروەر دەبیت، یان وازدێنیت لەئیش و كار، والسلام).

## حەوتەم: هەرێمەكان لەنێوان مەركەزی و لامەركەزی دا

(عمری كوڕی عبدالعزیز ﷺ كاری بۆ ئەوە كرد كەهاوسەنگی یەك دروست بكات لەنێوان فدراڵیەت و كۆنفدراڵی واتە: هەرهەرێمە وسەربە حكومەتی مەركەزی یە بەڵام جۆرە ئازادی یەكیشی پێ دەدرێت وبەشێوازێكی تر نەسەربەخۆیە بەتەواوی ونەژێردەستەیشە).[2]

هەندێ هەڵوێست گەلی عمر دەخەینە ڕوو كەئەم هاوسەنگی یە ڕوون بكاتەوە، ئەو فەرمانەی كەلەنامەكەیدا بۆ والی كوفەی ناردبوو ئەم مانایەی تێدا بەرجەستەبووە، تیایدا بەئاشكرا (مركزیة)و سەربە حكومەتی مەركەزی تێدا هاتووەو دەڵێت: (من تۆم كردووە بەوالی ئەوێ، بەودەستەڵاتەی خوا پێ ی داوم، پەلە نەكەیت لەكاری لەسێدارەدان و هەڵواسیندا، تا پێش وەخت من ئاگادارانەكەیت و ڕای من وەرنەگریت)[3]

عمر لەم مەسەلە گەورەوگرانەدا كە —كوشتن و لەناوبردنە_ وای بەباش زانیوە و بەبەرژەوەندی ئوممەتی ئیسلامی زانیوە كەسەربەخۆ خوێنی كەس نەڕژێت و پێش وەخت مەركەزی لێ ئاگادار بكرێتەوە، هیچیش لەحوكمەكە كەم نابێتەوەو دێر بێت یان زوو دەكوژرێت بەڵام پەلەنەكران وهێمنی نواندن وپیاچوونەوەی بڕیار سەرنجامەكەی بەرپابوونی دادپەروەری لەدوایە،[4]

---

١ ـ عمربن عبدالعزیز عبدالستار الشیخ لا ٢٧٥ .

٢ ـ ووتەی وەرگێڕ .

٣ ـ تاریخ الطبری (النموذج الاداری) لا ٢٢٢ وەرگیراوە .

٤ ـ ـ تاریخ الطبری (النموذج الاداری) لا ٢٢٣ وەرگیراوە.

کۆمەڵێ کاروباری تریش هەیە کەگەورەتر وترسناکترن، عمر ڕوونی کردۆتەوە بۆ کاربەدەستەکانی کەلەو کارانەدا دەبێت بگەڕێتەوە بۆلای خەلیفە و شێوازی مەرکەزی یەت جێ بەجێ بکەن، چونکە ئەوشتانە کۆمەڵە مەسەلەیەکی گەورە چارەنووسی سازن وهەموو ئوممەت دەگرێتەوە، قورئان و سوننەتیش باسیان لێوە نەکردووە،

بەڵام عمر لەڕێگەی بڕیارو ئاراستەکانی یەوە بۆ سەرۆکی هەرێمەکانی وڵاتی ئیسلام سیاسەتی خۆی لەوبارەیەوە بۆ ڕوون کردونە تەوە ووتویەتی:ـ

(.....ڕوداو وکەڵێکی گەورە هەیە کەلەم دواییانەدا ڕوودەدەن و پێشتر قورئان و سوننەت جێگیریان نەکردوون، نابێت هەر ئەمیر وبۆ خۆی بڕیاری تێدا بدات و دەبێت بیگەڕێنینەوە بۆلای خەلیفە وپاشان ملکەچی بڕیارەکەیشی بن).[1]

لەبوارێکی تریشدا کە کاری بەمەرکەزی یەت کردووە، ئەوەیە کەلە والی یەك زیاتری بۆ عیراق داناوە، هەروەك خوراسان وسجستان وعومانی والیّ کردووە کەڕاستەوخۆ سەر بەخەلیفەبن، هەروەك خۆی والی یەکی بۆ ئەندەلوس (أسپانیا) دیاری کردوە ئەمەش وەك زیادە گرنگی دانێك بەو دەڤەرەوە نەیخستۆتە سەر هەرێمی ئەفریقیا.[2]

ئەمەش مانای وایە عمر زۆر گرنگی داوە بەوەی، کە هەرێمەکان سەربە پایتەخت بن ومەرکەزی یەت ڕۆڵی گرنگی خۆی ببینێت.

ـ نموونەیش لەسەر ئەوەی کەکاریشی لەسەر سەربەخۆیی هەرێمەکان کردووە و (لامرکزیة)تی بەکارهێناوە لەوانە:

دەگێڕنەوە عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نووسیوە بۆ کاربەدەستی یەمەن(عروە)ی کوڕی (محمد)و پیّ ی ووت: (من وانامەت بۆ دەنووسم، فەرمانت پیّ

---

١ ـ سیرە عمر ابن عبدالحکم لا ٦٣ .

٢ ـ الاداری فی العصر الاموی. نجدة الخماش لا ١٠٧ .

دەکەم کەخۆت ستەم لەسەر موسڵمانان لابەرەو ناهەقی یەکان بگێڕەوە بۆ خاوەنەکانیان، مەسەلەکان هەموویان ئاراستەی من مەکەرەوە، تۆنازانیت چەند دووره ڕێگاکەی نێوان من وتۆ، نازانی ڕووداوی مردنیش چەند زۆره، تەنانەت ئەگەر منیش بۆت بنووسم کەبزنێکیش بەناهەق خورابوو، بیگێڕەوە بۆ خاوەنەکەی، تۆ نامەم بۆ دەنووسیتەوە کەئایا ڕەش بێت یان سپی؟!.

دەی لەکاروباری موسڵمانان بکۆڵەرەوە وخۆت مافەکان بۆ خاوەنەکانیان بگێڕەرەوەو بەرەو ڕووی منی مەکەرەوە).[1]

لەم بڕیارەوە ئەوپەڕی وردی دیوەجوانەکەی(مرکزیة)و(لامرکزیة) دەردەکەوێت و بەمەشدا دەردەکەوێت کە(لامرکزیة)لە بەرژەوەندی ئیسلام و ئوممەتەکەیەتی.[2]

هەڵوێستێکی تریش کەئەو پەڕی مانای ئازادی و فیدراڵیەت دەبەخشێت بەسەرجەم هەرێمەکانی وڵاتی پان و پۆری ئیسلام، ئەو نامەیەی عمر بوو بۆ والی شاری بەسرەی نارد(عدی)کوڕی (ارطاة)و پێ ی ووت:

پاشان...تۆ هەر بۆ هەموو شتێك لەسەر ماو گەرمادا پیاوێکی موسڵمان ماندوو دەکەیت ودەینێریت بۆ لام تا دەربارەی سوننەت پرسیارێکم لێ بکات، تۆبەم کارەت وەك بڵێ ی گەورەم دەکەیت، دەی سوێند بەخوا _حەسەنت بەسە_ واتە (حسن البصری) رَحِمَهُ اللهُ ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێ گەیشت بۆ من و بۆ خۆت و بۆ سەرجەم موسڵمانان پرسیار لە(حەسەن)بکە[3]

کەواتە لەم نامەیەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەکات کوشتن بەکۆمەڵی کیتابو مەسەلەی ڕۆتینی یەوە کاری والی یەکانە وەنابێت بۆ هەموو شتێك بگەڕێنەوە بۆ فەرمانی پایتەخت، بەڵکو دەبێت باوەڕیان بەخۆیان هەبێت وسوود لەزانست و زانیاری زانایانی نێو هەرێمەکە وەربگرن وپشت بەدادوەرو ژیرمەندەکانی ناوخۆیان ببەستن وهەق ودادپەروەری بەرپابکەن لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت وڕێڕەوی

---

١ - الطبقات (٣٨١/٥) .

٢ ـ النموذج الاداری لا ٣٢٤ .

٣ ـ هەمان سەرچاوە.

چوار یارە ڕاشیدەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ.[1]

هەروەها بەم نامەیەشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەهەموو هەرێمێکی ناو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئیسلام، دەبێت ڕێزی گەورە وگران دابنێن بۆ زاناو پێشەوایانی ئاینی وسود لەزانست وزانیاری وبۆچوونەکانیان وەربگرن و لەبەڕێوەبردنی وڵاتدا بەشداریان بکەن.

(نەك وەك ئەمڕۆ - هەموو وڵاتە ئیسلامی یەکان - هەوڵ دەدەن مامۆستاو مەلاکان بکەنە خۆیان و لەژێر ناوی یەکێتی زانایاندا کۆیان بکەنەوەو لەژێر گوشاردا بەچاوترسێنیان بکەن فەتوای حەڵاڵ کردنی هەرشتێك حوکمڕاکان پێیان خۆشە لێیان بپچڕن لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە دژایەتی کانیاوی ساف و زوڵاڵی ئیسلام وهەڵگرەکانیان لەسەر دەستەکانی یانی پێ بکەن وهەموو شتێکی بیدعە ودور لەسوننەتی پێغەمبەریان پێ زیندوو بکەنەوەو بە بەشداری پێنەکردنیان لەبڕیاری چارەنووسی سازیەکانی وڵاتدا مانای جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەتیان پێ ئەنجام دەدەن، دواتر یەك مامۆستا وپێشەوای ئاینی لەترسی بڕینی موچەکەی نەتوانێت ووتارێکی هەق بدات مەگەر وتارێك پیاوانی قەسر بۆی دابڕێژن وزیانی بۆ پەزەکان نەبێت).[2]

عمر رحمه الله لەکاری هاوسەنگی نێوان(مەرکەزیەت)و(لامەرکەزیەت)دا کۆمەڵێ پێوەری هەبوو لەوانە:

١- پێویست کردنی هەڵوێستەکان بە بەرژەوەندیەکی گشتی یان تایبەتی یەوە.

٢- دیاری کردنی ئەو کارە گرنگانەی کەهەرێمەکان ناتوانن سەربەخۆ ئەنجامیان بدەن بەڵکو دەبێت پایتەخت یەکلای بکاتەوە وەك کوشتن وهەڵواسین.

٣- هەندێ مەسەلە قورئان و سوننەت باسی نەکردووە، بەڵام قسەکردن تیایدا زۆر گرنگە.

---

١ ـ النموذج الاداری لا ٣٢٤ .

٢ ـ ووتەی وەرگێڕ .

٤- ڕەچاوکردنی دووری ماوەی نێوان خەلیفەو والی یەکان .
٥- ڕەچاوکردنی گرنگی کات و لەوانەیە زیانێکی گەورەی وەك مردن ڕووبدات.
٦- بوونی کەسانێك کەمتمانەیان هەبێت بەزانست وزانیاری و ژیرییان.
٧- کاری گەری زوو ئەنجام دانی کارەکان لەجێگەی خۆیاندا .
٨- ڕەچاوکردنی بەخشینی متمانە بەدادوەرەکان و والی وکاربەدەستەکان.[١]

لەژێر ڕۆشنایی ئەم پێوەرانەدا عمر توانی هاوسەنگی یەکی چاك وڕێك و پێك بخاتە نێوان(مرکزیة)و(لامرکزیة)و بەو کارە گرنگەیشی توانی بنەمایەکی چاك دابمەزرێنێت وپێشکەشی زانایانی بکات.لەبواری ئیدارەوبنەماکانی هەڵس و کەوت کردنی دروست لەگەڵ زمان وڕەگەزە جیاجیاکاندا لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی یەکگرتوودا.[٢]

(بەمەش دا دەردەکەوێت بۆ خوێنەری کورد کە ئەم فیدراڵیەتەی ئێستا ئەم بەشە کوردیەی کوردستانی عێراق تیایدا دەژی ئیسلام هێناویەتی وئیسلام سەدان سەدە پێش ئێستا دانی ناوە بەهەموو هەرێمەکانی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئیسلامدا و زمان ونەژادو جل و بەرگی تایبەتی خۆیانی پاراستووە وهەرلەخۆیان والی وسەرکردەی هەڵبژاردووە).[٣]

## هەشتەم: بنەمای نەرمی نواندن لەکاری ئیداری عمردا

عمری کوڕی عبدالعزیز ﷺ لەهەموو بوارەکانی تێگەیشتن وگفتوگۆ وفیکر و جێ بەجێ کردنی فەرمان و پابەندبوون پێوەیدا بنەمای نەرم ونیانی جێبەجێ کردووە.

(میمون)ی کوڕی (مهران) دەڵێت: (عبدالملك)ی کوڕی (عمری کوڕی عبدالعزین)بەباوکی ووت: باوکە گیان، بۆچی ئەوەی هەق و دادپەروەری یە جێ بەجێ ی ناکەیت؟سوێند بەخوا گرنگ نی یەلەلام من وتۆ لەمەنجەڵدا بکوڵێنن لەو پێناوەدا؟

---

١ ـ النموذج الاداری لا ٣٢٦.
٢ ـ هەمان سەرچاوە.
٣ ـ ووتەی وەرگێڕ.

لەوەلامدا عمر ووتی: کوڕی خۆم، من دەمەوێت خەڵکی لەسەر شتێکی زۆر ناڕەحەت ڕابهێنم، من نامەوێت هەموو ئەو شتانەی دادپەروەری تێدایە زیندوویان بکەمەوە، بەڵکو ئەوە دوا دەخەم بۆ کاتێك دنیا پەرستی لەدڵەکاندا دەردەهێنم، دێن بەدەم ئەمەوەو دڵخۆشیش دەبن بەمە)[1].

لەشوێنێکی تردا عمر دەڵێت: "خەڵکی نەهاتن بەدەممەوە لەکاری گەڕانەوەی مافەکان بۆ شوێنی خۆی، تاشتێکی دنیایم نەخستە بەردەستیان.[2]

عمر رحمه الله هەرلەسەرەتای وەرگرتنی خەلافەتەوە ئەوەی ڕاگەیاند کە هێنانەدی ئامانجەکان پێویست بەنواندنی هەندێك نەرمی نواندن _مرونة_ وچاوداخستن دەکات، مەسەلەکە بەوە سەرناگرێت کە(عبدالملك)ی کوڕی دەیووت گوایە لەوپێناوەدا ئامادەین هەردووکمان لەمەنجەڵدا بمانکوڵێنن وئیتر گوێ بەلایەنەکانی تر نەدرێت.[3]

ئەمەش هەڵوێستێکی تری عمرە کەووتو ووێژێکە لەنێوان خۆی وعبدالملك ی کوڕیدا ڕوویداوە: عبدالملك: ئەوە چۆن چاوەکانت دەچێتە خەو، کەهەندێ سکالای ماف خوراوان هاتۆتە بەر دەستت وهێشتا بەو جۆرەی خوا پێ ی خۆشە یەکلایت نەکردوونەتەوە؟

عمر: کوڕی خۆم، نەفسم وەکو وڵاخەکەم وایە، ئەگەر ڕەحمی پێ نەکەم نام گەیەنێتە جێگای مەبەست، ئەگەر خۆم و هاوکارەکانم ماندوبکەم ئەوەندەی پێ ناچێت منیش و ئەوانیش دەکەوین، من ئەوەندەی کاتە بەئاگا کانم بەتەمای پاداشتی خوام ئەوەندەش بەتەمای پاداشتم لەم کاتی خەوتنەم.

چونکە خوای گەورە ئەگەر بیویستایە قورئانی بەیەکجار دەنارد خوارەوە، ئەلام یەك ئایەت ودووئایەت دابەزیوەتە خوارەوە تا دڵەکان بەنوری باوەڕ هێمن

١ـ سیره عمر( ابن الجوزی) لا ٨٨ .

٢ـ هەمان سەرچاوە .

٣ ـ النموذج الاداری لا ٣٢٨ .

بوونەتــەوە کــوڕی خــۆم ئــەم کــارەی مــن دەســتم داوەتــیّ زۆر گــرنگ تــرە لــەلام لەبنەماڵەکەی تۆ_مەبەستی ئەمەوی یەکان بوو_ کەژمارەیان زیاترە ودەستەڵاتیان بەهێزترە وپێش ئەوانیش ئەوەیەکەوە دەیزانیت،

ئەگەر هەمووی لەیەك ڕۆژدا چارەسەربکەم دەترسم لێم هەڵبستن، بەڵام ماف لەیەك دووکەس دەسەنمەوە، هەواڵەکەیشی دەگاتە ئەوانی ترومەسەلەکە ئاسایی دەبێت لەلایان).[1]

لەم بەسەر هاتانەی پێشووەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەتا ئاستێکی بەرز عمری کوڕی عبدالعزیز خاوەنی فیقهو تێگەیشتنێکی قوڵ بووە لەبواری چاکسازی و نوێ خوازیدا ولە بەرنامەڕێژی کردندا بۆ نەمانی زوڵم و زۆرو حەرام خۆری و بڵاوبوونەوەی داد ویەکسانی.[2]

مەبەست لەو ووشەیەی کەووتی: (من ئەگەر خۆم و هاوکارانم ماندووبکەم، کەمێك ناخایەنێت منیش و ئەوانیش دەکەوینە زەوی).

عمر دەیەوێت بڵێت: ووزەی مرۆڤ دیاری کراوە وکاری بەردەوام سنووری هەیە، مرۆڤیش بۆ وەرگرتنی ئەم کارە قورسانە پێویست بەکاتێك دەکات کەلێی بوەستیت تا قبوڵیان دەکات و پاشتر دەیگۆڕێت بۆ بەرنامەو ڕێرەوی ژیان و تێکەڵی خوێن و گۆشت و دەمارەکانی دەبێت، پاشتر لەگەڵ لەشی ولار و خانەکانی لەشیدا یەکدەگرنەوە.

بەبێ بوونی ئەم تێکەڵ بوون ویەککگرتنە دەروونی یە، بەردەوام پاڵەپەستۆی دەرەکی پاڵدەنێت بەمرۆڤەوە وئەم پاڵە پەستۆیەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر نارەحەتی دەکات وڕۆژێك دێتە پێشەوە کە ئەو زۆرە دەرەکی یەی بەسەرەوە نەمێنێ پشتاوپشت بگەڕێتەوە سەر هەڵس وکەوتەکانی پێشتری.[3]

---

١ ـ سیرة عمر (ابن الجوزی) لا ١٠٦.

٢ ـ ملامح الانقلاب لا ١٧٣.

٣ ـ ملامح الانقلاب لا ١٧٣.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەم بڕگەیەیەتی کەدەڵێت:..... بەڵام من نان بۆ یەك دوو کەس وەردەگرمەوە و هەوالیش دەگاتە کەسانی ترو بەو جۆرە مەسەلەکە ئاسایی دەبێت لەلای ئەوانیش و، پاشان عمر لێرەدا پرۆژە وکارکردن لەسەری پێش کەش دەکات و لەپێناوی چاکسازی و نوێخوازیدا، چونکە زۆرن ئەو کەسانەی کەووتەی گەورەگەورە وقەبە دەردەبڕن بۆ گەلەکانیان _بەتایبەتی لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا _ بەڵام کەمن ئەوانەی کەپرۆژەکانیان دەبەنە بواری کردەوە وجێ بەجێ کردنەوە ئیتر باکەمیش بێت ئەو جێ بەجێ کردنە.

بەڵام عمر ئەم چاکسازە مەزن وفەقیهە شارەزایە، دەیەوێت کۆمەڵێ پرۆژە بەکردەوە پێش کەش بکات و نایەوێت بەزۆر وتوندوتیژی وبێ پلان وبەرنامە ڕێژی، نەخێر بەڵکو ماف بۆ یەك کەس ودووکەس وەردەگرێتەوە، یان مافیان لێ دەسێنێتەوە و هەواڵەکەش دەگاتە خەڵکانی ترو، بەم کارەو وورد وورده پرۆژە چاکسازیەکە تێکەڵی خوێن ودەماری تاکەتاکەی ئوممەتی ئیسلام دەبێت و دەڵێن(دەستێك دەوڵەت بیبڕێت ئێشی نی یە)[1].

عمر رحمه الله لەگەڵ ئەم قۆناغ بەندی ونەرمی یەیدا ئەوەشی فەرامۆش نەدەکرد کەبەخشش و ماڵی دنیایی بدات بەو کەسانەی کەفەرمانڕەوایی دەکردن تادڵیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت[2].

کەسیش مافی ئەوەی نی یە کەبڵێت: ئەمە دابەزین ولادانی عمری کوڕی عبدالعزیز لەئامانجە نوێخوازی وچاکسازی یەگشتی یەکەی لەبەرخاتری چارەسەری کاتی وپینەکاریەکی لاوەکی ... چونکە لەوەتی عمرمان ناسیوە و بووەتە گەورەی موسڵمانان _بستێك_ دابەزینی پێوە دیارنەبووە ئامانج و مەبەستەکانی قورئانی کەریم وسوننەتی خاوێن، بەڵام لێرەدا عمر کاربەشێوازە زیندووەکان دەکات کەدەبنەهۆی هێنانەدی ئامانجەکانی قورئانی پیرۆز بەتەواوەتی .

پاڵەپەستۆی بەردەوام تەقینەوەی لەدوایە، ئەم تەقینەوەیەش هەر چەند کەم

---

١ ـ ووتەی وەرگێڕ .

٢ ـ ملامح الانقلاب لا ١٧٤.

بێت بەڵام هەر سوتێنەرو ڕوخێنەر دەبێت، لەتوانای سەرکردە و فەرمانڕەواکاندا هەیە ئەم ڕووخان وسوتانە دووربخەنەوە بە بەکارهێنانی شێوازێکی زیندوو کە بگونجێت لەگەڵ سروشت ودەروونی مرۆڤدا، دەی بۆچی نایگرنەبەر؟.[١]

کاتێك (عبدالملك)ی کوڕی پێ ی ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، فەرمانی خوا جێ بەجێ بکە، ئیتر بامنیش وتوێش لەناو مەنجەڵدا بکوڵێنین، وەڵامی خەلیفەی نەرم ونیان ئەوە بوو پێ ی ووت: کوڕی خۆم، ئەگەر بمەوێت بەو جۆرە بکەم کە تۆ دەیڵێیت ناچارم پەنا بۆ شمشێر بەرم، دەی خێر نی یە لەخێرێکدا کە لەڕێگەی شمشێرەوە زیندوو بکرێتەوە.[٢]

دەی کەواتە خەلیفەیەك ئا بەم جۆرە وبەنەرمی بجوڵێتەوە وبەم زیرەکی یە هەڵس وکەوت بکات هەرگیز ڕۆژی لەڕۆژان لەئامانجی خۆی لانادات.[٣]

بەمانەی پێشەوەدا نەرمی عمر دەردەکەوێت لەبەڕێوەبردنی وڵات وجێ بەجێ کردنی سیاسەتەگشتی یەکان، بەرپاکردنی دادپەروەری وبڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و دامەزراندنی دەوڵەت لەسەر بناغەی بیروباوەڕ .[٤]

ئەمەش کۆمەڵێ بەڵگەیە لەسەر جێ بەجێ کردنی بنەمای نەرمی لەجێ بەجێ کردندا کەعمر بەکردەوە لەژیانیدا کاری لەسەرکردووە:

١- فەرمانی ئێمە نوێژت پێ دوانەخات:

عمر رحمه الله جارێکیان چوو بۆ لای پاسەوانەکانی، پێ ی ووتن، کامتان ئەو پیاوە ئەناسن کە ماوەیەك لەمەوبەر ناردمان بۆ وڵاتی میسر؟ ووتیان: هەموومان دەیناسین، عمریش ووتی: کامتان منداڵ ترین کەستانن بابچێت بەدوایدا وبۆم بانگ بکاتەوە پاسەوانێکیان خۆی گەیاندە نیراوەکەو بانگی کردەوەئەویش وای گومان برد، کەعمر وای زانیوە ساردو سڕی نواندوە وخێرا نەچووە، پێی ووت: پەلەم لێ

١ ـ ملامح الانقلاب لا ١٧٤.

٢ – الکامل فی التاریخ لە ملامح الانقلاب لا ١٧٥ وەرگیراوە .

٣ ـ الکامل فی التاریخ لە ملامح الانقلاب لا ١٧٥.

٤ ـ النموذج الاداری لا ٣٢٩ .

مەکە هەرئێستا خۆم دەگۆڕم ودێم، پاشان بەپەلە هات بۆ لای عمر.

عمریش پیێ ی ووت: ترست نەبێت، ئەمڕۆ ڕۆژی جومعەیە، لەشاردەرمەچۆ تا نوێژەکەی جومعەت نەکەیت، من تۆم ناردوە بۆ کارێکی زۆر، پاشان بەپەلە و گرنگی موسڵمانان، دەی هەرگیز لەکردنمان لێت بۆ هەر کارێك وات لێ نەکات نوێژەکانت لەکاتی خۆی دوابخەیت.[1]

دەی تەماشابکە لەگەڵ گرنگی و پەلەیی کارەکەیدا کەچی لەجێ بەجێ کردنەکەیدا نەرمی دەنوێنێت لەگەڵ ئەو نێرراوەدا.[2]

٢- بەربانگ بکەرەوە وپاشان بڕۆ:

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله کاربەدەستەکەی ، کە بەسەر خوراسانەوە بوو بانگ کردەوە، هەر کە فەرمانەکە پێگەیشت خێرا خۆی کۆکردەوە وخۆی گەیاندەوە لای خەلیفە_ وەك جێ بەجێ کارێکی دڵسۆز_ وکاتێ گەیشتەوە کۆشکی خەلیفە لەدیمەشق_ وعمر ئاسەواری ماندوویەتی وشەکەتی ڕێگای تێدا بەدی کرد، بۆیە پرسیاری لێ کرد: کەی لەوێ دەرچوویت؟ ووتی: لەمانگی ڕەمەزاندا.

عمر ووتی: ڕاستەکەن دەڵێن زۆر وشکیت!! دەی باشتر نەبوو خوت بگرتایە تاچەژنت دەکرد وئەوجا بکەوتیتایەتە ڕێ.[3]

٣- نارەحەتیان مەکەن، توندمەبن لەگەڵیاندا:

(ابن سعد) دەگێڕێتەوە لە(میمون)ی کوڕی (مهران)ەوە کە بەرپرسی دیوانی دیمەشق بووە دەڵێت: مووچەیان بڕیەوە بۆپیاوێکی نەخۆشی درێژخایەن، منیش ووتم:قەیناکادەبێت لەگەڵ ئەونەخۆشانەداباش بین کەنەخۆشی ترسناك و درێژخایەنیان هەیە بەڵام مووچەی مرۆڤێکی لەش ساغیان پێ بدرێت؟!شتی وانابێت.

---

١ ـ سیره عمر لابن الجوزی لا ١٠٦ .

٢ ـ النموذج تلاداری لا ٣٣٠ .

٣ ـ تاریخ الطبری _له_ النموذج الاداری لا ٣٣٠ .

سکالاّی ئەم بۆ چوونەمیان گەیاندبووە عمری کوڕی عبدالعزیز وپیان ووتبوو: زۆر توندوتیژە لەگەڵماندا وناڕەحەتمان دەکات، ئەویش نامەیەکی بۆ نووسیم و پێی ووتم: ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێ گەیشت ئیتر توندوتیژ مەبە لەگەڵ خەڵکی وناڕەحەتیشیان مەکە، چونکە من ئەوەم پێ خۆش نی یە.[1]

عمر ئەم نامەیەی بۆ (میمون) نووسی کەلەبنەمای نەرمی نواندن لەبەر پرسیارێتی وە سەرچاوەی گرتبوو.

٤- نەرمی نواندن لەگفتوگۆو لێك گەیشتندا:

گفتوگۆی ئاشتیانە ووەلاّمدانەوەی بەڵگە بە بەڵگە شێوازی عمربووە رحمه الله لەکۆبوونەوەو دانیشتنەکانی لەگەڵ خەواریجەکان دا بەکردەوە ئەم نەرمی یەی پێوە دیار بووە، _وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد کە_کۆمەڵێك لە_حەروریەکان_هاتن بۆ لای عمر، لەمەسەلەیەکدا گفتوگۆیان لەگەڵ کرد،

هەندێ لەیاوەرانی عمر ئاماژەیان بۆ کرد کەبیانترسێنێت وچاویان لێ سور بکاتەوە، بەلاّم عمر هەر نەرم ونیان ولەسەر خۆبوو لەگەڵیان تاڕێك کەوت لەگەڵیان کەتاماوە لە ژیاندا خواردن وجل وبەرگیان بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەوانیش بەوشێوەیە بەجێیان هێشت، کاتێ دەرچوون عمر دای بەئەژنۆی یەکێ لەهاوڕێکانیدا ووتی: ئەی فلاّن کەس، ئەگەر چارەسەرێك هەبوو بۆ چارەسەرکردنی هاوڕێکەت هەرگیز پەنامەبە بۆ داخ کردنی بەئاگر.[2] لەهەموو هۆکارەکانی هەڵس و کەوت کردندا نەرمی نواند لەگەڵیاندا.[3]

٥- نەرمی وکراوەیی فیکریی:

نەرمی وکراوەیی فیکریی عمر بەجۆرێك بوو بەئاشکرا پێوەی دیاربوو، کەبەدوربوو لە توندوتیژی و وشکی وکەللەپوچی،_ وەك پێشتر باسمان کرد_

---

١ ـ الطبقات (٧/٣٨٠) .

٢ ـ سیره عمر (ابن الجوزی) لا ٧٦_٧٨ .

٣ ـ النموذج الاداری لا ٣٣١ .

کەجارێکیان عمری کوڕی عبدالعزیز (یزید)ی کوڕی(أبی مالك)و(حارث)ی کوڕی(محمد)نارد بۆ ئەفریقیا، بۆ ئەوەی خەڵکی فێری سوننەت وژیانی پێغەمبەری خواﷺ بکەن، بریاریشی دا مووچەیان پێ بدات بەرامبەر ئەو کارە، (یزید) قبوڵی کردو (حارث) قبوڵی نەبوو کەبە پارە خەڵکی فێری ئیسلام بکات ووتی: من هەرگیز ئامادەنیم لەبەرامبەر زانستێکدا کە خوا فێری کردووم مووچە وەربگرم، مەسەلەکەیان بۆ عمر باس کرد وئەویش ووتی: ئەوەی (یەزید)کردوویەتی دروستە و هیچی تێدا نی یە، بەڵام خوا نموونەی(حارث)مان لەناودا زۆر بکات.[1]

دەبینی هەڵوێستێکی دیاری کراوی یەکلایەنەی نەبوو بەرامبەر ئەو دوو زانایە، لەگەڵ ئەوەشدا دوو ڕای جیاوازیان هەبوو لەوەرگرتنی پارە لەبەرامبەر زانست بەخشین دا، پشتگیری پارەوەر گرەکەی کرد و ووتی هیچ گوناهێکی تێدا نی یە، بەڵام دووعای خێرو چاکەی کرد بۆ (حارث)، کە نەرمی عمر دەگەیەنێت بەرامبەر ڕاجیاوازەکان لەیەك کاتدا، تەنانەت پێ ی وایەکە بنەمای نەرمی وکراوەیی فیکری و جیاوازی بیروڕا پێویست وچاکە، تەنانەت جیاوازی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەبیروڕادا پێخۆش بووە وەك دەڵێت:(پێم خۆش نەبوو کەهاوەڵانی پێغەمبەرﷺ جیاواز نەبوونایە لەبیرو بۆچووندا، چونکە ئەگەر جیاوازانە بوونایە، ڕێگەپێدان_رخصة_ نەدەبوو)،[2] ویان لەوبارەیەوە دەڵێت: ئەو جیاوازیەی ناو هاوەڵانی محمدﷺ ناگۆڕمەوە بەسورە وڵاخ.[3]

## نۆیەم: گرنگی کات لەحکومەتەکەی عمردا

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله زۆربەی کاتەکانی_ ئەگەر نەڵێین هەمووکاتەکانی_ تەرخان کردبوو بۆ کاروباری دەوڵەت وبەرژەوەندی موسڵمانان یان جێ بەجێ کردنی هەقی پەروەردگار لەخواناسی وعیبادەت کردن، شەوەکانی بەنوێژو پاڕانەوە

---

١ ـ سیره ومناقب عمر، (ابن عبدالحکم )لا ١٣٧ .

٢ ـ سیرة عمر، (ابن الجوزی) لا ٢٧٥ .

٣ ـ الطبقات (٣٨١/٥) .

لەدەرگانەی خوا دەبردەسەر ولەدوای نوێژی وەتر ئیتر قسەی لەگەڵ کەسدا نەکردوە.[١]

هەردەربارەی لەدەست نەدانی هەلەکانی کات دەڵێت: ((ان الليل والنهار يعملان فيك فاعمل فيهما)) واتە: شەوو ڕۆژ کارت تێدا دەکەن دەی تۆش کاریان تێدا بکە.

هەمیشە کاتی بەهەڵ دەگرت بۆ هەڵسان بەکارێکی چاکە یان دەرکردنی فەرمانی خێرا ولەجێ ی خۆیدا و خێرا یەکلایی کردنەوەی ئیش وکارەکان ودەرکردنی بڕیارە ئیداری یەکان، خۆ بەدور گرتن لەهەموو ئەو کارانەی کەدەبوونە هۆی دواکەوتنی کارێکی چاکەیان بەرژەوەندیەکی موسڵمانان، گەورەترین بەڵگەیش لەسەر ئەمە ئەو سێ بڕیارە بوو کەهێشتا(سلیمان) بەخاك نەسپێرابوو دەری کردن.

وەك(ابن عبدالحکم) دەڵێت: هەرکە(سلیمان) بەخاك سپێردرا کاتی نوێژی مەغریب بوو، فەرمانی دا قەڵەم وکاغەزی بۆ بهێنن، سێ بڕیاری گرنگی نووسی، کەنێوان خۆی وخوا نەیتوانی دوایان بخات، یەکسەر هەرلەویدا ئیمزای کردن.

هەرچەندە هەندێ لەخەڵکی هۆی ئەم پەلەکردنەیان نەدەزانی، بۆیە بە لاقرتێ و چاو داگرتنەوە بەیەکتریان دەووت: دەی ئەم پەلەپەلەی بۆ چی یە؟ ئەی نەی دەتوانی خۆی بگرێت تادەگەڕایەوەماڵەکەی خۆی؟! دەی وادیارە ئەمە خۆشەویستی پلەوپایەیە؟ وئەمە بوو ئەیان ووت پێ ی ناخۆشە بکرێتە خەلیفە؟!

خۆ ئەم کارەی عمر لەبەر خۆشەویستی کورسی وپلەوپایە نەبووە، بەڵکولێپرسینەوەی لەگەڵ دەروونی خۆیدا کردووە ووای بۆ چووە کەدواخستنی ئەو کارە هیچ پاساوێکی نی یە.

(ورد بەرەوە خوێنەری کوردی خۆشەویست، کەچۆن گەورەو فەرماندەی ڕاستەقینە زۆر پەلەیەتی ئیش وکاری موسڵمانان نەوەستێنێت وبەخێرایی ڕاپەڕێنرێت نەك وەك ئەمڕۆ گرنگ ترین کار دەوەستێنن بەبیانووی ئەوەی گوایە پەرلەمان لەمۆڵەتی هاوینەدایە!! یان سەرەك کۆمار لە گەشت وسەیرو سەفادایە! یان کەمێ ناساغە!! وهتد....).[٢]

---

١ ـ سيره عمر،( ابن الجوزي) لا ٢١٠ _ ٢١١ .

٢ ـ ووتەی وەرگێڕ .

بڕیارەکانیش ئەم سێ بڕیارە بوون :

١- بڕیاری یەکەم: هیچ پەیوەندی یەکی بەخۆیەوە نەبوو، بەڵکو تایبەت بوو بەتێکۆشەران و گیان بازانی ئیسلام بوو لە_قسطنطنیە_کە ماوەیەکی زۆر بوو لەبرسێتی وناڕەحەتیدا دەژیان، ناڕەحەت بوو بوون لەبەردەمی دوژمنانی ڕۆمدا، عمر فەرمانی دەرکرد بەسەرکردەی سوپا(مسلمة)ی کوڕی (عبدالملك)کە گەمارۆی سەرقەڵاکان لابەرێت وسوپای ئیسلام پاشەکشە پێ بکاتەوە وعمر لەم کارەیدا پێی وابوو ئەگەر کارێك تایبەت بێت بەموسڵمانن ناڕەحەت وماندووەوە دەبێت پەلە بکرێت لەدەرکردنی بڕیار بۆیان .؟[1]

٢- بڕیاری دووەم: لابردنی بەرپرسی خەراجی میسر لەسەرکارەکەی کەناوی (اسامە)ی کوڕی (زیدالتشوخی)بوو لەبەر زوڵم و زۆر و نارەوایی و خۆسەپاندنەکانی لەو ولاتەدا.

٣- بڕیاری سێ یەم: هەروەها فرمانی لابردنی والی ئەفریقیەی دەرکرد کەناوی (یزید)ی کوری(أبی مسلم) بوو، ئەویش لەبەر ناهەقی وزوڵم و ستەمەکانی کەهەواڵی بەباشی دەگەیشتەوە عمر.[2]

هەروەها گرنگی تایبەتی بەکات دەدا وەهەمیشە کاتی گونجاوی هەڵدەبژارد بۆراگەیاندنی فەرمان و بڕیار وئاراستەکانی تابەئاسانتر بگاتە هەموو لایەك، بۆ ئەو مەبەستە باشترین کاتی هەڵدەبژارد، ئیتر چ لەبەر زۆری خەڵکەکە یان لەبەر پیرۆزی شوێنەکە، کەزیاتر گرنگی پێ دەدرێت.

ئەوکاتەش وەرزی حەج کردن بوو کە یان خۆی وتاری بۆ پان دەدان بڕیارو فرمانی لەشێوەی نامەدادەنارد و بەسەر حاجی یەکاندادەخوێنرایەوە و فرمانەکانی زیاتر دەبوە جێگای گرنگی موسڵمانان، کەدوو ئامانجی دەپێکا:

---

١ ـ سیره عمر بن عبدالعزیز (ابن عبدالحکم) لا ٣٢ .

٢ ـ النموذج الاداری لا ٣٣٧، ٣٣٨.

١- بڵاوبونەوەی زیاتری بڕیارەكانی لەناو ژمارەیەكی زۆر لەموسڵمانان و وڵاتانێكی زۆردا.

٢- خێر بڵاوبونەوەی بڕیارو ئاراستەكانی خەلیفە لەناو كۆمەڵێكی زۆر لە موسڵماناندا لە كاتێكی گونجاودا.

یەكێ لەو نامانەی كە بەسەر حاجیانی ماڵی خودا خوێنرایەوە تیایدا هاتووە:

پاشان .... من لەم مانگە بەرێزەدا و لەم شارە بەرێزەدا ولەم ڕۆژی حەجی گەورەدا خوادەگرم بە شایەت و خۆم بەری دەكەم لەلای ئەو خوایە لەستەم و ناڕەوایی ئەوا كاربەدەستانەی ستەمیان لێ كردوون، لە دەستدرێژی ئەوانەی دەست درێژیان لێ كردوون، من بەریم لەوەی كەمن فەرمانم پێدابن یان پێ ی ڕازی بوو بم یان بەئەنقەست كردبێتم، مەگەر لێم تێك چووبێت یان پێم نەزانیبێ ورجایشم وایە ئەوەم لێ نەگیرێت ولێم خۆش بن بەتایبەت بزانن كەمن ئەوپەری لێبڕان وخۆ ماندوكردنم بەخەرج داوە، ئیتر هیچ بەربەستێك نی یە لەنێوان من ستەم لێكراواندا ومن پشت وپەنای هەموو چەوساوەیەكم، هەركاربەدەستێكی من لەهەق لابدات و قورئان وسوننەت پەیڕەو نەكات، گوێڕایەڵیان مەكەن، كاری لابردنی یان مانەوەی دەدەمە دەستی ئێوە ئیتر،یان دەگەڕێتەوەبۆلای هەق یان دەینێرمەوە ماڵی خۆی.

ناهێڵم سەروەت وسامان لەلای دەوڵەمەندەكانتان تۆپەڵ ببێت و لە فەئیشیتان هەژارانتان بێ بەش ناكەین، هەر كەسێ لەئێوە بێت بۆ لامان و هەواڵێكمان بۆ بێنێت كەخێرو خۆشی تایبەتی یان گشتی تێدابێت لەنێوان(٢٠٠)تا (٣٠٠)دیناری پێ خەڵادەكەم بەپێ ی نیەتی خێری خۆی ودووری ڕێگاكەی،

ڕەحمەتی خوا لەكەسێك كەدوری ڕێگاوای لێ نەكات كەنەیەت بۆ لامان وخوا بەهۆیەوە هەقێك سەربخات، ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە كەلەئەركەكانی حەجم دەكردن كۆمەڵێ مەسەلەی هەق وڕەوام بۆ ڕۆشن دەكردنەوە كەخوا زیندوی كردونەتەوە وكۆمەڵێ مەسەلەی تریش لەنارەوایی یەكان كەخوای (عزوجل)لەگۆڕی ناون، ئەوەش چاكەیەكەو دەبێت سوپاسی خوای لەسەر بكرێت وسوپاسی كەسی ترنەكەن، چونكە ئەگەر خوا دەستم لێ بەربدات منیش وەك كەسێكی ئاسایرم لێ

دێت (واتە: خەلافەت بەڕێوە دەبەم وەھەقم بەھەق و ناھەقەوە نابێت_ والسلام).[١]

## دەیەم: دابەش کردنی کارەکان

عمـری کـوڕی عبـدالعزیز رحمه الله بەڕاشـکاوانە بنـەمای دابەشـکردنی کـاری ڕوون کردۆتەوە، کارەکانی بەرپرسیاێتی دەوڵەتی دیاری کردووە، بۆئەو مەبەستە نامـەی نووسـی بـۆ(عقبـة)ی کـوڕی(زرعـة الطـائی)کـاتێ کـە کـردی بەبەرپرسـی خـەراجی خۆراسان:

(......دەستەڵات چوار کۆڵەکەی ھەیەو بـەبێ ئـەو کۆمەڵـە کانـە ڕاناوەسـتێت، واڵی کۆڵەکەیەکە، قازی کۆڵەکەیەکە، بەرپرسی دارایی_بیـت المـال_ کۆڵەکەیەکـە، کۆڵەکەی چوارەمیش منم(واتە خەلیفە)[٢]

لەگەڵ تێبینی کردنی ئەم چوار کۆڵەکە گرنگـەی دەوڵـەتی ئیـسلامدا کـەبڕبڕەی پشتی دەوڵەتەکەن: والی کەسەرۆك کۆمـاری ھەرێمەکانـە وقـازی ڕۆڵـی وەزیـری داد دەبینێت و بەرپرسی(بیت المال)کە ڕۆڵـی وەزیـری دارایـی دەبینێـت و خەلیفـەیش کەسەرۆکی گشتی وڵاتە ئیسلامیە یەکگرتوەکانی.

کۆمەڵی پۆستی تر ھەیە کەبەکۆڵەکـە لاوەکـی یـەکان _مرغیـە_ دادەنـرێن وەك سەرۆکی جەنگ و جیھاد و(منـصور)ی کـوڕی (غالـب) سـەرۆکی بـووە لەسـەردەمی عمردا.[٣]

بەرپرسی ڕێك وپێك کردنی ریزەکـانی سـوپا(ولیـد)ی کـوڕی (ھـشام)و (عمـرو)ی کوڕی(قیس السکونی) .[٤]

پۆستێکی تر بەناوی ئاسایـشی نـاوخۆ، کـە(عمـر)ی کـوڕی(یزیـد)ی کـوڕی(بـشر الکلبی)ی کرد بوو بەسەرۆکی پۆلیس.[١] (عمر)ی کوڕی(مھاجر)ی کـوڕی(ابـی مـسلم

---

١ ـ حلیە الاولیاء (٥/٢٩٢ ـ٢٩٣) .

٢ ـ تاریخ الطبری لە النموذج الاداری لا ٣٤٢ وەرگێڕاوە .

٣ ـ سیرە عمر (ابن عبدالحکم) لا ٧١.

٤ ـ تأریخ خلیفە لا٣٢٤.

الانصاری)کرد بەسەرۆکی پاسەوانەکان، (حبیش)یشی کرد بەسەرۆکی دەرگاوانەکان ـ الحاجب ـ.

هەروەك کۆمەڵێ خاڵی پشکنینی دانا لەسەر رێگای هەرێمەکان کە ئەمڕۆ بەخاڵی گومرگی سنور ناسراوە.[٢]

پۆستێکی تر کەتایبەت بوو بە(نوسین)ە وەکە(لیث)ی کوڕی (ابی رقیە)ی مەولای(ام الحکم)ی کچی(ابو سفیان) بەرپرسی بوو، بەرپرسی مۆریش(نعیم)ی کوڕی (سلامە)بووە.[٣]

بەشێکیش بۆ بەدواداچوونی کاروباری دارایی وچەند لقێکی هەبوو، وەك(خراج) و (عقبە)ی کوڕی (رزعة الطائی)بەرپرسی بووە.[٤]

کۆکردنەوەی زەکات کە(عبداللە)ی کوڕی(عبدالرحمن)ی کوڕی(عتبە القرشی)بەرپرسی بووە،[٥] ودەزگای_سکەلێدان_کە(عمر)ی کوڕی(ابی حملە القرشی)بەرپرسی بووە.[٦] وهەروەها (صالح)ی کوڕی(جبیر الغدانی)سەرۆکی (خراج)ی گشتی بووە.[٧]

لە بواری فێرکردن ورۆشنبیرکردن دا عمر هەستا بەدامەزراندنی دەزگای فێرکردنی هەمیشەیی لەمزگەوتەکاندا، چەند کەسێکی دیاری کرد بۆ شارەزاکردن و فێرکردنی گەڕۆك لەناو بیابان نشینەکاندا، هەروەك کۆمەڵێ کەسی ڕاسپارد بۆ بانگەوازی رێگای خوا وفەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە، کۆمەڵێ خانووی دروست کرد بۆ کاری دادوەری ولەمیسردا فەتوای دایەدەستی سێ زانای بواری (الفقە).[٨]

---

١ ـ تأریخ خلیفە لا٣٢٤.
٢ ـ عمربن عبدالعزیز فی رد المظالم.
٣ ـ تاریخ خلیفە ٣٢٤.
٤ ـ تاریخ الطبری لە النموذج الاداری لا ٣٤٤ وەرگیراوە.
٥ ـ امراء دمشق لا ٤٨.
٦ ـ عمربن عبدالعزیز وسیاستە لا ٢٩٥.
٧ ـ تاریخ خلیفە لا ٣٢٤.
٨ ـ النموذج الاداری ٤٣٤.

لەگەڵ ئەم پۆستە گرنگەدا هەندێ پۆستی تریش هەبوون وەك بەرپرسی نوێژ، حەج، بەڕێوەبردنی کارەکان، پۆستەو گەیاندن وکۆمەڵێ پۆستی تر کەبواری باسکردنی هەموویان نی یە لێرەدا.

ئابەم شێوەیە عمری کوڕی عبدالعزیز یاسای دابەشکردنی پۆستەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی دامەزراند وبەڕاستی ئەتوانین بڵێین لەیەکێك سەرکردەمەزنەکان بووە.

فەرموون لەگەڵ هەندێك لەشێوازی تێگەیشتوویی عمری کوڕی عبدالعزیز لەکاری بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا:

- هۆکاری سەرکەوتنی پرۆژە چاکسازی یەکەی عمری کوڕی عبدالعزیز:

کۆمەڵێ هۆکار بوونە هۆی سەرکەوتنی عمر لە هەوڵە چاکسازی ونوێ خوازیەکەیدا، وەك:

١- کۆمەڵێ ڕەوشتی مەزن لەکەسایەتی عمردا: وەك: زانایی، لەخواترسان، دنیانەویستی، بێ فێزی، نەرم ونیانی، لێبووردەیی، لێخۆشبوو، سووربوون(الحزم)دادپەروەری، گوناه نەکردن(الورع).

لەگەڵ توانایی بەڕێوەبردنی گەورە لەهونەری پلان ونەخشەکێشاندا، لەسەرکردایەتی وئاراستە کردن، ناسینی مرۆڤەکان.

٢- بوونی تێڕوانینێکی ڕوون وئاشکرای نوێخوازی وچاکسازی، کە ئامانجی ڕاندنەوەی دەوڵەت و ئوممەتە بۆ سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان ولەسەر پرۆگرامی پێغەمبەرانە.

٣- کۆبوونەوەی ئوممەت لەدەوری ئەم پرۆژەیە لەپاش ئەوەی نیەتی پاك و دڵسۆزی خاوەنەکەیان بۆ دەرکەوت.

٤- بوونی کۆمەڵێك ئەستێرەی پرشنگدار لەزانایان کەلەوسەردەمەی ئەودا ژیاون وتوانای ڕابەرایەتی کردنی وڵات ونەتەوە کەیانیان هەبوو، بەگەیشتنی عمری کوڕی عبدالعزیز بۆ سەر کورسی دەستەڵات ئیتر بواری تەواویان بۆ ڕەخساو دەستیان کرد بەداهێنان و لەئەرك وکارە گەورەکاندا لێهاتوویی خۆیانیان سەلماند.

ئەمەش وانەیەکی گرنگە لەوەی کەزۆر گرنگ وپێویستە زانایانی ئیسلام لەهەموو ڕوویەکەوە زانابن ونابێت تەنها خەریکی زانستە شەرعی یەکان بن ولەگەڵ دەستپاکی ولەخوا ترسانەکەیاندا دەبێت. هەوڵی بەرەودان بە کەسایەتی خۆیان بدەن و توانای پێشەوایەتی کردن وسەرکردایەتی کردنی گەلیان تێدا دروست ببێت، ئەوکاتە بەزانا ڕەببانی یەکان دەژمێردرێن.

هەرئەوەش وایان لێ دەکات کەشەریعەتی خوا پیادەبکەن کاتێک دەستیان دەگاتە پۆستە بەرزەکانی دەوڵەت، ئەو کاتە سەرکردایەتی جەماوەردەکەن و لەدەوری پرۆژەی مەزنی حکومەتی ئیسلامی کۆیان دەکەنەوە.

٥ـ سووربوون و داکۆکی کردن لەسەر بەرپاکردنی حوکمی شەرع لەهەموو کارێکی گەورەو بچووکدا، لەسەر ئاستی دەوڵەت وئوممەت، ئەو کاتە کۆمەکی پەروەردگاریش دەبێتە بەشیان، لەوبارەیەوە خوای(عزوجل) دەفەرموێت:﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾الاعراف: ٩٦.

واتە: هەرکاتێ خەڵکی شارەکان باوەڕبهێنن ولەخوابترسن ئێمەش هەموو فەڕو بەرەکەتی ئاسمان وزەویان بەسەردا دەبارێنین.

## شوێنەواری دەستگرتن بەقورئان وسوننەتەوە لەدەوڵەتەکەی عمردا :

وردبوونەوە لەقورئانی کەریم وفەرموودەکانی پێغەمبەرمان ﷺ وهەروەها وردبوونەوەش لەژیانی گەل ونەتەوەکان زانیاری یەکی چاك بەمرۆڤ دەدەن سەبارەت بەسوننەتی خوا لەخەڵکی وگەردوون وئاسمانەکاندا.

ڕوونترین جێگایش کەئاشنامان بکات بەسوننەتەکانی خوای گەورە و یاساکانی لەگەردووندا قورئانی کەریمە کەدەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ النساء:٢٦، واتە: (خوا دەیەوێت بۆتان ڕوون بکاتەوە وڕێنمونیتان بکات بۆ سەر گوزشتەی ئوممەتانی پێش ئێوەو لەگوناهەکانیشتان خۆش ببێت وخوایش زاناو دانایە).

سوننەت وڕێرەوەکانی خوامان بۆ دەردەکەوێت لەڕێگەی خوێندنەوەو شارەزابوونمان لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ، کەهەموو کاتەکانی بەهەل دەزانی تاسوننەت و ڕێرەوێکی نوێی پەروەردگار بۆهاوەڵانی ئاشکرا بکات.

بۆ نموونە حوشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەناوی(العصنباء) بوو زۆر خێرابوو، کەس پێشی نەدەدایەوە، بەڵام ڕۆژێکیان عەرەبێکی بیابان نشین هاتوو وپێشبڕکێی لەگەڵ پێغەمبەردا کرد ولەئاکامدا پێشی پێغەمبەری خوای دایەوە، بۆیە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (خوایان لێ ڕازی بێت) زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەت بوون و پێیان ناخۆش بوو.

پێغەمبەر ﷺ کەبەئەوەی زانی ڕووی تێ کردن وسوننەتی خوای بۆ ڕوون کردنەوە وفەرمووی: ((حق على الله الا يرتفع شيء من الدنيا الا وضعه)).[1] واتە: خوا لەسەر خۆی فەرز کردووە کەهیچ شتێك لەدنیا تاسەر بەرز نەبێت وڕۆژێك دێت دای دەنەوێنێتەوە ودەیخات.

خوای گەورەیش لەقورئانە پیرۆزەکەیدا داوامان لێ دەکات کەبەدوای فێربوون و زانینی ڕێرەو وسوننەتەکانیدا بگەڕێین لەڕێگەی خوێندنەوەی ژیانی ئوممەت و گەلەکانی پێش خۆمان وبزانین چۆن بوون ولەئاکامدا چیان بەسەرهات؟

وەك دەفەرمووێت﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ال عمران: ١٣٧، ١٣٨ واتە: لەپێش ئێوەوە ژیان وگوزەران وڕێڕەو هەبوو، دەی بەزەویدا بگەڕێن وبزانن سەرەنجامی بەدرۆخەرەوان چی بووە؟! وئەمەش ڕوون کردنەوەیە بۆ خەڵکی ورینمایی وئامۆژگاریشە بۆ لەخواترسەکان.

تایبەت مەندی یەکانی سوننەتەکانی پەروەردگار:

١- قەدەر دانانێکی پێش وەختە:

خوای(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿ مَّا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ

---

١ ـ البخاری کتاب الجهاد والسير ژ ٢٨٧٢ .

ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ قَدَرٗا مَّقۡدُورًا ﴾ الاحزاب ٣٨ .

واتە: حوکمی پەروەردگار و فەرمانەکانی(مەحاڵە)هەر ودەبێت بێنەدی، کەس ناتوانێت لەڕێگەیاندا بوەستێت وهەرچی خۆی بیەوێت ڕوودەدات وهەرچیشی نەوێت روونادات.

٢- گۆڕانی بەسەردا نایەت :

خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ وَلَوۡ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوَلَّوُاْ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴾ الفتح: ٢٢_٢٣، واتە: سوننەتی خوا وایە ئەگەر دووڕوو دڵنەخۆشەکان وازنەهێنن لەدژایەتی کردنت، ئەوا نەفرەتی خوایان دەبارێت بەسەردا وناکامیشیان کوشتنە لەهەرشوێنێ بن وئەم سوننەتی خـوایش گـۆڕانی بەسەردانایە وگەلانی پێشوویش هەروابوون.

٣- بێ گومان ڕوودەدات ونەهاتنە دی بۆ نی یە:

خوای (عزوجل) دەفـەرموێت:﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغۡفَرۡ لَهُم مَّا قَدۡ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدۡ مَضَتۡ سُنَّتُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ الانفال ٣٨.

واتە: بڵێ بەبێ باوەڕەکان وازدەهێنن لەکفرو سەر کەشی ودوژمنایەتی کردنی ئیسلام باشە، خوالێیـان خـۆش دەبێـت، ئەگەر دەست پـێ بکەنەوە ئەوە وەك ئوممەتەکانی تریان بەسەر دێت واتە دەکەونە بەر خەشم و قینی خوا.

٤- دژایەتی ناکرێت ودژایەتی کردنی بێ سوودە :

خوای گەورە باسی گەلەکانی پێش ئیسلام دەکات کەدژایەتی خوایان کرد، لەهێزو دەستەڵات و ژمارەشدا لەئێوە زۆر تربوون بەڵام سوودی نەبوو دژایەتی یەکەیان وسەرنەکەوتن وەك دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِنۡهُمۡ وَأَشَدَّ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم

مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ غافر ٨٢ .

٥- تەنها باوەڕداران وانەو پەندی لیٚ وەردەگرن :

خوای گەورە لەسورەتی ال عمران ئایەتی ١٣٧_١٣٨ دادەفەرمویٚت: ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾.

واتە: لەپێش ئێوەشەوە گەلانی تر ژیاون، دەی بگەڕێن بەسەر زەویدا وسەیر بکەن وبزانن سەرنجامی دوژمنان وبیٚ باوەڕان بەچی گەیشتووە؟ وئەمەش بەیانێکە بۆ خەڵکی ورێنموونی وئامۆژگاری یەبۆ باوەڕدارە لەخوا ترسەکان .

٦- بەسەر چاکەکاران وپیاو خراپاندا جیٚ بەجیٚ دەبێت:

باوەڕداران_کەپێغەمبەرانیش دەگرێتەوە_ وەك بیٚ باوەڕەکان ئەم سوننەتەی خوا دەیانگرێتەوە بەبیٚ جیاوازی واتە چی بریارێکی داوە بۆ باوەڕداران دێتەدی و چی بڕیارێکیشی داوە بۆ بیٚ باوەڕان دێتەدی .

کارکردن بەقورئانەکەی پەروەردگار شوێنەواری دنیایی وقیامەتی هەیە:شوێنەوارە دنیایی یەکان لەدەوڵەتەکەی عمردا ئەمانە بوون:

١- دەستەڵات وحوکم دەداتە دەستیان:

وەك بینیمان خوای گەورە وپەروەردگار حوکمی دایە دەستی عمری کوڕی عبدالعزیز ودەستەڵاتێکی مەزنی دایە دەستی، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەکە زۆر سووربوو لەسەر بەرپاکردنی شەرعی خوا لەخۆی ماڵ ومنداڵ و دەوروبەر و هۆزەکەی وئوممەتەکەیدا، دڵسۆزانە خۆی یەکلایی کردبوویەوە بۆ پرۆژە چاکسازی یە ڕاشیدی یەکەی، خوایش پشتی گرت وهاوکاری کرد، چونکە مەرجەکانی دەستەڵات وحوکم پێدانی لە لایەن خواوە، جیٚ بەجیٚ کردو هێنایەدی و

خوایش پەیمانی خۆی تێدا هێنایەدی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا﴾النور: ٥٥.

ئەمەش سوننەتی خوایە وجێ بەجێ دەبێت وگۆڕانی بەسەردانایەت، بەسەر ئەو کەسانەدا کە دەیانەوێت شەرع ویاسای خوا لەسەر زەویدا بچەسپێنن.

٢- بەرقەراربوونی ئاشتی:

لەسەردەمی خەلیفە ئوممەوی یەکان پێش عمری کوڕی عبدالعزیز _ڕ_ زۆری لەشۆرش کردن و دژایەتی کردن ودەنگی ناڕەزایی بەرزکردنەوە شیعاری زۆری لەگەلە موسڵمانەکەبووە، بەتایبەتی _خەواریجەکان_ کەبەردەوام بەحوکمی هیچ خەلیفەیەك ڕازی نەبوون ودژایەتیان کردوون .

بەڵام کاتی عمر چووە سەر حوکم لەڕێگەی گفتوگۆی ئاشتیانەوەو وتووێژەوە توانی زۆرێکیان بەوەڕازی بکات لەواز لەشۆرشی ودژایەتی کردنی خەلافەت بهێنن، سەردەمەکەی بوو بەسەردەمێکی جیاو ئاشتی وئاسایشی تێدا بەرقەراربوو ئەمەش بەهۆی دادپەروەری لەحوکمڕانیدا وگەڕاندنەوەی ناهەقی یەکان بۆ خاوەنە شەرعیەکانی خۆیان، ڕێزلێنانی زۆر لەهەموو چینەکانی کۆمەڵ، سوور بوونی لەسەر جێ بەجێ کردنی شەریعەت لەهەموو لایەنێکی ژیاندا وخوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ الانعام ٨٢ .

٣- سەرکەوتن ورزگاریی :

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کەبەهەموو هۆکارێك هەوڵی سەرخستنی ئاینی خوابدات، دەی سوننەتی خوایش وایە هەرکەسێك بیەوێت

خوای گەورە سەربخات خوایش ئەو سەردەخات، چونکە خوای_عزوجل_ گرنتی ئەوەی داوە بەهەموو هێزو توانایەوە ئەوکەسانە سەربخات بەسەر دوژمنانیاندا کەدەیانەوێت لەسەر بەرنامەی خوا بڕۆن ولەناو خەڵکیشدا بەرپای بکەن.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ الحج ٤١ .

واتە: بەدڵنیایی یەوە خوا ئەوکەسان سەردەخات کەئەوان هەوڵی سەرخستنی ئەو دەدەن و خوای گەورە زاڵ وبەتوانایە، ئەوکەسانەی کەبیانخەینە ئاستی بەرپرسیایێتی ودەستەڵاتەوە نوێژ بەرپادەکەن وزەکات دەبەخشن وفەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە دەکەن وسەرەنجامی کارەکانیش بۆلای خوا دەگەڕێنەوە.[1]

٤- سەربەرزی وئابڕوداری:

ئەو شەرەفی گەورە وسەر بەرزی یە مەزنەی لەژیانی حوکمڕانی عمری کوڕی عبدالعزیزدا تۆمارکراوە بەهۆی باپەندبوونی یەوە بووە بەقورئانەکەی پەروەردگارو سوننەتەکانی پێغەمبەرەکەیەوە .

هەرکەسێ شانازی بکات بەوەی سەربە قورئانەکەی خوایە، ئەوقورئانەی کەئوممەتی ئیسلامی پێ سەربەرزبووە، ناویان چووەناوناوان بەهۆیەوە، ئەوە کەسێکە پێ ی خستۆتە سەر ڕێگای ڕاست.

سوننەتی خوای لەخۆیدا هێناوەتەدی کەسەربەرزی وشەرەف دەبەخشێت بەوکەسانەی دەست دەگرن بەقورئان وسوننەتەوە ولەوبارەیەوە خوای - عزوجل- دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَـٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ الانبياء ١٠)

(ابن عباس) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: قورئانێکتان بۆ هاتۆتە خوارەوە

---

١ ـ صفحات مشرقه من التاريخ الاسلامى _صلابى (٣٠٦/٢) .

كە(فیە شرفكم)[1] وشەرەف وڕێزە بۆتـان.، ئوممـەتی ئیـسلامیش لـەو سـەردەمەوە شـەرەف مەنـد وسـەربەرزی دەسـت كـەوت كەدەسـتی گـرت بـەئاینی پـیرۆزی ئیسلامەوە وشەرعی خوای پیادەكرد .

٥- بەرەكەت كەوتە ژیان وخۆش گوزەرانی كەوتە ناوخەڵكی یەوە:

خوای - عزوجل - دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾الاعراف:٩٦.

ئەگەر خـەڵكی ئـەو ناوچـەیە باوەڕیـان بهێنایـەو لـەخوا بترسـانایە بەرەكـەت و فەڕی ئاسمان وزەویمان دەڕژان بەسەریاندابەڵام چونكە بێ باوەڕیان دەسـت دایـە، لەسەرەنجامی ئەوەدا لێیان زویر بووین و لەناومان بردن.

دەستگرتن بەشەرعی خواوە وجێ بەجێ كردنی ڕێنمونی یـەكانی جۆرەهـا فـەڕو بەرەكەتی دیارو نهێنی دەڕژێت بەسەریاندا، سوننەتی خوایش وایـە ئەگـەر بـاوەڕ و تـەقوا لەهـەر گەلێكـدا بێتـە دی خـوای گـەورە بـەم بەخـشینە خـوایی یـە مەزنـە بەهرەمەندیان دەكات .

ئەو_فـەڕو بەرەكاتـەیش كـە خـوا پـەیمانی داوە بیـدات بەبەندەڕاسـتەقینەكانی شـێوازیان زۆر، هـیچ دەقێـك سـنور داری ناكـات، مانـا شـاراوەكانی قورئـان وادەردەخـەن كـە بەخـشینێكی خـوایی یـە ولـە هـەموو لایەكـەوە دەبارێـت بەسـەر مرۆڤـداو لەهـەموو لایەكـەوە هەڵـدە قوڵێـت، بـەبێ سـنورداری وبـەبێ نـاوبردنی، بەرەكاتی خوایە بەهەموو شێوەكانی یەوە وئەوەی خەڵكی خەیاڵیان بۆی دەچێت و ئەوەشی هەر بیریان لێ نەكردۆتەوە.[2]

خەڵكی لەسەردەمی عمری كوڕی عبـدالعزیزدا بەئاشـكرا ئـەم بەرەكـەتی خـوایی یەیان هەست پێ دەكرد، ئیتر با دیاریان نادیاربوایە، خەڵكی سەرسام بوون چـونكە

---

١ ـ تفسیر ابن كثیر (٣/١٧٠) .

٢ ـ فی ظلال القران (٣/١٣٣٩) .

لەناكاو خۆشگوزەرانی هەموو ژیانی هەموو خەڵكی گرتەوە ودارایی دەوڵەت زیادی كرد، لەهەموو پارچەیەك لەپارچەكانی دەوڵەتی مەزنی ئیسلامیدا خەڵكی هەستی بەدڵنیایی دەكرت، تاوای لیّ هات زۆر كەم بوون ئەوانەی زەكاتیان پیّ دەشیاو وەریان دەگرت، تاوای لیّ هات بووبە كیّشەیەك بۆ دەوڵەمەندەكان وهەژاران زەكاتیان لیّ وەرنەدەگرتن وئەمەش ئەوەی دەخواست كەچارەیەكی خیّرای بۆ ئامادە بكریّت.

(یحیی)ی كورِی (سعید) دەڵیّت: عمری كورِی عبدالعزیز كردمی بەبەرپرسی كۆكەرەوەی زەكاتی ئەفریقیاو منیش وەرم گرت لیّیان، گەرِاوم بۆ هەژارو نەدار تازەكاتی پیّ بدەم دەستم نەكەوتووە وكەسیش نایەت لیّم وەربگریّت، چونكە عمری كورِی عبدالعزیز هەموو خەڵكی دەوڵەمەند كردبوو، بۆیە بەو پارانە بەندەمان دەكرِی وئازادمان دەكردن ودەبوون بەیەكیّك لەموسڵمانان .[1]

پیاویّك لەنەوەی زیدی كورِی(خطاب) بوو رضي الله عنه دەیووت: عمری كورِی عبدالعزیز دوو ساڵ و نیو گەورەی موسڵمانان بوو، كە(٣٠)مانگ دەكات، لەدنیا دەرنەچوو تا وای لیّ هات موسڵمانیّك دەهات وسامانیّكی زۆری دەهیّنا بۆ بیت المال ودەیووت: ئەم پارانە ببەخشن بەهەژاران، كەچی ئەوەندە هەژار نەمابوو وەری بگریّت ناچار كابرا بەسامانەكەیەوە دەگەرِایەوە بۆ ماڵەوە، چونكە عمری كورِی عبدالعزیز هەموو خەڵكی دەوڵەمەند كردبوو.[2]

ئەمەش ئەنجامی فەرِو بەرەكەتی ئەو حكومەتە قورئانی یە بوو كە عمری كورِی عبدالعزیز دروستی كردبوو شەرعی خوای تیّدا جیّ بەجیّ دەكرد .

٦- تەشەنەكردنی رِەوشت بەرزی وتوانەوەی بەدرِەوشتی:

نیّوان شەریعەت ونیّوان خەڵكی تۆكمەترین پەیوەندی هەیە، چۆن نا؟كە چەیامی ئیسلام لەگەورەترین ئامانجەكانی: رِەوشت بەرزی وچاكەكاری یە، خوای - عزوجل - یش دەفەرمویّت: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟

---

١ - رجال الفكر والدعوة (٥٨/١) .

٢ - رجال الفكر والدعوة (٥٨/١) .

عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ ال عمران: ١٦٤.

واتــە: خوانــازی نوانــدووە بەســەر موســڵمانانددا کەپێغەمبــەرێکی لــەخۆیان بــۆ ناردوون قورئانیان بەسەردا دەخوێنێتەوە و ڕەوشت و دەرونیان خاوێن دەکاتەوە و فێری ژیربێژیان دەکات و(یزکیهم)واتە: فەرمانیان پێ دەکات بەکردەوەی جوان و بــەرگریان لــێ دەکات لــەکردەوەی خــراپ تــا دەروونیــان خــاوێن دەبێت ولەپیسی وخەوشی ڕەوشت نزمــی ڕزگاریــان دەبێــت کــە لەســەردەمی دور لەخواییــدا پێــوەی دەیان نالاند.[1]

عمــری کــوڕی عبــدالعزیز زۆر گرنگــی داوە بەبڵاوکردنــەوەی ڕەوشــت بــەرزی و جەنگیشی دژی بەدڕەوشــتی ڕاگەیانــدووە، قوتابخانــەی ئامۆژگــاری وڕێپیشاندان و پەروەردەیەکــەش کەکەســانی بــەرزی وەك(حــسن البــصری)و(ایــوب السختیانی)و(مالك)ی کوڕی (دینــار) وکەســانی تــر رابەرایــەتیان دەکــرد، لــەم کــارە مەزنەدا پاڵپشتی عمر بوون، ئەم قوتابخانەیەش بەروبوومێکی گەورەو ئاشکرای لــێ کەوتەوە لەنەهێشتنی ڕەوشی ناشیرین وچەسپاندنی ڕەوشت بەرزی.

لەم ماوە کەمەی ســەردەمی عمــری کــوڕی عبــدالعزیزدا نوێگەریــەکی گــەورەهات بەسەر ئوممەتدا وکۆمەڵگەی ئیسلامی پێشکەوتنێکی گەورەو بەرچاوی بەخۆوە دی لەبواری ئارەزی پاك و ڕەوشتی جوان وحەزەکاندا .

(الطبری) لەمێژوەکەیدا دەڵێت : خەلیفە(ولید) خــەریکی بیناســازی وکردنــەوەی گارگەو شوێنی حەوانە وەبووە، خەڵکی سەردەمەکەشی بەو شێوەیان لــێ هــاتبوو، کە ئەگەر دوو کەس بەیەك بگەیشتنایە دەربارەی خانوو بیناسازی قسەیان دەکرد، هەرکە لەسەردەمی(سلیمان) هاتە پێشەوە ئەو زیاتر خەریکی ژن هێنان وخــواردنی خۆش وبەچێژ بوو، بۆیە ئەگەر دووکەس بەیــەك بگەیــشتنایە دەربــارەی ژن هێنــان وخواردنی خۆش قسەیان دەکرد، بەڵام هــەر کەســەردەمی عمــری کــوڕی عبــدالعزیز هاتە ئاراوە، خەڵکی کەبەیەك دەگەیــشتن یــەکتریان دەوت: ئــەم شــەو چــەند ڕکــات

١ ـ تفسیر ابن کثیر (٤٠١/١) .

شـەو نوێـژت کـردووە؟ وچـەند ئایـەتت لەبـەر کـردووە؟ کـەی خەتمەکـەت تـەواو دەکەیت؟ وکەی تەوات کرد؟ ولەمانگێکدا چەند ڕۆژ بەڕۆژوو دەبیت؟[1].

٧- هیدایەت ورێنموونی کردن:

وەك پێشتر باسمان کرد، عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله نامەی نووسی بۆ حاجیـانیماڵی خوا ولەوێ نامەکـە خوێنرایـەوە بەسـەر حاجیـانی هـەموو هەرێمـەکانی وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئیسلام دا وتیایدا هاتووە:_

((.....ئەگەر لەبـەر ئـەوە نەبوایـە لـەکارو ئەرکـەکانی حـەجم دەکـردن بـەدوورو درێـژی ئـەو ڕێـرەوە ڕاسـتانەم بـۆ روون دەکردنـەوە کـەخوای گـەورە بەزینـدو رای گرتـوون، هـەموو ئـەو شـتە نارەواییانەشـم بـۆ ڕوون دەکردنـەوە کـەخوای گـەورە لەگۆڕی نـاون لەناوتانـدا، لەسـەر ئـەم کارەشـم خـوای گـەورە شایستەی سـوپاس کردنە، سوپاسی کەسی تری لەسەر مەکـەن، چـونکە ئەگـەر کۆمـەکی ئـەو نەبوایـە بەسەرمەوە منیش وەك خەلیفەکانی تر دەبووم)[2].

گومانی تێدا نی یە کەعمری کوڕی عبدالعزیز زۆر هەوڵی داوە کەشەریعەتی پاکی خوا لەدەوڵەتەکەیـدا جـێ بـەجێ بکـات، لەبـەر ئـەو هۆیـەش بووکـە خـوای گـەورە گەورەترین بەخششی پێ بەخشی کە_ هیدایەت ورێنموونی _بوو.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾(النساء٦٦ _٦٨).

واتە: ئەگەر پێمان بگوتنایە خۆتان بکوژن یـان لـەماڵ وحـاڵی خۆتـان دەربـچن، نەیانـدەکرد مەگـەر کـەمێکیان نـەبێت، ئەگـەر بەوشـێوەیەی ئامۆژگاریـان کـراوە

---

١ ـ تاريخ الطبری لە رجال الفكر والدعوە (٨/١) وەرگیراوە .

٢ ـ حلية الاولياء (٥/٢٩٢_٢٩٣) .

هەڵسوكەوتیان بكردایە، زۆر باشترو ڕاوەستاوتر دەبوون، لەلایەن ئێمەشەوە پاداشتی گەورەیان دەست دەكەوت، ئەمان خستنەسەر ڕێگەی ڕاستیش.

گەلانی پێش ئیسلام بەدوو شت ئامۆژگاری كرابوون یەكەم شەریعەتی خوا پیادەبكەن وشوێن پێغەمبەرەكەی بكەون، ئەگەر وایان بكردایە خوا لەسەر پێی خۆیان دەی وەستاندن ولەرزە نەدەكەوتە دینداری یەكەیانەوە، هیدایەتی خواییان بۆ دەهات وبەهیچ لایەكدا پێیان هەڵنە دەخلیسكا، بەوجۆرەیش دەگەیشتنە ئەجرو پاداشتی گەورە.[1]

بەڕاستی خەلافەتەكەی عمری كوڕی عبدالعزیزرحمه الله بەرپەرچ دانەوەیەكی بەهێزە بۆ هەموو ئەو دەنگانەی، كە-نەفامانە-دەڵێن: ئەگەر دەوڵەتێك لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلام دابمەزرێت توشی چەندان گیروگرفت وكۆسپ وقەیران دەبێت!! لەهەموو ساتێكدا چاوەڕوانی ڕوخانی لێ دەكرێت، ئەو كارەش مەگەر لەخەودا بێتەدی، بەڵام مێژوو بەرامبەر ئەو دەنگانە دەوەستێت وپێیان دەڵێت:﴿ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾النمل: ١١،واتە: بەڵگەتان چی یە ئەگەر پیاون و ڕاستەكەن.[2]

لەكاتی هەڵدانەوەی لاپەرەكانی مێژوودا ئەوەی زیاتر سەرسامی كردم پەیوەست بوونی بەرەئیسلامی یەكانە جیل لەدوای جیل، كەلەناو بازنەیەكی یەكگرتوودا هەموویان پەیوەستن بەیەكەوە .

ئەمە سوڵتان نورالدین الزنكی كەلەساڵی ٥٦٨ی كۆچیدا گیانی سپاردوە، زانای بەتوانا ولێهاتووی (كوردی شاری هەولێر)[3] بۆی دەنووسێت ورێنموونی دەكات كەلە سەر پەیڕەو بەرنامەی عمری كوڕی عبدالعزیز هەنگاوهەڵگرێت ئەم زانایە ناوی

---

١ ـ فتح القديم (١/٤٨٥) .

٢ ـ رجال الفكر والدعوة (١/٥٩) .

٣ ـ ئەو پیاوە مەزنە زانایەكی ناوداری كوردبووە وخەڵكی شاری هەولێر قەڵاو منارە بووە.(وەرگێڕ).

( ابو حفص معین الدین) عمری کوڕی محمدی کوڕی(خضر الأربلی)بووه.

بەوشێوەیە ئەو بەروبووم وئەنجامە جوانەی کاتی خۆی بەرنامە نوێگەری یە چاکسازی یەکەی عمری کوڕی عبدالعزیز دەستی کەوت، بەهەمان شێوە لەدەوڵەتە کەی (نورالدین الزنکی) یشدا دووبارەبوویەوە، کاتێ ئەو زانا خواناسە حەق بێژە پرۆگرامی عمری کوڕی عبدالعزیزی نووسی یەوەو خستی یەبەردەستی ئەوسەرکردە سەربازی وکەسایەتی یە سیاسی یە، ئەویش پێ ی ڕازی بوو کاری لەسەر کرد.

(أبو حفص معین الدین) لەسەرەتای ئەو نامەیەیدا بۆ(نورالدین) دەڵێت:... چاك زانیت کەشوێن پێ هەڵگرتنی پێشینە چاك وژیرەکان پاداشتی تەواوی تێدایە وناویشت بەردەوام دەهێڵێتەوە، شوێن کەوتنی ڕێبازی هیدایەت دراوە راشیدەکان دەبێتە هۆی چاك بوونی مەسەلە نهێنی یەکانی مرۆڤ وژیانیشی جوان دەکات، خوای گەورەیش فەرمانی داوە بەپێغەمبەرەکەیﷺ کەشوێن پێ ی پێغەمبەرانی پێشوو هەڵبگرێت وەك دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ﴾ واتە: ئەو پێغەمبەرانە لەلایەن خواو، ڕێنموونە کراون، دەی تۆش شوێن پێیان هەڵبگرە وچاویان لێ بکە.

تێبینی ئەوەم کرد لەسوڵتاندا _خوا بیپارێزێت_ کە زۆر پێ ی خۆشە ژیان و بەسەرهات وپاشماوەکانی ئەو خەلیفە خواناسەی بۆ کۆبکەمەوە.

لەوێدا بۆم دەرکەوت کەپێویستە لەسەرم کەهاوکاری بکەم وبەوپەڕی توانام پشتی بگرم، ئەمەش لەبەر دڵسۆزیم بۆ خاوەن شکۆ وسەلماندنی برایەتیم بوو بۆی، بۆئەومەبەستەیش هەموو هەوڵێکی خۆم خستە کار بۆ کۆکردنەوەی ژیان و بەسەرهاتی خەلیفە راشید وبەختەوەر عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله لەخوای گەورەیش پارامەوە، کە بە جوانی هاوکاریم بکات وئەوکارە قورسەم لەسەرئاسان بکات.

ئەوە بوو دڵم کرایەوە بۆ ئەو کارە وهاوکاری خوایم لەخۆمدا بەدی دەکرد و دەستم کرد بەکۆکردنەوەی ژیانەکەی ونەخشەی (بیت المال)ە دەوڵەمەندەکەیم کێشا، وەك هاوکاریەك لەکاری خێرو چاکەدا.[1]

---

١ ـ الکتاب الجامع لسیرة عمر بن عبدالعزیز (١/٢) .

ئـەم زانایـە پایـە بـەرزە هەسـتا بەکێـشانی پرۆگرامێـی ورد وجـوان وپراکتیکـی _کردەوەیی_ بۆ پایەدار (نورالدین الزنکی) و(نورالدین)یـش لەسـەر بناغـەی ژیـانی عمری کوڕی عبـدالعزیز دەوڵەتەکـەی دامەزرانـد، شـەریعەتی ئیـسلامی کـردەوە بـە بەرنامەی حوکم، دادپەروەری هێنایەکایەوە، هەموو گـومرك و سـەرانەیەکی لەسـەر میللەتی موسڵمان هەڵگرت، دەستی کرد بەزیندوو کردنـەوەی ڕێـڕەو سـوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ،سەرکوت کردنی هەموو بیدعەکان،پێناسەی ئوممەتی قولڵ کردەوە.

گیانی جیهادی ڕێگەی خوای زیندوو کردەوە وزانست وزانیاری بڵاوکـردەوە، وای لەوڵات کرد پێشکەوتن خۆش گوزەرانی پێوە دیاربوو، ئەمانەی گریّ دا بـوو لەگـەڵ دنیانەویـستی و خۆپـارێزی _لـەگوناه_ وبەندایـەتی وڕاسـتگۆیی ودلـسۆزیدا، هەرکەسیش حەزدەکات بەجوانی وبەدرێژتر لەم مەسەلەیە حـاڵ ببێـت باسـەردانی کتێبی(الجهاد والتجدید فی القرن السادس الهجری _عهد نورالـدین الزنکـی وصـلاح الدین)بکات، کە(محمد حامد الناصر) نوو سیوویەتی.

شوێنەواری حوکم کـردن بەشـەریعەت وڕێبـازی خـوای گـەورە لـەناو گەلەکانـدا بەئاشکرا بۆ مێژووناسان ئاشکرا دەبێت کە ئەودەوڵەتانە لەهەمووژیانیاندا فـەرمانی خوایان جیّ بەجیّ کردبێت ولەقەدەغەکراوەکانیشی بەدور بووبن.

ئەوشوێنەوارەچـاکانەی کەبەئاشـکرا بەدەوڵەتەکـەی عمـری کـوڕی عبـدالعزیز و دەوڵەتەکەی (نورالدین الزنکـی)و(یوسـف بـن تاشـفین) و(محمـد الفـاتح)وەدیـاربوو، سوننەتی خوایش وایە وهەرگیز گۆڕانی بەسەردانایەت و بەردەوام جیّ بەجیّ دەبێت لەهەموو سەردەمێکدا ئەگەر هەرسەرکردەیەکی موسڵمان بیەوێت بەم ئاکامە بەرزە بگات وئەم کارە گەورەیە بکـات وبەدڵـسۆزی لەبـەر خـوا ئـەو هـەنگاوە هـەڵبنێت و لەسـوننەت وڕێـڕەوی نـەگۆڕدراوی خـوا حـاڵی ببێـت ولەخۆیـدا بێنێتەدی،مەحاڵـە دەگاتە ئەوئاکامە بەرزە ئیتر با پاشی ماوەیـەکی تـریش بێـت و شوێنەوارەکەیـشی بەدیار دەکەوێت لەهەموو تاکێك و کۆمەڵگاو دەوڵەت و یاساکانی دا.

مەبەستیش لەلێکۆ ڵینەوە مێژوویی یەکانی ئیسلام ئەوەیە کەسودی چـاکی لـیّ وەربگیرێـت لەئـەو گەلانـەی بـەباوەڕەوە و پـێش ئێمـەوە مـردوون، هـەر لـەجیهاد

کردنیـــان، زانـــست و زانیاریـــان، پـــەروەردەو فێرکردنیـــان، هـــەوڵی هەمیـــشەو بەردەوامیان بۆ بەرپاکردنی حوکمی شەرعی خوا لەناو کۆمەڵگادا، دەست گرتنیـان بەسوننەتەکانی خواوە وحاڵی بوونیان لیّ ی.

لەگـەڵ ڕەچـاوکردنی قۆنـاغ بەنـدی وپلەبەنـدی وبەرزکردنـەوەی ئاسـتی گـەلان بەرەو ئـەو تـەواوی یـەی کەئیسلام دەیـەوێت، هاوکـاری وکۆمـەکی مـەزنی خـوایی بەئاشکرا لەمێژووی گەلەکەماندا دیـارە بـۆ هـەموو ئـەو سـەرکردانەی کەلێبڕاوانـەو دڵسۆزانە لـەپێناو خـوای خۆیانـدا کاریـان کـردووە وشـەرعی خوایـان بـەرپاکردووە وڕەزامەندی خواشیان لەسەرووی هەموو مەبەستێکەوە بووە .

## دوارۆژەکانی ژیانی عمر رحمه الله :

### ١ـ دواین ووتـاری عمری کوڕی عبدالعزیز:

دواین ووتاری ئەو سەرکردە نوێخوازە لێهـاتووە لەخەناسـیرە پێشکەشی کـرد وتیایدا ووتـی: ((ئەی خەڵکینە، ئێوە بێهودە دروسـت نـەکراون وبـەخۆڕایش وازتـان لیّ ناهێنرێت، ئێوە وەستانێکتان هەیە لەقیامەتدا وخوای عزوجل خۆی دادەبـەزێت وحوکمتان دەدات وحوکمتان بۆ دەدات.

دەی خەسارومەندیّ بۆ کەسێك کەبێبـەش بێـت لەورەحمەتـەی خـوا کـە هـەموو بوونەوەری گرتۆتـەوە، یان بیّ بەش بێت لەبەهەشتێك کەپانتایی یەکەی ئەوەنـدەی زەوی وئاسمانەکانە.

دەی بیشزانن کەبیّ وەیی لـەویّ بـۆ کەسێك دەبێـت کەلـەخوا ترسـابێت وخـۆی لەخەشم وقینی پاراستبێت، ماڵی لەناوچووی فرۆشتووە بەماڵی هەتاهەتایی، کەمی داوە بەزۆر، ترسانی بەخەرج داوە لەم لا بۆ پێوەیی بیّ خـەم بـوونی ئـەولا، ئـەی نابینن ئێوەش لەڕێزی لەناوچواندان، دوای ئێوە کەسانی تر دێنێتـە شـوێنەکانتان، بەوجۆرەش دەبێت تارۆژیّ کەخوا خۆی دەمێنێت وبەس، هەموو ڕۆژێك مردوویـەك ئەسپەردەی خاك دەکەن ودەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، لەناوسکی زەویدا دەیشارنەوە، بـەبیّ پـشتی وبـەبیّ دۆشـەك ڕای دەکـشێنن، کـە لەخۆشەویستانی دوورکەوتـەوە،

دەستی لەدنیا بچڕا، ناو خۆڵ بوویەماڵی و چاوەڕوانی لێپرسینەوەیە، دواڕۆژی بەکردەوەکانی یەوە بەندە، پێویستی بەو لایەو دەستی لەدنیا بڕاوە.

دەی لەخوا بترسن پێش ئەوەی مردن ئێخەتان پێ بگرێت وبڕۆنە دنیاکەیەوە، ساوەڵلاهی لەم کاتەدا کەئەم قسانەتان بۆ دەکەم ونازانم کەستان گوناهتان لەمن زیاتربێت، دەی داوەی لێخۆش بوون لەخوادەکەم وپەشیمانی دەردەبڕم، نەداری و پێویستی کەستان نابیستم ئەگەر حەزنەکەم بەو پەری توانا بەدەمی یەوە پێم و پێویستی یەکەی بۆ جێ بەجێ بکەم، هەرکەسیش بەوەڕازی بێت لەگەڵماندا بژی تێکەڵی خوێن وگۆشتی خۆمی دەکەم، تا ژیانی هەردوو لامان وەك یەکی لێ دێت.

سوێند بەخوا ئەگەر جگە لەمەم بوویستایە لەخۆشی وڕاد بواردنەکانی ژیان ئەوە من زمانێکی پاراوم هەیە ودەزانم چۆن پەیدای بکەم، بەڵام لەلایەن خوا نامەیەکی کردەوی واهەیە هەقی تێدایە ودادپەروەری ڕەچاوکردووە، تیایدا فەرمانی گوێڕایەڵی خۆی داوە و بەرگریشی کردوە لەسەرپێچی کردنی .

پاشان چمکی کەواکەی بەرزکردەوە ودەستی کرد بەگریان وهاوار وهەناسە هەڵکێشان وخەڵکەکەی چواردەوریشی کردەگریان، پاشان لەسەر مینبەرەکەدابەزی، ئیتر لەوڕۆژە بەدوا تائەو ڕۆژەی گیانی پاکی سپارد_نەیان دیوە ووتار بدات رحمه الله.[1]

## ٢ـ دەرما نخوارد کردنی:

مێژوو نووسەکان جیاوازیان هەیە لەهۆی مردنەکەی عمری کوڕی عبدالعزیز و نەخۆشی یەکی سەرەمەرگی، لەکاتێکدا کەهەندێ لەڕیوایەتەکان واباسی دەکەن کەهۆی نەخۆش کەوتن ومردنی عمر دەگەڕێتەوە بۆ لەخواترسانی لەسنور بەدەری وگرنگی دانی زۆر بەئیش وکاری خەڵکی وەك چۆن (فاطمە)ی خێزانی دەگێڕێتەوە، (ابن سعد)لە(ابن لهیمه) وە ئەم هۆیەی نقلّ کردوە.[2]

---

١ ـ تأريخ الطبري (٧/٤٧٥) .

٢ ـ فقه عمر بن عبدالعزيز (١/٤٣) .

لەلایەکی ترەوە کۆمەڵێ ترلە مێژوو نووسان باس لەوەدەکەن کەدەرمان خوارد کراوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە کە(بنی أمیە) زۆر قاڵس وناڕەحەت بوون بەسیاسەتەکانی عمری کوڕی عبدالعزیز، کە لەسەر بنەمای هەق ودادپەروەری دای مەزراندبوو، بێ بەشی کردبوون لەخۆشی وڕابواردنێك، کەبەس خۆیانی تێدابوو خەڵکی لێ ی بێ بەش بوون، بەڵکو وای کردبوو لە(بنی أمیە)، کە دوری خستنەوەو هیچ بەدەستی کردبوون لەدەوڵەتەکەیدا و هەموو ئەو شتانەی بەناڕەوا گەیشتبووە دەستیان لێ ی سەندنەوەو دایەوە بەخاوەنەکانی ونەیدەهێشت بەئارەزووی خۆیان لەناودەوڵەتدا پێ دابگرن، بۆیە هەندی لە(بنی أمیە) ژەهریان بۆ کردە خواردنەوەو پێیان دا.[1]

ئەمەش بەدورنازانرێت کە کەسێك لە(بنی أمیە) هەستێت بەدەرمانخوارد کردنی، تا ڕزگاریان ببێت لەدەستی، ئەمەش بەهۆی خزمەتکارەکەیەوە کەژەهری بۆ بکاتە ناو خواردن وخواردنەوەکەی، دەگێرنەوە پەیمانی (١٠٠٠)دینارو ئازاد کردنیان پیدا بوو ئەگەر نەخشەکەی سەرکەوتوو بێت، خزمەتکارەکەش نەیدەزانی چی بکات وڕارابوو لە کردنی ئەو کارە گوناهە گەورەیەدا، بەڵام ئەوان هەڕشەی کوشتنیان لێ کرد ئەگەر ئەو کار جێ بەجێ نەکات وئەو خزمەتکارە نەگبەتەش لەنێوان ترساندن وپاڕپێداندا ناچار خۆی یەکلایی کردەوە بۆ ئەو کارە ناڕەوایەو ژەهرەکەی کردبووە سەر پەنجەی و کاتێ خواردنەوەکەی بۆ عمر دانا بەدزیەوە وەراندیە ناویەوە وخستیە بەردەستی عمر وئەویش هەمووی خواردەوە ولەوساتە وەختەدا هەستی کرد شتێ چووە ناو گەدەیەوە.[2]

(مجاهد) دەگێڕێتەوە وەدەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز پێی ووتم: خەڵکی دەربارەی من چی دەڵێن؟ دەڵێ ووتم: دەڵێن جادووت لێ کراوە، ئەویش ووتی: مەسەلەکە جادوو نی یە.

پاشان خزمەتکارێکی خۆی بانگ کرد وپێ ی ووت: بێ قەزابی یاخوا! لەبەرچی

---

١ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (٤٣/١) .

٢ ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز (ابن الجوزی) لا ٣١٦، ٣١٧ .

دەرمـــانخواردت کردم؟خزمەتکارەکـــەش ووتـــی:لـــە پێنـــاوی هـــەزاردینارو ئـــازاد کردنیشمدا.

عمـر پـیّ ی ووت: دەی هەزاردینارەکـە بێنـە! وئـەویش هێنـای وعمـریش لـیّ ی سـەندو خـستی یـە (بیـت المـال)! وپـیّ ی ووت: بـڕۆ خـۆت وون کـە باکـەس پێـت نەزانێت، واتە: ئەگەر پێت بزانن دەتکوژن.[1]

کەواتە هۆی ڕاستەوخۆی مردنی ئەمیری باوەڕداران وەك ڕیوایەتەکان دەگێڕنەوە بەهۆی دەرمانخوارد کردنی یەوە بووە.[2]

### ٣ـ لێبوردەیی بێ سنوور:

ئەوەی بەسەر عمردا هێنرا ولەئەوجی لاوێتی دا کەتەمەنی (٤٠_٤١) سالآن بـوو، کەبـەپیلانی خزمـەکانی ولەڕێگـەی خزمەتکارەکەیـەوە هـەوڵی تیرۆرکردنـی دراو سەریشی گرت، کەچی وەك سەرکردەکانی ئەمڕۆ نەهات دادگای سەربازی گەورەیان بۆ دروست بکات ویەك یەك هـەموویان لـەدار بـدات وناویـان لـیّ بـنیّ کودەتاچی یەکان!

بەلآم عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله ئەوەنـدە دڵـی بەکورسـی یەکـە خـۆش نـی یـە، ئەوەنـدیش ژیـانی خـۆی بـەلاوە خۆشەویـست نـی یـە، تـا خـەڵکی لەسێدارەبدات لـەپێناوی خۆیـدا بـەڵکو وانەیـەکی لەخەلیفـەی سـیّ یـەمی پێغەمبـەری خـواوە وەرگرتووە کەگیانی خۆی ومالّ ومندالّ و خەلیفەیی لەدەست دا لـەپێناوی ئـەوەدا، کـەخوێنی یـەك موسـڵمان نـەڕژێت لەسـەر ئـەو ونەیهێـشت بـەرگری لـیّ بکـەن لەئاژاوەگێڕەکان ئەمە دەکرێـت بـەژێرەوە، بـەلآم گـەنجێك لەئـەمریکا تەقـەدەکات لەسەرۆك کۆمارو بریندارى دەکات وئەویش دەڵێت لـیّ ی ببـورن چـونکە ئـەوە ڕای خۆی بووە و بەفیشەك دەری بڕیوە.[3]

---

١ ـ تذكرة الحفاظ (١٢٠/١) .

٢ ـ فقه عمر بن عبدالعزيز (٤٤/١) .

٣ ـ ووتەی وەرگێڕ .

ئەمە کەی لێبوردنە بەرامبەر بەمەزنی لێبوردەیی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله، کەنە دادگایی خزمەتکارەکەو نەلەژێر فشاری سزاداندا ناچاری کردبێت کەدان بەتاوانەکەیدا بنێت وپاشانیش یەك یەك ناوی ئەو کەسانە بلێت کەئەم پیلانە یان دارشتووە _ئەمەش ئەو پەڕی لێبوردەیی یە_ چونکە عمر بۆ دنیایەکی گەورەترو خۆشترو هەمیشەیی دەیڕوانی کەڕۆژی قیامەتە، هەروەها لە ولێبوردنەیشدا پاداشتی گەورەو نەبڕاوەی دەست دەکەوێت لەلای خوای گەورە، دەیزانی ئەگەر بیانگرێت وتۆڵەیان لێ بکاتەوە زۆر ئاسانە بەڵام لەپاداشتی لێبوردن بێ بەش دەبوو لەلای خوای گەورە، بۆیە لێبوردنی هەڵبژارد بەسەر تۆڵەسەندنەوە بۆڕازی کردنی دەروونی خۆی.[1]

### ٤ـ بە پارەی خۆی جێگە قەبری خۆی کڕیوە:

خۆبەکەم زانین و ـ تواضع ـ ی عمر گەشتبووە ئاستێك کاتێك هاوڕێکانی باسی ئەوەیان کرد کەئەو ژورەی گۆڕی پێغەمبەری نازدار(ص)و(ابوبکر)و(عمری کوڕی خطاب) لێ یە جێگایەکی خاڵی تێداماوە، پێیان ووت: ئەوە بۆچی لەمەدینە نزیك نابیتەوە تا لەوێ بتنێژن.

عمر لەوەولامدا ووتی: ((والله لئن یعذبنی الله عذاباً _الاّ النار فانی لاصبربی علیها _احب الیَّ من ان یعلم الله من قلبی انیّ أرانی لذلك اهلا)).[2]

واتە: سوێند بەخوا ئەوەم پێخۆشترە کەخوای گەورە سزام بدات _جگە لەئاگری دۆزەخ چونکە توانای خۆگرتنم نی یە _ نەك ئەوەی خوای گەورە بزانێت لەناو دڵمدا هەست بەوە بکەم کەشایانی ئەو جێگایەم _ واتە لەتەنشتی ئەو سێ زاتە بەرێزەوە بنێژرێم.

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله قبولی ئەوەی نەکرد بەڵکو ئەوەی پێخۆش بوو کەبەپارەی تایبەتی خۆی جێگا گۆڕەکەی خۆی بکڕێت، ئەمەش بەهۆی خۆلە

---

١ ـ التاریخ الاسلامی (١٦/٢٢٩) .

٢ ـ سیره عمر بن عبدالعزیز (ابن الجوزی) (٣٢١_٣٢٤) .

حەرام پارێزی و لێپرسینەوەی خۆیەوە بووە.

بۆیە لەکاتی سەرەمەرگیدا ووتی بەیارانی چواردەوری: جێگاگۆڕێکم لەوڕاهیێبە گاورە بۆ بکڕن، بەڵام گاورەکە ووتی: سوێند بەخوا ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەوەخێرێکی زۆر گەورەیە بۆمن کەگۆڕەکەت لەلای ئێمە دابێت و ئێمە بەچاوی _تەبەڕوکە_ وەبۆی دەڕوانین، بۆیە ئەو زەویەت پێ دەبەخشین بەبێ بەرامبەر، بەڵام عمر قبوڵی ئەوەی نەکرد ووتی: یان دەبێت جێگە گۆڕەکەم پێ بفرۆشن یان ئەوەیە لەجێگایەکی تر دەیکڕم، پاشان پارەکەی پێ دان _کەدەڵێن دوو دینار بووە، یان دەڵێن (٦)دینار بووە، دەشڵێن (٣٠)دینار بووە، کاتێ خستیانە مشتی گاورەکەوە، وەری گرت ووتی: ئەگەر لەوەنە ترسایناپە کەلە شوێنی تر زەوی بکڕێت ولەئێمە دوور بکەوێتەوە ئەوا پارەمان لێ وەرنەدەگرت.[١]

### ٥ـ وەسیەتنامەکەی عمر بۆ خەلیفەی داهاتوو:

عمری کوڕی عبدالعزیز ﷺ نامەیەکی نووسی بۆ یەزیدی کوڕی عبدالملك(کەلەکاتی سەرەمەرگدا بوو) پێ ی ووت:

((بسم اللە الرحمن الرحیم، لەبەندەی خوا عمر _ئەمیری باوەڕداران_ بۆ_(یزید)ی کوڕی(عبدالملك)، سەلامی خوات لێ بێت، من سوپاسی ئەو خوایەت بۆ دەکەم کەجگە لەو خوای تر نی یە.

پاشان... لەکاتێکدا ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم من نەخۆشی زۆری بۆ هێناوم _وچاك بزانە من بەپرسیارم لێ دەکرێت، لەلای پادشای دنیاو قیامەت_ دەربارەی ئەو کەسەی دوای خۆم دیاری دەکەم، لەوکاتەشدا ناتوانم هیچ شتێك لەکردەوەکانم بشارمەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾الاعراف: ٧،واتە: هەموو کردەوەیەکی مرۆڤەکان دەزانین ولەقیامەتدا بۆیان دەگێڕینەوە چونکە ئێمە هیچمان لێ وون نابێت.

ئەگەر خوا بەبەزەیی لێم ڕازی بێت ئەوە سەرکەوتووم ورزگارم بووە لەبەلاو

---

١ ـ سیرە عمر بن عبدالعزیز (ابن الجوزی) لا ٣٢٢_٣٢٣ .

ناڕەحەتی دوورو درێژەکان، بەڵام ئەگەر لێم ڕازی نەبێت ولێم زویر بێت، دەی قوڕبەسەرم پەنا بۆ کوێ بەرم؟ دەی داواکارم لەوخوایەی کەتەنهایە وجگەلەو خوای تر نی یە کەلە ئاگری دۆزەخ بمپارێزێت، ڕەزامەندی خۆی وبەهەشتم پێ ببەخشێت، تۆش لەخوا بترسە، ئاگات لەمیللەتی ژێردەستەت بێت، میللەت،چاك بزانە تۆش دوای من زۆر لەدنیا نامێنیتەوە ودەگەڕێیتەوە بۆلای خوای بەئاگاو بەبەزەیی و سۆز.[1]

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێت:..(سلیمان)ی کوڕی (عبدالملك) بەندەیەك بوو لەبەندەکانی خوا، خوای گەورەگیانی کێشاو منی خستە شوێنەکەی و هەر ئەویش منی هەڵبژارد بەخەلیفەی دوای خۆی و(یزید)ی کوڕی(عبدالملك)یش لەدوای من، بزانە ئەگەر کاربەدەستی وخەلافەت بۆ زۆر هێنان وپارەکۆکردنەوە، بوایە، ئەوە خوای گەورە پلەیەکی وای پێدابووم کەدەمتوانی بەچاکترین شێوە هەموویم چنگ بکەوێت بەڵام من لەلێپرسینەوەی ترسناك وپرسیاری ورد دەترسام_مەگەر کەسێك خوای گەورە کۆمەکی کردبێت، والسلام علیکم ورحمه الله وبرکاته.

عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەکاتی نەخۆشی وسەرەمەرگدا بەئەو پەڕی تواناو ئەوپەڕی دڵسۆزیەوە ئامۆژگاری وئاراستەکانی خۆی پێشکەشی(یزید)ی کوڕی(عبدالملك)کرد وبەئەو پەڕی هەوڵدان هەوڵی دا بەهەموو شێوەیەك لەسەرەنجام وڕۆژی لێپرسینەوە.بیترسێنێت، بەنموونە هێنانەوە، بەباس کردنی کەسانی لەدنیا دەرچوو، بەڕاستی ئامۆژگاری خۆی پێ گەیاند بەتێروتەسەلی.[2]

### ٦- وەسیەتنامەی عمر رحمه الله بۆ منداڵەکانی:

کاتێ عمر رحمه الله لەمردن نزیك بوویەوە(مسلمە)ی کوڕی(عبدالملك) چووە ژورەوە بۆلای وپێ ی ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، تۆ دەمی منداڵەکانی خۆتت گرتۆتەوە لەپارەو سامانی (بیت المال)، چۆنە ئەگەر وەسیەت بەمن یان بەکەسێکی تر بکەیت

---

١ ـ سیره عمر (ابن الجوزی) ٣١٨_٣١٩ .

٢ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (٤٧/١) .

کەدوای خۆت لایەکیان لێ بکەینەوە وپێداویستیەکانیان دەربکەین.

عمر کاتێ ئەم قسەیەی بیست، ووتی: ،دامنیشێنن، کاتێ دایان نیشاند ووتی: چاك گوێم لەووتەکانت بوو(مسلمه)، ئەوەی کە دەڵێیت: تۆ پارەو سامانت لەمنداڵەکانت گرتۆتەوە! دەی سوێند بەخوا یەك مافی خۆیان لێ زەوت نەکردوون، هەرگیزیش بەناڕەوا هیچم نەداونەتێ .

ئەوەشی کەدەڵێیت: وەسیەتێکمان پێ بکە بۆیان، دەی وەسیەتی من ووتەی پەروەردگارە بۆیان﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ الاعراف: ١٩٦، واتە: خوای گەورە کەقورئانی ناردوە پشت وپەنای صالحانە).

منداڵەکانی عمر لەدوو جۆر بەدەر نین: یان ئەوەیە صالح و پیاوچاکن ئەوە خوا دەوڵەمەندیان دەکات. وئەگەر واش نەبن دەی هەرگیز من بەپارەو سامان هاوکاری کەس ناکەم لەسەر گوناە وتاوان.

(مسلمه) منداڵەکانم بۆ بانگ بکەن، ئەوانیش هاتن، کاتێ چاوی پێیان کەوت چاوەکانی بوون بەگۆمی ئاو، ووتی: لەترسی خۆم منداڵەکانم بەهەژاری بەجێ هێشتووە ودەستی کرد بەگریان ووتی: من خێروبێرێکی زۆرم بۆ بەجێ هێشتوون، لەمەولا بدەن بەلای هەر موسڵمانێکدا، یان هەرکەسێك لە(اهل الذمه)دا ئەوە دەزانن کەمافتان هەیە بەسەریانەوە، کوڕەکانم: من لەنێوان دوو کاردا بووم: یان ئەوەبوو پارەوپولی چاکم بخستایەتە بەردەستتان بەڵام خۆم بچومایەتەناو ئاگری چ هەننەم، یان ئەوە بوو بەهەژاری بمژیاندنایە وخۆم بچوومایەتە بەهەشتەوە، دەی من هەژاریەکەتانم پێ خۆشتربووە، دەی هەڵسن خوا بتانپارێزێت، هەڵسن خوا ڕزق و ڕۆزیتان بدات.[1]

لەڕیوایەتێکدا هاتووە: عمرڕحمه الله وەسیەتی کرد بۆ(مسلمه) کەئامادەی مردنەکەی بێت وکاروباری شۆردن وکفن کردنی بگرێتە ئەستۆ، لەدوای تەرمەکەی بێت بەرەو گۆڕستان، یەکێك بێت لەوکەسانەی کەدوای دەهێڵنە گۆڕەکەیەوە،

---

١ ـ سیره عمر ( ابن عبدالحکم) لا ١١٥ ، ١١٦ .

پاشان سەیرێکی کرد وپێ ی ووت:

بڕوانە _مسلمە_لەچ ماڵێکدا بەجێم دەهێڵێت، لەچ حاڵێکی دنیاییدا دەمدەن بەدەستەوە؟! (مسلمە)یش پێ ی ووت: ئەمە هەزار دینارە بیگرە، بۆکێ پێت خۆشە بیبە خشە پێ ی ....وعمریش ووتی: ئەی شتێك لەوەش باشتربێت ئەی (مسلمە)؟ ئەویش ئەوەیە کەلەکوێ وەرت گرتووە بێگێڕەوە بۆ ئەو شوێنە.

(مسلمە)یش ووتی:خوا لەجیاتی ئێمە پاداشتی خێرت بداتەوە ئەی ئەمیر، سوێندبەخواکۆمەڵێ دڵی ڕەقت نەرم کرت، یادگاری صاڵحانت لەناوماندا نوێ کردەوە.[1]

لەژیانی پیاوانی پێشوودا، پەندو ئامۆژگاری هەیە، لەنموونەی یەکەمدا خۆپاراستن ی عمری کوڕی عبدالعزیز دەردەکەوێت لەگوناه وحەرام خواردن، تەنانەت لەکاتی ئامۆژگاری کردنی کوڕەکانی بۆ دوای مردن، بەجۆرێ کەڕازی نەبوو وەسیەت بۆ منداڵەکانی بکات لەسەرەمەرگدا کەلە(بیت المال) پارەیەکیان بۆ دیاری بکات کە مافی خۆیان نەبێت، ئەوکاتە بەوگوناهەوە دەگەڕێتەوە بۆلای خوای (عزوجل)، بۆیە وای بەباش زانی بیانداتە دەستی خوای گەورە.

لەبەخێو کردنی ماڵ و منداڵەکەیدا دووڕێگەی لەبەردەمدابوو: یان ئەوەبوو لەسەر حیسابی(بیت المال)ی موسڵمانان بەناڕەوا دەوڵەمەندیان بکات، ئەکاتە دووچاری کلّپەی ئاگری جەهەنەم دەبێت، یان ڕازی بێت بەوەی تەنها لەمووچە کەمەکەی خۆی خەرج بکات بۆیان، بەخێویان بکات، بۆیە ڕێگای دووەمی هەڵبژارد، لەگەڵ دڵنیابوونیشی بەوەی کە خوا نایان فەوتێنێت.

لەوەش دڵنیای کردن، کە ناوبانگێکی چاکم بۆ بەجێ هێشتوون، جێگای ڕێزو مێهرەبانی هەموو موسڵمانان و(اهل الذمە)دەبن لەدوای مردنی، ئەوەش لەهەموو میراتی یەك باشترە، بەڵکو لەلای بیر ڕوناك و ژیرمەندەکان گەورەترین سەرمایەیەو بەسامان مەزەندە ناکرێت.

---

١ ـ سیرە عمر ( ابن عبدالحکم) ١٢٢_١٢٣.

مەبەست لەووتەکەی کەدەڵێت: ((نەوەکانی عمر لەنێوان دوو جۆرکە سدان، یان پیاو چاك وموسڵمانن ئەوە خوا خۆی وەزعیان باش دەکات، یان ئەوەیە چاك نین دەی من نابەم بەیەکەمین هاوکاریان (بەپارە) بۆ کاری سەرپێچی کردنی پەروەردگار)).

لەم ووتەیەدا عمر دەیەوێت ئەوەیان تێ بگەیەنێت، کەخوای گەورە لەگەڵ دۆست و ئەولیاکانی خۆیدایە ودەیانپارێزێت، ئەمەش ئامارەیە بۆ ئایەتی ﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى الصَّالِحِينَ﴾.

کەمەبەست لەم ئایەتەئەوەیە مرۆڤ ئەو پەری گرنگی بەپەروەردەکردنی منداڵەکانی بدات و ڕەوشتیان چاك بکات تاخوای گەورە لەدوارۆژدا بیانپارێزێت، گرنگیش ئەوە نی یە کە بەدەوڵەمەندی بەجێیان بهێڵێت وئەگەر گوناە بارو پیاو خراپ دەربچن ئەوە پارەکەی ئەم دەبێتەیارمەتی دەروهاوکاریان لەسەر گوناە و سەرپێچی کردنی خوای تەعالا.[1]

لەبەسەرهاتی دووەمدا، عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله دەیەوێت ئامۆزاکەی (مسلمە)لەوە حاڵی بکات کەماڵ و سامان دەبێت حەڵاڵ بێت وسەرچاوەکەی زانراوبێت، هەربەوەش حەڵاڵ نابێت کەخاوەنەکەی بیکات بەخێر یان بیبەخشێت، ئەگەر مرۆڤیش بۆی دەرکەوت پارەکانی هەموویان حەڵاڵ نین و سەرچاوەکانیان پاك نین دەبێت هەوڵ بدات بیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان و خۆی وماڵ منداڵی لەتیکەی حەرام بپارێزێت نەك دڵی بەوەخۆش بکات کەبیانبەخشێت ویان بیانکات بەخێر خوا لێ ی خۆش دەبێت وپارەکانی حەڵاڵ دەبێتەوە.[2]

## ٧ـ وەسیەت دەکات بۆ نێژەرانی:

لە(رافع)ی کوڕی (حفص المدنی)یەو دەگێڕنەوە کە عمری کوڕ عبدالعزیز بە(رجاء)ی ووت: ئەگەر مردم وشوردمتانوکفنتان کردم ونوێژتان بەسەرەوە خوێندم وپاشان داتان هێلامە گۆڕەکەمەوە، سەرم بکەنەوە وبزانن ڕووم لەقیبلەیە

---

١ـ التاريخ الاسلامی (٢٢٢/١٦) .

٢ ـ التاريخ الاسلامی (٢٢٢/١٦) .

یان نا، ئەگەر ڕووم لەقیبلەبوو ئەوە سوپاس وسەنای خوا بکەن، ئەگەر واش نەبووم وخەڵکەکەش لەسەر قەبران مابوون _بەو ڕووداوەی من_ بیانترسێنن لەخوای گەورە.

دەڵێ: کاتی_رجاء_ بەنەرمی ولەسەر خۆ سەری هەڵدایەوە دەبینی ڕووی لەقیبلەیە، هەرهەمووومان بەدەنگی بەرز(الحمد لله)مان کرد وسوپاسی پەروەردگارمان کرد لەسەر ئەو دیمەنە کاریگەرە.[1]

## ٨ـ کۆتا پاداشتی موسڵمانە:

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله دەڵێت: (پێم خۆش نی یە. نارەحەتی گیان کێشانم لەسەر سووك ببێت، چونکە ئەوە کۆتا پاداشتی خوایە بۆ موسڵمانان لەسەر نارەحەتی یەکان).[2]

لەریوایەتێکی تردا هاتووە کەووتوویەتی: (پێم خۆش نی یە نارەحەتی و سەکەراتی گیان کێشانم لەسەر سووك ببێت چونکە ئەوە کۆتا هۆکارە بۆ هەڵوەرینی گوناهی موسڵمان)[3]

## ٩ـ لەکاتی گیان کێشاندا:

کاتی سەرەمەرگی عمر هاتە پێشەوەرحمه الله وەك هەموو مرۆڤێکی تر کە ئەجەلێکی دیاری کراوی_هەیە_ بەهاوڕێکانی ووت: بڕۆنە دەرەوە کەسم لەلانەمێنێت، هەموو هاتنە دەرەوە (فاطمە)ی خێزانی (مسلمەی کوڕی عبدالملك)ی برای لەبەر دەرگاکەیدا وەستابوون وگوێیان لیّ بوو دەیووت:سڵاو لەم دەمووچاوانە،کەنەدەم و چاوی مرۆڤن ونەدەم وچاوی جنۆکە.[4]

لەریوایەتێکدا دەڵێن: (فاطمە کچی عبدالملك)ی خێزانی دەڵێت: من گوێم لێی

---

١ ـ الكتاب الجامع لسيره عمر بن عبدالعزيز (٢/٦٤٤) .

٢ ـ الكتاب الجامع لسيره عمر بن عبدالعزيز (٢/٦٤٨) .

٣ – هەمان سەرچاوە.

٤ ـ الكتاب الجامع لسيره عمر بن عبدالعزيز (٢/٦٥٢) .

بـوو لـەکۆتا ڕۆژەکـانی نەخۆشـی یەکەیـدا دەیـووت: خوایـە مردنەکـەم لەخـەڵکی بشارەوە ئیتر بایەك سەعاتیش بێت، ئەو ڕۆژەی کەگیانی سپارد تیایدا لەژورەکەی چوومەدەرەوە و لەو دیوی دەرگاکەیەوە دانیشتبووم، گوێم لـێ بـوو ئـەم ئایەتـەی قورئـانی دەخوێنـد: ﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ القصص: ٨٣ .

واتە: دوا ڕۆژی چاك وقیامەت بـۆ ئـەو کەسـانەیە کەلـەدنیا گـەورەیی وبـەرزییان نەویـستووە وخراپەکاریـشیان بـرەو پـێ نـەداوە، سـەرەنجامیش هـەر بـۆ لـەخوا ترسەکانە.

(فاطمـە)دەڵێـت: پاشـان بـێ دەنـگ بـوو، نـەدەنگێ نەووتەیـەك، نەچـرپەیەکی نەبوو، ووتم بە خزمەتکارێك کەخزمەتی دەکـرد: بـۆ ناچیتەژوورەوە وسـەرێکی لـێ بدەیت! وئەویش چووە ژوورەوە وهاوارێکی کرد، منیش بەخێرایی چوومەژوورەوە و دەبینم ڕووی کردۆتە قیبلە وبەدەستێکی چاوەکانی خۆی نوقاندوە وبەدەستەکەی تریشی دەمی خۆی داخستووە، گیانی سپاردوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت.[١]

لەڕیوایـەتێکی تـردا بـەو جـۆرە هـاتووە کـەدەڵێت: عمـری کـوڕی عبـدالعزیزرحمه الله لەنەخۆشی یەکەیدا کەبەهۆیەوە گیـانی سـپارد، بەخـەڵکەکـەی ووت: دامنیـشێنن!، ئەوانیش دایان نیشاند، پاشان ووتی:- ئەی خوایـە مـن ئـەو کەسـەم فـەرمانت پـێ دەکردم و مـن کەمتـەر خـەمیم دەکـرد، بـەرگریت لـێ دەکـردم ومنـیش سەرپێـچیم دەکردی، بەڵام هیچ خوایەك نی یە تەنها (الله)نەبێت_لااله‌الاالله.

پاشان سەری هەڵبڕی و زۆر بەوردی سەیری ئەم لاولای دەرکرد، پێیان ووت: تـۆ زۆر بـەوردی سـەیری ئـەم لاولادەکـەیت، ووتـی: مـن کەسـانێك دەبیـنم لێـرەن کـە نەجنۆکەن ونەمرۆڤن، پاشان گیانی پاکی بەخوای خۆی سپاردرحمه الله.[٢]

لەناو مۆرەکەیدا ـ موستیلەکەی دەستی ـ نووسرابوو((عمـر بـن عبـدالعزیز یـؤمن بالله))، واتە: عمری کوڕی عبدالعزیز باوەڕی بەخوا هەیە.

---

١ ـ الكتاب الجامع لسيره عمر بن عبدالعزيز (٢/٦٥٣) .

٢ ـ الكتاب الجامع لسيره عمر بن عبدالعزيز (٢/٦٥٤) .

## ١٠- ڕۆژی مردنەکەی:

خەلیفەی دادپەروەرو دنیانەویست عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەڕۆژی جومعەی ٢٠ی رەجەبی ساڵی ١٠١ی کۆچیدا گیانی پاکی بەخوای خۆی سپارد، ئەمەش ڕاسترین ڕیوایەتە لەوبارەیەوە، نەخۆشی یەکەی ماوەی(٢٠)ڕۆژی خایاند، لە(دیر السمعان)لەناوچەی(المعرة) لەشام ولەدوای دووساڵ وپێنج مانگ وچوار ڕۆژ خەلافەت کردن ولەوکاتەدا تەمەنی(٣٩)ساڵ بووەو هەندێکی تر دەڵێن(٤٠)ساڵ بووە.[1]

## ١١- لەدوای خۆی چەندێ سامانی بەجێ هێشت؟

ڕیوایەتەکان جیاوازیان هەیە لەبڕی ئەو پارەو موڵك وسامانەی عمری کوڕی عبدالعزیز بەجێ ی هێشتووە لەدوای مردنی، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوەن کەزۆر کەم وبێ نرخ بووە.[2]

لەو ڕیوایەتانە: عمری کوڕی حفص المعیطی،دەڵێت:عبدالعزیزی کوڕی عمری کوڕی عبدالعزیز بۆی گێڕاینەوە ودەیووت: ووتم: چەندێ پارەی بۆ بەجێ هێشتن؟ و ئەویش زەردەخەنەیەکی کرد ووتی: خزمەتکارێکمان، کە هەموو خەرج کردنەکانی عمر لەدەستی ئەودا بوو بۆی باس کردم ووتی: عمری کوڕی عبدالعزیز لەسەرەمەرگدا پێی ووتم:چەندێ پارەمان هەیە لەلات؟دەڵێ:ووتم: تەنها (١٤)دینار. پێم ووت: ئەی دیاری وبەخشینێ؟ ووتی:(٦٠٠)دینار کە عبدالملك دیاری کردبوو، ئێمەیش(١٢)کوڕ و(٦)کچ بووین ودابەشمان کرد بۆ پانزە بەش.[3] و ڕیوایەتی ڕاستدا(١١)کوڕ مابوون چونکە(عبدالملك)پێشتر کۆچی کردبوو.

## ١٢- بەرەکەتی پارەی حەڵاڵ:

کوڕانی عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەپاشەڕۆژدا هەموویان وەزعیان باش بوو، هەندێکیشیان دەوڵەمەند بوون، بەڵام نەوەی هەندێ لەخەلیفەکانی تری ئوممەوی

---

١ ـ تاریخ القضاعی لا ٣٦٣ .

٢ ـ تذکرة الحفاظ (١/١١٨) .

٣ ـ سیرة عمر (ابن الجوزی)لا ٣٣٧ .

بینراوە سواڵیان کردووە.[١]

(ابن الجوزی)دەڵێت: بیستوومەکە خەلیفە(منصور)بە((عبدالرحمن)ی کوڕی(قاسم)ی کوڕی(محمد)ی کوڕی ابوبکر الصدیقﷺ ی ووت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش ووتی: عمری کوڕی عبدالعزیز مردو(١١) کوڕی لێ بەجێما، هەموو میراتی یەکیشی(١٧)دینار بوو بە(٥)دیناری قوماشی کفنەکەی بۆ کڕرا،(٢)دیناریشی بۆ کڕینی جێ گۆڕەکەی، ئەوەیشی مایەوە دابەش کرا بەسەر منداڵەکانیدا. هەرکوڕێکی(١٩)دەرهەمیان بەرکەوت!، بەڵام کاتێ هشام ی کوڕی عبدالملك مرد ئەویش (١١)کوڕی لێ بەجێما، کاتێ سامانەکەی بەش کرا هەرکوڕەو هەزارهەزاری بەرکەوت - ملیون -!. بەڵام ڕۆژان ڕۆشتن وڕۆژان هاتن ویەکێ لەنەوەکانی عمری کوڕی عبدالعزیزم بینی ولەیەك ڕۆژدا باری(١٠٠)وڵاخ شت ومەکی لەپێناوی خوادا بەخشی! بەڵام یەکێ لە کوڕەکانی (هشام)م بینی خێریان پێ دەکرد.[٢]

لەمەی پێشووەوە بۆ مان دەردەکەوێت کەئەو پارە زۆرەی کە(عمر)لەباوکی یەوە بۆی بەجێ مابوو لەژیانـدا لێ ی خەرج کردبوو تا تەواو بوو واتە دەستی نەبردبوو بۆ سامانی (بیت المال)ی موسڵمانان تا ئەوڕۆژەی گیانی پاکی بەخوای پەروەردگار سپارد.[٣]

### ١٣- خەڵکی باسی چاکەی عمری کوڕی عبدالعزیز دەکەن:

١- (مسلمە)ی کوڕی (عبدالملك)کە ئامۆزای بوو. کاتێ عمر کۆچی کرد وکفن کرابوو_ ووتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت! بەڕاستی کۆمەڵەدڵانێکی ڕەقت بۆ نەرم کردین، یادگاری صاڵحانت لەناو ماندا نوێ کردەوە.[٤]

---

١ - ووتەی وەرگێڕ .

٢ - سيرة عمر (ابن الجوزی) لا ٣٣٨ .

٣ - فقه عمر بن عبدالعزيز (٥٦/١) .

٤ - سيرة عمر (ابن الجوزی) لا ٣٢٩ .

٢- (فاطمە)ی کچی عبدالملك: (وهیب)ی کوڕی(ورد) دەگێڕیتەوە ودەڵێت: بۆیان باس کردووین کەکاتیێ عمری کوڕی عبدالعزیز لەدنیا کۆچ دەکات، زاناکان بۆ سەرەخۆشی کردن لە(فاطمە)ی خێزانی دەچنەلای وپیێ ی دەڵێن: ئێمە هاتووین سەرەخۆشی عمرت لیێ دەکەین، بەڕاستی هەموو ئوممەت کۆسیان کەوت، دەی تۆش ڕەحمەتی خوات لیێ بێت کەمیێ باسی عمرمان بۆ بکە: کەهەڵس وکەوتی لەماڵدا چۆن بووە؟ چونکە کەس وەك ژن پیاوەکەی خۆی ناناسێت.

(فاطمە)یش ووتی: لەنوێژ وڕۆژوودا لەئێوە زیاتری نەبوو، بەڵام سوێند بەخوا کەسم نەدیوە ئەوەندەی عمر لەخوابترسێت، وەڵلاهی خۆشترین کاتی پیاو ئەوکاتەیە بەماندوویی دێتەوە لای خێزانی وئارامی یەکی بۆ دێتەوە، شەوانە نێوان من وئەو لێفەیەك بوو، هەرئەوەندەم دەزانی بیرێکی لەگەورەیی خوا دەکردەوەو ڕادەپەری ودەستی دەکرد بە باڵەتەبە وەك چۆن باڵندەیەك بکەوێتە ناو ئاوێکەوە، پاشان دەستی دەکرد بەگریان تاوام لیێ دەهات دەممووت: وەڵلاهی خۆی نەکوژیێ باشە، پاشان بەزەییم پێدا دەهاتەوەو لێفەکەم لەسەر هەردووکمان لادەدا پێم دەووت: خۆزگە وسەدخۆزگە ئەوەندەی نێوان ڕۆژ هەلات وڕۆژئاوا لەخەلافەتەوە دوور بووینایە، وەڵلاهی لەوەتی تیێ ی کەوتووین خۆشیمان نەدیوە.[1]

٣- (الحسن البصری): کاتیێ هەواڵی مەرگی عمری کوڕی عبدالعزیزیان دا بەشێخ(حسن البصری) ووتی: ((انا لله وانا الیه راجعون)) ئەی خاوەنی هەموو چاکەیەك.[2]

٤ـ (مکحول) یەکێکە لەزانا ناو دارەکانی (فقە الاسلامی) دەڵێت: نەمدیوە کەسێك لەعمری کوڕی عبدالعزیز زیاتر دنیانەویست و لەخواترس بووبێت .

٥- (یزید)ی کوڕی (حوشب) دەڵێت: هەرگیز نەمدیوە، هیچ کەسێك بەوێنەی (حسن البصری)و (عمری کوڕی عبدالعزین) لەخواترس بووبێت[3]، وەك بلێیێ ی ئاگر

---

١ ـ البدایه والنهایة له (ملامح الانقلاب) لا ٥٦ وەرگیراوە.

٢ ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (٥٣/١) .

٣ ـ تاریخ الخلفاء للسبوطی وله (ملامح الانقلاب) وەرگیراوە لا ٥٥ .

تەنها بۆ ئەوان دروست کراوە .[١]

٦- (رهبان)ی گاوریش بۆی گریاون:

(الاوزاعی)دەڵێت: من ئامادەی بەخاك سپاردنی عمری کوڕی عبدالعزیز بووم، پاشان بەرەو شاری (قنسرین)کەوتمەڕێ، لەڕێگا دام بەلای(راهب)ێکدا و پێ ی ووتم: تۆ دەلێم، وادەزانم ئامادەی ناشتنی ئەو پیاوە بوویت؟ ووتم: پێی: بەڵێ. و ئەویش چاوی داخست ودەستی کرد بەگریان، گریانێکی بەکوڵ.

پێم ووت: تۆچۆن دەگریت! خۆتۆ لەسەر ئاینەکەی نیت؟ کابرا ووتی: من بۆ ئەو ناگریم، بەڵکو بۆ ئەو نوورە دەگریم کەلەسەر زەویدا بوو بەلام بەمردنی ئەو کوژایەوە.[٢]

٧- پادشای ڕۆم ودارو دەستە وپیاوانی ئاینی یەکەی :

عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله وەفدێکی فەرمی نارد بۆ لای پاشای ڕۆم بەکارێك کە بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدابوو، کاتێ ڕۆشتە لای پاشا، بینیان پاشا تاجێکی بەسەرەوەیەو تەرجومانێکیش لەلایدا وەستابوو، لەسەر عەرشەکەی پاڵی لێدابوویەوە، پیاوانی ئاینی لەلای راست وچەپی یەوە وەستابوون و خەڵکەکەی تریش هەریەکە وبەپێ ی پلەو پایەیان لەبەردەمیدا وەستابوون، موسڵمانەکانیش ئەوەی مەبەستیان بوو لەهاتنەکەیان خستیانە ڕوو، پاشایش بەڕوویەکی خۆشەوە وەلامی دانەوە، ئەوڕۆژە لەوێ مانەوەو چوونە دەرەوە لەلای پاشا.

لەڕۆژی داهاتوودا نێرراوی پاشاهات وشتێکی پێ ووت، کاتێ موسڵمانەکان هاتنەوە دیوەخانی پاشا دەبینین واپادشا وەك دوێنی نی یە غەمبارو دڵتەنگ لەسەر عەرشەکەی هاتۆتە خوارەوەو تاجەکەی حستۆتە باوەشی وەك بڵێ شتێکی لێ ڕوودابێت،ڕووی تێ کردن و پێ ی ووتن: ئەزانن بۆچی بانگم کردوون؟ووتیان: نەء ووتی: کاربەدەستێکم کەهاوسنوری وڵاتی عەرەبە، پێ ی ڕاگەیاندم لەم نامەیەدا کە: ئەمڕۆ ئەو پیاوە صالحەی کەگەورەی عەرەبەکانە _موسڵمانان_ لەدنیا

---

١ - صفه الصفوة (١٥٦/٣) .

٢ - سیره عمر (ابن الجوزی) لا ٣٣١ .

دەرچوو، هەموو خۆیان پێ نەگیراو دەستیان کرد بەگریان.

پاشایش ووتی: بۆ خۆی دەگرین؟ یان بۆ ئاینەکەتان؟ یان بۆ خۆتان؟ ووتیان: بۆ خۆمان وئاینەکەمان وئەو دەگرین.

پاشا ووتی: بۆ خۆتان بگرین بۆ ئەو مەگرین ئەو تازە ڕۆی وگەیشتە جێگایەك زۆر لەم ژیانەی باشترە، زۆر لەوە دەترسا کەلە گوێرایەڵی خوای_ گەورە_ دەربچێت وخوایش دوو ترسی لەسەر کۆنەکردەوە ترسی دنیاو ترسی خوا.

من زۆرم بیستووە لەچاکەو لێهاتوویی وڕاستگۆیی ئەو پیاوە، گومانم وابووە ئەگەر کەسێکی تر دوای عیسی عليه السلام مردووی زیندوو بکردایەتەوە ئەو پیاوە دەبوو، بەوردی چاودێری وبەدوادا چوونم کردوە وبۆم دەرکەوتووە دیوی دەرەوەو ناوەوەی وەك یەکە، بەڵکو دیوی ناوەوەی باشتربووە کەکاتێ بەتەنهایی چووەتە خەڵوەتەوە لەخزمەت پەروەردگاریدا بووە.

پاشا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو ووتی: من بەو ڕاهبە وخواناسانە سەرسام نیم کە واز لەدونیا دەهێنن ولە گۆشەیەکی چۆڵدا خواناسی خۆیان دەکەن، بەڵکو بەم پیاوە سەرسامم کە سامان و دەستەڵاتی دنیا هاتە بەردەستی بەڵام ئەو دنیانەویستی(زهد) بەولاوە شیرین بوو هەڵی بژارد تاوەك ڕاهیبەکانی لێهات، بەڵام داخەکەم چاکە کاران لەناو خراپەکاراندا زۆر نامێننەوەو کۆچ دەکەن.[1]

### ١٤- کەرامەتی لێوەگێڕراوەتەوە:

لە(حسین القصار)ەوە دەگێڕنەوە کەدەڵێت: لەسەردەمی عمری کوڕی عبدالعزیزدا بزن ومەڕم دەکڕی، دام بەلای شوانێکدا ڕانی دەلەوەڕاندو بەچواردەوری ڕانەکەدا (٣٠)گورگم بینی بەڵام گومانی ئەوە برد سەگ بن.

بۆیە بەشوانەکەم ووت: ئەی برای شوان ئەم هەموو، سەگەت بۆچی یە؟، ووتی: کوڕی خۆم ئەوانە سەگ نین بەڵکو هەموویان گورگن! ومنیش ووتم: پاك وبێگەردی بۆ خوا گورگ لەناوڕاندایە ونایشیان خوات؟!

---

١ ـ مروج الذهب (١٩٥/٣) فقه عمر بن عبدالعزیز (٥٤/١) .

کابرا ووتی: کوڕی خۆم، ئەگەر سەر تەواو بێت، لاشە زۆر گرنگ نی یە.[١]

بەڵام زۆر پشت بەك ڕووداوانە نابەسترێت چونکە خوای گەورە سوننەتی خۆی لەم ژیانەدا بۆ هیچ کەسێك تێك نادات وبەسروشتی حاڵ گورگ و دڕندەکان لەسەر گیانلەبەرانی تر دەژین. ولەلایەکی تریشەوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا گورگ شوانی مەڕ نەبووە ولەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانیشدا لەوشتانە ڕوویان نەداوە بەڵکو ئۆباڵی ڕاستی ناڕاستی ئەم جۆرە بەسەر هاتانە لەئەستۆی گێرەرەوەکانیاندایە.

(بەڵام پاش لەدنیا دەرچوونی ئەو خەلیفە لاوە دادپەروەرە، زاناو داناو ناودارەکانی ئیسلام خەوی خۆشیان پێوە دیوە، هەموو موسڵمانان بەگشتی و بەهەموو لایەنێکیانەوە بەداخ بوون بۆ مردنی و مردنەکەیان بەخسارەت دەزانی بۆ بەردەوامی ئەو چاکسازی ونوێخوازیەی کە خوێنێکی تازەی کردە جەستەی وولاتە یەکگرتووەکانی ئیسلام و وڵاتی بەرەو سەردەمی زێڕینی چوار خەلیفە ڕاشیدەکە گەڕاندەوە)[٢]

(لە کۆتاییدا داواکارم لەپەروەردگاری باڵا دەست ئەمیری باوەڕداران لەناو باخ و باخاتی بەهەشتە نەبڕاوەکەی خۆیدا جێ بکاتەوە وئێمەش بکاتە قوتابی یەکی گوێڕایەڵی ئەو قوتابخانە مەزنەی ئیسلام کە وێنەی کوڕی عبدالعزیزی پێش کەشی مرۆڤایەتی کرد).[٣]

**سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين**
**والحمدللة رب العالمين**

١ ـ الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز (٢/٦٧٠) .
٢ ـ ووتەی وەرگێڕ .
٣ـ ووتەی وەرگێڕ .

# ناوەڕۆك